چاپی یەکەم
2013

# کچەکەم فەرەح



## یاداشتەکانی فەریدەی دیبا
## (دایکی فەرەح پەهلەوی شاژنی ئێران)

وەرگێڕانی: سەمیر حسێن

# کچەکەم فەرەح

## یاداشتەکانی فەریدەی دیبا (دایکی فەرەح پەهلەوی شاژنی ئێران)

نوسینی: فەریدەی دیبا

وەرگێڕانی: سەمیر حسێن

چاپی یەکەم

٢٠١٣

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
زنجیرە: (٤٠٠)

٥٥٥٥٥٥٥٥٥٥




## ناسنامەی کتێب

کچەکەم فەرەح

- بابەت: یاداشت
- نوسینی: فەریدەی دیبا
- وەرگێڕانی: سەمیر حسێن
- بەرگ و دیزاین: فواد کەوڵوسی
- چاپخانە: گەنج.
- نۆبەتی چاپ: یەکەم.
- ساڵی چاپ: ٢٠١٣
- کوردستان - سلێمانی.
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە.

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە: ()ی ساڵی ٢٠١٣ی پێدراوە.



ناونیشان
سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.
ژمارەی مۆبایل: ( ٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣ ) ( ٠٧٥٠١١٩١٨٤٧ )



# پێڕست

# پێشەکی وەرگێڕ

زۆرێك لە مێژوونوسە بەناوبانگەکانی جیهان کۆکن لەسەر ئەوەی کە خوێندنەوەی مێژوو تەنها بۆ چێژ وەرگرتن نیە لە ڕووداوەکان، بەڵکو بۆ ئەوەیە نەوەکانی ئەمڕۆ بتوانن کەڵك لەو ڕووداوانە وەرگرن کە ڕوویانداوە، وەکو ئەوەی دەسەڵاتدارەکان چۆن وڵاتیان بەڕێوەبردوە، لەکوێ ڕاستیان کردوە و لەکوێ توشی هەڵەی گەورەبوون، کام سەرکردە خۆشەویست بووە لەلای خەڵکی، بە پێچەوانەوە کام سەرکردە و پاشا بێزراو بوون؟ بۆچی هەندێك لە نەتەوەکان پێشکەوتوون و هەندێکیش بەردەوام لەناو کێشە و ململانێی گەورە و بێ سەروبەریدان؟ بۆچی بەدرێژایی مێژوو بەشێك لە دەسەلاَتەکان بەردەوام خراپەکار و نادادپەروەر و گەندەڵ و بێ کەڵك بوون و سامانی نیشتیمانیان وەکو هۆکارێك بەکارهێناوە بۆ تێرکردنی خواستەکانی خۆیان...

بەلاَم پرسیاری سەرەکی ئەوەیە بۆچی مرۆڤ زۆرجار هەڵەکانی مێژوو دووبارە دەکاتەوە، یان بۆچی بەردەوام دیکتاتۆر دروست دەبێت و دەسەلاَتەکان زۆر بەکەمی دەتوانن سود لە مێژوو وەرگرن، ئایا ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی سروشتی مرۆڤ یان پەیوەندی بەلایەنێکی ئالۆزی شاراوەی دەروونی مرۆڤەوە هەیە کە خۆی لەناخەوە حەز لە وێرانکردن و تالاَنکردن و نادادپەروەری دەکات. ئەمەش ئەو پرسیارە گرنگەیە کە بەردەوام دووبارە دەبێتەوە کە بۆچی زۆرێك لە مێژووی دەسەلاَتەکان خوێناویین و تاوەکو دەتوانن خەڵکی بۆ مەرامی خۆیان بەکاردەهێنن؟

گرنگی مێژوو لێرەوە دەردەکەوێت کە ئێمە بتوانین سود لەو هەموو ڕووداوانە وەرگرین کە لە ڕابردوودا ڕوویانداوە بۆ وەلاَمی بەشێك لەو پرسیارانە، بەتایبەتی ئەو ڕووداوانەی کە ئەمڕۆ بەشێوەیەکی دیکە دووبارە دەبنەوە.

لەم سۆنگەیەوە بوو حەزم کرد ئەم کتێبە وەربگێڕم، چونکە بەڕاستی ئەم کتێبە تەنها یادەوەرێکی ئاسای نیە، هەرچەندە کتێبەکە لە هەندێك شوێندا بیرەوەری

منداڵی و گەنجی و کاتە سەختەکانی ژیانی کەسێك دەگێڕێتەوە، کە لەوانەیە هەر کەسێکی ئاسای توشی ئەو سەختیانەی ژیان بووبێت، بەڵام لە زۆرشوێنیشدا ئاماژەی گرنگی سیاسی و کۆمەڵایەتی و باسی سەرنجڕاکێشی تێدایە لەبارەی کەسایەتی و دەسەڵاتدارەکانەوە، وەکو لە دەستپێکی کتێبەکەشدا هاتووە، (فەریدە دیبا) دایکی فەرەح دیبا، لەبەر ئەوەی کە ژنێکی سادە و ساکار بووە و زۆر تێکەڵ بە سیاسەت و لایەنی بەرژەوەندی شەخسی نەبووە، زۆر بەشێوەیەکی ڕاشکاوانەتر لە کەسانی بنەماڵەی پەهلەوی باسەکان دەکات و ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە، زۆرشتی نەوتراوی وتووە کە تەنانەت بووەتە جێگەی نیگەرانی کچەکەی و کەسە نزیکەکانیشی، وەکو خۆی دەڵێت دەمویست تاوەکو ئەو شوێنەی پێم دەکرێت حەقیقەتەکان ڕوون بکەمەوە، هەرچەندە لەکۆتاییشدا خۆی دانبەوەدا دەنێت کە هێشتا نەیتوانیوە کۆمەڵێك ڕاستی هەیە بیانخاتەڕوو، و ئەو حەقیقەت و ڕووداوانەشی بۆ هەمیشە سپاردوە بە کونجی تاریکی مێژوو.

بەڵام بەهەرحاڵ ئامانج لەم وەرگێڕانە ئەوەبوو کە خوێنەری خۆشەویستی کورد، ئاگاداری بەشێك لەڕووداوەکانی سەردەمی پەهلەوی بێت، هەروەها لە دەمی فەریدە دیباوە ئاگاداری شێوەی ژیانی فەرەح بێت کە چۆن بەهەژاری گەورە دەبێت و بە هۆی ڕۆژگار و کاری چەرخی گەردونەوە دەبێتە یەکەمین ژنی دەسەڵاتداری ئێران و بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر شانۆی سیاسی ئێران ڕۆڵ دەبینێت، لەگەڵ باسێکی کورتی ئەو کەسایەتی و سیاسی و سەرکردانەی کە لەو سەردەمەدا ڕۆڵیان هەبووە، لەگەڵ باسی شکۆمەندی دەسەڵاتی محمد ڕەزا و دەستوپەیوەندەکەی و لەکۆتاییشدا دەربەدەری و ئاوارەی شا و قاچاخبوونی لەم جیهانە پان و بەرینەدا.

لەلایەکی دیکەشەوە ئەم کتێبە لەو ڕوانگەیەوە بۆ ئێمە گرنگە، کاتێك کە دەبینین دەسەڵاتی شاهنشاهی لە ترۆپکی دەسەڵات و سامان و هێزدا چۆن توشی گەندەڵی و درۆ و دزی و تالانی و ڕاوەڕووتی دەسەڵاتدارەکانی بوویەوە و بەچەشنێك کە هەر کەس لە ئاستی خۆیەوە خەریکی وێرانکردنی ئەو وڵاتە بوو و دەسەڵاتدارەکان لەو پەڕی خۆشی و کەیف و نۆشدا بوون و خەڵکیش لەوپەڕی داماوی و برسیەتی و نەزانی و دواکەوتوویدا، بەتایبەتی کاتێك ئەو بەشانە دەخوێنینەوە کە چۆن (شا)

کۆمەڵێک لە گەندەڵ و دز و درۆزن دەوریان تەنی بوو و نەیاندەهێشت بەهیچ شێوەیەک حەقیقەتی خەڵکی هەژار و کەم دەرامەت ببینێت و تێبگات لە کێشەکانی خەڵکی گشتی، دەرئەنجامیش هەر ئەو درۆزن و گەندەڵانە بوون لە کۆتاییدا وڵاتیان توشی خەڵاتانی خوێن و مەینەتی و وێرانبوون کرد و پێش هەموو کەس ئەو وێرانبوونەش بەرۆکی خۆیانی گرت و زۆرێکیان گیران و لەسێدارە دران و بەشێکیشیان بۆ هەمیشە ئاوارە و سەرگەردان بوون، ئیدی تێدەگەین کە ئەم مێژووە بەردەوام لە ئێستاشدا دووبارە دەبێتەوە کە چۆن خەڵکی گەندەڵ و ماستاوچی و درۆزن بەردەوام بازنەیەکی چڕیان بەدەوری دەسەڵاتدارەکان و ناوەندەکانی بڕیاردا دروستکردوە و لە بەرژەوەندی تەسکی خۆیان کاروبارەکان ئاراستە دەکەن. دەرئەنجام هەمیشە سەرکردەکان و دەسەڵاتەکانیش بەهۆی خراپی ئەو کەسە گەندەڵ و مەشەخۆرانەوە لەناوچوون کە پارێزەری سەرەکی خۆیان بوون.

هیوادارم هەرکەسێک ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە بتوانێت سەرەڕای چێژی ڕووداوەکان، پەی بە ڕاستی و دروستی ئەو دەسەڵاتانەش بەرێت و دڵنیا بێت لەوەی کە هەموو دەسەڵاتێکی گەندەڵ و دز و درۆزن هەرچەندە زۆر بەهێز و دەزگای زۆر گەورەی سیخوڕی و ئاسایشی و نهێنیشی هەبێت، بەڵام ئەگەر نەتوانێت لەناو هەناویدا دادپەروەری و خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی فەراهەم بکات بۆ خەڵکی گشتی، سەرئەنجام ئەو دەسەڵاتە مۆرانە دەکەوێتە گیانی و بەرەبەرە دادەڕزێت و لەناودەچێت و بۆ هەمیشە دەچێتە ناو زبڵدانی مێژووەوە.

ئامانجم لەم وەرگێڕانەش ئەوەیە کە کتێبێکی مێژوویی دیکە بخەمە سەر کتێبخانەی خۆشەویستی زمانی کوردی و ببێتە هۆی سودوەرگرتنی هەرکەسێک کە دەیخوێنێتەوە.

لەکۆتاییشدا داوای لێبوردن دەکەم لە هەر هەڵە و کەموکوڕێک کە کردبێتم، چونکە جگە لە خودای گەورە هیچکەس بێ کەموکوڕی نیە.

سەمیر حسین

٢٠١٢/٧/٢٣

## دەستپێك .....

بێگومـان، شۆڕشـی ئیسلامی ئێـران یەکێکـە لـە ڕووداوە سـەیر و کاریگـەرەکانی سەدەی بیستەم.

مـاوەی ڕاپـەڕینی شۆڕشـی خـەڵکی ئێـران لـە دژی سـەرەڕۆیی پەهلـەوی تـاوەکو سـەرکەوتنی شـۆڕش و کـەوتنی دەســەڵاتی پاشـایەتی ئەوەنـدە کـەم بـوو کـە دەسـەڵاتدارەکانی ئـەو حکومەتـەی بەشێوەیەك توشـی سەرسـامی کـرد کـە تـاوەکو ئێـستاش پـاش تێپـەڕینی سـی و چەند سـاڵ هێـشتا نـاتوانن سـەر لـەو بارودۆخـە دەربکەن کە چۆن ڕوویدا.

بە جورئەتەوە دەتوانرێت بوترێت، تاوەکو ئێستا هیچ شۆڕشێکی گەورەی جیهـان ئەوەنـدەی شۆڕشـی ئیسلامی ئێران کتێبی لەبارەوە نەنوسـراوە. زیـاد لـە دوو هـەزار ناونیشانی کتێب لەلایەن نوسـەرەکان، مێژوونوسـەکان، سیاسـەتمەدارەکان و پیاوانی ئـەورووپی و ئەمریکیـەوە لـە بـارەی شۆڕشـی ئێرانـەوە نوسـراوە و بلاوکراوەتـەوە، تەنانەت زۆرێك لە دەستڕۆیشتوەکانی حکومەتی پێشوو و تەنانەت ئەندامانی خێزانی پەهلـەوی (و خـودی شـای پێـشووش) لـە بـارەی ئـەم ڕووداوە مێژووییـەوە کتێبـی نوسیوە.

بەرهەمەکانی بەشێك لەم نوسـەرانە، وەکو کتێبەکەی محمد حسنین هیکل (ئێران، ئـەو چـیرۆکەی کـە هـەرگیز بـاس نـەکرا) بـێ لایەنانـە و بەشـێوەیەکی ورد باسـی ڕووداوکان و بەسەرهاتەکانی کردوە.

هەنـدێکی دیکـە وەکـو نوسـەرە ئـەمریکی و بەریتانیـەکان سـەرەڕای باسـکردنی بارودۆخـەکان و ڕووداوە مێژووییـەکانی هەوڵیانداوە لە ڕاستی ڕووداوەکان لابدەن و دەستکاری مێژوو بکەن.

کەسانی وەکو (شا)ی پێشوو لە کتێبی (وەڵام بۆ مێژوو) و یان ژەنراڵ عباس قرەباغی یان کریم سنجابی و شاهپور بەختیار و...هتد هەوڵیانداوە، سەرەڕەی باسکردنی ئەو ڕووداوانەی کە بوونە هۆی کەوتنی ڕژێمی پاشایەتی بەڵام خۆشیان لە بەردەم مێژوو و نەوەکانی دواتردا پاك بکەنەوە و خۆیان بێ بەری پیشان بدەن.

بەهەرحاڵ، سەرجەمی ئەم بەرهەمانە هەرچەندە بە ئامانجیش نوسرابن، بەڵام لە هەمان کاتدا، خاوەنی بنەمایەکی بەنرخن لە دەرخستنی حەقیقەتەکان و ڕووداوەکان، و کەسی لێکۆڵەر و خوێنەری شیکاری دەتوانێت بە جیاکردنەوەی ڕاستی لە ناڕاستیەکان بگات بەو ڕێڕەوە ڕووداوانەی کە لە کۆتاییدا بوونە هۆکاری هەرەسهێنانی ئەو ڕژێمە.

بەنرخترینی ئەم بەرهەمانە کتێبی یاداشت و بیرەوەریەکانی ئەندامانی خێزانەکەی پەهلەوی، فەریدە دیبا و سیاسیەتمەندارەکان و پیاوانی دەسەڵاتداری ئەو حکومەتەیە.

هەرچەندە هەریەکە لەو کەسانە، لە کتێبەکانی خۆیاندا، هەوڵیانداوە بە جۆرێك لە جۆرەکان کێشەکانی خۆیان لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە ناکۆکیان هەبووە لەگەڵ یەکتریدا یەکلایی بکەنەوە، و هەموو تاوانی هەرەسی ڕژێمەکەیان بخەنە سەر یەکتر و خۆیان بێ تاوان بخەنەڕوو، بەڵام لە کۆتاییشدا خۆیان ڕسوا کردوە و نهێنی و بابەتی فراوانیان ئاشکراکردووە.

لەناو ئەو بیرەوەری و یاداشتانەی کە لەلایەن کەسانی خێزانی پەهلەویەوە نوسراوە دەتوانرێت ئاماژە بە کتێبی بیرەوەریەکانی ئەشرەف پەهلەوی، (وەڵام بۆ مێژوو)ی محمد ڕەزا پەهلەوی، (پاش هەرەس) ئەحمەد علی ئەنصاری-کوڕی پورێی فەرەح دیبا، (براکەم شا) غلامڕەزا پەهلەوی و (کچەکەم فەرەح) فەریدە دیبا بکرێت.

بە باوەڕی زۆرێك لە لێکۆڵەرەوانی مێژووی ئێران، دوو کتێب (وەڵام بۆ مێژوو)ی (محمد ڕەزا پەهلەوی) و بیرەوەریەکانی خاتو فەریدە دیبا (کچەکەم فەرەح) دیارترین و بەرجەستەترینن لە هەموو کتێبەکانی دیکە. بەتایبەتی خاتو فەریدە دیبا (دایکی فەرەح پەهلەوی) چونکە بە هۆی ناشارەزای لە پێکهاتە و شێوەی سیاسی و زاڵبوونی هەستی ژنانەی بەسەر لایەنی بیرکردنەوەی بەرژەوەندیانەدا، بێ پەردەتر و

ڕاشکاوانەتر لە کەسانی دیکە قسەی کردوە و نهێنیە نەوتراوەکانی خێزانی پەهلەوی و دیبای ئاشکرا کردوە و خستویەتیەڕوو.

کتێبی کچەکەم فەرەح (بیرەوەریەکانی خاتو فەریدە دیبا) بڵاوکراوەی نیما لە جنێوەری ساڵی ١٩٩٩ لە لەندەن بڵاوی کردەوە.

بڵاوکەرەوەی چاپە ئینگلیزیەکەی کتێبەکە، لە پێشەکیەکی کورتدا، بەڕاستی ئاماژە دەکات بەوەی کە دەقی کتێبەکە لەسەر شریتە دەنگیەکانی خاتو دیبا نوسراوەتەوە و داڕێژراوە.

خاتو فەریدە دیبا، بەهۆی نەخۆشی و پیریەوە، نەیتوانیوە بەڕاستی بەشێك لە نامەکان و بەروارەکان بپێکێت، بەڵام بەشێوەیەکی سەیر ئەو ڕووداوە مێژووییانەی کە خۆی لەناویاندا بووە و شایەتیان بووە، بە دەرخستنێکی سادە و سەرنجڕاکێشەوە باس دەکات.

ئەو بابەتانەی کە خاتو دیبا دەیانخاتەڕوو، سوچێکی تاریکی مێژووی هاوچەرخی ئێران ڕووناك دەکەنەوە.

هەرچەندە، دایکی فەرەح پەهلەوی لە باسکردنی هەندێك لە ڕووداوەکاندا کەوتوەتە ژێر کاریگەری بۆچونەکانی محمد ڕەزا شا یان ڕادیۆ و چاپەمەنیە بێگانەکانەوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی کتێبی بیرەوەریەکانی (واتە ئەم کتێبەی کە لەبەردەستدایە) ڕاشکاوەنەتر و ڕاستترە لە کتێبەکانی دیکەی ئەندامانی خێزانی پەهلەوی. چونکە لەوانەیە بەبێ هیچ جۆرە بیرکردنەوەیەك لە بەرژەوەندێکی تایبەتی و شەخسی نوسرا بێت.

خاتو دیبا سەرەڕای باسکردنی وردترین و تایبەتیترینی پرسە ئەخلاقیەکانی شا و خێزانەکەی، باسە تایبەتیەکانی خۆیشی بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە و بێ باکانە باس کردوە.

لەم کتێبەدا، خاتو فەریدە دیبا دەستی خوێنەر دەگرێت لەگەڵ خۆیدا بەرەو دنیای پڕ نهێنی و ئەفسانە ئاسای کۆشکەکان و دەرباری شاهەنشای دەبات.

خاتون خوێنەری کتێبەکەی دەخاتە ناو ڕووداوی میوانداریەکان و سەفەرە پاشایانە شکۆمەندانەکانی سەرانی وڵاتانی بێگانە بۆ ئێران.

پاشان دیتە سەر باسی ئاهەنگی هاوسەرگیری کچەکەی لەگەڵ محمد رەزا شا و ئاهەنگەکانی تاج لەسەرنانی دوو هەزار و پێنج سەدەمین ساڵی شاهنشاهی، و تاوەکو ئەو شوێنەی کە بیرەوەری و یادەوەریەکانی ڕێگەی پێدەدەن کەسایەتیەکان و کەسانی دەسەلاتداری دەوروبەری شا و کچەکەی یەك بەیەك دەناسێنێت.

سەیرو سەمەرەترین بەشی ئەم کتێبە، بیرەوەری فەریدە دیبا (دایکی فەرەح پەهلەوی)، باسکردنی ڕۆژانی هەڵهاتنی محمد ڕەزا شا، فەرەح و ئەندامەکانی خێزانی پەهلەوییە بۆ میسر، مەراکیش، باهاما، پەنەما، مەکسیك و ئەمریکا...

خاتو دیبا، کە یادەوەری تاڵ و ناخۆشی هەیە لەبارەی ڕۆژانی ئاوارەیی لە غەریبیدا، بێ سەرپەرشتی و بێ چارەی محمد ڕەزا شا و ئاوارەییەکەی بەشێوەیەکی زۆر جوان دەخاتەڕوو و بە ئاشکرا بابەتەکان و باسەکان دەخاتە بەردەست خوێنەرەکانی.

بلاوکەرەوەی کتێبی خاتو فەریدە دیبا بەو شێوەیەی کە لە چاوپێکەوتنەکەی لە ڕادیۆی ٢٤ کاتژمێری لۆس ئەنجلسیشدا ئاماژەی بۆ کردوە، بلاوکردنەوەی ئەم کتێبە بووەتە هۆکاری توڕەیی ئەندامانی خێزانی پەهلەوی و تەنانەت بێتاقەتی کچەکەشی (فەرەح).

ئەم کتێبە، لەناو ئێرانیەکانی نیشتەجێی ئەمریکا و ئەوروپا و ئێران پڕ فرۆشترین کتێبی ئەم ساڵانەی دوایی بوو، کە ئێستاش وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی دەخرێتە بەردەست خوێنەرانی خۆشەویست.

پێویستە ئەوە باس بکرێت کە هەوڵدراوە تاڕادەیەك زۆری ئەو دەربڕینە زیادەڕەوی و بەکارهێنانە نازناویانەی کە ئاماژەی تەشریفاتین وەکو جەنابی ئەعلا حەزرەت و جەناب عالی یان جەنابی ڕێزدار حەزرەت کەم بکرێنەوە. ئەگەر لە هەندێك ڕستەدا ئەم دەربڕینانە بە ئاشکرا بەکارهێنرابن بۆ ئەوە بووە کە تاوەکو ڕادەیەك شێوەی قسەکانی خاتو دیبا بپارێزرێت.

(انتشاران به افرین)

# ئاشنایەتی لەگەڵ شا دا! .

لە یەکێك لە ڕۆژەکانی بەهاری ساڵی ١٩٥٨ بوو، منداڵەکەم بە شەوق و خۆشیێکی فراوان و سەرسوڕمانێکی زۆرەوە (حاڵەتێك کە باشترە بە شۆك بیچوێنم) هاتەوە بۆ ماڵەوە و وتی: (دایە! دایە! (کچەکەی شا بانگهێشتی کردوم بۆ ماڵەوەیان!)

کاتێك، کەمێك هاتەوە سەر خۆی و لەو حاڵەتە نائاساییە ڕزگاری بوو، باسی شێوەی بینین و چاوپێکەوتنی خۆی لەگەڵ (ئەردەشیری زاهدی)، زاوای شا (پیاوی خاتو شانازی) بۆ کردم.

(فەرەح) وتی بۆ بینین و چاوپێکەوتن لەگەڵ (ئەردەشیری زاهدی)، کە ئەو کات سەرۆکی کاروباری خوێندکارانی ئێرانی نیشتەجێی دەرەوەی وڵات بوو، سەردانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەم کرد و (ئەردەشیری زاهدی) لەلایەن هاوسەرەکەیەوە (شانان) بانگهێشتی کردم بۆ ماڵەوەیان.

***********

ڕێگەم پێ بدە هەندێك بگەڕێمەوە بۆ دواوە و باسی ئەو ڕووداوەت بۆ بکەم کە لە کۆتاییدا بووە هۆی ناسینی (فەرەح) لەگەڵ (محمد ڕەزا شا) و دەرئەنجامیش بووە هۆی هاوسەرگیریان.

پیاوەکەم (خوالێخۆشبوو سوهراب دیبا)، ئەفسەری[1] سوپای شاهنشاهی بوو و لە کۆتایی تەمەنی لە بەڕێوەبەرایەتی دادی سوپای تاران خزمەتی دەکرد. هاوسەرەکەم

---

[1] - باوکی فەرەح ئەفسەری سوپا نەبوو بەڵکو پلەداری سوپا بوو. لە بەڵگە بەجێماوەکانی سەردەمی پەهلەوی ناوی وەکو مقەوەز (سوهراب دیبا) براوە.

لە چەند ڕووداوێکی گرنگی مێژوویی سەربازیدا بەشداری ڕاستەوخۆی هەبووە کە لەوانە دەتوانم ئاماژە بە ئاژاوەکەی (ئیسماعیل ئاغا سمیتقو)[2] بدەم لە ئایزەربایجان، کە لەو ڕووداوەشدا بریندار بووبوو.

لەساڵی ١٩٢٥، هاوسەرەکەم گوازرایەوە بۆ هێزی سوپای گەیلان و بۆ خزمەتی سەربازی هات بۆ ڕەشت.

ئەو کات، من کچێکی هەرزەکار بووم و پاش تەواوکردنی قۆناغی خوێندنی سەرەتایی، بۆ فێربوونی دروومانی دەچووم بۆ لای خاتو سەکینە شەرەفی کە لە لای ڕۆژهەڵاتی مەیدانی سەرەکی ڕەشت (سەوزە مەیدان)ەوە بوو.

لەو ساڵانەدا زۆر بەکەمی کچێك پەیدا دەبوو کە دەیتوانی سەرکەوتوو بێت بە تەواوکردنی قۆناغی سەرەتایی.

هەڵبەتە، لە تاران دەکرا کچ قۆناغی ناوەندیش تەواو بکات. چەند خوێندنگەیەکی ناوەندی وەکو، قوتابخانەی ئیتاڵیەکان و فەرەنسیەکان لە تاراندا چالاکیان هەبوو کە تەنها کچیان وەردەگرت. بەڵام لە شارە بچوکەکان و پارێزگا و قەزاکاندا ئەم جۆرە قوتابخانانە نەبوون، هەرچەندە لە زۆرێك لە ناوەندەکانی پارێزگاکان و شارە گەورەکاندا بەشێوەیەکی پەرتەوازە هەلی لەبار هەبوو بۆ خوێندنی کوڕان بۆ قۆناغی ناوەندی، بەڵام بۆ کچان تەنانەت قۆناغی سەرەتاییش بوونی نەبوو.

ڕەشت یەکێك بوو لەو شارە دەگمەنانەی ئێران کە لەبەر ئەوەی لەسەر سەرە ڕێی وڵاتە گەورەکاندا بوو، بە ئاسانی دەستی دەگەیشتە شارستانیەتی و فەرهەنگی ئەورووپی، هەر بۆیە زۆر زووتر لە شارەکانی دیکەی ئێران بوو بە خاوەنی قوتابخانەی کچانە و تەنانەت دواناوەندیشی لێ کرایەوە.

---

گومانی تێدا نیە ئەو کەسانەی کە دەگەنە دەسەڵات و ناوبانگی بۆ خۆیان شەجەرەنامەیەك دروست دەکەن و ڕابردوویەکی شکۆمەندانە بۆ خۆیان ساز دەکەن. هەر لەبەر ئەوەشە کە مفەوەز دیبا دەگۆڕێت بۆ ئەفسەرێکی پلە بەرز.

[2] – ئیسماعیلی ئاقا سمیتقو سەرۆکی فەوجێك بوو لە ئایزربایجانی ڕۆژئاوا شۆڕشێکی بەرپا کرد بەڵام لەلایەن دەوڵەتەوە سەرکوت کرا و لە ساڵی ١٩٣٠ کوژرا.

هەڵبەتە ناوەندی هونەرستانیش بە مانای ئەمڕۆیی نەبوو. لەبیرمە تەنها چەند شارەوەندێکی ڕووس، لە ڕەشت فێرگەی بەخێوکردنی ماسی و فێرگەی کارەبا و چاککردنەوەی پەیوەست بە کەلوپەلی کریکاریان هەبوو. کارەبای شاریش لە کارگەیەکەوە دەهات کە موڵکی کەسێکی ڕووسی بوو.

باوکم زۆر زوو دنیای بەجێهێشت و لە یاریەکانی ڕۆژگاریش بوو کە لەم ڕووەوە چارەنوسی من و منداڵەکەم ڕێك وەکو یەك بێت.

کاتێك باوکم لە دەستدا، براکەم سەرپەرشتی ژیانی من و دایکمی لە ئەستۆ گرت. براکەم، محمد علی، تەنها چوار ساڵ لە من گەورەتر بوو و لەو ساڵانەی جەنگی جیهانی دووەم و ئەو قەیرانە سەختە ئابوریەدا دەبوو بە تەمەنێکی کەمەوە بەرپرسیاریەتێکی گەورە لە ئەستۆ بگرێت.

مرۆڤ، ئەگەر لە دنیادا هەموو شتێکی هەبێت و خاوەنی هەموو بەهرەکانی ژیانیش بێت، بەڵام باوك یان دایکی لەدەستدا بێت، هەمیشە هەست بە کەمی و ناتەواوی دەکات.

پەیوەستبوونی مهرەبانی و خۆشەویستی فراوان لەگەڵ باوك و دایك بۆ ئەوەیە کە مرۆڤ زادەی ئەوانە و لە ڕاستیدا بەردەوامی و درێژکراوەی بوونی ئەوانە.

کچ زیاتر وابەستەی دایکە، چونکە وابەستەبوونێکی زیاتری هەیە، و لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر ئەوەی کە کچ زیاتر لە کوڕ بوونەوەرێکی سۆزدار و هەستیارتر هەمان پەیوەندیەشی لەگەڵ باوکیدا هەیە.

من لەو کاتی هەرزەکاریەدا، بە لەدەستدانی باوکم، توشی سەرگەردانێکی گەورەی سۆزداری بووم کە تاوەکو ئەمڕۆش ئەو سەرگەردانیە لەگەڵمدایە و سوێندیش دەخۆم کە هەرگیز، تەنانەت لە باشترین ڕۆژەکانی سەرکەوتنی ژیانیشم، نەمتوانیوە ئەو هەستکردن بە کەمیەی باوکم لەبیر بکەم و بەردەوامیش هەستم بەو بۆشاییە کردوە.

بەداخەوە، کچەکەشم بە منداڵی باوکی خۆی لەدەستدا و لەوانەشە ئەمە یەکێك بێت لە یاریە سەیرەکانی ژیان و ویستە نەخوازراوەکانی خێزانی ئێمە.

دایکیشم بە هەتیوی گەورە بووبوو، واتە ئێمە سێ نەوەمان باوکمان لەدەستدا بوو!

فشار و گرفتەکانی ژیان پاش باوك زۆر بوون. تاوەکو کاتێك کە باوکم لە ژیاندا بوو، زۆر هەستمان بە قورسی و دژواریەکانی ژیان نەدەکرد. بەڵام پاش مردنی باوکم ژیان شێوە و ڕووخساری گرژی خۆی نیشانداین.

من لە تەمەنی ١٤ ساڵی بووم بە شاگردی خوالێخۆش بوو خاتو سەکینەی شەرەفی. لەو ساڵانەدا ڕەشت یەکێك بوو لەو شارە دەگمەنانەی ئێران کە هەندێك لە وڵاتەکانی دەرەوە لەو شارەدا کۆنسوڵگەری و بنکەی بازرگانیان هەبوو.

(بەندەری پەهلەوی)[1] یەکێك بوو لە بەندەرە سەرەکیەکانی وڵات و ڕێگەی پەڕینەوە و تێپەڕینی ئێرانیەکان بوو بۆ ئەورووپا.

تاوەکو پێش هاتنە سەر دەسەڵاتی ڕەزاشا (بەندەری پەهلەوی) کە پێش هاتنە سەر حوکمی ڕەزا شا پێی دەوترا (ئەنزلی)[2]، تەنها دەروازەیەکی کراوە بوو بە ڕووی ئەورووپادا. بەڵام لەسەردەمی ڕەزا شادا بەندەری دیکە لە کەناری کەنداوی فارس دروستکران و ڕێگەی دەریایی تازە کرانەوە.

نزیکی (ڕەشت) و ئەنزلی و هاتوچۆی بازرگانانی بیانی و دەریاوان و مەلەوانەکان بۆ ئەو بەندەرە و هاتووچۆیان بۆ ڕەشت و هەروەها بوونی بیانیەکان لە ڕەشت، سەرەڕای بنکە بازرگانیەکان و کۆنسوڵگەریە بیانیەکان، بووبوویە هۆی ئەوەی کە لە هەموو جۆرە نەتەوەیەك لەم دوو شارەدا ببینرێن. هەڵبەتە زۆرینەی ئەو بیانیانەش ڕوسی و ئەڵمانی و بەریتانی بوون.

لەناو ڕوسەکاندا کەسانی زۆر لە ڕوسە سپیەکان دەبینران کە پاش شۆڕشی بەلشەفیکیەکان هاتبوون بۆ ئێران. بازرگانێکی زۆریش لە ئەرمەنی و ئازەری و ویلایەتەکانی قەفقازیش هەبوون کە پاش شۆڕش لەگەڵ ژن و منداڵەکانیان هەڵهاتبوون بۆ ئێران و لە ڕەشت و ئەنزلی و شارەکانی دیکەی ئێران نیشتەجێ بووبوون.

لەگەڵ بوونی ئەم هەلومەرجە، ڕەشت و ئەنزلی بارودۆخێکی تایبەتی ئابوری و فەرهەنگیان هەبوو.

---

[1] – پاش ئەوەی کە ڕەزاخان گەیشتە دەسەڵات ناوی (بەنەری ئەنزلی) گۆڕی بۆ (بەندەری پەهلەوی).

[2] –پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی دووبارە ئەم بەندەرە ناوەکەی بوویەوە بە (ئەنزلی)

لەو سەردەمەدا شوێنی کاری خەیاتی و فرۆشتنی قوماش و جلوبەرگ بەشێوەی ئەمڕۆیی لە ئێراندا بوونی نەبوو و هەرچەندە بەرگدرومانی پیاوانە بۆ دوورینی جلوبەرگ لە شارەکاندا هەبوو، بەڵام ژنان زیاتر خۆیان جلوبەرگی خۆیان دەدوری و نیشانەیەکی ئامادەبوونی کچێك بۆ شوکردن و هاوسەرگیریش ئەوەبوو کە دوورین و درومانی بزانێت و بتوانێت جلوبەرگ بۆ خۆی بدورێت!

دووکانی دروومانیەکەی خاتو شەرەفی لە سەوزە مەیدان (سبزە مەیدان)ی ڕەشت تاکە دروومانێکی ناودار و پڕ مشتەری شاری ڕەشت بوو کە خاتونە دیارە ئێرانیەکانی وەکو ژنانی فەرماندەی لەشکر و پارێزگار و ناودارەکانی شار مشتەری بوون و خاتونە بیانیەکانی نیشتەجێی ڕەشت و ئەنزلیش بۆ دوورینی جلوبەرگە تازەکانیان بۆ خۆیان و منداڵەکانیان سەردانی ئەم شوێنەیان دەکرد.

خاتو شەرەفی تاوەکو ڕادەیەك ژنێکی خوێندەوار و زۆر سەنگین و لە هەمانکاتیشدا هونەرمەند بوو.

کاتێك کە زانی خێزانەکەی ئێمە ناتوانێت بۆ بەردەوامیدانی ژیانێکی شەرافەتمەندانانە تەنها پشتی بەو داهاتە کەمەی براکەم بێت، منی بردە لای خۆی. لەو کاتە بە دواوە ئیدی دووکانی دروومانیەکەی خاتو شەرەفی بۆ من گۆڕا بۆ هونەرستانێك کە لێوەی فێری هونەری بەرگدروومانی بووم و هەروەها بووە شوێنێکیش بۆ بەدەستهێنانی داهاتێك بۆ ئەوەی بتوانم لە ڕێگەیەوە خەرجیەکانی ڕۆژانەی ماڵی پێ دابین بکەم.

لە کۆتایی ١٩٣٦ کاتێك کە بوومە بەرگدروومانێکی بە ئەزموون و تاوەکو ڕادەیەك داهاتێکی باشم هەبوو، ڕووداوێك ڕوویدا ئاراستەی ژیانمی گۆڕی.

ماڵی ئێمە لە نزیك بازاڕی ڕەشت بوو. ماوەیەك کاتێك کە لە دووکانەوە بەپێ دەچومەوە بۆ ماڵەوە هەستم بە پیاوێکی گەنجی پاسکیل سوار دەکرد کە خستبوومیە ژێر چاودێریەوە تاوەکو دەگەیشتمەوە ماڵەوە.

بەهەرحاڵ، ڕۆژێکیان ئەم پاسکیل سوارە نزیك بوویەوە لێم و پێی وتم دەمەوێت لەگەڵ دایکمدا بێمە خوازبێنیت.

دواتر کاتێك که هاوسەرگیریم لەگەڵدا کرد هۆکاری ئەوەم بۆ دەرکەوت که بۆچی ماوەیەك چاودێری دەکردم. وتی لەو ماوەیەدا زۆر بەوردی هەڵسوکەوت و هاتوچۆ و ئەخلاقتم خستبویە ژێر چاودێری وردەوە تاوەکو دڵنیابێت کە بزانیت من دەتوانم هاوسەرێکی خاوەن متمانە و شایستە بم بۆی.

من پێش ئەوەی کە بابەتەکە باس بکەم بۆ دایکم، باسەکەم لای خاتو شەرەفی باس کرد و ئەویش وتی دەبێت خۆم لێکۆڵینەوە بکەم لەو مەسەلەیە. هەروەها، خاتو شەرەفی داوای لێکردم کە ئەگەر دووبارە توشی بوومەوە داوای لیّ بکەم بڕوات بۆ ماڵی خاتو شەرەفی بۆ ئەوەی لەویّ خاتونەکەم ببینێت.

هاوسەرەکەی خاتو شەرەفی، ناوی حسین خان شەرەفی بوو، لە دەروازەی بەردەم شاری ڕەشت میوانخانەیەکی ئاسای و ڕستۆرانێکی باشی هەبوو.

ڕۆژێك کاتێك کە خوازبێنەکەرە پاسکیل سوارەکەم بینی. وەستام تاوەکو گەیشتە بەرامبەرم. پێم وت ئەم شێوە چاودێریە و کەوتنە دووم لەبەرچاو خەڵکی گشتی بە پاسکیل کارێکی جوان نیە و دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی بەشێوەیەکی خراپ شتەکان لێکبدەنەوە، پێم وت ئەگەر سوری لەسەر بڕیارەکەت و دڵنیایت لە کارەکەت دەبێت چاوت بکەویت بە وەستاکەم و بڕۆیت بۆلای.

ئەویش قبوڵی کرد و ناونیشانی ماڵی خاتو شەرەفی وەرگرت و ڕۆیشت.

چەند ڕۆژێك دواتر، لەگەڵ دایکی، کە خوا عەفوی بکات ژنێکی بەڕێز و حورمەتدار بوو، چوون بۆ بینینی خاتو شەرەفی و وتبوی پلەداری سەربازیم و خاوەنی موچەیەکی جێگیرم و بە تازەی لە تارانەوە گوازراومەتەوە بۆ ڕەشت و ئێستاش مەبەستی هاوسەرگیری و پێکهێنانی خێزانم هەیە و بۆیە بەم شێوەیەش هاتوومەتە پێشەوە بەڕاستی لەبەر ئەوەیە کە لە ڕەشت هیچ خزم و ناسراو و کەسێکمان نیە تاوەکو لەڕێگەی ئەوانەوە کارەکە جێبەجیّ بکەم، بۆیە ناچاربووم خۆم چەند کەسێکم ڕاسپاردوە کە پرسیار بکەن بۆم و ئەوانیش ئەم کەسیان هەڵبژاردوە بۆم.

لەبارەی هەڵبژاردنەکەی خۆشمەوە ئەوە بوو کە ماوەیەکە خستومەتە ژێر چاودێریەوە و ئەو ماوەیە ئەو کچە تەنها لەسەر کارەکەیەوە بەرەو ماڵەوە

ڕۆیشتوەتەوە و بۆم دەرکەوتووە کە خاوەنی هەڵسوکەوتێکی باش و ڕێزدارانەیە و شایەنی ئەوەیە کە بیکەمە هاوسەری خۆم.

خاتو شەرەفیش پرسیاری ناونیشانی شوێنی کارکردن و ناوی فەرماندە و سەرۆکەکەی لێ دەکات و پاشان لەلایەن هاوسەری فەرماندەی لەشکری ناوچەکە و هاوسەری چەند پلە دارێکی دیکەوە، کە مشتەری خۆی بوون، لێکۆڵینەوەیەکی فراوان دەکات لەبارەی هاوسەری ئایندەمەوە و پاش ئەوەی کە دڵنیا دەبێت لە کەسایەتی و نیەتەکەی، باسی چاوپێکەوتنەکەی و لێکۆڵینەوەکەی کرد بۆم و پاش گفتوگۆیەکی فراوان باسی ئەوەی کرد کە دەبێت هەموو کچێك شو بکات و هەوڵ بدات خێزانێك بۆ خۆی پێکبهێنێت و چانسی هاوسەرگیریش تەنها جارێك دەدات لە دەرگای هەر کچێك و ئەگەر هەوڵ نەدات ئەو دەرگایە بکاتەوە ئەوا هەلەکەی لەدەست دەردەچێت و ئیدی جارێکی دیکە ئەو چانسە لەو دەرگایە ناداتەوە!

لەڕاستیدا، خاتو شەرەفی کە خوازبینیکەرەکەی منی بە کەسێکی متمانەپێکراو و جێگیر ناوبرد خۆیشی هاتە ناو مەسەلکەوە و مەراسیمی خوازبێنیکردنەکە و شیرنی خواردن و دەستگیرانی و گرێبەستی و شاییەکەی لەئەستۆ گرت.

(خوا عەفوی بکات خاتو شەرەفی بەڕاستی ژنێکی خزمەتکار و چاکەکار بوو و لە سەردەمی کارکردنی لە دووکانەکەی زۆربەی ئەو شاگرد و بەردەستانەی کە کاریان بۆ دەکرد ناردنیەماڵی خۆیان و هاوکارێکی گەورەی کردن بۆ هاوسەرگیری)

لە ساڵی ١٩٣٧ لە ئاهەنگێکی زۆر سادە و ساکاردا، لەگەڵ (سوهەراب دیبا) هاوسەرگیریم کرد.

(سوهەراب دیبا) لەدایکبووی (ششکلان)ی تەبرێز بوو، بەڵام باوك و دایکی خەڵکی باکۆ بوون و کاتی خۆی کۆچیان کردبوو بۆ ئێران.

برایەکیشی هەبوو بەناوی (ئەحمەد) کە لە تاران خەریکی کارکردن و خوێندن بوو و دواتر توانی بڕوات بۆ زانکۆی تاران و بڕوانامەی بەرز بەدەست بهێنێت. ئەمەش لەیاریەکانی ڕۆژگارە کە باوکی فەرەح ئازەری و دایك و باوکی پیاوەکەشی لە کۆچەکەرە باکۆییەکان بێت و دواتریش کاتێك کە فەرەح لەگەڵ محمد ڕەزاشا

هاوسەرگیری کرد دایکی محمد ڕەزا (خاتو تاج الملوك)یش لە کۆچکەرە باکۆییەکان و باوکی (ڕەزا شا)ش لە کۆچکەرە باکۆییەکان بوو.

هاوسەرەکەم پیاوێکی زۆر ئیماندار و لە خواترس و ئەهلی نوێژ و ڕۆژوو بوو و بەمانایەکی تەواو پیاوێکی ئیمانداری واقعی بوو.

لەماوەیەکی کورتی ژیانی هاوبەشمان کە پێنج ساڵ و نیو زیاتر درێژەی نەکێشا هەستم بە مانای ڕاستی خۆشبەختی ژیان کرد. کچێك کە لە هەرزەکاریدا باوکی لەدەستدا بوو ئێستا پیاوێکی هەبوو بە خۆشەویستی و مهرەبانیە فراوانەکانی خۆی جێگەی چۆڵی باوکیشی بۆ پڕ کردبوویەوە.

بەداخەوە مرۆۆ لەم جیهانەدا بۆ ئەوە دروست نەکراوە کە بە ئارامی و بێ خەم بژی!

نزیکەی ساڵێك پاش هاوسەرگیری، هاوسەرەکەم لە ڕەشتەوە گوازرایەوە بۆ سوپای یەکی ئایزەربایجان و منیش ناچاربووم بۆ یەکەمینجار لە ژیاندا دایك و براکەم بەجێبهێڵم و لەگەڵ پیاوەکەم و دایکی پیاوەکەم بەرەو غەریبی بڕۆم.

ئێمە ڕۆیشتین بۆ ماڵی باوکی پیاوەکەم لەناوچەی ششکلانی تەبرێز و لەوێ نیشتەجێبووین. چەند مانگێك پاش ڕۆیشتنمان بۆ تەبرێز (فەرەح) لەدایکبوو.

خۆشی لەدایکبوونی فەرەح زۆر درێژەی نەکێشا چونکە براکەم (محمد علی) هات بۆ تەبریز بۆ سەردانمان. بە بینینی جلوبەرگی سەرتاپا ڕەشی براکەم تێگەیشتم کە محمد علی بۆ بینینی خوشکەزا تازە لەدایکبووەکەی نەهاتووە بۆ تەبرێز، بەڵکو هاتووە هەواڵێکی ناخۆش و مەینەتباری پێیە.

هەستکردنەکەم ڕاست بوو. دایکم بەهۆی توشبوونی بە نەخۆشی سیل کە لەو سەردەمەدا یەکێك بوو لە بەربلاوترین نەخۆشیەکانی ئێران گیانی لەدەستدابوو و ئێمەی بەجێهێشتبوو.

لەبەر ئەوەی کە لە دواهەمین ڕۆژەکانی ژیانی دایکم نەمتوانی لەلای بم و دیدارمان کەوتە قیامەتەوە توشی بێتاقەتی و نیگەرانێکی قوڵ بووم کە تاوەکو ئێستاش ئەم هەستە جەرگبڕە لەگەڵمدا بەردەوام ماوە.

هێشتا جلە ڕەشە ماتەمباریەکانی دایکم لانەبردبوو پیاوە خۆشەویستەکەم کە خۆشەویستتر بوو لەگیانم لەدەستمدا.

ماوەیەك بوو (سوهەراب) هاواری ئازارێكی دەكرد لە سكیدا و بەردەوام لاواز و سیس دەبوو. كەچی توشی شێرەپەنجەی گەدە بووبوو و ئێمەش نەماندەزانی و وا بیرمان دەكردەوە كە برینی گەدەی هەیە.

ماوەیەكی زۆر بەو شێوەیەی كە لە شارە دوورە دەستەكانی ئێران باو بوو، رێژەیەكی زۆر لە هەموو جۆرە دەرمانێكی گیاییمان بۆ كولاند و بەشێوەی جۆراوجۆر ئامادەمان دەكرد بۆی و هەوڵی چارەسەركردنمان دەدا، بەلام ئەو شتانە سودیان نەبوو....

كاتێك كە ئازارەكە ئومێدی لێ بری. بریارماندا بیبەین بۆ تاران. لە تاران، رۆیشتین بۆ نەخۆشخانەی سوپا لە ئەمیرییە و لەوێ نەشتەرگەرێكی بۆ ئەنجامدرا. كاتێك كە سكیان هەڵدری، وتیان توشی شێرەپەنجە بووە. چەند رۆژێك پاش ئەو نەشتەرگەریە ناسەركەوتووە كۆچی دوایی كرد و بەجێیهێشتین و منی لەگەڵ منداڵە بچكۆلانەكەم بە كێوێك خەم و خەفەتەوە بە تەنها هێشتەوە. لەم كاتەدا كەچەكەم (فەرەح) تەنها چوار ساڵ تەمەنی بوو.

پاش مردنی پیاوەكەم گەرِاینەوە بۆ تەبرێز و بۆ ماوەیەك لەلای دایكە جگەرسوتاوەكەی پیاوەكەم ماینەوە.

لەو ماوەیەدا براكەم رۆیشتبوو بۆ تاران و لەوێ كاروكاسپێكی باشی بەدەستهێنابوو.

لەبەر ئەوەی كە حەزێكی زۆرم هەبوو كە كچەكەم بروات بۆ قوتابخانەیەكی باش و خوێندن تەواو بكت داوام لە براكەم كرد سەرپەرشتی فەرەح لەئەستۆ بگرێت.

محمد علی زۆر بە خۆشحاڵییەوە ئەم داواكاریەمی قبوڵ كرد و فەرەحی بردە لای خۆی بۆ تاران.

دووبارە گەرِامەوە بۆ تەبرێز و لەبەر ئەوەی كە خەیاتێكی زۆر باش بووم لەوماڵەی كە لە ششكلان  لە تەبریز لە پیاوەكەمەوە بۆم بەجێمابوو بەرگدروومانێكم دانا و بەو داهاتەی كە لە دوورینی جلوبەرگی ژناندا دەستم دەكەوت، ژیانی خۆم و خەسوە پیرەكەم پێ بە رێ دەكرد.

تاوەکو کاتێك کە پیاوەکەم لەژیاندا بوو بۆ یارمەتیدانی براکەی هەموو مانگێك بڕێك پارەی دەنارد بۆ تاران تاوەکو بتوانێت بژی و خوێندنەکەی تەواو بکات. پاش مردنی پیاوەکەم من هەوڵمدا ئەم یارمەتیە نەپچڕێت و ئەو گەنجە لە تاران توشی سەختی و دژواری ژیان نەبێت.

لە ماوەی ئەو ڕووداوانەی کە هاوکات بوون لەگەڵ هێرشی هاوپەیمانەکان و داگیرکردنی ئێران خەسوشم کۆچی دوایی کرد و منیش بەتەنها و تەنها مامەوە.

بێوەژنێکی گەنج، تاك و تەنها لە شارێکی غەریب ئیدی دیارە دەبێت بتوانێت چ ڕۆژ و حاڵێك چاوەڕوانی بکات.

لەو سەردەمەدا ئایزەربایجان لەژێر چاودێری دیموکراتەکاندا بوو کە دەیانویست حکومەتێکی هاوشێوەی حکومەتی بەلشەفیکیەکان دروستبکەن. ڕێبەرەکەیان (سید جعفەر پیشەوەری) بوو کە خوازیاری یەکگرتنی هەردوو ئایزەربایجانەکە و پێکهێنانی حکومەتێکی سۆسیالستی بوو و بانگەشەی یەکسانی و دادپەروەری و یەکسانی و دابەشکردنی دادپەروەرانەی سامانی دەکرد.

لە ماوەیەکی کورتدا حکومەتەکەی پیشەوەری، زەویێکی زۆری دەرەبەگەکانیان گرت و دابەشی کرد بەسەر لادێنشینەکاندا. سەرمایەدارە گەورەکانیش یان لە لەناوچەکەدا هەڵهاتن یان کۆمەڵێکیان پەنایان بردە بەر شاخەکان.

کەسانێك کە ساڵانێکی زۆر سوکایەتیان پێ دەکرا ئێستا لە حکومەتەکەی پیشەوەری ئەندامی ئەنجومەنی حکومەتەکە بوون و خەڵکانی جوتیار و کرێکار و چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگەش پیاوی حکومەت و کاروباری کۆمەڵگەیان دەبرد بەڕێوە و هەلومەرجی کار و چالاکیان بۆ دەرەبەگەکان و بەرپرسە گەورەکان دژوار کردبوو.

بەشێوەیەکی گشتی ئایزەربایجان لە خاکی سەرەکی ئێران جیاکرابووبوویەوە و حکومەتی ناوەندی هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی بەسەردا نەمابوو.

پیشەوەری و هاوڕێکانی لە دوورترین خاڵی سنوری ئایزربایجانی ئێران لە (مغان) و (ئاستارا) و (ماکۆ) تاوەکو (زنجان) و (ئەهر) لە نزیك قەزوین دەسەڵاتیان هەبوو و حکومەتیان پێکهێنابوو.

لەم پەشێویەدا، زەویدارە گەورەکان و سەرمایەدارەکانیش بێدەنگ دانەنیشتبوون و شەوانە بە یارمەتی شەڕکەر و پیاوەکانیان و بە هاوکاری چەك و تفاقی ئینگلیز و ئەمریکیەکان دەیاندا بەسەر هێزی دیموکراتەکاندا، ئەم بارودۆخەش تاوەکو دەرچوونی هێزی هاوپەیمانەکان لە ئێران و پاشەکشێی هێزی سۆڤیەتەکان و کەوتنی حکومەتی دیموکراتەکان بەردەوام بوو.

لە هەلومەرجێکی لەم شێوەیەی نائارامدا، من وەکو ژنێکی گەنجی پیاو مردوو زۆر زیانم پێگەیشت و بێ سەرپەرشت و بێ پشت و پەنا بووم. هەرلەم ڕوانگەیەشەوە بوو، کاتێك کە پێشنیاری هاوسەرگیریم بۆ کرا لەلایەن بازرگانێکی دەوڵەمەندەوە بەبێ لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن پێشنیارەکەم قبوڵ کرد.

(ڕەحیم ئاغا ئیپکچی) لە تەبرێز بازرگانێکی ناسراوبوو کە بۆ پاراستنی پێگەی ئابوری خۆی هەرچەندە لە ناخەوە مەیل و حەزی بە دیموکراتەکان نەبوو، بەڵام چووبوویە ڕیزیانەوە و بە زیرەکی و لێهاتویی خۆی توانیبوی هەم موڵکو ماڵەکانی خۆی بپارێزێت و هەمیش بە دەستخستنە ناو کاری هاوردەکردنی کاڵا لە ڕوسیا و وڵاتانی دراوسێی وەکو ئایزەربایجان، لەو هەلومەرجە مەترسیدارەدا، داراییەکەشی پەرەپێبدات!

ڕەحیم ئاغا ماڵێکی تازەی بۆ کڕیم و ژیانێکی گونجاوی بۆ فەراهەم هێنام. هەرچەندە من هەرگیز ژنی ئەسڵی و هاوسەرە کاتیە (صیغەیەکانیم) نەبینی بوو، بەڵام ئەوەندەی نەبرد تێگەیشتم کە سەرەڕای ژنە ئەسڵی و گرێبەستیەکانی چەندین ژنی دیکەی صیغەیی هەیە و سەرەڕای ئەوەش پاش منیش چەند ژنێکی دیکەی صیغەیی هێنا.

هەندێك کات کاتێك کە پرسیارم لێ دەکرد، زۆر بێ باکانە و بێ پەروایانە وەڵامی دەدامەوە کە تاوەکو ئێستا زیاتر لە دانەکانی تەسبیحێك ژنم صیغە کردوە!

(ڕەحیم ئیپکچی) بەهۆی توانایی داراییەوە، بەو شێوەیەی کە عادەتی هەموو (سەرمایەدارەکانی) هەموو ئەم جیهانەیە، خۆی بە زیاتر لە خەڵکی دەزانی و بەشێوەیەکی نزم و کەم سەیری چینەکانی دیکەی کۆمەڵگەی دەکرد. ژیانی من لەگەڵ ئیپکچی دوو ساڵ زیاتر درێژەی نەکێشا.

کاتێك تێگەیشتم، بینیم شەهەوانی و زەوقی لەڕادەبەدەری ئەم پیاوەی کردوە بە ئاژەڵێکی نانەجیب، بۆیە داوام لێ کرد صیغەکەم هەڵوەشێنێتەوە.

(ئیپکچی) سودی لە هەژاری و کەم دەرامەتی خەڵکی وەردەگرت و سەرەڕای ئەوەی کە تەمەنی نزیکەی پەنجا ساڵ بوو کچانی منداڵ، هەندێکجار نۆ و دە ساڵی لەبەرامبەر بڕێك پارەی کەم و بێ نرخ و تەنانەت هەندێکجار لەبەرامبەر کەمێك کەلوپەلی بێ مانا لەلایەن خێزانەکانیانەوە دەکڕی و دەیکردنە صیغەی خۆی.

هەڵبەتە ئەو لەم کارە ناشیرین و قێزەونەی خۆی هیچ شتێکی پێ نەدەوتم و من بە پرسین و گەڕانی تایبەت، کە بەشێکە لە فترەتی ژنان، ئەم مەسەلانەم لەژێر زمانی خزمەتکارێکی پیریەوە کە ساڵانێکی زۆر لە ماڵەکانی ئیپکچی خزمەتی دەکرد دەرهێنا بوو. کاتێك بۆم ڕوون بوویەوە کە ئەم (حاجی بازاڕییە) چۆن ئارەزەوەکانی تێر دەکات لە کچانی تەمەن کەم و پاك و بێ بەری پێڵاوەکانم لە پێ کرد و لە صیغەکەی خۆم ڕزگار کرد.

کاتێك کە ئەم پیسی و قێزەونیەم بینی ئیدی هەرگیز ڕازی نەبووم هاوسەرگیری بکەم و ڕووم کردە تاران و چوومە لای براکەم.

لەو ساڵە سەخت و دژوارانەدا کە من لەگەڵ تەنهاییدا دەست و پەنجەم نەرم کردبوو، براکەم محمد علی لە تاران بە کار و هەوڵدانێکی زۆر توانیبووی ژیان و بارودۆخی خۆی باش بکات و هاوسەرگیریش بکات.

دەرئەنجامی هاوسەرگیری براکەم کوڕێك بوو کە ناویان نابوو ڕەزا. ڕەزا دوو ساڵ لە فەرەح بچوکتر بوو.

لەبەر ئەوەی کە کوڕی خاڵۆ و کچی پوورێ لە ماڵێکدا لە ژێر سەقفێکدا دەژیان زۆر پێکەوە خوویان گرتبوو بەیەکەوە و دراوسێکان هەموو وایاندەزانی  ئەم دوو منداڵە خوشك و بران.

براکەم، لە تاران، لەلای بازرگانێکی یەزدی، ئیشی دەکرد و بەهۆی پاکی ئیشکردنیەوە توانیبووی متمانەی ئەو بازرگانە بەدەست بهێنێت.

کەم کەم براکەم شارەزای نهێنی و هونەری بازرگانی و کڕین و فرۆشتن بوو و بەهۆی یارمەتی ئەو بازرگانە یەزدیەوە بە تەنیا دەستیکرد بەکارکردن و بە لوتفی

ئیلاهی پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی و بارودۆخێکی دارایی شایستەی کۆمەڵایەتی بۆخۆی دەستەبەر کرد.

محمد علی، بەهۆی ئەو هۆشمەندیە زۆرەی کە هەیبوو لە پاڵ کار و هەوڵدانەکەیدا ڕۆژانە بەردەوامی دەدا بە خوێندنەکەشی و سەرکەوتوو بوو بەوەی کە قۆناغی ناوەندی تەواو بکات و بچێتە زانکۆش، کە ئەمەش بۆ هەموولایەك باوەڕپێ نەکراو و چاوەڕوان نەکراو بوو.

باشبوونی بارودۆخی دارای و کۆمەڵایەتی محمد علی زۆر کاریگەری هەبوو لە چارەنوسی من و کچەکەم. محمد علی وەکو باوکێکی مهرەبان و بەسۆز چاودێری من و فەرەحی دەکرد، کاتێك کە کوڕەکەی بۆ تەواوکردنی خوێندن ناردی بۆ یەکێك لە باشترین قوتابخانەکانی ئەو کاتەی تاران، فەرەحیش لە هەمان قوتابخانەدا ناونوس کرد بۆ ئەوەی ئەویش بخوێنێت.

من تاوەکو نزیکەی تەمەنی نۆ ساڵی مردنی باوکی فەرەحم لە کچەکەم شاردبوویەوە و هەرکاتێك لەبارەی باوکیەوە پرسیاری دەکرد پێم دەوت بە ئەرکێك نێردراوە بۆ شارێکی دیکە.

هەستم دەکرد ئەم منداڵە لە هەلومەرجێکدا نیە کە هەواڵی مردنی باوکی قبوڵ بکات و تەحەمولی بکات.

لە تەمەنی نۆ ساڵیدا، فەرەح پێی وتم دایە دەزانم باوکم ئیدی ناگەڕێتەوە. پێی وتم دەزانم بۆچی جارجارێك دەگریم و هەرکاتێك خۆم دەکەم بە ژووردا لەگەڵ کەسانی دیکە قسە دەکەیت قسەکانت دەگۆڕیت.

تێگەیشتم کە کچەکەم گەیشتوەتە جۆرە هەستێکی دەروونی و ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە حەقیقەتی تاڵی مردنی باوکی پێ بڵێم.

فەرەح لەگەڵ ڕەزا (کوڕی براکەم) دەڕۆیشتن بۆ قوتابخانەی ئیتاڵیەکان، بەلام لە ساڵی دووەمی قوتابخانە لەیەك جیابوونەوە و محمد علی فەرەحی برد بۆ قوتابخانەی فەرەنسی (ژاندارك) کە ڕاهیبە فەرەنسیەکان قوتابخانەکەیان دەبرد بەڕێوە.

فەرەح قوتابخانەی سەرەتایی لەژێر چاودێری ڕاهیبە فەرەنسەیەکاندا تەواو کرد و بۆ بەردەوامی خوێندن چووە قوتابخانەی دواناوەندی کچانەی (ژاندارك)ەوە.

من بۆ ئەوەی کە نەبمە سەرباری براکەم بەهۆی ئەو لێهاتووییەی کە لە بەرگدرووманیدا هەمبوو دوکانێکی شەرافەتمەندانەم لە جادەی (شا ئاباد)، کە ئەو سەردەم یەکێك بوو لە جادە سەرەکی و پڕ لە ڕەونەقەکانی تاران، لە نزیك ڕستۆرانی لوقانتە ڕێکخست و بۆ خانمە دەوڵەمەندە پلە یەکەکانی تاران جلوبەرگم دەدوری و بەم شێوەیە داهاتێکی زۆرم دەست دەکەوت.

تاوەکو ئەو کاتەی کە فەرەح دەچوو بۆ قوتابخانەی سەرەتایی من لە ماڵی براکەمدا دەژیام. بەڵام دواتر ماڵێکم لە دەوروبەری (بهارستان) گرت کە نزیکی ماڵی براکەم بوو.

فەرەح پاش کۆتایی هاتنی قۆناغی دواناوەندی و بەدەستهێنانی بڕوانامە بە نمرەی باڵا هەوڵیدا بڕواتە (کۆلێژی پزیشکی) لە زانکۆی تاران.

لەم سەردەمەدا، محمد علی کە لە بواری دروستکردنی بیناسازی و ڕێگاوبان و پرد و تونێل و تەندەراتدا ئیشی دەکرد، بڕیاریدا کوڕەکەی ڕەزا بۆ بەردەوامیدانی خوێندن بنێرێت بۆ فەرەنسا.

ڕەزا و فەرەح ئەوەندە خویان گرتبوو بە یەکەوە کە ڕەزا مەرجی ڕۆیشتنی بۆ فەرەنسای بەستەوە بە چوونی فەرەحیش و بە ئاشکرا وتی بەمەرجێك ئامادەم ئەم وڵاتە بەجێبهێڵم و بڕۆم بۆ غەریبی کە فەرەحیشم لەگەڵدا بێت!

فەرەحیش لەبەر ئەوەی کە ڕەزای لە برا خۆشتر دەویست و بە منداڵی لەگەڵیدا گەورەبووبوو بڕیاریدا نەچێت بۆ کۆلێژی پزیشکی و و سوربوو لەسەر ئەوەی کە ئەویش دەبێت لەگەڵ ڕەزادا بچێت بۆ فەرەنسا.

لەو سەردەمەدا، ڕۆیشتن بۆ دەرەوە بۆ خوێندن تایبەت بوو بە نەجیبزادەکان و پلە یەك و دەوڵەمەندەکانەوە و هەرچەندە محمد علی دەیتوانی تێچوونی مانەوە و خوێندنی ڕەزا دابین بکات لە فەرەنسا، بەڵام قبوڵکردنی تێچوونی دوو خوێندکار لە دەرەوە بۆ ئەو قورس بوو. هەر بۆیە لەم بارەیەو هەموو دانیشتین و گفتوگۆمان کرد و گەیشتینە دەرئەنجامێك کە ئەگەر من داهاتی درووманیەکەم بدەم بە فەرەح و محمد علیش کەمێك هاوکاری بکات دەتوانیم فەرەحیش لەگەڵ ڕەزادا بنێرم بۆ فەرەنسا.

من له باسی ئهم بهشهی یاداشتهکانم زۆر بابهتی نهوتراو دههێڵمهوه و به خێرای لهو ساڵه دژوار و پڕ له غهم و مهرگ و کۆچکردنانه تێ دهپهڕم تاوهکو زووتر بگهم به بهشه خۆشهکانی ژیان و لهسهروی ههمووشیانهوه ڕووداوی هاوسهرگیری کچهکهم لهگهڵ محمد ڕهزا. ئهو ڕووداوهی که نهك ههر ژیانی من و فهرهح، بهڵکو ژیانی ههموو (دیبا)کان و خێزانی قطب (قطبی) سهرهوژێر کرد.

کاری وهرگرتنی جهواز و ناردنی ڕهزا و فهرهح بۆ پاریس و تۆمارکردنی ناویان له کۆلێژی بیناسازی و نهخشهسازی له لایهن براکمهوه ئهنجامدرا و ئهم دوو کهسه بهرهو دیاری غهریبی کهوتنهڕێ.

محمد علی مانگانه ۱۵۰ تمهنی بۆ ڕهزا و ۱۵۰ تمهنی بۆ فهرهح دهنارد که ئهم ڕێژهیه لهو سهردهمدا ڕێژهیهکی زۆر گهوره بوو. ههڵبهته بهشێك له تێچوونی سهفهرهکهی فهرهح من دابینم دهکرد. دواتر له فهرهحهوه بیستم که پارهکه بۆ ژیان و خوێندنهکهی له پاریس به پێی پێویست نهبوو و کچهکهم بهبێ ئهوهی ئێمه ئاگادار بکاتهوه بۆ پڕکردنهوهی ئهو بۆشاییه تێچوونیه لهناو ماڵه فهرهنسیهکاندا وهکو پهرستار و چاودێری منداڵهکانیان کاری دهکرد.

کاتێك که بڕیاریمدا بهشێك له بیرهوهریهکانی خۆم بخهمه سهر کاغهز. زۆرێك له خزم و نزیکهکانم داوایان لێ کردم که ئهم بهشانهی ژیانی باس نهکهم و خۆم بهدوور بگرم له نوسینهوهی ههندێك له بهشه تایبهتیهکانی ژیانی چونکه به باوهڕی ئهوانه باسکردنی ئهوهی که شاژنی ئێران له سهردهمی خوێندکاریبوونیدا له ناو ماڵه فهرهنسیهکاندا خهریکی چاودێریکردنی منداڵ بووه و وهکو پهرستار ئیشی کردوه و یان ئهوهی که ههتیو بووه و له ههلومهرجێکی سهخت و دژواردا ژیاوه زیان دهدات له پێگه و متمانه و ئابڕوی خێزانهکانی قطبی و پههلهویهکان.

من ئهم شێوه بیرکردنهوهیهم قبوڵ نهکرد و باوهڕم وایه که ئهمه خواستی خواوهنده و یهکێك بووه له یاریهکانی ڕۆژگار که کچێکی ههتیو و ژیان دژوار ببێته شاژنی ئێران. به باوهڕی من، ههژاری و کهم دهستی به تاوان و عهیبه دانانرێت. مردنی باوك و ههتیو بوون نه بهدهستی خودی مرۆڤه و نه به ههڵبژاردنی خۆشیهتی. کهواته

کاتێك کە ئەم مەسەلەیە لە دەرەوەی توانای مرۆڤەوەیە، ئیدی پێویست ناکات وەکو خاڵێکی لاواز حسێب بکرێت و لێکبدرێتەوە.

(ڕەزا شا)ش بەهەمان شێوە هەتیو بوو، کاتێك کە هێشتا چەند ڕۆژێك لە تەمەنی تێنەپەڕی بوو باوکی لەدەستدا و دایکی (نوش ئافەرین خانم) زێدی خۆی بەجێهێشت و چارەنوسی ڕەزای گەیاندە شوێنێك تاوەکو گەیشتە پاشایەتی ئێران و پێگە بە شوێنی کورش و داریوش لەق بکات.

دەبێت ئەوە قبوڵ بکەین کە زۆرێك لە کاروبارەکان لە دەرەوەی خواست و ئیرادەی ئێمەوەیە و چارەنوسی ئێمە لە شوێنێکی دیکەوە دیاری دەکرێت...

کچەکەم، لەبەرئەوەی کە قۆناغی سەرەتایی لەلایەن ژنە ڕاهێنەرە فەرەنسیەکانەوە تێ پەڕاندبوو بە ئاسانی زاڵ بوو بەسەر زمانی فەرەنسی و دواتریش بەهۆی ئەوەی کە ڕۆیشت بۆ فەرەنسا و لەوێ مایەوە و دەستیکرد بە خوێندن ئەخلاق و خوی فەرەنسیەکانی وەرگرت. ئەگەر چاوە ڕەشەکان و ڕەنگی قژە ڕەشەکانی نەبوایە زۆرێك لەخەڵك نەیاندەتوانی لەنێوان فەرەح و خاتونێکی فەرەنسی جیاوازی بکەن!

فەرەح لەماوەی مانەوەی خۆی لە پاریس، توانی قۆناغی (کۆلێژی پردی تەکنیکی) بە سەرکەوتووی تەواو بکات و وەکو ئەندازیارێکی معماری تەخەروج بکات.

خوێندکارانی قۆناغی معماری، لە سەردەمی خوێندن، پلانرێژی و نەخشەشیان دەخوێند. بەلاّم فەرەح جگە لە بەرنامەڕێژی و نەخشەکێشان توانی لە وێنەکێشانیشدا لێهاتوییەکی باش بەدەستبهێنێت و هەر لە سەردەمی خوێندکاریشدا چەند پێشەنگایەکی لە پاریس کردبوویەوە.

برازاکەم، ڕەزاش کە لە بیرکاریدا بەهێز بوو توانی خولی پردی تەکنیکی پاریس تەواو بکات و پاشان تەخروجی کرد.

هەموو ئەو سەردەمەی کە فەرەح لە پاریس بەسەری برد، پەیوەندی ئێمە تەنها لە ڕێگەی نامەوە بوو. بەلاّم براکەم یەکجار چوو بۆ پاریس و دڵنیابوو لە هەلومەرجی ژیانی خوێندنی ڕەزا و کچەکەم.

لەو سەردەمەدا، خوێندکارانی ئێرانی زیاتر لە ئەڵمانیا و فەرەنسا دەیانخوێند.

له سەرەتای ساڵی ١٩٥٨ بوو کە فەرەح نامەیەکی درێژی بۆ ناردم و لە نامەکەدا داوای لێکردم ڕێگەی پێ بدەم بۆ ئەوەی هاوسەرگیری بکات لەگەڵ گەنجێکی ئێرانیدا.
لەگەڵ نامەکەشدا وێنەیەکی ناردبوو کە فەرەح لەگەڵ هاوڕێ نزیکەکانیدا گرتبووی.

من ئەو وێنەیەم هێشتا هەر لەلا ماوە. ئەو کەسانەی کە لەو وێنەیەدا دەبینرێن بریتین لە خاتو (ناهید کلهر) کە ئێستا ژنی کەسێکی فەرەنسییە و هەرگیز نەگەڕایەوە بۆ ئێران. هەروەها (لەیلی ئەمیر ئەرجمەند) کە تاوەکو ئێستاش هاوڕێی نزیکی فەرەحە و وەکو خوشکی وابوو بۆی. (کەریم پاشا بهاداری)یش لەم وێنەیەدا لەپاڵ فەرەحدا دەبینرێت.

من هێشتا وەڵامی نامەکەی فەرەحم نەدابوویەوە وێنەیەکی دیکەی بۆ ناردم، کە لەو وێنەیەدا محمد ڕەزاشا دەبینرێت کە لە سەفەرێکیدا بۆ فەرەنسا سەردانی خوێندکارە ئێرانیەکانی کردبوو و وێنەیەکی لەگەڵدا گرتبوون و فەرەحیش لە وێنەکەدا بوو.

نوسیم بۆ فەرەح کە هاوسەرگیری کارێکی شەخسیە و بڕیاردان لەم بارەوە پەیوەستە بە خودی خۆتەوە. بەڵام باشترە زیاتر لێکۆڵینەوە بکەیت و هەموولایەنەکان بە باشی هەڵبسەنگێنت و تاوەکو پێت دەکرێت لەگەڵ ڕەزا (قطبی) لەم بوارەدا ڕاوێژ بکە.

براکەم، کە نامە و نامەکاری زیاتری هەبوو لەگەڵ کوڕەکەی (ڕەزا) و زیاتر ئاگاداری ژیانی فەرەح بوو لە پاریس، هەرگیز پێی نەوتم کە فەرەح لە سەردەمی مانەوەی لە پاریسدا شەیدای چالاکیە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان بووە.

دواتر تێگەیشتم کە کچەکەم بەهۆی ئەو زەحمەت و مەینەتیانەی کە لە منداڵیدا هاتبوو بەسەریدا و لەبەر ئەو ڕۆحیەتە هەستیارەی کە هەیبوو بۆ خۆشەویستی خەڵك و دادگەری! شەیدای گروپە سیاسیە چالاکەکانی ناو خوێندکارە ئێرانیەکانی نیشتەجێی پاریس بووبوو.

یەکێك لە هاوپۆلەکانی فەرەح لەسەردەمی خوێندنیدا بە ناوی (ئەنوشیروان رەئیس فەیرۆز)[1] کە یەکێك بوو لە چالاکەکانی حزبی تودەی ئێران فەرەحی ناساندبوو بە حزب و فەرەحیش چووبوویە ناو رێکخستنی ئەم حزبەوە.

حزبی تودە، لە ساڵی ١٩٥٣، لە ئێراندا بڕیاری نایاسای درا و حکومەت زۆر بەتوندی دژی ئەم حزبە دەجەنگا.

لەو سەردەمەدا، وەزارەتی کاروباری دەرەوە سەرپەرشتی خوێندکارە ئێرانیەکانی نیشتەجێی دەرەوەی وڵاتی لە ئەستۆگرتبوو و ناردنی چەك و پارەش بۆ خوێندکارانی دەرەوە لە ڕێگەی وەزارەتی دەرەوە ئەنجام دەدرا.

من لە بەر ئەوەی کە لەکاتی مانەوەی فەرەح لە پاریس لەگەڵیدا نەبووم زۆر ئاگاداری نەبووم لە بارەی چالاکیە کۆمەڵایەتیەکانیەوە لە پاریس.

تاوەکو دوو ساڵ پاش ڕۆیشتنی فەرەح بۆ پاریس هیچ کێشەیەکمان نەبوو. پارەی پێویست بۆ دابینکردنی چەکی بانك لە ڕێگەی وەزارەتی دەرەوە بۆ کاروباری خوێندکاران بە نرخی گۆڕینەوەی بڕی ١٥٠ تمەن بۆ هەر مانگێك بە فەرەنك دەنێردرا بۆ فەرنسا. دوو ساڵی یەکەم فەرەح لە بەشی معماری و نەخشەسازی دەیخوێند.

بەڵام لە ساڵی سێیەم بە دواوە، ئیدی گلەییەکانی فەرەحمان پێ دەگەیشت لەبارەی نەگیشتنی پارەکە یان درەنگ گەیشتنی. بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەش من و براکەم زۆر سەردانی وەزارەتی دەرەوەمان دەکرد بۆ ئاگاداربوون لەو کێشەیە، لەوێدا بوو کە ڕووبەڕووی پرسیا و ئاگادارکردنەوەی زۆربووین.

لەو ساڵانەدا (حزبی تودە) سەرنجڕاکێشترین ڕێکخستنی سیاسی بوو لەناو گەنجە خوێن گەرم و چالاکەکاندا.

گەنج، بەهۆی ئەو ڕۆحیەتە گەنجی و هەستیاریە تایبەتیەی کە هەیەتی، کێشمەکێش و هەوڵدانێکی زۆری بۆ یەکسانی و داواکردنی دادپەروەری هەیە.

حزبی تودە بانگەشەی زۆر سەرنجڕاکێشیان دەکرد و گەنجەکانیش کە بێزاری دواکەوتووی ئێران و سیستەمی دەرەبەگایەتی و رەعیەتی و کێشە جۆربەجۆرەکان بووبوون شەیدای ئەم بانگەشانە بووبوون.

---

[1] —بووبوو بە ئەندامی چالاکی فدراسیۆنی خوێندکارەکان.

فەرەحیش بەدەر نەبوو لەم چوارچێوەیە.

کاتێك کە بابەتی هاوسەرگیری فەرەح لەگەڵ (کەریم پاشا بهادری) هاتە پێشەوە ڕەزا لە پاریس دژایەتی دەکرد و دوای کرد لە فەرەح کە پێویستە پاش چەند ساڵێك مانەوە لە پاریس سەفەرێك بکات بۆ ئێران سەرەڕای دیدار و چاوپێکەوتنی لەگەڵ دایك و خێزانەکەیدا لەم بارەشەوە گفتوگۆ و قسەوباسی پێویست بکات، و بە ڕاوێژ و گفتوگۆ بڕیاری کۆتایی بدات.

فەرەح سەرەتا سور بوو لەسەر ئەوەی کە بۆ هەمیشە لە پاریس بمێنێتەوە و نەگەڕێتەوە بۆ ئێران و تەنانەت لە نامەکانیدا جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە دەبێت منیش بڕۆم بۆ پاریس بەڵام بەهۆی کاریگەری بۆچونەکانی ڕەزا (قطبی) لە پڕێکدا هاتەوە بۆ ئێران.

گەڕانەوەی فەرەح بۆ ئێمە زۆر چاوەڕوان نەکراو بوو. چوار ساڵ و شتێك منداڵە تاقانەکەم نەبینی بوو. دیدارەکان تازەبوونەوە و ڕۆحیەتێکی تازەم بەبەردا هاتەوە.

پێکەوە ڕۆیشتین بۆ ڕەشت بۆ بینینی خزمەکانمان. لەم سەفەرەدا (لەیلی ئەمیر ئەرجمەندی) لەگەڵ فەرەحدا هاتبوو بۆ تاران.

لیلی لە ئەوروپا ئاینەکەی گۆڕی بوو و چووبوویە سەر مەزهەبی کاسۆلیکی. منیش گۆڕانێکی گشتیم لە فەرەحدا هەست پێدەکرد. سەیریش نەبوو چونکە کچێك کە لە قوتابخانەی ژاندارك خوێندبێتی و بۆ درێژەپێدانی خوێندنیش ڕۆیشتبێت بۆ فەرەنسا و ئەو هەموو سەردەمەی منداڵی و هەرزەکاری و گەنجیەی لە ژێر بۆچونی ژنە ڕاهێنەر و مامۆستا فەرەنسیەکاندا گوزەراندبێت.

هەرچەندە کە منداڵەکەم کچ بوو بەڵام هەرچی سەیری شێو و باڵا و ڕۆیشتنیم دەکرد بەبێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت لە مێشك و بیرمدا وێنای هاوسەرکەم دەکێشا و دەهاتەوە پێش چاوم. لەش و لاری شێوەی فەرەح لە باوکی شایەنی باس نەبوو و هەر دەت وت باوکیەتی.

جوڵە و شێوەی قسەکردن و جۆری دەنگیشی میراتێك بوو لە باوکیەوە بۆی بەجێمابوو.

فەرەح زیاتر لە دوو مانگ لە تاران بوو. ڕۆژە خۆشەکان بە زووی تێپەڕین. ڕەزا بە هۆی ئەو چالاکیە کۆمۆنیستیانە و ئەندامیەتیەی کە هەیبوو نەیتوانی و جورئەتی گەڕانەوەی نەبوو بۆ ئێران، بەلاّم فەرەح بەو شێوەیەی کە خۆی باسی دەکات لەکاتی هاتنەوەی بۆ ئێران توشی کێشەیەکی لەو شێوەیە نەبوو و باوەڕی نەدەکرد بەهۆی بەشداریکردنی چەندجارەی لە خۆپیشاندانەکانی خوێندکارانی ئێرانی نیشتەجێی پاریس ناوی لە پێرستی دژە دەوڵەتی ئێرانیدا هەبێت.

ئێمە لە تاران ڕەزامەنیمان پیشاندا بۆ شوکردنی فەرەح. فەرەح زۆر باسی خوازبێنیکەرەکەی کرد و دەرکەوت کە هەر لەکاتی ڕۆیشتنی ئەم دووانە بۆ پاریس لەوێ یەکتریان ناسیوە و زۆربەی کاتەکانی خۆیان پێکەوە بەسەر بردوە.

هەڵبەتە، بەوشێوەیەی کە لە فەرهەنگ و ئاینی ئێرانیەکاندا هەیە هاوڕێیەتیەکەی نێوان فەرەح و کەریم پاشا زۆر پاك و سادە بوو!

فەرەح کاتێك کە بینی من ڕازی بووم، دانی بەوەدا نا کە ئەوان لە ئاهەنگێکی بچوکدا بە ئامادەبوونی هاوڕێکان و چەند خوێندکارێکی ئێرانی دیکەی نیشتەجێی پاریس بە ڕەسمی دەستگیراندارى خۆیان ئاشکرا کردوە.

چەند ڕۆژێك پێش گەڕانەوەی فەرەح بۆ پاریس بە یەکەوە ڕۆیشتین بۆ بازاڕی تاران و هەندێك پێویستی و کەلوپەل کە پێویستی بوون کڕیمان بۆ ئەوەی بیان باتەوە بۆ پاریس. لەبیرمە کە سەماوەرێکی خەڵوزیشمان لە مەیدانی بەهارستان کڕی.

بڕیارمان لەسەر ئەوەدا کە پاش گەڕانەوەی فەرەح بۆ پاریس لە ماوەی دوو تاوەکو سێ مانگی دیکەش منیش بڕۆم بۆ پاریس تاوەکو بەشداربم لە ئاهەنگی هاوسەرگیری کچە تاقانەکەم. براکەم محمد علیش کە ماوەیەکی زۆر بوو کوڕەکەی نەبینی بوو، و هەروەها ڕەزاش نەیدەتوانی بوو بگەڕێتەوە بۆ ئێران و بۆ ئەوەی سود لەم کاتەش وەرگرێت ئەویش بڕیاریدا لەگەڵ مندا بێت بۆ پاریس تاوەکو بەشدار بێت لە ئاهەنگی خوشکەزاکەی و چاویشی بکەوێت بە کوڕەکەی.

مرۆۋ بەدرێژای ژیانی، هەموو ڕۆژێك بۆ دەیان ڕۆژ و هەفتە و مانگ و ساڵی دیکە پێشبینی و بەرنامەڕێژی دەکات بۆ خۆی و ئەو خەونە خۆشانەی کە هەیەتی و

دیمەنی جوان دەهێنێتە پێش چاوی بەڵام ڕوون نیە کە چارەنوس بۆ چەند ساتێك دواتری ژیان چ بڕیارێکی بۆ دەدات!

هەندێکجار کاتێك بە تەنهام و هەموو ئەو ڕابردووە پڕ لە هەوراز و نشێوییەی خۆم وەکو فلیمێکی سینەمای دەهێنمەوە پێش چاوم دەگەمە ئەو دەرئەنجامەی کە لە جیهانی ئێمەدا چەندین هێزی نەناسراو هەیە کە ئێمە ئەو هێزانە نابینین و هەستیان پێ ناکەین، بەڵام چارەنوش و ژیان و مردنی ئێمە بەڕاستی لەلایەن ئەو هێزانەوە دیاری دەکرێت!

هەندێکجار، ڕووداوی سادە، چارەنوسی مرۆڤەکان بەرەو ئاراستەیەکی بەتەواوی جیاواز بەبێ ئەوەی بیری لێ بکاتەوە دەبات.

هەندێکجار کاتێك کە مرۆڤ دەرئەنجامی کاری خۆی دەبینێت و ئەو ڕابردوەی لەبەرچاو دەگرێت، کە بەم شێوەیە کۆتایی هاتووە دڵنیا دەبێت ئەو ڕووداوانەی کە ساڵانێك پێشتر ڕوویانداوە و پاش ماوەیەکی زۆر تێ دەگات کە ئەم دەرئەنجامانە ڕووداوی پێشبینی کراو نەبوون، بەڵکو هەمان ئەو هێزە نەناسراوانە بوون کە ئێمەیان دەورەداوە و لە لەڕابردوویەکی دوورەوە ئێمەیان بەرەو ئەو ئاراستانە ڕێنوێنی کردوە.

چیرۆکی ژیانی کچەکەم فەرەح نمونەیەکی ئاشکرا و ڕوونە بۆ ئەم شێوە بیرکردنەوەیە.

کچێکی هەتیو بە کۆڵێك مەینەتی و ئازارەوە، گەورە دەبێت و بەهۆی ئەو ڕۆحیەتە هەستیاری و خوازیاریە دادپەروەرانەی کە دەرئەنجامی هەمان ئەو ژیانە پڕ لە مەینەت و دژوارەی بوو، دەچێتە ناو چالاکیە تایبەتە سیاسیەکانەوە و هەر ئەم چالاکیانەشن دەبنە هۆی ئەوەی کە دەوڵەت ڕووبەڕووی ببێتەوە و ئەم ڕووبەڕووبوونەوانەشن کە دەرئەنجامی تاڵ و ناخۆشی بۆ هەمووبمان دروستکرد، لەبارەی کچەکەشمەوە چارەنوس و هێزە نادیارەکە یاریەکەی بەجۆرێکی دیکە گۆڕی و ئەو مەسەلانە هەموو بوونە هۆی خۆشبەختی و سەعادەت بۆ کچەکەم!

فەرەح چەند ڕۆژێك پێش گەڕانەوەی بۆ پاریس بۆ درێژکردنەوەی بەڵگەکانی پەیوەست بە جەوازەکەی و حەواڵەکردنەکانی بۆ بەشی خوێندکارانی نیشتەجێی

دەرەوە، سەردانی وەزارەتی دەرەوەی کرد و دەوروبەری نیوەڕۆ بە نارەحەتی و ترسەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و وتی: لە وەزارەتی دەرەوە ڕێگری لێ کراوە بۆ درێژکردنەوە و تازەکردنەوەی بەڵگەکانی وتویانە ناوی لە پێڕستی ئۆپۆزسیۆنەکانی چالاك لەدژی (شا)دا هەیە!

پارچە کاغەزێکیان پێدابوو کە ژمارەیەکی لەسەر بوو و پێیان وتبوو هەفتەی ئایندە بۆ وەرگرتنی دەرئەنجامی کۆتایی دووبارە سەردانی وەزارەتی دەرەوە بکەرەوە...

زۆر بێتاقەت بووین. ئەمە تۆمەتێك بوو کە دەیتوانی هەموو ڕەنج و زەحمەتە کەمان بدات بە بادا.

ژەنراڵ تەیمور بەختیار سەرۆکی ساواك بوو. پیاوێکی دڵڕەق بوو و لەبارەیەوە باسی و خواستی کارەساتباریان دەگێڕایەوە. تەنانەت وا بلاو بوو کە زۆر حسابیش بۆ فەرمانەکانی جەنابی حەزرەت (شا)ش ناکات. بەبێ دواکەوتن ڕۆیشتم بۆ ماڵی براکەم و چاوەڕێی هاتنەوەم کرد. ئەوکاتە براکەم سەرپەرشتی کۆمپانیایەکی بینایی سەر بە دامەزراوەی بەرنامە و بوجەی دەکرد و دۆست و ناسراوێکی زۆر بوو.

کاتێك محمد علی گەڕایەوە، فەرەح هەموو ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە کە لە وەزارەت ڕوویدا بوو. محمد علی داوای لێکردین بێینەوە سەر خۆمان و خۆی بە تەلەفۆن بە شەخسی کە دواتر تێگەیشتم برای سەرۆکی دامەزراوەی بەرنامە و بوجەیە قسەی کرد و داوای یارمەتی لێ کرد. پاش ئەم قسەکردنە تەلەفۆنیە هەندێك هاتینەوە سەرخۆمان چونکە براکەم وتی هاوڕێکەم بەڵێنی پێداوم خۆی قسە دەکات لەگەڵ ئەردەشێری زاهدی، کە ئەو کات سەرۆکی کاروباری خوێندکارانی ئێرانیەکانی دەرەوە بوو.

ئەم کەسە (ئەحمد علی ئیبتهاج) بوو کە لە بواری کاری بیناسازیدا کاری دەکرد[1] و چەند برایەکی دەسەلاتداری هەبوو کە یەکێکیان سەرۆکی دامەزراوەی بەرنامە و بوجە

---

[1] –ئەبوالحسن ئیبتیهاج، غلامحسین ایبتیهاج و ئەحمەد علی ئیبتیهاج لە کۆڕوکۆبوونەوەی سیاسی ئەو سەردەم لە تاران بە سێ چەکدارەکە بەناوبانگ بوون.

و کەسێکی جێگەی متمانەی شا بوو و یەکێکیشیان ماوەیەك سەرۆکی شارەوانی و هەروەها سەرۆکی فەرۆکەوانی میلی ئێران بوو.
ئەحمەد علی ئیبتهاج، لە ڕێگەی یەکێك لە براکانی خۆیەوە، کە نازانم ئەبو ئەلحەسن خان بوو یا غلام حسین خان بوو، داواکەی خوشکەزاکەی محمد علی قطبی دەگەیەنێتە ئەردەشیر زاهدی و کارەکە دەکەوێتە ئاراستەیەکی تازەوە...

*نازانێت جگە لە زاتی پەروەردگار که بەیانی چ یارێك دەکات ڕۆژگار*

لەکاتێکدا کە فەرەح چاوەڕوانی هەفتەی ئایندە بوو تاوەکو کاتی دیاری کراوی خۆی بێت و بڕوات بۆ وەزارەتی دەرەوە، بەیانی هەمان ڕۆژ لە وەزارەتی دەرەوەوە تەلەفۆنیان کرد بۆ ماڵی براکەم و وتیان خودی بەڕێز بەڕێوەبەری گشتی دەیەوێت فەرەح دیبا ببینێت و تێ بگات لە کێشە و گازندەکەی و بەپێی پێویست چارەسەری بۆ بکات.
بەردەوام، ئەو خوێندکارانەی کە توشی گرفتەکانی هاوشێوەی کچەکەم دەبوون پاش گەڕانەوەیان بۆ ئێران سەفەری دەرەوەیان لێ قەدەغە دەکرا و لەهەموو مافێکی

---

(ئەبو الحسن ئیبتیهاج (برا گەورەکە) پیاوێکی توڕە و توندوتیژ بوو لە ڕووبەڕووبوونەوەدا. ئەبو ئەلحسن سەرەتا لە بنکەی ئاو و کارەبای خوزستان کاری دەکرد و کەم کەم لە ئیداری و دەوڵەتیەکاندا سەرکەوت تاوەکو سەرئەنجام سەری لە بانکی ملی و دواتریش دامەزراوەی بەرنامە و بوجەوە دەرهات و دواتریش بووە سەرۆکی ئەو دامەزراوەیە.
ئەبوئەلحسن دوو برای هەبوو بەناوەکانی غلامحسین و ئەحمەد علی کە ئەوانیش بەهۆی بەرەکەتی براکەیانەوە سەروەت و سامانێکی زۆریان دەستکەوتبوو. ئەحمەد علی خاوەنی کارگەی چیمەنتۆری تاران و کۆمپانیایەکی بیناسازی گەورە بوو.
غلامحسینیش سەرۆکی شارەوانی تاران بوو. ئەم سێ برایە بەهۆی ئەو پەیوەندیە زۆرەی کە لەگەڵ خاتو ئەشرەف پەهلەوی هەیان بوو زوو بەزووی توانیان سەرکەوتنی گەورە بەدەستبهێنن.
ئەبوالحسن ئیبتیهاج لە ئێران خاوەنی بانکێکی تایبەتی بوو و لەگەڵ دوو براکەی دیکەی ڕێژەیەکی زۆر پارەی ئەختینەیان نارده دەرەوەی وڵات و ماوەیەك پێش سەرکەوتنی شۆڕش ڕۆیشتن بۆ ئەمریکا.

کۆمەڵایەتیش بێ بەش دەکران. ساواك لە ژێر سەرۆکایەتی تەیمور بەختیار زۆر بەشێوەیەکی فراوان چاودێری بارودۆخەکەی دەکرد و سەرەڕای ئەوەش ئەوەی کە بێ بەش دەکرا لە هەموو مافێك و سەفەرکردنی لێ قەدەغە دەکرا دەگیران و دەخرانە زیاندانە درێژ ماوەکانەوە.

من و براکەم کە خەریکی ئەو حاڵ و بەیسە بووین و بەهۆی ئەو کێشانەی کە باسم کرد کە دروست دەبوون بۆ ئەو خوێندکارانەی کە چالاکی سیاسیان هەبوو و لەترسی ئەوەی نەوەکو فەرەحیش لەکاتی چوونی بۆ وەزارەتی دەرەوە توشی کێشەی پێشبینی نەکراو بێت و یان بگیرێت و ڕەوانەی زیندان بکرێت لەگەڵیدا ڕۆیشتین بۆ وەزارەت. ئەو کات ئەم وەزارەتە لە جادەی فروغ بەرامبەر بنکەی ئەفسەران بوو. براکەم تاپۆیەکی دەزگای بینایەکی نیشتەجێبوونی سەر ڕێگەی جادەی سێیەمی ئەسفەندی هێنابوو لەگەڵ خۆیدا تاوەکو ئەگەر کارمان بکەوێتە دادگا و شکات و شکات کاری بتوانیم ئەو تاپۆیە وەکو کەفالەتێك دابنێین و ڕێگە بگرین لە دەستگیرکردنی فەرەح.

هەڵبەتە ئەمە تەنها پێشبینیێك بوو، چونکە بە ئاگاداربوون لە داوای براکانی ئیبتهاج (کە داوایان لە ئەردەشیر زاهدی هاورێیان کردبوو) دەمانزانی کە لەوانەیە کێشەکەمان بە ئاگادارکردنەوە و چەند ئامۆژگارێك و وەرگرتنی بەڵێن نامەیەك کۆتایی پێبێت. ئەو کات تاران بەم شێوەیەی ئێستا خاوەنی بینای گەورە و فراوان نەبوو. ئەو ناوچەیەی کە وەزارەتی لێ بوو، ناوچەیەك بوو لە کۆتایی سەردەمی حکومەتی ڕەزاشادا دروستکرا بوو و ئەو ناوچەیەش بینای کۆمپانیای ملی نەوتی ئێران (پۆستەخانەی دواتری) جادەی سپە و بینای وەزارەتی کاروباری دەرەوە (لە جادەی فروغی) و بینای بنکەی ئەفسەرانی بەرامبەر وەزارەتی کاروباری دەرەوە و بینای شارەوانی گشتی تێدا بوو، بینای شارەوانیە گشتیەکەش ئەندازیارە ئەڵمانیەکان لەسەر نەخشەی کۆشکی پاسارگاد دروستیان کردبوو کە زۆر جوان و سەرنجڕاکێش بوو.

بەتایبەتی پایە بەرزەکانی کە لە شێوەی پایەکانی تەختی جەمشید دروستکرا بوون، ڕەونەق و کەشێکی تایبەتی بەو ناوچەیە بەخشی بوو و خەڵکی ئەو سەردەم ئەو ناوچەیان بە (باخی ملی) ناودەبرد.

فەرەح بەتەنیا چووە ناو بینای وەزارەتەوە و من و براکەم ڕێگریمان لێ کرا بڕۆینە ژوورەوە بۆیە ئێمەش هەر لەو شوێنە خەریکی پیاسکە کردن بووین و سەیری بیناکانمان دەکرد.

هەرچەندە چاوم بڕیبوویە بیناکان و سەیری شێوەیانم دەکرد، بەڵام هەوڵمدا براکەم نەزانێت  کە دەگریم و فرمێسک دەڕێژم. دڵم بەخۆیەوە نەبوو. بیرم لەو ڕۆژە سەخت و دژوار و مەینەتیانە دەکردەوە کە هاتبوو بەسەرمدا کە چۆن بە منداڵی باوکم لەدەستدا و لە سەرەتای گەنجیدا پیاوەکەم و دایکم لەدەستدان...

کەوتمە بیری ڕۆژانی ژیانم لە تەبریز لەژێر دەسەڵاتی هاوپەیمانەکاندا کە لەتوانامدا نەبوو بۆ بەسەربردنی ژیانم تەنانەت نانی ڕۆژانەش پەیدا بکەم.

کەوتمە بیری ئەو ڕۆژانەی کە نان چەندە بەنرخ بوو و هەموو ڕۆژێك لە سوچێکی شارەوە ئاژاوەی نان دروست دەبوو و ژمارەیەك لەو کەسانەی کە نانی ڕەش و دەگمەنیان دەدا بە خەڵکی دەکوژران.

بیرم لەو ڕۆژانە دەکردەوە کە چۆن خەریکی دوورینی جلوبەرگی خەڵکی بووم و بە چ زەحمەتێك خەرجی خوێندنی کچە تاقانەکەم دابین دەکرد.

هەرچەندە لە ناخی دڵمەوە ئیمانم هەبوو بەوەی کە ئەم کێشەیە کۆتایی دێت، بەڵام دیسانەوە دڵم هەر دەکولا و تاوەکو ئەو کاتەی کە فەرەح بە خۆشحاڵی و پێکەنینەوە لە وەزارەتی دەرەوە نەهاتە دەرەوە ساتێك ئارامیم بەخۆمەوە نەبینی.

فەرەح وتی هەڵسوکەوتی ئەمڕۆی بەرپرسەکانی کاروباری دەرەوە زۆر جیاواز بوو و تەنانەت وتی پێشنیاری کارکردنیان بۆ کردوم لە وەزارەتی دەرەوە یان لە سەفارەتی ئێران لە پاریس!

دواتر باسی ئەوەی کرد کە بەرپرسەکان چ جۆرە پرسیارێکیان لێ کردوە و چ داواکارێکیان خستوەتە بەردەست. پرسیاری تەواوەتیان لەفەرح کردبوو لەبارەی بارودۆخی خێزانی و ئاستی خوێندنی و هەروەها لەبەر ئەوەی کە کچەکەم زۆر بە

ئاسانی دەیتوانی بە فەرەنسی و ئینگلیزی قسە بکات و تەنانەت زمانە فەرەنسیەکەی زۆر باشتر بوو لە زمانی فارسیەکەی پێیان وتبوو دەتوانێت وەکو وەرگێڕ و کارمەندی ناوچەیی لە سەفارەتی ئێران کار بکەیت و یان دەتوانێت لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە لە تاران دابمەزرێت. کاتیان بۆ دیاری کردبوو کە بۆ سێ شەمەی داهاتوو سەردانیان بکاتەوە بۆ ئەوەی چەواز و بەڵگەکانی خۆی وەرگرێتەوە.

هەناسەیەکی ئارامم کێشا و گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. هەفتەی ئایندە لەبەر ئەوەی ئیدی هەست کردن بە ترس نەبوو فەرەح خۆی بەتەنیای ڕۆیشتەوە بۆ وەزارەتی دەرەوە، لەم ڕۆژەدا بوو کە ئیدی چارەنوسی کچەکەم سەرتاپا گۆڕانی بەسەردا هات و ئاراستە و ڕێگەیەکی تازە لەبەردەمیدا کرایەوە و بە کەمتر لە ساڵێك گەیشتە پلەی شاژنی ئێران!

بەو شێوەیەی کە فەرەح باسی دەکرد دەڵێت لەگەڵ ئەوەی کە دووبارە ڕۆیشتمەوە بۆ وەزارەت پێی دەڵێن کە بەڕێز ئەردەشیر زاهدی خۆی فۆرمی پرسیار و وەڵامەکەی خوێندویەتەوە و دەیەوێت چاوی پێت بکەوێت.

ئەردەشیر زاهدی ئەو کات زاوای (جەنابی شا)[1] بوو و لە هەموو شوێنێك بە (ئاغا زاهیدی) ناویان دەبرد و پلە و ئیشەکەی گرنگی نەبوو.

ڕۆڵی باوکی ئەردەشیر خان لە سەرکوتکردنی شۆڕشگێڕەکان و گەڕانەوەی شا بۆ دەسەڵات بووبوویە هۆی نزیکی ژەنراڵ زاهیدی لەگەڵ خێزانی پەهلەوی و ئەم نزیکیەش بە شێوەیەك بوو کە محمد ڕەزا کچە گەورەکەی خۆی خاتو شانازی کردە ژنی ئەندازیار ئەردشیر زاهیدی.

---

[1] –خاتو فەریدە دیبا لە هەموو شوێنێکی کتێبەکەیدا محمد ڕەزا پەهلەوی بە جەنابی حەزرەتی شا ناوی دەبات!

لە لاپەڕەکانی دواتردا جەنابی حەزرەت زۆر بەکارناهێنین و زیاتر محمد ڕەزا یان شا بەکار دەهێنین. (فەریدە دیبا) تەنانەت لەو شوێنانەشی کە ڕەخنە لە محمد ڕەزا یان ئەشرەف پەهلەوی و خێزانی محمد ڕەزا دەگرێت ناوی ڕێزدارانەی وەکو خاتو حەزرەت یان شاخاتوون یان خاتو گەوهەر و خاتو شاژن و ئەم جۆرە ناوانە بەکاردەهێنێت بۆیە ئێمە بەپێی پێویست ئەم نازناو و وشانەمان لابردوە. سەرەڕای ئەوە لە هەندێك لەلاپەڕەکاندا بۆ ئەوەی (کە ژنگەی ئەو ڕۆژگارە و فەزای فکری ئەو خێزانە هەستی پێ بکرێت) ئەم نازناو و وشانە بەکارهێنراوەتەوە.

کاتێک کە فەرەح دەچێت بۆ ژوورەکەی زاهیدی. زاهیدی زۆر خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕێت بە بینینی کچێکی ئێرانی کە توانیویەتی ئەو شەهادە باشە لە بەشی ئەندازیاری بهێنێت لە پاریس و ئارەزووی خۆشبەختی بۆ دەکات. لەو ساڵانەدا ژمارەی ئەو کەسانەی کە خوێندنیان تەواو کردبوو لە ئێراندا زۆر کەم بوون بەتایبەتی لەناو ژناندا زۆر بەکەمی ژنێک دەیتوانی بگاتە ئاستی پلەی ئەندازیاری یان دکتۆرەیی.

کاتێک کە زاهیدی دەزانێت فەرەح توانیویەتی نەخشەسازی و وێنەکێشی ئەندازیاری تەواو بکات و بەشێوەیەکی تەواو بە هەر دوو زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی قسە بکات باشتر هەستی ڕێزی خۆی بۆ دەردەبڕێت. سەرئەنجام بانگهێشتی دەکات بۆ ئەوەی چاوی بکەوێت بە خاتو شانازی (کچی شا).

(شاناز) کچە گەورە و منداڵی یەکەمی محمد ڕەزاشا بوو، دایکی شاناز خاتو فەوزیە کچی مەلیک فاروقی میسر بوو کە یەکەم ژنی محمد ڕەزاشا بوو.

سەردەمێک، مەیدانێکی گەورەی تاران بە ناوی فەوزیەوە بوو و کاتێکیش فەوزیە تەڵاقی وەرگرت و لە ئێران دەرچوو ناوی ئەو مەیدانەیان نا مەیدانی شاناز. ئێستا نازانم ئەو مەیدانە ناوی چییە [٢]

شاناز کچێکی جوان بوو زۆر شێوەی لە فەوزیەی دایکی دەچوو. بەهۆی ئەوەی کە فەوزیە نەیتوانی لە ژیانی هاوسەرگیریدا سەرکەوتوو بێت و هەر بەگەنجی تەڵاقدرا و پاشان لە ئێران دەرچوو و کچە بچوکەکەی هەر بە منداڵی بێ دایک بوو خەڵکی خۆشەویستێکی زۆریان بۆی هەبوو. من خۆم، لەگەڵ ئەوەی کە تاوەکو ئەو کاتە هەرگیز خاتو شانازم نەبینی بوو لە دڵەوە خۆشەویستیم بۆی هەبوو.

فەرەح کاتێک کە لە وەزارەت گەڕایەوە بە هەیجان و زەوقێکی زۆرەوە هەواڵی بانگهێشتەکەی ئەردەشیری زاهیدی پێ ڕاگەیاندم و وتی زاواکەی شا خۆی بانگهێشتی کردوم تاوەکو بڕۆم بۆماڵیان بۆ بینینی خاتو شاناز.

دەبێت ئەم هەواڵەم چۆن لێک بدایەوە؟

---

[٢] –مەیدانی ئیمام حسین

هەموو ئەو دایکانەی کە کچی گەنجیان هەیە دەتوانن نیگەرانی و پەرێشانی من لەم بانگهێشتە هەست پێبکەن.

کاتێك کە بابەتەکەم باس کرد بۆ براکەم ئەویش بوو بە شەریکی خەمم.

خودی فەرەح زۆر بە ئازایانە ئەم بانگهێشتەی قبوڵ کردبوو. کاتێك بینیم کە کچەکەم زۆر حەز دەکات بڕوات بۆ ئەم بانگهێشتە پێشنیارم کرد کە منیش دەمەوێت بێم لەگەڵتدا. بەڵام فەرەح وتی تەنها منیان بانگهێشت کردوە. (کاتێك کە ئەردەشیر زاهیدی ئەم بانگهێشتە چاوەڕوان نەکراوەی بۆ پێشنیار کردبوو بە ڕادەیەك سەرسام و خۆشحاڵ بووبوو کە لەبیری نەبووبوو بپرسێت ئایا دەتوانم دایکم لەگەڵ خۆمدا بهێنم یان نەیهێنم؟)

بەهەرحاڵ دانیشتین و دەستمان کرد بە ڕاوێژ کردن و زیاتر لە هەموومان هاوسەری براکەم (لوییز صمصامی) زۆر ڕازی بوو بە ڕۆیشتنی فەرەح بۆ بینینی خاتو شاناز و باوەڕی وابوو کە نەڕۆیشتنی فەرەح بۆ ئەم بانگهێشتە لەوانەیە وەکو شێوەیەك لە بێ ڕێزی لێکبدرێتەوە.

براکەم وتی ئەگەر ئەم بانگهێشتە بۆلای خاتو شاناز نەبوایە و ئەردەشیری زاهیدی نەیوتایە کە ئامانجی ئەم بانگهێشتە چاوپێکەوتنە لەگەڵ کچی شا، دەکرا ئەم سەردانە ڕەفز بکرێتەوە بەڵام نەڕۆیشتن بۆ دیداری کچی گەورە و خۆشەویستی شا ڕاست نیە.

خودی خۆشم باوەڕم وابوو کە ئەگەر فەرەح ئەم بانگهێشتە قبوڵ نەکات لەوانەیە توشی کێشە ببێت و بابەتی ئۆپۆزسیۆنبوونی فەرەح لەگەڵ دەوڵەت لەسەردەمی قوتابیبوونیدا جارێکی دیکە بهێنرێتە ئاراوە و بۆ کچەکەم کێشەی چاوەڕوان نەکراوی بۆ دروست بکرێت.

لەو ساتەدا تەنها شتێك کە بە بیری هیچکاماندا نەدەهات ئەوە بوو کە ڕۆیشتنی فەرەح بۆ ماڵی ئەردەشیری زاهیدی و چاوپێکەوتنی لەگەڵ کچی شا پێشەکێك بێت بۆ شوکردنی فەرەح بە محمد ڕەزاشا.

محمد ڕەزا شا ماوەیەك بوو کە وازی هێنا بوو لە خاتو (سورەیا ئەسفەندیاری) و بەتەنهای دەژیا. سورەیا ئەسفەندیاری کە بە شازنی خەمگینی ئێران بەناوبانگ بوو

پاش جیابوونەوەی لەگەڵ شادا لەگەڵ دایکی کە خاتونێکی ئەڵمانی بوو لە ئێران چونە دەرەوە و لە پاریس دەژیان. ئەمەش لە یاریە سەیر و سەمەرەکانی ڕۆژگارە کە شاژنی ئێران بەیەکجاری دەڕوات بۆ پاریس و کچێکی ئێرانی لە پاریسەوە دێتەوە بۆ تاران تاوەکو ببێتە شاژنی تازەی ئێران!

لەگەڵ ئەوەی کە هەموومان ڕەزامەندیمان پیشاندا بۆ ئەوەی بچێت بۆ بینینی خاتو شاناز بەڵام لەبەر ئەوەی کە من باوەڕی زۆرم بە خواجەی شیرازی هەبوو هەستام و لەسەر تاقە بچوکەکەی دیواریماڵەکەمان دیوانی گەورەی عارفم هێنا و دەستم کرد بە گرتنەوەی فاڵێك کە ئەم پارچە شعرەی هێنا:

*هر که این عشرت نخواهد خوشدلی بروی تباه*

*واینکه این مجلس نجوید زندگی بروی حرام*

ئەردەشیری زاهیدی و هاوسەرەکەی شاناز لەخانە باخێکی گەورەدا دەژیان لە کەرەج.

لە ڕۆژی دیاری کراوی بانگهێشتەکەدا فەرەح جلوبەرگێکی سادە و کچانەی لەبەرکرد و بەشێوە و ڕوخسارێکی زۆر ئاساییەوە ڕۆیشت بۆ دیداری کچی گەورەی شا، بەڵام نەیدەزانی کە خاتو شاناز بەزووی دەبێتە کچی ئەو!

دەوروبەری کاتژمێر پێنجی دوانیوەڕۆ ئەردەشیر خان ئۆتۆمبێلێکی ڕەنگ سورمەیی سەر بە وەزارەتی دەرەوەی نارد بە شوێن فەرەح و ئۆتۆمبێلەکە هاتە بەردەم ماڵی ئێمە و فەرەحیش سوار بوو و ڕۆیشت بۆ ماڵی خاتو شاناز.

ئەمە چاوپێکەوتنێکی سادە بوو لە نێوان شاناز و فەرەح. دواتر کچەکەم بۆی باس کردم کە کچەکەی شا لەم چاوپێکەوتنەدا پرسیاری زۆری لە فەرەح کردوە و هەوڵیداوە تاوەکو پەی بەرێت بە بیروبۆچوون و شێوەی بیرکردنەوەی.

لەم دیدارەدا فەرەح کاریگەرێکی باشی کردبوویە سەر شاناز بەشێوەیەك کە هەردووکیان بوون بە هاوڕێی گیانی بەگیانی و بەدرێژایی مانگی مەی ئەم چاوپێکەوتنانە سێ جار دووبارە بوونەوە.

لەدوا چاوپێکەوتنیاندا، محمد ڕەزاشا بەبێ زانیاری پێشوو تەشریفی بردبوو بۆ ڤێلاکە و لەو میوانیە کورت و سادەیەی کچەکەیدا بەشدار بوو و لەگەڵ فەرەح چاویان بەیەك کەوتبوو.

ئەو ڕۆژە، لەبیرمە کچەکەم جلێکی ڕەنگ پستەیی کە ناوقەدی کاڵ بوو و خۆم بۆم دووری بوو لەبەر کردبوو.

کاتێك کە فەرەح لەم چاوپێکەوتنەدا گەڕایەوە زۆر سەیر توشی واقوڕمان بووبوو و نەیدەزانی لەکوێوە قسە بکات و بابەتەکە چۆن و بە چ شێوەیەك باس بکات.

فەرەح وتی کاتێك کە لەگەڵ خاتو شاناز لە پاڵ مەسبەحەکەدا خەریکی پیاسکە و قسەکردنی ئاسای بووین لەپڕێکدا خزمەتکار و ئیشکەرەکان هاتن بۆلامان و بە ترس و شڵەژانەوە ڕایانگەیاند کە جەنابی حەزرەتی شا تەشریفیان هێناوە.

فەرەح وتی:

(دڵم کەوتبوویە شەپۆلدان! هەوڵمدا لە ڕووبەڕووبوونەوەم لەگەڵ جەنابی حەزرەت خۆم بم و گوفتار و کردارم دروستکراو نەبن و ڕەنگم تێکنەچێت. تەنها، پێشتر، یەکجار پاشام لە پاریس لە دوورەوە لەناو کۆمەڵێك خوێندکارانی نیشتەجێی پاریس بینی بوو. ئەمە ئەو پاشایە بوو کە چەندینجار لەدژی بەشداری خۆپیشاندانم کردبوو و ئێستاش دەتوانم لەنزیکەوە بیبینم.

ئێستاش یەکەمین ڕستەم لەبیرە کە ئەو ڕۆژە لە نێوان من و شادا ئاڵوگۆڕ کرا. شا لێی پرسیم (لەکوێ دەخوێنیت؟) منیش وتم لەکۆتایی خوێندندام و خەریکی نوسینی نامەکەم لە بەشی ئەندازیاری پردی تەکنیکی لە پاریس...

بەم ڕستانە ناسراوی ئێمە دەستیپێکرد و چەند خولەکێك چۆنیەتی خوێندنەکەم لە پاریس بووە بابەتی گفتوگۆکەمان.

شا ڕووبەڕووبوونەوەیەکی زۆر خۆشەویستانەی لەگەڵمدا هەبوو و منیش بێ ڕادە کەوتمە ژێر کاریگەری قسە خۆمانەکانیەوە. پێش ئەوە تەنانەت لە جیهانی خەیاڵیشدا باوەڕم نەدەکرد کە ڕۆژێك دەبێت لەپاڵ شادا دادەنیشم و ڕووبەڕوو لەگەڵیدا قسە دەکەم. بەڵام ئێستا دەبینم کە (شا)ش کەسێکی ئاساییە و وەکو هەموو

خەڵکێکە و خواستەکانیشی هەمان ئەو خواستانەن کە هەموو کەسێکی ئاسایی هەیەتی!

زۆر بەئاسانی قسەم بۆ هات لەگەڵ شادا و توانیم قسەکانم بەبێ ڕیا و فێڵ بکەم و بیروبۆچون و باوەڕەکانم بێ پەردە و دوور لە هەر مەرایییەکەوە بخەمەڕوو...)

پاش هاوسەرگیری فەرەح لەگەڵ محمد ڕەزا بوو کە ئێمە تێگەیشتین کە دیداری ئەو ڕۆژە لەگەڵ شادا چاوپێکەوتنێکی لەناکاو و چاوەڕوانکراو نەبووە.

خودی شا دواتر خۆی باسی کرد: (کە ڕۆژێك کچەکەم شاناز بە چاوانێکی زیاتر لە حاڵەتی ئاسایی گەشاوەوە هاتە لام و وتی پیاوەکەم (ئەردەشیر زاهدی) لەگەڵ کچێکی گەنج بەناوی فەرەح ئاشنا بووە کە بە بۆچوونی ئەو لە هەموو ڕوویەکەوە شایەنی ئەوەیە ببێتە هاوسەری من و ببێتە شاژنی ئێران!

زاوا و کچەکەم کە کاتێك ناسراویان پەیدا کردبوو لەگەڵ فەرەح منیان بانگهێشت کرد بۆ خوانێکی ئێوارە و منیش بە پێداگیری و سووربوونی ئەوان ڕۆیشتم بۆ ئەو بانگەشەیە و پاش بینین و قسەکردن لەگەڵ فەرەحدا بۆم دەرکەوت کە من و فەرەح لە زۆرێك لە لایەندا بیروبۆچوونمان لەیەکەوە نزیکە...)

چاوپێکەوتنەکانی فەرەح لەگەڵ محمد رەزا چەندینجار دووبارە بوونەوە و ڕۆژێکیان فەرەح کە لەیەکێك لەو چاوپێکەوتنانەدا گەڕایەوە ئێمەی توشی سەرسامی و واقوڕمان کرد و وتی: (ئەمڕۆ جەنابی حەزرەت بە ئاشکرا داوای هاوسەرگیری لێ کردم و خوازبێنی کردم!)

منیش وتم بە فەرەح: تۆ چ وەڵامێکت دایەوە؟

فەرەح وتی: ئاشکرایە، بە شەوق و حەزەوە قبوڵم کرد!

کۆتایی ئارەزووی هەر دایکێك ئەوەیە کە کچەکەی خۆی بە بوکی ببینێت و بینێرێت بۆ ماڵی بەختی خۆی. لەبەر ئەوەی کە ژیانی ئێمە بەهۆی ناسروشتی زیاد لەڕادەوە سەرەتا توشی چەندین گۆڕان و هەوراز و نشێو بووبووین و کچەکەم بە ڕۆیشتنی بۆ فەرەنسا پەروەردەی فەرەنسیەکانی وەرگرتبوو، من وەکو دایکەکانی دیکەی ئێرانی هیچ جۆرە باوانێکم بۆ ئامادە نەرکردبوو، جگە لە چەند مانگی پێشوتر نەبێت کە کە لەخۆیەوە هەواڵی دەستگیرانی و هاوسەرگیری کردنی لە ئایندەیەکی

نزیکدا لەگەڵ (کەریم پاشا بهادری) بیستبوو و وابیرم دەکردەوە کە (کەریم پاشا بهادری) زاوای ئاییندەمانە.

هەرگیز باوەڕم نەدەکرد ڕۆژێك بێت ببمە خەسوی پاشای وڵات! ئێستا دەبێت چیم بکردایە؟ من لە ژیاندا هەرگیز لەگەڵ خانەدان و پیاوەگەورەکاندا دانەنیشتوم و بەشداریم نەکردوە لە گفتوگۆ و میوانیاندا. ئێستا چۆن دەتوانم لەگەڵ شای وڵات و خێزانی پەهلەوی هاتوچۆ بکەم.

بۆ هاوسەرگیری کچەکەم دەبوو چی بکەم؟ دەبوو چ باوانێکم ئامادە بکردایە؟ ئایا بێوەژنێکی وەکو من کە لەڕێگەی دروومانیەوە ژیانم بەڕێکردوە دەتوانم باوانێك ئامادە بکەم کە بە ماڵ و شان و شەوکەتی پاشا بخوات؟

لافاوێك لە وەهم و خەیاڵی دووروودرێژ هێرشیان دەکردە سەر مێشکم..

هەموو ئەم ڕووداوانە لە ماوەی کەمتر لە مانگێکدا ڕوویاندا. (وەکو بروسکە!) و پێش ئەوەی کە ئێمە هەندێك بێینەوە بەخۆماندا هەموو شتێك شێوەیەکی جدی لەخۆی گرت.

سەرەتا (جەنابی حەزرەت) ئۆتۆمبێلێکی جۆری (کرایسلەری) پێشکەش بە فەرەح کرد کە کلیلەکانی زێڕ بوون. ئەمە یەکەمین خەڵاتی محمد ڕەزاشا بوو بۆ هاوسەری ئاییندەی.

جارێکی دیکە شا ملوانکەیەکی وردی ئەڵماسی گرانبەهای پێشکەش بە فەرەح کرد.

ئێمە، لەبەرامبەر ئەم خەڵاتە گرانبەهایانەی شا دەمانتوانی چ شتێکی پێشکەش بکەین؟

من وەکو خەسوی شا ئەرك بوو لەسەرم بەپێی ئەوەی کە ڕێوڕەسم و عادەتی ئێرانیەکانە خەڵاتێکی شایستە و بەنرخ بۆ زاوای ئاییندەم ئامادە بکەم. بەڵام خەڵاتێك کە بۆ شا بێت، دەبێت شایانی بێت کە ئەمەش لە ڕادەی توانای من بەدەربوو.

کچەکەم دوو وێنەی لوتکەی دەماوەند و دیمەنێکی لە دەربەندی کێشا و گرتیە چوارچێوە و پێشکەشی هاوسەری ئاییندەی کرد.

دەبێت ئەوە بڵێم کە تاوەکو ئەم کاتەش من هێشتا (شا)م نەبینیوە. سەرئەنجام فەرەح ئاگاداری کردینەوە کە جەنابی شا من و براکەم (محمد علی) بانگهێشت کردوە بۆ خوانێکی ئێوارە لە کۆشکی سعد ئاباد.

وابزانم سەرەتای مانگی جون بوو، (پێموایە هەفتەی یەکەمی جونی ساڵی ١٩٥٩) بوو کە ڕۆیشتین بۆ دیداری شا.

تاوەکو ڕادەیەك خۆم دۆڕاندبوو. کاتێك کە ئۆتۆمبێلەکە چووە ناو کۆشکی "سعد ئاباد"ە وە و گەیشتە بەردەم حەوشەی کۆشکی سپی، یەکێك لە خزمەتکارەکانی بە پەلە هاتە پێشەوە و دەرگای دوای ئۆتۆمبێلەکەی کردەوە تاوەکو من و فەرەح کە لە دواوە دانیشتبوین، دابەزین.

بەڵام من لە ئەژنۆکانمدا هەستم بە لاوازی دەکرد و توانای دابەزینم نەبوو.

براکەم کە لە پێشەوە دانیشتبوو و پێش ئێمە دابەزی بوو و کاتێك ئەو بارودۆخەی منی بینی هاتە پێشەوە و دەستی منی گرت و بە یارمەتیدان منی لە ئۆتۆمبێلەکە هێنایە دەرەوە.

کۆشك و باخی فراوانی سعد ئاباد لە باکوری مەیدانی تەجریش بوو کە لایەکی دەچووە سەر مەیدانی دەربەند و بەشێکی دیکەی دەگەیشتە منظریە و لاکانی دیکەی بەرەو باشوری زنجیرە شاخەکانی ئەلبرز و شائاباد دەیڕوانی.

تاوەکو ئەو کاتە چەندجارێك بۆ گەڕان هاتبووم بۆ مەیدانی دەربەند. بەڵام هەرگیز باوەڕم نەدەکرد کە ڕۆژێك ببم بە میوان لە کۆشکی سعد ئاباد.

پاش هاوسەرگیری کچەکەم لەگەڵ شا بوو تێگەیشتم ئەمە نەك هەر تەنها کۆشکێك نیە بەڵکو کۆمەڵەیەکە لە چەندین کۆشکی بەرز و جوان[1]

---

[1] -کۆشکەکان و پارکە فراوانەکەی سعد ئاباد پاش سەرکەوتنی شۆرشی ئێران بوو بە گەنجینەیەکی گەورە و لەبەردەم گەشتیارە ناوخۆی و دەرەکیەکاندا کرایەوە. ئەم کۆشکانە لە کۆتای باکوری تاراندایە و ناوچەیەکی فراوانە کە بەشێکی دیوارەکانی دەگاتە مەیدانی دەربەند و بەشێکی دیکەشی دەگاتە دارئابد و باشوری زنجیرە شاخەکانی ئەلبورز.

ئەو شوێنە موڵکی سعد الدولەی وەزیری دەرەوەی محمد علیشای قاجار بوو کە دواتر لەلایەن ڕەزاخان سەرداری سوپا (ڕەزاشای دواتر) دەستی بەسەردا گیرا.

لەو دوانیوەڕۆ دڵبزوێنەدا کە کۆتایی بەهار بوو دەنگی ناسکی بولبلەکان و ئاوازی کەناری و باڵندە جیاوازەکان هەموو شوێنێکی ئەو دەوروبەرە فراوانەی کۆشکی سعد ئابادیان پڕکردبوو.

لەبەردەم کۆشکی سپی دەریاچەیەکی تاڕادەیەك گەورە هەبوو کە دەیان درەختی کاژ و ڕازاوە جوانێکی تایبەتیان پێ بەخشی بوو.

هەروەکو خەڵکی واقوڕماو سەیری ئەو دیمەنانەم دەکرد و نوقمی حەزی ڕۆح بزوێن و ئاوازی دڵڕفێنی باڵندەکان بووبووم و لەو کاتەدا بینیم محمد ڕەزا و شاناز بۆ بەخێرهاتنمان هاتن بۆلامان.

---

کۆشك و پارکەکانی سعد ئاباد و میوانخانەکەی دەربەند لەماوەی ساڵانی ١٩٢١ تاوەکو ١٩٤٩ بەرە بەرە دروستکران.

چل ساڵ پێش ئەو مێژووە، ئەو کەسانەی کە لە تاراندا دەژیان ئەگەر توشی کێشەیەکی چارەسەرنەکراو ببونایە دەڕۆشتن بۆ شمیران بۆ ئەوەی سەردانی زیارەتی ئیمام صالح تەجریش و ئیمام زادە قاسم یان (سادات دلدم) بکەن و دوعا و پاڕانەوەکانیان گیرا ببوایە.

باوکی ئەم ساداتە لە دەربەند و لە شوێنی ئەم کۆشکی سعد ئابادەی ئێستادا بوو و پاشاکانی قاجار زۆر ئیمانیان بەم مەرقەدە هەبوو و لە ڕۆژانی ئیمانداریاندا دەهاتن بۆ مەرقەد و دەستیان دەکرد بە دوعا و پاڕانەوە.

کامەران میرزا (جێگری سەڵتەنەت) کە باخێکی هاوینەی لە شمیران (کامرانیەی ئەمڕۆ) هەبوو یەکێك بوو لە ئیماندارە سەد لەسەدەکانی ئەم ساداتە و ساڵی یەکجار لە کامرانیە بە پێی دەهات بۆ دەربەند تاوەکو سادات دەربەند (دلدم) دوعای بۆ بکات.

ئەم ساداتە چەند خێزانێك زیاتر نەبوون کە ڕەزاشا ماڵ و ئەژداد و ئابادیان داگیر کرد و بەزۆر دەستی گرت بەسەر ئەو ناوچانەدا و خودی خۆشیان بەرەو باکور و باشوری وڵات ئاوارە بوون.

کاتێك کە کریم ئاغا بوزرجمهوری بوو بە سەرۆکی شارەوانی ئەو ئەرکەی بەسەردا سەپێنرا تاوەکو خەڵکی ئەسڵی ئەو ناوچەیە دەربکات و لەو شوێنەدا کۆشکی بەرز بۆ ڕەزاشا دروست بکات. ئامانج لە دروستکردنی سعد ئاباد ئەوە بوو کە سەرداری سوپاش وەکو شازادەکان و پیاوانی قاجاری سەرەڕای کۆشك و ماڵەکانی شار (لە ناوچەکانی فەلەستین جادەی پاستوری ئێستا) کۆشك و خانە باخیشی لە شمیران هەبێت!

شا، بێ ڕادە شانازی کچی خۆش دەویست و شانازیش هەڵبەتە کچێکی جوان و بەڕێز و تەندروست و خاوەنی ڕەوشتێکی زۆر بەرز و چاك بوو، ئەم تایبەتمەندیانەش ئەم کچەی جیا دەکردەوە لە هەموو بنەماڵەی پەهلەوی.

دەبێت ئەوەش بڵێم کە ئیمانێکی بەهێزیشی هەبوو و هەر لەبەر ئەوەشە دواتر هەوڵیدەدا خۆی لە میوانیەکان و شەونشینیەکان بەدوور بگرێت و کەم کەم گۆشەگیر دەبوو.

(هۆکاری جیابوونەوەی ئەو لە ئەردەشیریش هەمووکەس دەزانێت کە بێتاقەتی و ناخۆشحاڵیەکانی شاناز بوو لە مەسەلە ئەخلاقیەکانی پیاوەکەی)

من، دواتر لەم بارەیەوە دەدوێم. ئێستا ڕێگەم پێ بدە باسی یەکەمین دیداری خۆمان بکەم لەگەڵ زاوای ئایندەم.

محمد ڕەزا هاتە پێشەوە و فەرەح تەوقەیەکی لەگەڵدا کرد و منی ناساند بە محمد ڕەزا. من هەموو ئەو ڕاهێنانەی کە پێشتر ڕاهێنرابووم لەسەری لەبیرم کرد لەوانە نوشتانەوە لەبەردەم شادا کەئەمش نەریتێك بوو بەلاّم من لەبیرم کرد!

محمد رەزا زۆر ڕێزی گرت لە من و براکەم محمد علی. پاشان هەموومان پێکەوە ڕۆیشتین بۆ ناو کۆشکەکە.

محمد ڕەزا، هەندێك قسەی کرد و منیش لە شێوەی قسەکانی تێگەیشتم کە فەرەح هەموو ژیانی ئێمەی بەبێ کەم و زیاد بۆ باسکردوە و منیش شتێکی زۆرم بۆ وتن نەبوو لەگەڵ شادا.

محمد ڕەزا ئەوەی خستەڕوو کە مەبەستی ئەوەی هەیە لەگەڵ فەرەحدا هاوسەرگیری بکات و باسی ئەوەی کرد کە لەسەر خواستی فەرەح بڕیارمداوە ئەمشەو ئەم بابەتە باس بکەم و بە کورتی بەو مانایە کە داوای دەکات لەلای من.

منیش ئەوەم خستەڕوو کە مەیل مەیلی شایە و خواست خواستی جەنابی حەزرەتە. پاشان باسی ئەو حاڵەتەم کرد بۆ پاشا کە چۆن فاڵی حافزم گرتوەتەوە و باسی ئەو دێڕە شعرەم کرد کە پێشتر ئاماژەم بۆ کرد پاشاش زۆر خۆشحاڵ بوو و چەندجارێك پرسی: بەڕاستی! بەڕاستی ئەو دێڕە شعرە هات؟

کاتێک باسی باوەڕ و بۆچوونەکانی خۆمم بۆ کرد بۆ فالی حافز، فەرمانی کرد دیوانی حافز بهێنن تاوەکو دووبارە لە بەردەم ئەویشدا فالێکی دیکە بگرمەوە!

هەرچەندە دڵنیا نەبووم ئەمجارەیان بتوانم بەختێکی باش بەدەستبهێنم. بەڵام نەشمدەتوانی ڕووبەڕووی ئەم خواستە منداڵانەی پاشاش ببمەوە بۆیە ئامادەی خۆم پیشاندا.

خزمەتکارەکە چەند خولەکێك دواتر دیوانەکەی حافزی هێنا و منیش فاتیحەیەکم خوێند بۆ ڕۆحی حافز و سەلام و پێزانینی خۆم پێگەیاند و داوام لێ کرد کە ئابڕووم بپارێزێت و ئەو دێڕە شعرانەم بۆ بێت کە خۆشی و کەیفی ئەم دانیشتنە تێکنەدا، بەڵکو ببێتە هۆی زیاتر خۆشی و شادی ئەم دانیشتنەمان.

کاتێك کە دیوانەکەی حافزی شیرازیم کردەوە ئەم شعرانە هاتن کە بەبێ دواکەوتن خوێندمنەوە بۆ پاشا و محمد ڕەزاش چەندجارێك وتی: سەیرە! سەیرە! ئای!

عشق بازی و جوانی و شراب لعل فام

*مجلس انس و حریف همدم و شرب مدام*

*ساقی شکر دهان و مطرب شیرین سخن*

*همنشینی نیك کردار و ندیمی نیکنام*

*شاهدی از لطف و پاکی رشك اب زندگی*

*دلبری در حسن و خوبی غیرت ماه تمام*

*و تاوەکو کۆتایی....*

وتم بە شا کاتێك کە بۆ یەکەمجار فالی حافزم گرتەوە ئەم دێڕانەم بۆ هات و ئەمەش بۆ من زۆر سەیرە!

چەند خولەکێك دواتر، (جەنابی خاتو ئەشرەف)یش هاتنە ناو دانیشتنەکەمانەوە. بۆ من کە تاوەکو ئەو ساتە ئەو خوشك و برایەم لە نزیکەمەوە نەبینی بوو هاوشێوەی جوڵە و هەڵسوکەوتی هەردووکیان بۆم زۆر جێگەی سەرنج بوو.

شا وتی: ئەم خاتونە دایکی ئەو فەرەح خانەیە کە بڕیارە بێتە شاژنی ئێران. بۆم دەرکەوت کە هەرچەندە ئەشرەف تاوەکو ئەو ڕۆژە فەرەحی نەبینی بوو بەڵام ئاگاداری ناسراویەکەی کچەکەم لەگەڵ شا بووبوو.

پاشا شا وتی لەسەر مێزی نان خواردن شاژنی دایك (خاتو تاج الملوك)یش ئامادە دەبێت تاوەکو لە نزیکەوە بوکی داهاتووی خۆی بناسێت.

ئەشرەف بێدەنگ دانیشتبوو و تەنها گوێی بۆ ئەو قسە و باسانە دەگرت کە لەنێوان ئێمەدا دەکرا و هیچ بۆچونێکی دەرنەدەبڕی.

شا لە براکەم لەبارەی چالاکی و کاروبارەکانیەوە پرسیاری کرد و محمد علیش وتی خەریکی بەڕێوەبردنی کۆمپانیاییەکی بینـاییم لەگەڵ چەند کەسێکی دیکەدا و کاری ئێستاشم کارکردنە لە چاکردنی ڕێگاوبانەکانی فڕۆکەخانەی میر ئاباد.

شا دووبارە وتی بە براکەم کە فەرەح بۆی باس کردوم کە ئەرکێکی زۆرت کێشاوە بـۆ دابینکردنـی تێـچوونی خوێنـدنی لـە فەرەنـسا و ڕۆڵێکـی گرنگـت بینیـوە لـە پەروەردەکردنی و پێگەیاندنیدا؟

محمد علی لەسەرخۆ و نەرم وەڵامی دایەوە خوشکەکەم ڕەنج و زەحمەتی زۆری کێشاوە بۆ هەردووکمان، منیش سەرکەوتنی خۆم بۆ فیداکاریەکانی ئەم خوشکەم دەگێڕمەوە.

محمد ڕەزاشا بـۆ ئـەوەی کـە دڵنەواییەکی منیش بکات وتـی: بیـستومە خـەڵکی ڕەشتی؟ ڕەشت شارێکە کە پڕە لە خەڵکی باش و ڕۆشنبیر.

منیش سوپاسی لوتف شایانە و بۆچوونە جوانەکەیم کرد.

محمد ڕەزا دووبارە وتـی: باوکم (حەزرەتی کۆچکردوو) ماوەیەکی زۆر لە سوپای قزاق لە ڕەشت خزمەتی دەکرد هەمیشە کاتێك باسی ئەو سەردەمەی دەکرد بەباشی باسی چاکەکاریەکانی ڕەشتیەکانی دەکرد.

بە ناوهێنـانی نـاوی جەنابی حەزرەتی کۆچکردوو هەریەکە لە ئامادەبوان چەند ڕەستەیەکی پیاهەڵدان و وەصـفیان لەبارەی خوالێخۆش بوو ڕەزاشاوە باس کرد و محمد علی وتی جارێکیان لەکاتی سەردانی ڕەزاشا بۆ بەندەری پەهلەوی لە نزیکەوە حەزرەتی کۆچکردووی بینیوە.

هەندێکیش باسـی یادگـاری هـاتنی یەکـەمین کەشـتی تایبـەتی کـرد بـۆ بەنـدەری پەهلەوی، شا و ئەشرەفیش لە بیستنی ئەم بابەتە زۆر خۆشحاڵ بوون.

ئەشرەف كە تاوەكو ئەو كاتە بێدەنگ دانیشتبوو، ئینجا دەستیکرد بە قسەکردن و بیرەوەری زۆری لەبارەی ئەو کەشتیە تایبەتەوە باس کرد کە لەگەڵ باوکیدا هاتبو و لە کۆشکێکی تایبەتی لە بەندەری پەهلەوی مابوونەوە.

ئەوەنـدەم زانـی کـە دانیـشتنە میوانیەکـە گـۆڕا بـۆ دانیـشتنێك کـە لەناویـدا باسـی یادەوەریە مێژوویەکان دەکرا و هەموو ئامادەبوان پێشبڕکێیان دەکرد بۆ پیاهەڵدان و وەصفکردنی ڕەزاشا.

فەرەح بۆ ئەوەی بابـەتی قسەکردنەکە بگۆڕێـت وتـی بە محمد ڕەزا: ئەگـەر جەنابی حەزرەت ئیجازە بفەرموون دەبێت بۆ پێشکەشکردنی نامەکەم و ئەنجامدانی کۆمـەڵێك کاروباری شەخسی و کۆکردنەوەی ئەو کەلوپەل و شتانەی کە لەپاریسدان سـەرێك لـە پاریس بدەم.

محمد ڕەزاش پێشوازی کرد لەم بڕیارە و وتـی: زۆرباشـە هـەر بـەو مناسەبەتەشەوە خاتو شەمسەش ئێستا لەسەر سەفەرە بۆ ئەوروپا. بۆیە لەگەڵ ئـەودا بـڕۆ بـۆ فەرەنسا و سـەرەڕای ئەنجامـدانی کـارە شەخـسیەکانت کەلوپـەلی پێویـستی گرێبەسـتی و بوکیەکەشت بکرە.

درێژەی باسەکە وەستا چونکە وترا کە شاژنی دایك تەشریف دەهێنێت!

هـەمووومان بـۆ ڕێـزی شـاژنی دایـك هەسـتاینەوە و دەسـتمان کـرد بـە وەصـف و پیاهەڵدانی.

محمد ڕەزا ڕۆیشتە پێشەوە و خـانم تـاج الملـوکی لـەباوەش گـرت و کوڕ و دایـك بـۆ چەند خولەکێك یەکتریان لەباوەش گرت و یەکتریان ماچ کرد.

محمـد ڕەزا لـە ڕووی شـێوە و ڕەخـسار و قـەد و قیافـەوە زۆر چـووبوویەوە سـەر دایکی. ڕەزا شا باڵا بەرز بوو بەڵام محمد ڕەزا باڵای کورت بوو.

شاژنی دایك لەگەڵ خاتو ئەشرەف خان بەهەمان شێوەی کوڕەکەی دەستی کرد بە ماچ و موچ و یـەکتریان لـە بـاوەش گـرت. خـاتو شـانازیش چووە پێـشەوە و سـەرەتا دەستی دایکە گەورەی و پاشان دەموچاوی ماچ کرد.

خـاتو شاژنی دایـك جلوبـەرگێکی لـە جـەواهر دووراوی شکۆمەندی لەبـەردا بـوو کـە درەوشاوەی و ڕەنگی گەوهەرەکانی سەرنجی مرۆڤی ڕادەکێشا.

هەر لەگەڵ ئەوەی کە لەسەر جێگە هەمیشەیەکەی خۆی دانیشت، محمد علی ڕۆیشتە پێشەوە و دەستی خاتو شاژنی دایکی ماچ کرد. منیش ڕۆشتمەوە پێشەوە و ڕێزی خۆم بۆ دەربڕی. فەرەحیش چووە پێشەوە و تەوقەیەکی لەگەڵدا کرد.
بەشێوەیەکی زۆر سەخت دەینالاند بەدەست ئازاری ئێسقانەکانی بەتایبەتی ئازاری ئەژنۆکانیەوە، وابزانم هۆکاریَ ئەو ئازار و ناڕەحەتیەش بەهۆی قورسی و کێشی لەشیەوە بوو.
محمد ڕەزا ئێمەی ناساند و وتی ئەمەش خاتو فەرەح دیبایە کە لەبارەیەوە قسەم بۆ کردی.
بەبێ ئەوەی وشەیەك بڵێت سەرتاپا سەیری ئێمەی دەکرد بە وردی.
هێشتا ئەوەندە لە هاتنە ژوورەوە و دانیشتنی دایکە شاژن تێ نەپەڕی بوو جەنابی حەزرەتی شا پرسی لە خزمەتکارەکە: ئایا خواردن ئامادەیە؟
کاتێك وەڵامی بەڵێیان بیست فەرموویان لە ئێمە کرد تاوەکو بڕۆین بۆ سەر خوانەکە بۆ تەلارە تایبەتەکە.
شاژنی دایك، لەگەڵ محد ڕەزا کە دەستی خستبویە سەر شانی لە پێشەوە، و فەرەح لەگەڵ شاناز و ئەشرەفیش لە پشتیانەوە و من و محمد علیش لە پاڵیاندا چووینە ناو تەلارە شکۆمەندەکەوە بۆ خواردنی نانی ئێوارە.
لەسەر مێزی خواردنەکە، چەند قسەیەك لەنێوان محمد ڕەزا و فەرەحدا کرا. لەو قسانە محمد ڕەزا وتی فەرمان دەدەم بە سەفارەتی ئێران لە پاریس تاوەکو کەلوپەلی پێویستی ئاهەنگەکە فەراهەم بکەن و بینێرنەوە بۆ ئێران.
بڕیار درا فرەح هەرچی دەوێت لە پاریس بیکڕێت و وەصڵی حسابەکانی بدات بە سەفارەت تاوەکو پارەکەی بدەن و پاشان کەلوپەلە کڕدراوەکان بنێرنەوە بۆ تاران.
پاش خواردنی نانی ئێوارە و هەندێك خواردنی دیکەی پاش خواردنی سەرەکی، کاتێك کە بۆ خواردنی قاوە و چای ڕێنوێنی کراین بۆ تەلارێکی دیکە، بە سەرسوڕمانەوە بینیم دوو گۆرانیبێژی ناسراوی ئەو سەردەمانەی ئێران کە خۆشبەختانە منیش زۆر حەزم لە دەنگیان بوو، لەگەڵ گروپێك لە ژەنیارەکانی ڕادیۆی ئێران ئامادەبوون.

ژەنیارەکان بۆ دەربڕینی ڕێز و پێزانین تاوەکو ناو قەدیان نوشتانەوە. ڤیگن گۆرانیبێژی ناسراوی جاز و پوران شاپوری گۆرانیبێژی ناودار هاتنە پێشەوە و دەستی جەنابی خاتو شاژنی دایک، جەنابی خاتو ئەشرەف و خاتو شانازیان ماچ کرد و ڕێز و پێزانینی خۆشیان بۆ من و فەرەح و براکەم دەربڕی.

ئەوان نەیاندەزانی کە ئەو کچە جەستە باریکە، بەو قژە کۆکراوانەی کە لە پشتەوە بەستویەتی و ڕووبەڕوویان وەستاوە تاوەکو کەمتر لە ساڵێکی دیکە دەبێتە شاژنی ولاتەکەیان.

دانیشتین و چای و قاوەیان بۆ هێناین و دەستمان کرد بە خواردنی.

هونەرمەندەکانیش دەستیان کرد بە پێشکەشکردنی بەرنامەکەیان. ڤیگن و پوران شاپوری چەند گۆرانیێکیان پێکەوە وت کە ئێمەیان زۆر خۆشحاڵ کرد.

محمدڕەزا بێ ڕادە حەزی لە مۆسیقا بوو و تاوەکو ئەو کاتەی کە لە ئێران مایەوە هەموو شەوێك بەرنامەی مۆسیقای هەبوو[1].

دواتر لە ساڵی ١٩٦٠ کاتێك کە کاری نۆژەنکردنەوەی کۆشکی نیاوەران دەستی پێکرد، شا فەرمانی دەرکرد کە تەلارێکی تایبەتی سینەمای بۆ نمایشی فلیم و پێشکەشکردنی کۆنسێرت لە کۆشکی نیاوەران دروست بکرێت.

محمد ڕەزا، حەزی لە مۆسیقای جاز بوو و ئەو گۆرانیبێژەی کە حەزی لێ دەکرد (فرانك سیناترا) بوو کە یەکێك بوو لە هاوڕێ زۆر نزیکەکانی خۆیشی.

فەرەح بە مانەوەی زۆری لە پاریس تێکەڵی فەرهەنگی فەرەنسیەکان بووبوو و زیاتر حەزی لە گۆرانیبێژە فەرەنسیەکان دەکرد و ئەو گۆرانیبێژەی کە حەزی لێ دەکرد (ژوداسن)بوو کە دواتر لەسەر بانگهێشتی فەرەح چەندجارێك هات بۆ تاران!

ڕووداوەکانی ئەو شەوە هەرگیز لەبیر ناکەم. ئەگەر بڵێم خۆشترین شەوی ژیانی من بوو هەرگیز زیادەڕەویم نەکردوە. هەڵبەتە هەرگیز خۆشم نەهات لە هەڵسوکەوتەکانی

---

[1] – بە پارەی خەڵکی ئێران بە خەرجێکی زۆر گەورە و پێدانی پاداشتی پوند و دۆلار و فرانك گۆرانیبێژ و ژەنیاری بیانیان بانگهێشت دەکرد بۆ تاران و لە ئاهەنگە تایبەتیەکانی محمد ڕەزای پەهلەوی و فەرەح و ئەندامانی خێزانی پەهلەوی گۆرانیان دەوت و سەمایان دەکرد.

شاژنی دایك و هەڵسوکەوتەکانی دواتری بوونە هۆی ئەوەی کە بۆ هەمیشە خۆمی لێ دووربخەمەوە.

ئەوە ئاشکرایە و هەمووکەس دەزانێت کە من و تاج الملوك هەرگیز نەمان دەتوانی بەیەکەوە بین.

(تاج الملوك) زۆر لەخۆبای بوو و زۆر بەشێوەیەکی بچوك سەیری کەسانی دەورووبەری خۆی دەکرد. زۆر چێژی لەوە وەردەگرت کە قسەکانی لەلای محمد ڕەزا دەڕوات و بە هەڵسوکەوت و جوڵەکانی لەلای هەموو ئەندامانی خێزانەکەی وا خۆی پیشان دەدا کە ئەو ڕۆڵی یەکەم دەبینێت لەناو خێزانی پەهلەویدا!

لەبەر ئەوەی کە ئێستا ئەو لە دنیادا نەماوە و کۆچی دوایی کردوە پێم خۆش نیە لەمە زیاتر لەو بارەیەوە قسە بکەم. بەڵام تەنها دەمەوێت ئەوە بخەمە سەر قسەکانم کە ئەوە تاج الملوك بوو کە سەڵتەنەتی پەهلەوی (بەدەست هێنا). پیاوەکەی ئەو بابەتەی دەزانی و هەر بۆیە پاش مردنی پیاوەکەشی پێی خۆش بوو هەموو خێزانەکەی بەردەوام سوپاسگوزاری بکەن و وەکو هاوسەری ڕەزاشا ڕێزی لێ بگرن و بزانن بەوەی کە ئەو لە چ پێگەیەکدایە.

هەندێکجار کاتێك کە تورە دەبوو تەنانەت دەیوت بە محمد ڕەزا: (ئەگەر باوکت نەبوایە ئێستا تۆ هیچت بەدەست نەبوو!)

تەنها کەسێك کە تاج الملوك خۆشی دەهات لەگەڵیدا جەنابی خاتو ئەشرەف بوو.

بەڕاستی ئەشرەفی بە گیان و بەدڵ خۆش دەویست و هەمیشە لە دەربڕینی خۆشەویستیدا بۆیشی زیادەڕەوی دەکرد.

بەم شێوەیە کچێك کە لە سەردەمی خوێندکاریدا لە پاریس بووە ئەندامی حیزبی تودەی ئێران و لەدژی دەوڵەتەکەی شا خۆپیشاندانی دەکرد و چالاکی هەبوو ئێستا بووەتە دەستگیرانی شای ئێران. کچێك کە تاوەکو چەند ڕۆژێك پێشتر قەدەغە بوو بچێتە دەرەوە و مافی ئەوەی نەبوو بگەڕێتەوە بۆ فەرەنسا ئێستا بە فڕۆکەی تایبەتی و بە جەوازی سیاسی دەگەڕێتەوە بۆ پاریس تاوەکو کەلوپەلی بوکێنیەکەی بکڕێت!

بەڵام بۆچی ئەردەشیر زاهیدی و شاناز دەستپێشخەریان کرد و لەبیری دۆزینەوەی کچێك بوون بۆ ئەوەی ببێتە هاوسەری شا؟

پاش تەڵاقدانی سورەیا و ڕۆیشتنی لە ئێران کە دەوترێت زیاتر بەهۆی دەستێوەردانەکانی خاتو ئەشرەف و شەمسەوە بووە لە ژیانی تایبەتیدا، ئیدی هەریەك لە نزیکیەکانی محمد ڕەزا هەوڵیاندەدا کچێك بۆ هاوسەری محمد ڕەزا بدۆزنەوە و لەم ڕێگەیەوە دەسەڵاتی خۆیان لەلای شا پەرەپێبدەن و بەهێزی بکەن.

داواکاری خاتو شاژنی دایك بۆ ئەوەی ببێتە هاوسەری محمدڕەزا کچێکی خوشکی بوو کە محمد ڕەزا پاش ماوەیەك کە لەگەڵ ئەم کچەدا پەیوەندی هەبوو بەگونجاوی نەزانی بۆ ئەوەی ببێتە هاوسەری و (گیتی خطیر)ی بە سەرمایەیەکی گونجاوەوە نارد بۆ ئیتاڵیا. گیتی دوای هاوسەرگیری فەرەح لەگەڵ محمد ڕەزا هاتەوە بۆ ئێران و ماوەیەکی زۆر پەیوەندی هەبوو لەگەڵ علینقی ئەنصار، سەفیری ئێران لە ئیتالیا و لە خانوویەکی ڕازاوەی چەند دۆنمی لە مهرشاری کەرەجدا دەژیا.

شمسە و ئەشرەف و تەنانەت فاتمە و غلامرەزا هەریەکەیان کەوتبوونە خۆیان تاوەکو بۆ پاشا ژن بهێنن. غلامڕەزا خوشکی ژنەکەی خۆی بۆ پێشنیار کردبوو.

ئەم شتانە پاش هاوسەرگیری کچەکەم، محمد ڕەزا خۆی باسی کردبوون بۆ کچەکەم و هەندێکیشیان فەرەح لە ژنە باوەڕپێکراوەکانی خۆیەوە لەناو کۆشکدا دەیبیست.

لە سەفەرەکەی فەرەح بۆ فەرەنسا منیش ڕۆیشتم لەگەڵی. ئەمە یەکەمینجار بوو کە من سەفەر بکەم بۆ وڵاتێکی دەرەوە. لەو فڕۆکەیەی کە ئێمەی برد بۆ پاریس لەیلی ئەمیر ئەرجومەندی هاوڕێ و هاوپۆلی کۆنی فەرەحیشی تێدا بوو. جەنابی خاتونە شاناز و شەمسە و فاتیمەشمان لەگەڵدا بوون. مهرداد مین باشیان (پهلبد) پیاوی خاتونە شەمسیش هاتبوو.

لەسەر داوای من هاوسەری براکەم، لوییز صمصام الدولە بەختیاری (لوییز قطبی)یش هاتبوو لەگەڵماندا.

لوییز لە خێزانێکی دیار و خانەدان و ڕیشەداری ئێرانی بوو.

ئەسداللە علم دوو نەفری دیکەی لەگەڵدا ناردبووین بۆ ئەوەی کارەکانمان بۆ ئەنجام بدەن. هەردووکیان لە ئیشکەرە لێهاتوەکانی کۆشکی شاهنشاهی و خاوەنی ئەزموونێکی زۆری فراوانی سەفەرەکانی دەرەوە بوون.

مەجید ئەعلم، هاوڕێی محمد ڕەزاشاش بەو فڕۆکەیە هات بۆ پاریس بەڵام ئەو لەوێ جیابوویەوە و ئیدی ئێمە ئەومان نەبینیەوە.

کاتێك پاریسم بینی ئینجا تێگەیشتم بۆچی کچەکەم بڕیاریداوە بۆ هەمیشە لێرە بمێنێتەوە و ئیدی نەگەڕێتەوە بۆ ئێران.

ئەمە ئەو شارە بوو کە ئەحمەد شای قاجار بەهۆی زیاد لەڕادەی خۆشەویستی بۆ ئەم شارە لەسەردەمی سەڵتەنەتیدا ئەوەندە ماوەی مانەوەی درێژ کردەوە لە پاریس تاوەکو تاج و تەختەکەی لەدەستدا.

من و فەرەح پاش شۆڕشی ساڵی ١٩٧٨ کاتێك لە ئێران دەرچوین ماوەیەکی زۆرمان لەم شارەدا گوزەراند.

لە پاریس دوو هاوڕێی دیکەی فەرەح هاتن بۆلامان. یەکێکیان خاتو فەریدە میربابای بوو کە دواتر هاتەوە بۆ ئێران و بووە سەرۆکی نوسینگەی تایبەتی فەرەح. ئەوی دیکەیان خاتو ناهید کلهر بوو، کە ژنێکی زۆر خۆشەویست و شاعیرێکی خاوەن ڕێچکە بوو و لەگەڵ فەرەنسێکدا هاوسەرگیری کرد. ئەگەر هەڵەم نەکردبێت پیاوەکەی ناوی لافرانس (وابزانم ژان لافرانس) بوو.

ئەم ژن و پیاوە گەنجە لە شوقەیەکی نزیك ڕووباری (سین) لە جادەی سین فوژە ژیانێکی سەیر و غەریبیان هەبوو.

(فەرەح) ئەم ناهیدە خاتونەی زۆر خۆشدەوسیت چونکە (ناهید) لە سەردەمی هەرزەکاریدا کاتێك لە تاران دەیان خوێند وەکو فەرەح خوێندکاری قوتابخانەی ژاندارك بوو و پێشینەی هاوڕێیەتیان لە تارانەوە دەستیپێکردبوو و هەردووکیشیان لە کۆلێژێکیان دەیانخوێند لە پاریس.

بەگەیشتنمان بۆ پاریس بڵاوکراوە بەناوبانگەکانی فەرەنسا وەکو سپی و ڕەش، لوسڤار، فیگارو وهیتد کە نازانرێت لە چ سەرچاوەیەکەوە هەواڵی هاوسەرگیری فەرەحیان لەگەڵ شادا بەدەستهێنابوو، بە ڕۆژنامەنوس و پەیامنێرەکانیانەوە خۆیان گەیاندبوویە بەردەم هۆتێلی شوێنی مانەوەمان و بەگرتنی وێنەی فەرەح هەموویان باسی چیرۆکی ژیانی کچێکی ئێرانیان کرد لە پاریس کە پاشا وەکو شاژنی ئێران هەڵیبژاردوە.

وێنەی فەرەح لەسەر لاپەڕەی یەکەمی زۆربەی بڵاوکراوەکانی فەرەنسا جار لەدوای جار بڵاو دەبوویەوە.

دەچوین بۆ هەر شوێنێك هەموو خەڵك ئێمەیان دەناسی و بەو شێوەیەی کە لەلای فەرەنسیە خوێن گەرم و میواندارەکان باوە ڕێزی خۆیان بۆ دەردەبڕین. لەم حاڵەتەشدا گرتنی وێنەی یادگاری بازاڕی گەرم بوو.

بەڕێوەبەرەکانی بەشی کۆلێژی فەرەحیش ئاهەنگێکی تایبەتیان بەو بۆنەیەوە گێڕا و ئێمەیان بانگهێشت کرد و وێنەی یادگاریان لەگەڵ فەرەحدا گرت.

لە فەرەنسادا پێشوازی لە فەرەح و کاردانەوەی هەواڵی هاوسەرگیریەکەی فەرەح لەگەڵ شای ئێران بە شێوەیەك بڵاوبوویەوە کە والێك دەدرایەوە کە گوایە کچێکی فەرەنسی دەیەوێت لەگەڵ پاشایەکی ڕۆژهەڵاتیدا هاوسەرگیری بکات!

سەردێڕ و ناونیشانی هەندێك لە ڕۆژنامەکانم هێشتا لەبیرە. یەکێك لە گۆڤارە بەناوبانگەکانی فەرەنسا نوسیبووی شاژنی سەرزەمینی هەزار و یەك شەوە(!) و وێنەی فەرەحی لەسەر لاپەڕەی یەکەمی گۆڤارەکە دانابوو. (پاری ماچ) کە گۆڤارێکی بەناوبانگی فەرەنسی بوو فەرەحی وەکو بونەوەرێکی ئەفسانەی ناوبردبوو. بڵاوکراوەیەکی دیکە نوسیبووی هاوسەرگیری خوێندکارێکی دانیشتوی فەرەنسا بۆ پاشای ئێران!.

دوو هەفتە لە پاریس بووین هەرچەندە ئێمە بۆ کڕینی جلوبەرگ و پێویستیەکانی بوکێینی فەرەح هاتبووین بۆ پاریس بەلام زۆربەی کاتەکان تەرخان کران بۆ کڕینی کەلوپەلی حەزرەتی خاتونە ئەشرەف و شەمسە و زیاتر لە هەموو کەسیش کەلوپەل و پێویستیان کڕی.

لەگەڵ فەرەح ڕۆیشتین بۆ شوقەکەی و فەرەح بڕێك پێویستی سەردەمی خوێندکاری خۆی وەکو وێنەکانی یادگاری و بەڵگە و شەهادەکانی خوێندن و کتێبەکانی کۆکردەوە و هەرچی کەلوپەلی دیکەی هەبوو هەموو بەخشی بە خاوەنی شوقەکە.

ڕۆژێکیشیان ڕۆشتین بۆ ئارایشگای بەناوبانگی (کارتیە) و فەرەح لەو ئارایشگایەدا ئارایشێکی کورتی ئەنجامدا و داوای کرد لە ئارایشکەرەکانی بۆ ڕازاندنەوەی کاتی

بوكیەكەی، بێن بۆ تاران. لەچەند بازرگانێكی بەناوبانگی وەكو (كریستین دیڤور) جلوبەرگ و پێڵاو و دەستكێش و جلی ژێرەوە و خشڵ و زێڕی كڕی.

هەرچەندە ئێمە بە خەیاڵی خۆمان سەرگەرمی كڕینی كەلوپەل و پێویستیەكانی بوكێنی بووین بەلاّم ڕاستیەكەی ئەوەبوو كە هەمان ئەو دوو كەسەی كە ئەندامی تەشریفاتی وەزارەتی كۆشك بوون و ئەسدالله عەلەم ناردبوونی، كارمەندی ئامادەكاری پێشەكی دەستەی گرێبەستی و بوكێنی لە تاران و كڕینی پێویستیەكانی بوكێنی بوون و ئێمەش ئەم بابەتەمان نەدەزانی.

ئەوان ڕۆژێكیان فەرەحیان برد بۆ فرۆشگایەكی بەناوبانگ لە پاریس، كە تەنها جلی بوكێنی بۆ خێزانە نەجیبزادەكانی ئەوروپا دەدوری، و لەم شوێنەدا ئەندازە و قیاسی فەرەحیان گرت.

لە هەرشوێنێك كە پێویستی بكردایە كە قیاسی فەرەح بگرن دەیانبرد لەگەڵ خۆیاندا و لە هەرشوێنێكیش كە پێویستیان بە كچەكەم نەبوایە خۆیان ئیشوكارەكانیان دەكرد و دەبێت دان بەو ڕاستیەشدا بنێم كە لە كارەكانیاندا زۆر لێهاتوو و ڕاهێنراوبوون.

دوای بوك گواستنەوە و ڕۆیشتنی فەرەح بۆ كۆشكی سعد ئاباد كە تێگەیشتم ئەم دوو كەسە واتە صاحب ئەختیار (كە دواتر بوو بە سەرپەرشتی كۆشكەكانی سەڵتەنەتی و سەرۆكی گشتی خزمەتكارەكانی شاهنشا) و (فەریدونی) كە پێشتر بەرپرسی ئەنجامدانی مەراسیمی ڕێكخستنی بوكێنیەكەی سورەیای ئەسفەندیاری بوو، لەم بوارەدا شارەزاییەكی زۆر گەورەیان هەبو. پاش گەڕانەوەمان لە پاریس زۆر بەخێرای ئامادەكاری و بەرگوزاری گرێبەستی هاوسەرگیری ئەنجامدرا و لە ڕۆژی ٢٩ دیسەمبەری ساڵی ١٩٥٩ فەرەح لەناو مەراسیمێكی شكۆمەند و گەورەدا لە كۆشكی گوڵستان شوی كرد بە محمد ڕەزاشا.

لەبەر ئەوەی كە هەندێك قسە لەسەر حەزرەتی خاتونەكان كرا دەبێت بڵێم لەناو خوشكەكانی پیاوی كچەكەم تەنها فاتمە پەیوەندێكی پاك و بێ فێڵ و تەڵەكەی لەگەڵ فەرەحدا هەبوو.

فاتمه یان خوشکی ئەسڵی یان زڕ خوشکی محمد ڕەزا بوو. هاوسەرگیریەکانی زۆر بەختەوەرانە نەبوون. هاوسەری یەکەمی کە ئەمریکێك بوو بەناوی (وینست هیلەر) بەبێ ئەوەی تەڵاقی لێ وەرگرێت بەجێیهێشت و گەڕایەوە بۆ وڵات. هاوسەری دووەمیشی (ژەنراڵ محمد خاتمی) بوو کە پیاوێکی شەریف و خەڵکی ناوچەی ئێمە بوو بەهۆی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەکەی کوژرا و جەستە پارچە پارچە بووەکەشی لە دۆڵێکی پشت سەدی (دز) دۆزرایەوە[1].

خودی فاتمەش، ماوەیەك پێش ئێستا بەهۆی نەخۆشی شێرەپەنجەی سنگەوە لە لەندەن کۆچی دوایی کرد.

من فاتمەم لە ناخی دڵەوە خۆشدەویست.

زۆرجار، نەدەهاتە ناو میوانیەکان و ئاهەنگە تایبەتیەکانەوە و پێی خۆش بوو زۆربەی کاتەکانی خۆی لەگەڵ پیاوەکەی و کوڕەکانی بەسەر بەرێت کە لەناو خانوویەکی ئاساییدا بوون لەنزیك ناوچەی بنکەی هێزی ئاسمانی لە جادەی فەرەح ئاباد. ژنێکی گۆشەگیر و دوورەپەرێز بوو حەزێکی لەڕادەبەدەری بۆ خوێندنەوەی مەسنەوی، گولستان، حافز و کتێبە عیرفانیەکان هەبوو.

هەموو دایکەکان ڕۆڵێکی سەرەکیان هەیە لە ئامادەکاری و ڕێکخستن و ئامادەکردنی ئاهەنگەکانی گرێبەستی و بوکێنی کچەکەیاندا. بەڵام من تەنانەت بچوکترین ڕۆڵم لەم بوارەدا نەبوو بەڵکو بۆ خودی خۆشم بەرپرسەکانی تەشریفاتی

---

[1] – لەبارەی کوژرانی ژەنراڵ محمد خاتمی هەر ئەو کاتە دەوترا ژەنراڵ خاتمی کە پۆستی فەرماندەی هێزی ئاسمانی هەبوو لە کاتی کڕینی چەك و پێویستیەکانی هێزی ئاسمانی بەشێکی زۆر پارەی زۆری وەردەگرت و لەکاتی دابەشکردنی کەلوپەلەکانیشدا! شای هەڵدەخەڵەتاند و فێڵی لێ دەکرد.

پڕوپاگندە بڵاو بوو کە خاتمی لە معامەلاتەکانی کڕینی چەك و تفاقەکاندا شای هەڵدەخەڵەتاند و گیانی خۆیشی هەر لەبەر ئەم تەماعە زۆرە لەدەستدا!

پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی کۆمەڵێك بەڵگە و دیکۆمێنت بەدەست هاتن کە ئەوەیان نیشاندا کە بە فەرمانی خودی محمد ڕەزا کێشەیەك دروستکراوە لەناو باڵی فڕۆکەکەدا بۆ ئەوەی ژەنراڵ محمد خاتمی لەکاتی ڕۆیشتنیدا بکەوێتە خوارەوە و بمرێت و بەو شێوەیەش فڕۆکەکەی کەوتە خوارەوە و مرد!

کۆشکی شاهنشاهی بڕیاریان دەدا کە دەبێت چ جۆرە جلێك لەبەر بکەم و چ خشلێك بکەم بە خۆمدا.

لەفەرەنساوە چەند کەسێك وەکو مصمم و ئامادەکاری بوکێنی و ڕاوێژکاری ئاهەنگەکان هاتبوون بۆ ئێران یەکێك لەوانە ناوی (کلود بلیموند) بوو کە ناوبانگێکی جیهانی هەبوو.

بەرگدروومانی بەناوبانگی جیهانی (کریستیان دیڤور)یش کە خۆی قیاسی فەرەحی کردبوو لە پاریس و نمونەیەکی لە جلەکانی بۆ ئامادەکردبوو دوو کەس لە بەناوبانگترین بەرگدروومانەکانی خۆی ناردبوو بۆ تاران تاوەکو جلی بوکێنیەکانی فەرەح لە تاران تاقی بکەنەوە و بەقیاسی خۆی بیدورن، تاوەکو بەڕاستی بەبێ کەم و کورتی بێت.

ئارایشگەرەکانیش لە (کارتیە) لە پاریسەوە هاتبوون دوو لە ئارایشگەرەکان لە شەوی بوکێنیەکەی فەرەح لەگەڵیدا بوون و دوو ئارایشگەری دیکەی کاتیە کاری ئارایشتی کەسە نزیکەکانی بوك و خوشکەکانی شایان دەکرد.

هەندێك لە خشڵ و زێڕەکان لە خەزێنەی بانکی ناوەندیەوە هێنرابوون تاوەکو لە مەراسیمی ئاهەنگ گێڕانەکەدا سودیان لێوەربگیرێت.

هەڵبەتە ئەم خشڵ و زێڕانە بە بەشێك لە خشڵ و زێڕەکانی سەڵتەنەتی دادەنران و جگە لەو خشڵ و زێڕانەی کە لە گرێبەستەکەی محمد ڕەزا و خێزانەکەی هاتبوون بۆ فەرەح.

هەموو ڕۆژێك، فەرەحیان وەکو بوکێکی بچوك لەسەر کورسێك دادەنا و نمونەی جۆراوجۆری ئارایشتیان لەسەرە تاقی دەکردەوە!

ئەو ناچاربوو هەرچی ئارایشگەرەکان و بەرگدروومانەکان دەیڵێن بەگوێیان بکات و ئەمەش بەشێك بوو لە عادەتی ئەسڵی ئاهەنگەکە.

بەوشێوەیەی کە باسم کرد ئەم دوو کەسە، تایبەت بوون بە ڕێکخستن و ئەنجامدانی ئاهەنگەکان و میوانداریە سەڵتەنەتیەکان لە ناو خانەدانە نەجیبزادەکانی ئەوروپا.

کۆشکی گولستان ئامادەکرا بۆ ئاهەنگی بوکێنیەکە کە بریتی بوو لە کۆمەڵێك کاری هونەری شەخسی و شێوەی معماری سونەتی و پاشماوەی بەنرخی هونەری سەرەتاکانی قۆناغی قاجاری.

فرۆکە تایبەتەکە بەردەوام لەنێوان تاران و پاریسدا لە هاتوچۆدابوو تاوەکو هەموو ئامادەکاریەکان و پێویستیەکانی ئاهەنگەکە فەراهەم بکات.

بۆ من کە پاش مردنی باوکم و دواتریش پاش کۆچی دوایی پیاوەکەم لەبەر ئەوەی بە کەمترین پارە و توانای ئابوری دەژیام و کاروباری خۆم دەگوزەراند ئەم هەموو بێنە و بەرە و خەرجیە قورسە جێگەی قبوڵ کردن و شایەنی باوەڕکردن نەبوو.

بۆنمونە هەندێکجار بەرگدروومانە فەرەنسیەکە لەبیری چووبوو شریتێك بهێنێت لەگەڵ خۆی یان شتێکی ئاساییان بەجێهێشتبوو فرۆکەکەیان دەگەڕاندەوە بۆ فەرەنسا تاوەکو ئەو شتەی بۆ بهێنن!

لەکاتێکیشدا ئەو هەمووشتانە لە تاراندا هەبوون[1]!

من نەمدەتوانی لەبارەی ئەم مەسەلانەوە قسە بکەم وابزانم محمد ڕەزاش گوێی نەدەدا بەو مەسەلانە. بەڕێوەبەرایەتی کاروبارەکان لەدەستی تەشریفاتی کۆشکی شاهنشاهی بوو. هەموو کۆشکیش لە ژێر دەسەتی بەهێزی ئەسەداللەی عەلەم بوو کە من هەمیشە ڕقم لێی بوو.

دڵنیابووم ئەم بەزم و ڕەزم و ئاهەنگە بوکێنیە لە ڕاستیدا ئاهەنگی میوانی شادی سەدان کەسە کە هەریەکە بە جۆرێك لە وەڕێخستنی ئەم میوانیە دەستێوەردانی هەیە.

---

[1] -ئەحمەد علی ئەنصاری (کوڕی خاڵۆی فەرەح) لە کتێبی یاداشتەکانیدا (پاش کەوتن) دەنوسێت: (شەمسە پەهلەوی) بۆ هاتوچۆی سەگەکانی فرۆکەکانی هێزی ئاسمانی بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی سەگەکانی ببەن بۆ فەرەنسا و بەرتانیا تاوەکو لەوێ ددانیان پاك بکەنەوە یان بیانشۆن و بۆیاخیان بکەن!

خێزانی پەهلەوی بە داراییەکانی وڵاتی ئێران جلوبەرگ و خواردن و پێویستیەکانیان بە فرۆکەی بوئینگی ٧٤٧ی هێزی ئاسمانی ڕاستەوخۆ لە پاریس و ڕۆما و فرانکفۆرتەوە دەهێنا بۆ تاران..

*ئەگەر خەرج و سەرفکردن لەسەر گیرفانی میوان نەبوو ، بوون بە حاتەمی تەی ئاسان دەبوو!*

(فەرەح)یش هەندێکجار بەتایبەتی و بەجیا پێی دەوتم کە زۆر بێزارم لەم هەموو بێ سەروبەری و مەسروفە زۆرە لەکاتێکدا کە ملیۆنەها کەس لەم وڵاتەدا نانی پێویست نیە بخۆن و بەدەست ئازار و مەینەتیەوە دەناڵێنن کەچی ئەمانە بە هەزاران دۆلار بۆ بوك گواستنەوەیەکی ئاسای بە فیڕۆ دەدەن.

بەهەرحاڵ، فەرەح تەحەمولی نەکرد و ئەم بابەتەی بە زمانێکی نەرم و جیاواز گەیاندە محمد ڕەزاشا.

جەنابی حەزرەت وتبووی پێی دەبێت بوکەکە لە ئاستی پاشای وڵاتێکی کۆنی وەکو ئێراندا بێت، هەموو جیهان گرنگی بەم ئاهەنگە دەدەن من ناتوانم وەکو کەسێکی پاشکۆ و ڕەعیەت هاوسەرگیری بکەم!

ئەم قسەیە لۆژیکی بوو. هەرچەندە ئێمە توشی شۆك بووبووین بەڵام لە شەوی ئاهەنگەکەدا کاتێك میوانە بیانی و سەفیرەکان و نوێنەرە سیاسیەکانمان بینی تێگەیشتم بەو شێوەیەی کە محمد ڕەزا وتبووی بیانیەکان حەز دەکەن بەشداری بکەن لەو ئاهەنگە سەڵتەنەتیانەی کە بەجوانترین شێوە دەڕازێنرێنەوە.

تەلاری کۆشکی گولستان نوقمی ڕووناکی بووبوو، هەموو شوێنێك شکۆمەند و ڕازاوە بوو، هەموو نوقمی شادی و خۆشی بووبوون بەڵام من لەناخمەوە هەستم بە نیگەرانیێکی قوڵ دەکرد. چونکە ئەم ئاهەنگە و لەوانەیە ڕازاوەتر لەمەش بۆ فەوزیە و سورەیا ئەنجامدرابوو و بەڵام ئێستا لە تەنیای و غەریبیدا دەژیان. ئایا هەمان شێوە کە ئەو پەندە ناسراوە دەڵێت: (تاوەکو سێ نەوترێ یاری ناکرێ!) سێیەمین هاوسەرگیری محمد ڕەزاش بە تەڵاق کۆتایی نایێت؟

ئەم نیگەرانیەی من تاوەکو لەدایکبوونی یەکەمین منداڵی فەرەح هەمیشە لەگەڵمدا بوو. فەرەح لە هەمان مانگی یەکەمی هاوسەرگیری لەژێر چاودێری پزیشکی تایبەتی ژنان، دکتۆر جهانشاه صالح، بوو.

دکتۆر (جهانشاه صالح) سەرۆکی نەخۆشخانەی ژنان بوو. پزیشکێکی باش و پسپۆڕ بوو و ماوەیەکیش وەزیری تەندروستی بوو. شا بەتایبەتی پاش لەدایکبوونی ڕەزا زیاتر پەیوەندی لەگەڵ ئەو دکتۆردا بەست و پشتیوانی لێ کرد.

جهانشاه صالح برایەکیشی هەبوو کە لەنزیك زانکۆی تاران دەژیا و بەوە ناسرابوو کە دژایەتی شا دەکات. بەلاّم جهانشاه صالح بەهۆی فراوانی دەسەلاّتی خۆیەوە سەرکەوت بەوەی بکەوێتە دووی براکەی (الهیار) و پاشان لەدەستی ساواك بیپارێزێت.

لە سەرەتای مانگی فێبریوەری ساڵی ١٩٥٩ دکتۆر صالح کە هەموو ڕۆژێك فەرەحی دەبینی هەواڵیدا فەرەح سکی پڕە. ئەم هەواڵە زۆر دڵخۆشکەر بوو، بەلاّم من هێشتا هەر نیگەران بووم. شا کوڕی دەویست هیچ شتێك جگە لە منداڵێکی کوڕ ئەوی ڕازی و خۆشحاڵ نەدەکرد.

لە حەوتی نۆڤەمبەری ١٩٦٠ یەکەمین کوڕی فەرەح و محمد ڕەزا لە نەخۆشخانەیەك کە لە جادەی مەولەوی تاران بوو لە باشوریترین خاڵی تاران لەدایکبوو.

هەموومان بە لەدایکبوونی ڕەزا سەرمەست و خۆشحاڵ بووین. لە هەمووکەس زیاتر من و فەرەح خۆشحاڵ بووین، چونکە دەمزانی پاشا بۆ بەردەوامی سەڵتەنەتی پەهلەوی پێویستی بە جێگر و وەلیعەهد هەیە.

محمد ڕەزا بەهۆی نەبوونی منداڵی کوڕەوە کەوتبوویە ژێر فشاری خێزانەکەیەوە بۆ ئەوەی جێگرێك بۆخۆی دابنێت. پاش کۆچکردنی علی ڕەزا ماوەیەك قسە لەسەر ئەوە بوو کە وەلیعهد و جێگر غلامرزا بێت بەلاّم شا لە ناخەوە حەزی لەم کارە نەبوو.

لەدایکبوونی ڕەزا شۆڕشێکی لە کۆشکی سەڵەتەنەتیدا دروستکرد. شا لەخۆشحاڵیدا نەیدەزانی چی بکات. (ڕەزا) هەڵبژێردراوی خاتو تاج الملوك بوو و دەیویست ناوی پیاوەکەی زیندو بکاتەوە. محمدڕەزاش دەیوت: کوڕەکەم دەبێتە ڕەزاشای دووەم، بەلاّم هەڵبەتە دیسانەوە یاری ڕۆژگار ئەو ڕێگەیەی پێ نەدا کە ئەو خەونەی محمد ڕەزا ببێتە حەقیقەت و بە سەرهەڵدانی شۆڕش لە ئێران محمد ڕەزا ناچار بوو ئێران بەجێبهێڵێت و ناچاربوو تاج و تەختی ئێران بەجێبهێڵێت و ڕەزاش هەرگیز نەیتوانی تامی سەڵتەنەتی ئێران بچێژێت.

من داستان و بەسەرهاتی ناسراوی خۆم لەگەڵ محمد ڕەزا و هاوسەرکردنی کچەکەم زۆر بەکورتی باس کرد و تاقەتی ئەوەم نەبوو کە هەندێك لە وردەکاری و ناپێویستیەکان باس بکەم.

بۆ خوێنەران ئەم بیرەوەریانە چ سودێکیان هەیە کە من باسی هەموو ئەو جۆرە خواردنانە بکەم کە لە کاتی ئاهەنگی بوك گواستنەوەکەدا ئامادەکرابوون لەگەڵ یەك بەیەکی ئەو کەسانەی کە میوانداری کرابوون.

ئەم کورتەشم بۆ ئەوە باسکرد تاوەکو وەڵامێك بێت بۆ ئەو بابەتە ناڕاستانەی کە لە هەندێك کتێبەکاندا بلاۆکراوەتەوە پاش ڕووداوی ١٩٧٨.

لە هەندێك لە بیرەوەری و یاداشتەکاندا وابلاۆکراوەتەوە کە تەنها لەبەر ئەوە سوکایەتی کراوە بە کچەکەم کە هاوسەری شای ئێران بووە.

ئایا ئەگەر فەرەح لەگەڵ خاوەن کارگەیەك، سەرمایەدارێك، مامۆستایەك یان فرۆکەوانێك یان ئەندازیارێکی سادەدا هاوسەرگیری بکردایە دیسانەوە بابەتی درۆزنانەیان لەبارەی کاتەکانی مانەوەی لە پاریس بۆ دەنوسی.

ژەنراڵ (حسین فردوست) لە کتێبی بیرەوەریەکانی خۆی سەبارەت بە کچەکەم تۆمەتی دروستکردوە و قسەی ناڕاست و دروستی داوەتە پاڵی. نوسیویەتی فەرەح کچێکی هەژار و حەزی زۆری بەلای چەپ و کۆمۆنیستدا هەبوو.

ئێمە هەرگیز نەمان وتوە دەوڵەمەندبووین بەوپەڕی جێگەی فەخر و شەهامەتەوە باسی هەلومەرجی سەختی ئابوری ژیانی خۆم کردوە پاش مردنی باوك و دواتریش هاوسەرەکەم.

بوونی حەزی سیاسی لە گەنجیش تایبەتە بەو سەردەمەی تەمەنەوە بەتایبەتی لە ڕۆژانی سەردەمی زانکۆییدا و لە هەموو شوێنێکی دنیا خوێندکاران و گەنجەکان ئەم جۆرە حەزەیان هەیە.

تاوەکو ئێرە بەڕێز فردوست خالێکی سەیری نەوتراوی نەوتوە بەحسابی خۆی ئەو عەیبەی کە تاشیویەتی لەبارەی هەژاریەوە خۆ خۆیشی بەدەست هەژاریەوە دەینالاَند و پاش ناسراوی لەگەڵ محمد ڕەزا نانێکی تێری خوارد و پێستی تەڕبوویەوە!

بەڵام نوسینی بابەتی تۆمەت دروستکردن لەبارەی شێوەی ناسینی فەرەح لەگەڵ ئەردەشیری زاهیدی و دواتر ناساندنی فەرەح لەڕێگەی ئەردەشیری زاهیدیەوە و ناوبردنی کچەکەم بە ناوی (فەرەح حصارك) دەرخەری قولاّییەکە لە پیسی و نمەك حەرامی لەکاتێکدا کە دەهات بۆلای فەرەح لە دوورەوە پێیەکانی خۆی جووت دەکرد

و دەستی خۆی وەکو دەربڕینی ڕێزێك بەرز دەکردەوە و پاشان دەهاتە پێشەوە دەستی کچەکەمی ماچ دەکرد.

ئەمڕۆ کە لە غەریبیدام و دوور لە نیشتیمانی خۆم ئەم یادگاریانە دەهێنمەوە بیر خۆم، بێ ئیرادانە لەخۆم دەپرسم کە ئایا شادی و خۆشحاڵی ئەو ڕۆژە لە بیستنی هەواڵی خوازبێنی محمد ڕەزا بۆ کچەکەم لەڕاستیدا نرخ و بەهای خۆشیکردنی هەبوو؟

ئایا بوون بە هاوسەری شای وڵات و بوون بە خانمی یەکەمی مەملەکەت بەڕاستی بە خۆشحاڵی و خۆشبەختی دادەنرێت؟

هەموو تەمەن لە قەید و بەند و لەژێر چاودێریدا بەسەر بردن، بە بەرنامەی داڕێژراوی شەوانە هەستیتەوە و بە بەرنامەی پێشتر دیاریکراو کاتژمێرەکانی ڕۆژانە کۆتایی پێبهێنیت ئایا بە ڕاستی ئەمە بە خۆشحاڵی و خۆشبەختی دادەنرێت؟

هەموو کەس وابیری دەکردەوە کە فەرەح بەهۆی سکپڕبوونی و کوڕ بینینیەوە بووتە شاژنی خۆشبەختی ئێران، بەڵام خودی خۆی لێکدانەوەیەکی دیکەی هەبوو ڕۆژێکیان زۆر بەنهێنی پێی وتم:

(من بۆ ئەم خێزانی پەهلەوییە حوکمی مانگایەکم هەیە کە گوێرەکەیەکی بووبێت)[1]

---

[1] –(صاحب ئەختیار) پێشکەشکار و پیاوی باوەڕپێکراوی محمد ڕەزا شا لە کتێبی یاداشتەکانی خۆی کە لە لەندن بڵاوکراوەتەوە نوسیویەتی: (محمد ڕەزا چەند ساڵێك پاش هاوسەرگیری لەگەڵ فەرەح عاشقی سوفیالۆرینی ئەستێرەی ئیتاڵیا بوو.)

بەڵام وتویانە:

(دستت چو نمی رسد به بی بی          دریاب کنیز مگبخی را!)

ڕەزاشا پرۆفیسۆر (تسە) نەشتەرگەری بەناوبانگی بانگهێشت کرد و بۆ ئەوەی نەشتەرگەرێکی جوانکاری ئەنجام بدات بۆ فەرەح ئەویش بە کەمێك دەستکاری بە نەشتەرگەری پلاستیکی سەر گۆناکانی فەرەحی وەکو شێوەی سۆفیالۆریینی ئیتالی لێ کرد!

پرۆفیسۆر (تسە)ش پارەیەکی زۆری وەرگرت بەرامبەر بەوەی کە هەندێك سەر گۆناکانی فەرەحی خستەڕوو!

بۆیە محمد ڕەزا هەرگیز فەرەحی بەچاوی مرۆڤ سەیر نەدەکرد، بەڵکو وەکو دەزگایەك سەیری دەکرد کە چێژی پێ ببەخشێت!

ئەمە کارێکی داپۆشراو نیە و هەمووکەس دەزانێت کە محمدڕەزا و فەرەح بەهۆی ناسینێکی عاشقانەوە پێکەوە هاوسەرگیریان نەکرد.

محمد ڕەزا بەشوێن ژنێکی خاوەن کەسایەتی و لە شێوەی تایبەتمەندی فەرەحدا دەگەڕا تاوەکو لەگەڵیدا هاوسەرگیری بکات و ببێتە خاوەنی کوڕێك لێی.

کچەکەشم لەوتەمەنەدا خوازیاری فراوانخوازی خۆی بوو و پاش ناسراوی و ناسینی (شا)ش بەهۆی ئەو حەزی پێشوو و (دڵیەوە!) خۆی خواستی لەسەر بوو تاوەکو ببێتە شاژنی ئێران.

پەندێکی پێشینانی بەناوبانگی ڕوسی هەیە کە لەبراکەمەوە بیستومە دەڵێت: (بۆ بەدەستهێنانی شتێکی گەورە دەبێت شتی گەورەتر لەدەست بدەیت!)

کاتێك پاش سەرکەوتنی شۆڕش ئایتوالله خلخاڵی سەرۆکی دادگای گشتی شۆڕش بڕیاری دەستگیرکردنی شا، فەرەح و منداڵەکانی دەرکرد ئەفسوس و خەمی زۆرم خوارد کە بۆچی لە ساڵی ۱۹۵۹ دژی ئەو هاوسەرگیریەی فەرەح و محمدڕەزا نەوەستامەوە.

هەندێکجار کاتێك کە سەرزەنشتی خۆم دەکەم هەندێك لە نزیکەکانم پرسیار دەکەن کە ئایا دڵنیایت کە ناڕەزابیونی تۆ دەبووە ڕێگر لەو هاوسەرگیرییە؟

جارجارێك کە ژنان و پیاوانی زۆر پیر دەبینم کە پاش بەسەربردنی تەمەنێکی دوورودرێژی ژیان لە گەڵ یەکتریدا لە لێواری ڕووبارێك یان قەراغ دەریاچەیەك و یان مەسبەحێکی باخێکدا خەریکی وردکردنی پارچە نانێکن و خواردن دەدەن بە ماسی و باڵندەکان لەخۆم دەپرسم ئایا ژیانی فەرەح لەناو چوارچێوەکان و سیمە دڕکاوی و دیوارە بەرزەکانی کۆشکی نیاوەران و سعد ئاباد و لەژێر چاودێری شەو و ڕۆژی پاسەوانەکان خۆشبەختر بوو یان ژیانێکی ئارام و سادەی سەدان ملیۆن مرۆڤ لەم کونج و کەلەبەرانەی جیهاندا؟

لە جیهاندا تەنها خۆشەویستێکم هەبوو ئەویش کچەکەم بوو. کچێك کە بە زەحمەت و ماندووبوون گەورەم کرد، بەڵام ئێستا دڵنیا نیم کە ئایا کچەکەم توانی چێژی ڕاستەقینەی ژیان بە هەمان ڕادەی کچێکی لادێی یان کچێکی چینێکی ناوەندی شار ببینێت یان بەپێچەوانەوە.

من نەوەکانم زیاتر لە ڕۆحم خۆش دەوێن بەڵام ئێستا دڵنیانیم لەبەر ئەوەی کە ئەوان منداڵی شا بوون خۆشبەختر بوون لە منداڵی کەسێکی ئاسای.

نایشارمەوە ئەو پەیوەندیە ئاساییەی کە لەنێوان زاوایەك و خەسویەکدا هەیە هەرگیز لەنێوان من و محمد ڕەزادا بوونی نەبوو.

من هەمیشە ئەرك بوو لەسەر شانم کە دەبێت زاواکەم بە جەنابی حەزرەتی گەورە بانگ بکەم و بەردەوام ئاواتم دەخواست بۆ ئەو خەسوانەی کە لەگەڵ زاواکەیاندا بە دڵپاکانە و گاڵتەوە قسەی خۆش دەکەن و بە زەردەخەنەوە باس و خواست دەکەن.

ئەو کەسانەی کە لە نزیکەوە من دەناسن زۆر باش ئاگادارن کە چەند پەیوەندیم بە لایەنی عیرفانیەوە هەبووە.

بەهیچ شێوەیەك هاوشێوەیەك و خاڵێکی هاوبەش لە نێوان تایبەتمەندی ئەخلاقی من و ئەو ڕازاوەیی و زرق و برقەی ژیانی سەڵتەنەتی نەبوو و هەرگیزیش تاوەکو ئەو ڕۆژەی کە ئێرانم بەجێهێشت نەمتوانی قورسی ژینگەی کۆشك هەزم بکەم و قبوڵی بکەم.

هەڵبەتە فەرەح پاش لەدایکبوونی ڕەزا پێگەیەکی باشتری پەیدا کرد و کەم کەم توانی زاڵبوونی خۆی بەسەر کاروبارەکانی دەوروبەری شاهنشای بسەپێنێت و جێگە و پێگەی خۆی بەهێز بکات. ئەو هەرچەندە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا (متمانەی) تایبەتی خۆی پەیدا کرد، بەڵام دڵنیام بەو شێوەیەی کە خۆی پیشان دەدا، هەرگیز خۆشبەخت نەبوو (هەرچەندە هەرگیز کێشە و خواستەکانی ژیانی هاوسەرگیری خۆی لەگەڵ مندا باس نەدەکرد بۆ ئەوەی بێزار و نارەحەت نەبم و نەکەومە ژێر کاریگەریەوە).

پاش ڕەزا، فرحناز، علی ڕەزا و لیلا لەدایکبوون و فەرەح هەموو خۆشەویستی و سۆزێکی لەنێوان منداڵەکانیدا دابەش کرد.

منیش گرنگیم بە هیچ شتێك نەدەدا و هەموو دڵم خۆشەویستی نەوەکانم پڕیان کردبوویەوە و هەوڵمدەدا بەشێوەیەکی ڕێکوپێك و لەوانەشە هەموو ڕۆژەکانی کاتی خۆم لەگەڵ نەوەکاندا دەگوزەراند.

**هیوادارم توانیبیێتم بە باشی باسی ڕووداوی هاوسەرگیری کچەکەم لەگەڵ محمد ڕەزادا کردبێت. هەموو ڕووداوەکان بەم شێوە سادەیە بوو.**

**ئەو کەسانەی کە لە کتێبەکانی خۆیان قەڵەمسواوی دەکەن و داستان و بەسەرهاتی سەیر و غەریب باس دەکەن، یان قین لەدڵ و ڕقاوین یان هیچ زانیارێکیان نیە.**



فەوزیە و محمد ڕەزا شا ساڵی ١٩٤٨



ئەردەشیر زاهدی، فەرەح دیبا، فەریدە دیبا لەکاتی دەستگیرانی




تاج م ملوك دایکی محمد ڕەزا شا بە پیری



فریدە دیبا و محمد ڕەزا شا و فەرح دیبا لە کاتی دەستگیرانی



ثورەیا خێزانی دووەمی محمد ڕەزا شا



فەوزیە خێزانی یەکەمی محمد ڕەزاشا کە خەڵکی میسر بوو



فەرەح لەکاتی کڕینی جلی دەستگیرانی لە فەرەنسا



تەیمور بەختیار یەکەم سەرۆکی دەزگای ساواک



علی ڕەزا پەهلەوی



فرح پەهلەوی لەناو قوتابیانی زانکۆدا لە فرنسا ساڵی ١٩٦٦



محمد رەزا شا و سورەیای هاوسەری دووەمی

# ژیانی شاهانه

محمد ڕەزا وەکو هەموو پیاوانی دیکە خاوەنی ژیانی تایبەتی خۆی بوو، ئێمەش ئەوەمان دەزانی. لەناو بازنەی هاوڕێ تایبەتیەکانی خۆشەویسترینیان ئەسداللە علم، ئیرنست پرون و هۆشەنگ خان دولو بوون.

ژمارەی هاوڕێکانیش دەگۆڕان. هەندێکجار بۆ چەندین مانگ و یان چەندین ساڵ کەسانی وەکو دکتۆر حاجبی دەهاتە ناو بازنەکەوە و هەندێکجاریش ژمارەیان کەم دەبویەوە. بەلأم کەسانی وەکو هۆشەنگ خان دولو لە هاوڕێ جێگر و هەمیشەییەکانی بوو.

پاش هاوسەرگیری فەرەح لەگەڵ محمد ڕەزا کە هێشتا چەند مانگێك لە ڕۆیشتنی فەرەح بۆ کۆشکی سعد ئاباد تێنەپەڕی بوو دکتۆر جهانشاه صالح هەواڵی سکپڕبوونی کچەکەمی ڕاگەیاند.

کۆمەڵە کۆشکەکانی سعد ئاباد لە سەردەمی ڕەزاشادا دروستکرا بوون و هەرچەندە هەندێك لەبیناکانیشی وەکو کۆشکی سەوز بە شاکارێکی هونەری دادەنران، بەلأم لەڕوانگەی هۆکاری تازەگەری ئەمڕۆییەوە مەسەلەی هەواگۆڕکێی و فێنك کەرەوەی کەمیان تێدا بوو.

لە هەمووی گرنگتر دەوترا ئەم بینیانە لەبەرامبەر ڕووداني بومەلەرزە خۆیان ناگرن کە وەکو دەوترێت تاران لەسەر هێڵی بومەلەرزەیە و هەمیشە ئەگەری ئەوەی هەیە بومەلەرزە لێی بدات.

بۆیە محمد ڕەزا بڕیاریدا شوێنی تازە بۆ خۆی و خێزانەکەی دروستبکات تاوەکو منداڵەکانی لە شوێنێکی باشتردا بژین[1]!

ناوچەی کۆشکی سعدئاباد لە باشوری زنجیرە شاخەکانی ئەلبورز دەیڕوانی ڕووە شاری تاران.

کاتێك لە جادەکانی کۆشك، کە بە دوو ڕیز درەخت بەرەو ناخی ئاسمان ڕۆچووبوون، پیاسەکەم دەکرد دەچووم بەناو وەهم و خەیاڵدا و بەبێ ئاگایانە دەکەوتمە بیری ساڵانی ڕابردوو و ئەو ڕۆژە تاڵانەی خۆمم دەهاتە پێش چاو کە لەناویاندا بووم و هەرگیز باوەڕم نەدەکرد من کە سەردەمێك شاگرد و بەردەستی بەرگدروومانی خاتو شەرەفی بووم، ئێستا دایکی شاژنی ئێرانیم.

هەندێکجار کاتێك لەسەر کۆشکە بەرزەکانی سعد ئابادەوە سەیری درەوشانەوەی گۆڵپەکانی شەوانی تارانم دەکرد و سەیری ئەو دیمەنە جوانانەم دەکرد زۆر خەمبار دەبووم کە پیاوەکەم بە گەنجی ڕۆیشت و بە زیندووی نەما تاوەکو ببینێت چۆن خێزان و منداڵەکەی خۆشبەخت بوون.

دەکەوتمە بیری ئەو ڕۆژانەی کە لە ششکلان لە تەبریز لە ماڵێکی زۆر بچوك لەگەڵ خوالێخۆشبوو خەسوم لەو پەڕی کەم دەستی و هەژاریدا ژیانمان دەگوزەراند.

یەکێك لە تەلارە شوشەییەکان کۆشکی سپی بوو کە ڕێك دەیڕوانی بەسەر مەلەوانگەیەکی گەورەدا کە دەوری مەلەوانگەکەش پڕ بوو لە پەیکەری جوان و گەورە کە واپێدەچوو ئەو پەیکەرانە لە حاڵەتی پاسەوانی کردنی کۆشکەکەدان.

لەهەندێك شەوی جوان و سەرنجڕاکێشدا کاتێك کە مانگ پڕ دەبوویەوە، بە جوانی ئارامی خۆیەوە لەلابەلای لق و گەڵای درەختە بەرزە و چڕەکانی سعد ئاباد،

---

[1] - تێبینی بکەن بزانن خاتو دیبا چی دەڵێت:

دەڵێت: (محمد ڕەزا بڕیاریدا شوێنێکی تازە لە (کۆشکی نیاوەران) بۆ خۆی و خێزانەکەی دروستبکات تاوەکو منداڵەکانی لە شوێنێکی خۆشتردا بژین!) محمد ڕەزا کۆشکی سعد ئابادی بەو پارکە فراوانە و شوێنە زۆرە و کۆشکە گەورانەوە نەدەویست! لەکاتێکدا کە خەڵکی هەژار لە ناو شوێنی کورە و کولانە و گەوڕ و کێڵەکاندا دەژیان و زۆرینەی خەڵکی بێ بەش بوون لە سەرپەنایەك.

تیشکەکانی دەهاویشتە ناو دەریاچەکەوە، تیشکە زێڕینەکانی خۆی دەدرەوشاندەوە، منیش لەو مانگەشەوەدا نەرم و لەسەرخۆ پیاسکەم دەکرد و ورد دەبوومەوە لە ڕووخساری ئەو پەیکەرانەی کە لەسەر نمونە کۆنەکان دروستکرا بوون و بێ ئاگا ئەو بیرکردنەوە دەهات بە مێشکمدا کە ئەم پەیکەرانە هەمووشتێکی ئەم کۆشکە و ڕووداوەکانیان بینیوە بەڵام بێ گیانن و مۆری بێدەنگیان لە لێویانداوە و توانای قسەکردنیان نیە تاوەکو نهێنیەکانی کۆشکی سعدئاباد باس بکەن.

من بێ ڕادە کۆشکی سعد ئابادم خۆش دەویست و کاتێکیش کچەکەم و محمد ڕەزا زانیان من ئەو کۆشکەم خۆش دەوێت شوێنێکیان بۆ تەرخان کردم بۆ ئەوەی بتوانم هەرکاتێك بمەوێت لەوێ بمێنمەوە.

هەڵبەتە پاش هاوسەرگیری کردنی فەرەح لەگەڵ محمد ڕەزا من ماڵێکی باخداری باشم لە هەمان نزیکی کۆشکی سعد ئاباد گرت. ئەمانە ژمارەیەك خانوو بوون موڵکی محمد ڕەزا بوون و لە دەوروبەری سعد ئاباد دروستکرابوون. ئێستا نازانم ئەو خانووانە چارەنوسیان چیان بەسەردا هاتووە و کەوتونەتە دەست کێ؟

لەبەر ئەوەی کە زیاتر دڵم بە سعد ئاباد خۆش بوو بەردەوام بەهۆی قسەکردن لەگەڵ خزمەتکارە کۆن و پیرەکان و هەندێك لە ڕیش سپیەکانی ناوچەکەوە مێژوویەکی کورتی کۆشکەکانم بەدەستهێنا و لەگەڵ ئەوەشدا تێگەیشتم کە ڕەزاشا پاش دروستکردنی کۆمەڵە کۆشکەکانی سعد ئاباد بە یارمەتی ئەندازیارە ئەڵمانیەکان ویستویەتی لە ئاراستە و مەسیری دەربەندەوە ڕێگەیەکی گەورە هەڵکەنێت لەتارانەوە بۆ باکوری وڵات.

دواتر فەرەح کۆمەڵە نەخشە و بەڵگەیەکی پیشاندام کە لەسەردەمی سەڵتەنەتی ڕەزاشا بەجێمابوون. ئەم بەڵگە و نەخشانە ئەوەیان دەخستەڕوو کە ڕەزاشا ویستویەتی هەموو ناوچەکانی باشوری ئەلبورز کە دەڕوانێت بەسەر شاری تاراندا بکاتە دارستان و جەنگەڵی گەورە.

نەخشەی دروستکردنی ئەو تونێلەشی پیشاندام کە ئەندازیارە ئەڵمانیەکان دەیانویست دروستی بکەن هاوشێوەی ئەو ڕێگا گەورە شاخاویانەی نێوان فەرەنسا و سویسرا بوون، و مەبەستێکی تەواو هەبوو بۆ دروستکردنیان بەڵام مەسەلەی

داگیرکاری ئێران و ناچارکردنی هەڵهاتنی ڕەزاشا بۆ دەرەوەی وڵات هاتە پێشەوە و ئەم نەخشە و پلانە وازی لێهێنرا.

سروشتی سعد ئاباد لە هەموو ئێراندا سروشتێکی تایبەت و جیاوزە.

سەرچاوە کانیەکان لە کونج و کەلەبەری کەناری شاخەکە دەهاتنە خوارەوە کە ئاوی پاك و سازگار بوون. کاتێك نەسیمی نەرم لە نێوان گەڵا و لقی درەختە چڕەکانی سعد ئاباددا دەیدا لە مرۆڤ وەکو ئەوە بوو قوماشێکی نەرمی ئاوریشمی بهێنن بەسەر دەموچاوتدا.

ئەو هەوا و کەشە وەکو بڵێی تامی هەبوو. تامێکی تێك ئاڵاو لەگەڵ بۆنی هەموو جۆرە گوڵ و ڕێحانێك من دەمی خۆم دەکردەوە دەمویست هەرچی هەوای سعد ئاباد هەیە هەڵیمژم!

کاتێك کە هەوا هەڵی دەکرد دەنگێکی ڕۆح بەخش بەهۆی لەرینەوەی گەڵاکانی سورە چنارەکانەوە دروست دەبوو کە جوانترین دەنگ بوو کە دەکرا گوێی لێ بگریت.

خوالێخۆش بوو (ڕەحیم هیراد)، کە زۆرترین تەمەنی خۆی لەگەڵ ڕەزاشا بەسەر بردبوو و سەرۆکی نوسینگەکەی بوو، باسی بۆ کردم چۆن ڕەزاشا بە کڕینی باخەکانی سعد ئاباد و گەیاندنیان بەیەك ئەم کۆمەڵە جوانانەی دروستکردوە.

کۆشکەکان و پارکی سعد ئاباد لەماوەی ساڵەکانی نێوان ١٩٢١ و ١٩٣٩ هەنگاو بە هەنگاو دروستکران. پێش ئەمەش قاجاریەکان باخ و کۆشکێکی شێوە فەرەنسیان هەبوو کە هاوینان بۆ پشودان و کات بەسەربردنی خۆش سودیان لێ وەردەگرت. ئەم کۆشکە هێشتا هەر لە حەوشەکەی کۆشکی سعد ئاباددا مابوو و بە هەمان شێوەی کۆن مابوویەوە بەڵام چۆڵ بوو.

ڕەزا شا، لەناو ئەم کۆمەڵە باخەدا بۆ هەریەکە لە منداڵەکانی کۆشکێکی سەربەخۆی دروستکردبوو. ڕەزاشا باوکێك بوو کە خۆشەویستێکی زۆری هەبوو بۆ منداڵەکانی!

دواتریش لە سەردەمی مانەوەی فەوزیە لە ئێران و لەدایکبوونی شاناز کۆشکێکی تازە، بەڵام بچوکتر، بە فەرمانی محمد ڕەزا بۆ جەنابی خاتو شانازیش دروستکرا.

نوسینگەی کارکردنی ڕەزا شا لە کۆشکی مەرمەرە لە ناوەندی شاری تاران، لە جادەی سپە بوو. بەڵام ڕەزاشا نوسینگەیەکی کارکردنی بچوکتری هەبوو لە کۆشکی

سعد ئاباد، لەناو تەلارە سەرەکیەکەدا، پاش کۆچکردنیشی نوسینگەکەی بەبێ دەست لێدراو وازی لێهێنرا.

محمد ڕەزا حەزێکی زۆری هەبوو بۆ پاراستن و چاودێریکردنی پاشماوە و یادگاریەکانی باوکی. کۆمەڵە کۆشکەکانی سعد ئاباد و کۆشکە سەڵتەنەتیەکان جەنگەڵ و دارستانە سروشتی و دروستکراوەکان و باخچە پڕ گوڵەکان جیایان دەکردنەوە لەیەکتر و هەندێکجار ماوەی کۆشکێك لەگەڵ کۆشکێکی دیکە زیاتر لە کیلۆمەترێك بوو. بۆیە، هەمووکەس لە کۆشکەکەی خۆیدا بە ئازادی و بێ سەرە ئێشە دەژیا.

جەنابی خاتو ئەشرەف هەموو شەوێك میوانی ڕێکدەخست و شازادە و ئەندامەکانی دیکەی خێزانی شاهانەش بەبێ چاودێری کردن و دروستبوونی هیچ جۆرە سەرەئێشەیەك بە خۆشی و کەیف و سەفا کاتەکانیان بەسەر دەبرد. لەم میوانیانەدا فەرماندە باڵاکانی سوپا و پیاوە ناودارە سیاسیەکان و هەندێك کاتیش سەفیر و دیبلۆماتە بەناوبانگەکانی وڵاتە گرنگەکان و زۆربەی کاتیش هونەرمەند و گۆرانیبێژ و ژەنیارە بەناوبانگەکانیش بەشداریان دەکرد.

ئەشرەف زۆر حەزی بە لایەنی هونەری بوو و گرنگێکی زۆریشی پێدەدا و لەناو بازنەی هاوڕێ گیانی بەگیانیەکانیدا چەندین هونەرمەند و گۆرانیبێژی بەناوبانگی ئێرانی هەبوون.

من، لە زمانی خۆیەوە بیستم کە لە ڕووداویساڵی ١٩٥١ کاتێك ناچار بوون بە هەڵهاتن بۆ دەرەوەی ئێران و مانەوەیان لە ئەمریکا ویستویەتی لە فلیمێکی ئەمریکی سینەماییدا بەشداری بکات بەڵام کاتێك کە سەفارەتی ئێران لە واشنتۆن ئەم بابەتە ڕادەگەیەنێت بە محمد ڕەزا، ئەویش دوا لە ئەشرەف دەکات واز لەو کارە بهێنێت و ئەو پێشنیارە ڕەفز بکاتەوە لەبەر پاراستنی بەها و متمانەی خێزانی شایانەی ئێران ئەم بیری هونەرپیشەییە لە سەر دەربهێنێت.

دەیوت ئەگەر ئازاد بکرێم لەوەی کە پیشەیەك بۆ خۆم هەڵبژێرم ئەوا بێگومان ڕاستەوخۆ دەبمە ئەکتەر[1].

ئەو کات وەکو ئەمڕۆ ڤیدیۆ و کامێرەی سوك نەبوو کە بتوانرێت هەڵبگیرێن و بگوازرێنەوە، هەندێکجار کامێرامانی دەرهێنەری فلیمەکانمان دەبینی لەسەر بانگهێشتی ئەشرەف دەهاتن بۆ کۆشك بۆ ئەوەی وێنەی ئەشرەف بگرن لەکاتی ئەسپ سواری، پیاسەکردن یان یاری کردن لەگەڵ سەگە خۆشەویستەکەی کە ناوی (فیدل) بوو!

ئەشرەف ئەم فلیم و وێنەگرتنانەی لە کۆشکە تایبەتەکەی خۆی لێدەدایەوە بۆ هاوڕێ و میوانەکانی و ئەوانیش چەپڵەیان بۆ لێدەدا و دەستخۆشیان لێ دەکرد.

لەم دواییانەدا یارمەتێکی زۆر گەورەی چەند هونەرمەند و گۆرانیبێژێکی بەناوبانگی دا و باوەڕی وابوو کە دەبێت هونەرمەندەکان لە ڕوانگەی داراییەوە کێشەیان نەبێت و هیچ جۆرە بیرکردنەیەوەکیان نەبێت بۆ پەیداکردنی پارە بۆ ئەوەی بتوانن بەهەموو شێوەیەك خەریکی کاری هونەری خۆیان بن و هیچ جۆرە بیرکردنەوەیەکی لاوەکی سەرقاڵیان نەکات تاوەکو بتوانن کاری باشتر و گرنگتر ئەنجام بدەن[2]

---

[1] – ئەشرەف ژنێکی ناشیرین و بەدهەیبەت بوو و هەرچەندە ڕووخسار و شێوەیەکی پێویستی نەبوو بۆ ئەوەی ببێتە ئەکتەری فلیمە سینەماییەکان. دەبێت ئەوە بڵێین کە لە ژیانی خۆیدا ڕۆڵی شازادەیەکی چاکەکاری دەبینی.

ئەشرەف لەکاتێکدا کە یەکێك بوو لە قاچاخچیە سەرەکیەکانی ماددە بێ هۆشکەرەکان لەجیهاندا و یەکێکبوو لە ئەندامانی گروپی مافیای جیهانی، بەڵام لە ناو وڵاتدا سەنتەری خزمەتگوزاری دروست دەکرد و لە نەتەوە یەککگرتوەکانیشدا نوێنەی مافی مرۆڤی ئێران بوو!

[2] – یەکێك لەو هونەرمەندانە (بەهروز وثوقی) بوو کە ئەشرەف وەکو خەڵاتێك سینەمایەکی لە جادەی کۆنی شەمێران لە دەوروبەری قلهك بۆ کڕی.

ئەشرەف لە کاتی کردنەوەی فیستیڤاڵی فلیمی تاران (بەهروز وثوقی) بینی و پەیوەندی لەگەڵ دروست کرد!

بەهۆی ئەشرەفەوە بوو پیاوەکەی (مهدی بوشهری پور) توانی ڕێکخراوێکی گەورە و تازەی فلیمسازی لە ئێراندا دابمەزرێنێت و توانی چەندین فلیمی بەناوبانگ لە ئاستی جیهاندا بەرهەم بهێنێت و سینەمای ئێران بناسێنێت بە بازارە جیهانیەکان!

شاژنی دایک، خاتو تاج الملوك (دایکی محمد ڕەزا)ش زۆر سەیر کاری هونەری خۆشدەویست. هەڵبەتە سەلیقەی شاژنی دایك دەگەڕایەوە بۆ چەند دەیەیەکی پێشتر و لەگەڵ سەلیقەی گەنجەکاندا جیاواز بوو. ئەشرەف، محمد ڕەزا و فەرەح مۆسیقای تازەی وەکو جاز و پاپیان حەز لێ بوو بەڵام خاتو شاژنی دایك زیاتر بانگهێشتی هونەرمەند و گۆرانیبێژە سونەتیەکانی دەکرد و هەڵبەتە میوانە هەمیشەییەکەی شەوانەی خاتو شاژنی دایك خاتو (ملوك ضرابی) گۆرانیبێژی کۆن و هونەرمەندی سەرەتای گۆرانیبێژە ژنە ئێرانیەکان بوو[1]!

---

لە ساڵی ١٩٧٥ بەدواوە (بەهروز وثوقی) بووە هاودەمی (ئەشرەف) و زۆربەی کاتەکانی خۆی لە کۆشکی نور لەگەڵ ئەشرەف دەگوزەراند.

هاتوچۆی بەهروز وثوقی لەگەڵ ئەشرەف پەهلەوی بە ئاشکرا بوو و ئەشرەفیش ئەم هونەرمەندە فارسەی لەتەنیشت خۆی دادەنیشاند و لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ باکوری (نور)، وثوقی پاش ناسینی لەگەڵ ئەشرەف و بە پشتیوانی ئەشرەف سەری لەناو سەرەکاندا دەرهێنا و پارە و پولێکی باشی پێکەوەنا.

پشتیوانی ئەشرەف لە بەهروز وثوقی بووە هۆی ئەوەی کە بەهروز لەناو سینەمای ئێراندا دەرکەوێت. زۆرێك لە ڕێکەوتنە سینەماییەکاندا بە ئاگاداری ئەو دەبەستران، دەرهێنەر و ئامادەکارەکانی فلیمەکان کارەکانی خۆیان دەدا بە بەهروز چونکە بەهروز لە کۆشکەوە نزیك بوو و بە ئاسانی دەیتوانی لەو ڕێگەیەوە کارەکان ئەنجام بدات.

بە ئاماژەیەکی بەهروز ئەشرەف فەرمانی دەدا کە فلانە فلیم بوەستێت و فلانە فلیم ڕێگەی پێ بدرێت!

تەنانەت کارەکە گەیشتبوویە ڕادەیەك لەچەندین کۆمپانیای بیناسازیدا پشکی پێ درا بوو بە تاوەکو بەهۆی ئەو پەیوەندیەی کە لەگەڵ ئەشرەف هەیبوو بتوانێت ئیشی گەورە وەرگرێت!

[1] – خاتو ضرابی یەکەمین ژنی گۆرانیبێژی ئێرانی بوو کە لە ساڵی ١٩٩٩ لە تاران کۆچی دوایی کرد. ئەم ژنە هونەرمەندە زۆر خێرکەر و چاکەکار و دەروێش سیفەت بوو و بەپێی ئەو وەسیەتەی کە کردبووی هەرچی موڵکوماڵی هەیە هەمووی کرایە خێر و ئیحسان بۆ پاش خۆی.

من لەم میوانیانەیدا یەك یان دووجار زیاتر بەشداریم نەکرد.

جارێکیان ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونی ئەشرەف بوو کە زیاتر لە سێ سەد نەفەر بانگهێشت کرابوون. دانیشتنێکی گەورەبوو کە لە باخەکەدا ئاهەنگەکە ڕێکخرابوو. لە دەوروبەری دەرەوەی کۆشکەکە لەسەر چیمەن و سەوزاییەکە مێز و کورسی دانرابوون و شوێنێکیشیان بۆ نمایشی هونەری و گۆرانیبێژەکانیش ڕێکخستبوو.

زۆربەی ئەندامانی خێزانی سەڵتەنەتی و تەنانەت خێزانە دوورینەکانیش بانگهێشت کرابوون و بۆ یەکەمجار بینیم ئەشرەف ژمارەیەك لە ئەندامانی خێزانەکەی ئێمە واتە (قطبیەکانیشی) بانگهێشت کردوە.

کچەکەم ملوانکەیەکی ئەڵماس، جووتێك گوارە و ئەڵقەیەك و دەستبەندێك کە بە سێتێکی تەواو دادەنران پێشکەشی ئەشرەفی کرد.

نرخ و بەهای ئەم گەوهەرانە زیاتر بەهۆی کۆنیانەوە بوو کە فەرەح بە پرسی محمد ڕەزا لە فرۆشیارێکی بەناوبانگی کەلوپەلە گرانبەها مێژوویەکان لە لەندەن کڕی بووی. واباسیان دەکرد ئەو گەوهەر و خشڵانە موڵکی (ژۆزفین)ی خۆشەویستەکەی ناپلیۆن بوون و کاتی خۆی ناپلیۆن پێشکەشی ژۆزفینی کردبوون!

منیش کاتژمێرێکی کۆن کە لە خشڵ دروستکرا بوو لەلایەن خشڵسازە بەناوبانگەکانی سویسراوە و (فەرەح بۆ هەمان مەبەست کڕی بووی) پێشکەشی ئەشرەفم کرد. ئەو شەوە خەڵاتی زۆر گرانبەها پێشکەشی ئەشرەف کرا.

زۆرێك لە سەرمایەدار و خاوەن پیشەسازە گەورەکانیش بەشداریان کردبوو و خەڵاتی زۆربەنرخیان پێشکەش بە ئەشرەف دەکرد کە لەناو ئەو خەڵاتانەدا هەمووشتێك دەبینرا. لە پشکی کارخانەوە بیگرە تاوەکو بگاتە موڵکی گرانبەهای باکوری تاران و خشڵ و زێڕی گرانبەها و هیتد.

ئەندامانی خێزانی محمد ڕەزا بەردەوام و هەموو ساڵێك ئاهەنگی لەدایکبوون و ئاهەنگی ڕۆژی هاوسەرگیریان ئەنجام دەدا و فەرەح دەیوت ئامانجی سەرەکی لە ئەنجامدانی ئەم ڕێوڕەسمانە بۆ کۆکردنەوەی ئەو خەڵاتە گرانبەهایانەیە کە خەڵکی دەیانهێنێت بۆیان!

من ئەم جۆرە میوانیانەم پێ قبوڵ نەبوو کە لەپشتیانەوە مەبەستێکی شاراوە هەبوو. فەرەحیش وەکو من بیری دەکردەوە و هەر لەبەر ئەوەبوو ئاهەنگی لەدایکبوون و ساڵی هاوسەرگیرەکەی تەنها لە ناو ئەندامانی خێزانەکەی و لەگەڵ محمد ڕەزا و منداڵەکانیدا ئەنجام دەدا، کە هەڵبەتە منیش هەمیشە ئامادەییم هەبوو.

پەیوەندی من و شاژنی دایك هەرگیز لە پەیوەستبونێکی تەشریفاتی زیاتر هیچی دیکە نەبوو. پێش هەموو شتێك دەبێت ئەوە بڵێم کاتێك کە فەرەح بووە هاوسەری محمد ڕەزا لەسەر ئەوەی کە پاش ئەو هاوسەرگیریە من دەبێت بە چ ناوێکەوە بانگ بکرێم ماوەیەکی زۆر قسە و باس و گفتوگۆ بوو. لەبیرمە لە مانگی مەی ۱۹٦۰ ئاهەنگێك بە بۆنەی ساڵی تازەی ئێرانی لە کۆشکی سعد ئاباد ڕێکخرا. منیش لە پاڵ کچەکەم و محمد ڕەزا دانیشتبووم دکتۆر منوچهر ئیقبال هاتە ناو دانیشتنەکەوە و هاتە پێشەوە و دەستی محمد ڕەزای ماچ کرد و ئینجا دەستی کچەکەمی ماچ کرد و پاشان تەوقەیەکی لەگەڵ منیشدا کرد و ویستی دەستی منیش ماچ بکات بەلاّم من دەستم ڕاکێشایە دواوە و نەمهێشت.

خوالێخۆش بوو فەرماندە محمد خاتمی کە ئاگاداری ئەم حاڵەتە بوو وتی بە دکتۆر ئیقبال: (خاتو دیبا) حەزناکلا هیچکەس دەستی ماچ بکات!

ئیقبال وتی: (بەندە ویستم ئەرکی سوپاسگوزاری بەگا بێنم!)

دووبارە فەرماندە خاتمی بۆ ئەوەی جەوەکە خۆش بکات وتی: (خاتو فەریدە دیبا عوزری ئاینی هەیە!)

لەم گفتوگۆ کورتەدا دووجار وشەی (خاتون) یان (بانو) دووبارە بوویەوە.

کەمێك دواتر محمد ڕەزا وتی: ئەو نازناوەی کە ویستم دۆزیمەوە، فەرمان دەدەم لەمەو دوا لە هەواڵە ڕۆژنامەیەکان و زانیارە ڕەسمیەکانی کۆشکدا تۆ بە (بانو فەریدە دیبا) بانگ بکرێیت!

ناونیشانی ڕێزدارانە بۆ هەموو ژنەکان (خاتون) بوو کە هەمیشە لە ئێراندا بەشێوەیەکی فراوان بەکاردەهێنرا و ئێستاش بەکار دێت، بەلاّم بە (بانو) بانگکردنی من لەوەو دوا وەکو (جیاکردنەوەیەك) بوو و بۆ نیشانەی ڕێز بەکاردەهێنرا.

هەرچەندە محمد ڕەزا بە ڕێکەوت کەوتە بیری ئەو بابەتە، بەڵام لەم دواییانەدا شجاع الدین شفا پێی وتم ئەمە ڕێك یەکسانە بە نازناوی ڕێزدارانەی (جەناب) کە بۆ کەسی دیار و بەڕێز بەکاردەهێنرێت و وەکو بەکارهێنانی نازناوی (لیدی)یە کە لەناو نەجیبزادەکانی بەریتانیادا بەکاردەهێنرێت!

هەڵبژاردنی ئەم ناوە و سەپاندنی بەسەر مندا بووە هۆی دڵخۆشبوونی شاژنی دایك چونکە بێتاقەتی ئەوە بوو ئایندەدا لە ئێران دوو شاژنی دایك بوونیان هەبێت!

شاژنی دایك، پیاوێکی سەیریشی هەبوو کە لە دانیشتنە تایبەتەکاندا ئامادە دەبوو، کاتێك شێوە و ڕووخساری ئەو پیاوەت دەبینی، هونەرمەندە کۆمیدیەکانی فلیمەکانت بیر دەکەوتەوە. ئەم پیاوە ناوی (ذبیح الله ملك پور) بوو کە دەیانوت دایکی محمد ڕەزای صیغە کردوە. بەڵام من تێنەگەیشتم چۆن کەسێك کە مسوڵمان نیە دەتوانێت ژنێکی مسوڵمان صیغە بکات.

لە ڕۆژانی هاویندا، شاژنی دایك کە قەڵە و گۆشتن و ترپە بوو لەگەڵ ذبیح الله لەناو مەلەوانگەکەی بەردەمی کۆشکە تایبەتەکەی خۆی مەلەی دەکرد و محمد ڕەزاش هەندێکجار کە سەیری دەکردن چەپڵەی بۆ لێ دەدان.

تاوەکو ساڵی ١٩٦٦ ئەمە پیاوە وەکو هاوسەری شاژنی دایك لە کۆشکدا دەبینرا. بەڵام لەو بەروارە بەدواوە ئەو کابرایەیان لە کۆشك کردە دەرەوە کە هەڵبەتە من تێ نەگەیشتم لە هۆکاری تووڕەبوونەکەی شاژنی دایك. ماوەیەکی کورت دوای ئەوە بیستم کە ذبیح الله ملك پور کۆچی دوایی کردوە.[1]

---

[1] -ذبیح الله ملك پور (باوەپیارەی شا!) پاش ئەوەی کە مەزەکەی خۆی لەدەستدا تاج الملوك فەرمانیدا ئیدی ڕێگەی پێ نەدەن بێت بۆ کۆشکی سعد ئاباد بۆیە لە مەیدانی فردوسی تاران لە مەعرەزێکی سەیارە کە موڵکی شعبان رحیمی پور بوو لە (باشوری ڕۆژهەڵاتی مەیدان-لەتەنیشت دەرمانخانە ) کڕین و فرۆشتنی دەکرد. پور ئەم شوێنەی کردبوویە شوێنی بەرپرس و فەرماندە و ژەنراڵە پلە بەرزەکانی سوپا و هەموو کەس ب ملك پوری بە زاوای شا بانگ دەکرد. ملك پور لە کودەتای ١٩٥٣ هەندێك ڕۆڵی بینی بوو و بەهۆی ئەو ڕۆڵەی کە بینیی بووی شا مەدالیایەکی پێ بەخشی بوو ئەویش هەمیشە مەدلیاکەی دەکرد بە خۆیدا.

دواتـر ڕەحیمعلـی خـورەم کـە دەیـانوت کەسـێکی دەوڵەمەنـد و خـاوەن کـارە و لـە هاوڕێیانی ژەنراڵ نصیری، سەرۆکی ساواکە، بووە خۆشەویستی شاژنی دایك.

من حـەز ناکـەم بڕۆمـە نـاو پرسـە تایبـەتی و شەخسیەکانی خێزانـی محمد ڕەزاوە. بەتایبـەتی نامـەوێت بیرەوەری و تێڕوانینـەکان و ئەزمونـەکانی خـۆم لـەبارەی شـاژنی دایك و جـەنابی خـاتو ئەشـرەفەوە بهێنمـەوە بیر خـۆم، چونکە لەوانەیـە ببێتـە هـۆی بەدحاڵی بـوون و یـەکێك وابزانێـت دەمـەوێت هێرشیان بکەمـە سـەر. چونکە بـە نـاڕەوا کەسانێك وا بیریان دەکردەوە کە لەنێوان من و شاژنی دایك ململانێیەك هەیە و یان من چاوی بینینی خاتو ئەشرەفم نیە.

نایشارمەوە کە چ من و چ کچەکەشم تاڕادەیەکی زۆر ناڕازیبووین لـە دەستێوەردانە حەسودیەکانی شاژنی دایك و ئەشرەف و تاڕادەیەکیش شەمسە، بەڵام ئـەم مەسـەلەیە بەشێك بـوو لـەو کـەلتوری دەسـتێوەردانەی خەسـو و خوشـکی پیاوەی کە لـە ئێرانـدا هەبوو ئیدی هیچ جیاوازی نیە ئەگەر خەسوی دایکی پاشا بیت یان خەسوی دایکی کرێکارێك بیت.

ئیـشکەر و خزمـەتکارە کۆنـەکانی کۆشـکی سـعد ئابـاد و تەنانـەت هەنـدێك لـە ئەندامانی خێزانی پەهلەوی کە متمانەیان بە من و فـەرەح هـەبوو و تێکـەڵمان بووبـوون باسی سەیر و سەمەرەیان لـەبارەی دەسـتێوەردانی شـاژنی دایـك و ئەشـرەفەوە دەکـرد لـە ژیـانی تایبـەتی فەوزیـە و سورەیا و ( گوایا هـەر ئـەم دەسـتێوەردانانەش بـوون کـە بوونـە هـۆی ئـەوەی کـە ئـەوان تـەڵاق بـدرێن و ژیانیـان تێکبـچێت). بـەڵام پـاش لـەدایکبوونی ڕەزا، فـەرەح تـوانی وەکـو دایکـی وەلیعەهـد و پاشـای ئاینـدەی ئێـران، پێگەی بەچەشنێك بەهێز بکات کە ئەوان ئـەم پێگـەیان کـەم کـەم بەشێوەیەکی ڕەسمـی ناساند و نێوانی خۆیان لەگەڵ فەرەح وەکو شابانوی ئێران دەپاراست و ڕەچاوی ئـەو مەسەلەیان دەکرد.

من لەو سەردەمەدا ژنێکی وەستاوبووم، بەڵام لەڕووی ڕۆحیەوە هەستم دەکرد زیاتر لە تەمەنی ئەسڵی خۆم تەمەنم هەیە و پیرترم لەوەی کە هەم(!) لەم ڕووەوە بوو هەرگیز بیرم نەدەکردەوە جارێکی دیکە شو بکەم و گرنگیم بەوە نەدەدا کە پێگەی تـازەم وەکـو

دایکی شابانو فەرەح ببێتە جێگەی سەرنجی کۆمەڵێك لە پیاوانی پەیوەست بە کۆشك و شاهنشاهی و عاشقانی دەسەڵاتخواز.

کەم کەم خوازبێنکەرانم بۆ پەیدا دەبوون! لەناو ئەم خوازبێنیکەرانە هەموو جۆرە پیاوێك دەبینرا. لە سیاسەتمەنداران و فەرماندە سەربازیەکان و کەسانی پەیوەست بەدەوڵەتەوە بیگرە تاوەکو دەگاتە سەرمایەدار و بازرگانەکان.

من باش دەمزانی ئەم کەسانە خوازبێنیکەری من نین بەڵکو مەبەستیان ئەوەیە لەم ڕێگەیەوە خۆیان نزیك بکەنەوە لە کۆشك و پیاوانی سەڵتەنەتی تاوەکو بتوانن مەبەستەکانی خۆیان بپێکن.

ڕەنج و ئازاری ژیانی ڕابردوو لە سیمای مندا کاریگەری خۆی دانابوو و هەرچەندە لەو ساڵانەی سەرەتادا هێشتا بەخۆوە بووم بەڵام پیرتر و گەورەتر لە تەمەنی خۆم دەردەکەوتم.

زۆر بێتاقەت و ماندووبووم لەو هەموو داواکارە ماستاوچی و سوکانەی کە بەهەموو شێوەیەك تەنەزولیان دەکرد بۆ ئەوەی من ڕازی بم بەوەی کە شویان پێ بکەم.

زۆربەی خوازبێنیکەرەکانم لە چینی فەرماندەکانی سوپا و بازرگانەکان بوون. وتویانە کەسانی ناو سوپا حەز و مەیلێکی زۆریان هەیە بۆ ئەوەی بگەنە پلەی بەرزی سەربازی و لەم ڕێگەیەشدا ڕوو لە هیچ شتێك وەرناگێڕن و لە دواتردا باسی دەکەم بۆتان کە چۆن کچان و کوڕانی گەنجی خۆیان دەهێنا بۆ میوانیەکانی کۆشك تاوەکو بیانناسێنن بە محمد ڕەزا لەسەر نرخی تێکدانی ژیانی هاوسەرگیری کچەکەم و فرۆشتنی شەرەف و ناموسی خۆیان بۆ بەرزبوونەوەی پلەیەکی زیاتر.

هەندێکجار پیاوانی ژندار و خاوەنی منداڵی زۆریش داوای پەیوەندیان لەگەڵدا دەکردم. ڕۆژێکیان بە یەکێك لە خوازبێنیکەرە دزێوەکان کە فەرماندەیەکی وەرزشکار و تاوەکو ڕادەیەك گەنجیش بوو لە سوپای شاهنشاهی وتم: (بەڵام تۆ ژنت هەیە؟) ئەویش بە چەتاوەڕووی و بێ حەیاییەوە وتی: (ئەگەر تۆ من بە نۆکەر و غوڵام قبوڵ بکەی هەر ئێستا تەڵاقی دەدەم!)

جارێکیان کوڕی یەکێك لە سەرمایەدارە بەناوبانگەکانی وڵات داوای هاوسەرگیری لێ کردم پێیم وت: (تۆ بەم تەمەن کەمەوە بە منداڵی من دەخۆی! ویستم بەو دەربڕینە ئەو گەنجە ڕووداره عاقڵ و بە ئەدەب بکەم)

گوێی لە قسەکانم گرت و وتی: (ڕاستە بە منداڵی تۆ دەشێم بەڵام ئەگەر داواکاریەکەم قبوڵ نەکەیت و هەڵمنەبژێری بۆ هاوسەری خۆت ئەوا خۆم دەکوژم!)

بیرەوەری هاوسەرگیری صیغەییم لەگەڵ (ڕەحیم ئیپکچی) بازرگان و سەرمایەداری تەبرێزی ئەوەندە ئازاردەر و سەخت بوو بەجۆرێك لەجۆرەکان ڕقێکی قوڵم بۆ دروستبووبوو لە بەرامبەر بە پیاو.

بەتایبەتی، کاتێك پیاوانی دەوڵەمەندم دەبینی کە خۆیان بەوە دەزانی هەروەکو سەردەمی کۆن، ژنان و کچانی گەنج، کە هەندێکجاریش بە منداڵ و تەنانەت نەوەیان دەشان بکەنە موڵکی خۆیان و چێژیان لێوەرگرن منیش لەم بارودۆخە سەخت و دژوارەی ژنانی ئێران زۆر خراپ بێتاقەت و نیگەران بووم.

هەموو ئەو پیاوانەی کە لە کۆشکەکانی شاهنشا، میوانداری بانگهێشتەکان دەکران لە خێزانە دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارەکان بوون، کەسانێك بوون خیانەتیان لە ژنەکانیان دەکرد و بێ بەڵێن و بێ وەفابوون.

چەند کەسێك لەو کەسانەی کە وەڵامی نەخێرم دانەوە بۆ هاوسەرگیری داوایان لە محمد ڕەزا کردبوو کە هانم بدات بۆ ئەوەی هاوسەرگیریان لەگەڵدا بکەم.

یەکێك لەوکەسانە (منصف) بوو کە لە خێزانی ئەسدالله علم بوو. ئەم منصفە پیاوێکی تریاکی باشوری خۆراسان بوو و دەیانوت (سوڵتانی تریاکە).

تاوەکو دەیەی ساڵی ١٩٦١ لە ئێران کەم تازۆرێك چاندنی حەشیشە ڕەواجی هەبوو. بەتایبەتی لە ناوچەکانی وەکو تویسرکان، ملایر، نهاوند، لوڕستان و باشوری خۆراسان و ناوچەکانی نزیك سیستان و بلوجستان و هەواڵ دەگەیشت کە لەو ناوچانەدا بازرگانی تریاك زۆر ڕەونەقی پەیدا کردوە.

لە هەمەدانیش ناوی کابرایەکیان بەناوی (دایی قاسم)[1] دەبرد کە پەیوەندێکی زۆری هەبوو لەگەڵ گروپە جیهانیەکاندا.

---

[1] —دای قاسم لە سەرەتای شۆڕش لەسەر بڕیاری دادگای شۆڕش لەسێدارە درا.

من ئەم هەواڵ و زانیاریانەم هەندێکجار لە دانیشتنەکان و کۆبوونەوەکانی کۆشکدا دەبیست.

پاش ساڵەکانی ١٩٦١ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان فشارێکی زۆری خستە سەر ئێران لەبارەی مادده بێهۆشکەرەکانەوە بۆیە لە ئێراندا چاندنی حەشیشە بوو بە نایاسایی، بەڵام ئێران ڕێژەیەکی زۆری تریاکی هەبوو.

لە سەردەمی قاجاریەکان تریاک وەکو توتن ئازادانە لە هەموو دوکان و بەقاڵیەکاندا و لەسەر جادە و قەراغ شۆستەکاندا بە نرخێکی زۆر هەرزانتر لە توتن، دەفرشرا.

دایکانی بێ ئاگا بۆ نەهێشتنی ئازاری سك و با کردن، لەناو ئاودا دەیانکولاند یان لەناو چاییدا دەیانکولاند و دەیاندا بە منداڵەکانیان. تەنانەت لەسەردەمی ڕەزاشا و سەرەتای ساڵەکانی سەڵتەنەتی محمد ڕەزا لە چاخانەکاندا لەگەڵ قلیان و چاییدا دادەنرا و تەنانەت سوتاوەکەشی دەوڵەت لەلای چاچیەکان دەیکڕیەوە.

دواتر، هەرچەندە محمد ڕەزا بەکارهێنانی تریاکی بە ئاشکرا قەدەغە کرد، بەڵام شوێنی کێشانی تریاك و حەشیشە لە کۆمەڵێکی زۆر لە شارەکاندا هەبوو و لە تارانیش شوێنێك[٢]، هەبوو کە شوێنی تریاك کێشەکان لەوێ بوو.

لەساڵەکانی دەیەی ١٩٦١ ڕووبەڕووبوونەوەی دەوڵەت لەگەڵ قاچاخچیەکان و معامەلەچیەکانی تریاك جدیتر بوو و پۆلیس بە هێرشکردنە سەر کێڵگەکانی چاندنی خشخاش و حەشیشە هەموویانی وێران کرد و دەستی گرت بەسەر ئەو تریاکەی کە دەیاندۆزیەوە.

بەڵام لەبەرئەوەی کە ژمارەی تریاکیەکان لە وڵاتدا زۆر بوو دەوڵەت بەڕێوەبەرایەتێکی بۆ ئامادەکردنی تریاك دامەزراند لەناویدا ئەو کرێکارانەی کە سەر بە وەزارەتی تەندروستی بوون کاریان لە هەنون و کۆکردنەوە و ئامادەکردنیدا دەکرد و تریاکەکەیان لە دەرمانخانەکانی سەرتاسەری وڵات بە بەهای ١٥ تمەن بۆ هەر لولەیەك کە خەڵکی بە تەشەرەوە پێیان دەوت تریاکی (سیناتۆر) دەفرۆشت.

---

[٢] – زۆربەی شوێنی تلیاك کێشانەکان کە پێیان دەوت (شیر کشخانە) لە شوێنی دەروازی غار بوو کە ئێستا ناوەکەی گۆڕاوە بە (باغی همگانی)

دواهەمین سەرۆکی ئەم بەڕێوەبەرایەتیە نەقیبێکی خانەنشینی سوپا بوو بەناوی نەقیب ئایتی کە چیرۆکی سەیر و سەمەرەی لەبارەی ئەم کارگە دەوڵەتیەی تریاك دروستکردنەوە باس دەکرد.

بۆ نمونە باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن زانیویەتی بەوەی کرێکارەکان پاش کۆتایی هاتنی ئیشەکە بەشێوەی جیاواز و لێهاتوییانە لە کارگەکەوە تریاکیان بە قاچاخی بردوەتە دەرەوە.

هەندێکیان، تریاکیان دەبەست بە ژێر قاچیانەوە. هەندێکیان لەناو قژیاندا دەیانشاردەوە و هەندێکیشان بە نایلۆنێکەوە دەیانپێچاو قوتیان دەدا.

هەرچەندە دەوڵەت لە سەرانسەری وڵاتدا ڕووبەڕووی چاندنی تریاك دەبوویەوە. بەڵام ئێمە زانیاریمان هەبوو لەسەر ئەوەی کە لە هەندێك لە ناوچەکانی وڵات وەکو (ملایر) کە جۆری تریاکەکەی ناوبانگێکی جیهانی هەبوو هێشتا بەشێوەیەکی فراوان ڕەواجی هەیە و جوتیارەکانیش لە ژێر چاودێری و پارێزگاری بەرپرسە ناوچەییەکان و تەنانەت بەرپرسە باڵاکانی تارانیشدا دەیچێنن.

خێزانی ئەسد الله علم و کەسانی وەکو خوازبێنیکەرەکەی من (منصف) لە کێڵگە فراوانەکانی خۆیان کە ڕووبەرەی زەویەکانیان زۆرجار زیاتر بوو لەچەند وڵاتێکی عەرەبی کەنداو و وڵاتانی ئەوروپا، خەریکی چاندنی حەشیشە و کۆکردنەوەی تریاك بوون و هیچکەسیش بچوکترین ڕەخنەی لێ نەدەگرتن.

(منصف) چەندجارێك حەزی خۆی بۆ دەربڕیم بەڵام من زۆر بە سارد و سڕی وەڵامم دەدایەوە. تەنانەت جارێکیشیان، ئەسد الله علم بەهۆی زۆر نزیکیەوەی لەگەڵ محمد ڕەزا، زۆرجار لە کاروبارە شەخسیەکانیشمدا دەستوەردانی هەبوو، گلەیی لێکردم کە بۆچی بە ئەرێ وەڵامی منصف نادەمەوە، بەڵام کاتێك کە وەڵامەکەی منی بیست ئیدی لەم بارەیەوە قسەی نەکرد.

خوازبێنیکەرێکی دیکە کە زۆر پێداگیری دەکرد لەسەر خواستەکەی و سەرئەنجام منی تووڕە کرد (دکتۆر حاجبی)، قوماربازی ناسراو و هاوڕێی سەر مێزی محمد ڕەزا بوو، کە سەرەڕای بوونی ژن و منداڵیش، هەوڵیدەدا من قەناعەت پێ بکات.

محمد ڕەزا کاتێك کە بیست بووی من ئامادە نیم شو بکەم ڕۆژێکیان سوپاسی کردم و وتی: (هەڵبەتە ژیانی تایبەتی خۆت پەیوەندی بەخۆتەوە هەیە. من نامەوێت دەستبخەمە ناو ژیانی تایبەتیتەوە، بەلاّم من هەمیشە نیگەرانی ئەوە بووم کە وەلاّمی ئەریّی یەکێك لەم سەگانە بدەیتەوە کە بەردەوام لە دەورووبەرمدا دەسوڕێنەوە و کلك دەجوڵێنن و لەکۆتاییدا من بکەومە بارودۆخێکی نالەبارەوە. هەرچەندە لەلایەکەوە لەبەر ئەوەی کە دایکی شاژنی ولاّتی و ناتوانم زۆرکەس هەیە وەکو هاوسەری تۆ، کە دەتوانێت ببێتە هۆی سەرهەڵدانی بانگەشەی ترسناك لە دەورووبەری خێزانی سەڵتەنەتی قبوڵ بکەم بەلاّم لەلایەکی دیکەشەوە لەدیدی سروشتیشەوە ناتوانم ڕووبەڕووی خواستی دڵت ببمەوە کە مافێکی سروشتی خۆتە.

هەرچەندە من توشی سەرسوڕمان بووم لەم بۆچونەی محمد ڕەزا، بەلاّم هەر لەو کاتەدا لەخۆم پرسیم ئەگەر جەنابی حەزرەت بەم شێوەیە بیر دەکاتەوە و ئەم شێوە بیرکردنەوەیەی هەیە بۆچی ڕێگەی لە هاوسەرگیری دایکی نەگرت لەگەڵ (ذبیح الله) و دواتریش لەگەڵ (رەحیمجعلی).

لەم ساڵانەی دواییدا کاتێك بینیم کە لەناو دەرباردا چەند متمانە و خۆشەویستیم هەیە لەلای شا و خزمەتکارو ئیشکەرەکانی کۆشك ئاگاداریان دەکردمەوە لە ڕادەی متمانەم لەلای شا ئیدی توانیم وەلاّمی پرسیارەکەم دەستکەوێت کە بۆچی شا حەزی بەو کارە نەدەکرد.

(زوهرا مشهدی) کە هەر لە تەمەنی گەنجیەوە هاوکار و هاودەمی تایبەتی شاژنی دایك بوو و هەموو تەمەنی خۆی لەگەڵ ئەودا گوزەراندبوو و زۆریش گرنگی پیّ دەدا پێی وتم دایکی جەنابی حەزرەتی محمد ڕەزاشا هەر لە ساڵی یەکەمی مردنی ڕەزاشا ژمارەیەکی زۆر پیاو و خۆشەویستی گۆڕیوە و لە ڕاستیدا (ذبیح اللە) و دواتریش رەحیمعلی پیاوی ڕەسمی ئەو نەبوون و بۆ پاراستنی حەیا و شەرەفی کۆشك ئەم جۆرە پڕوپاگندانەی بلاّو دەکردەوە کە گوایە شاژنی دایك بە شێوەیەکی ڕەسمی شوی کردوە.

باسی ئەوە دەکرا کە محمد ڕەزا پەروەردەیەکی ڕۆژئاوایی هەبووە و زۆر گوێی نەداوە بە هاتن و ڕۆیشتنی پیاوانی بێگانە بۆلای دایك و خوشکەکانی.

شاژنی دایک لە کۆشکدا حەق و حقوقێکی باشی هەبوو، بەردەوام ڕۆڵی شاژنی چینی لە شاری قەدەغەدا دەگێڕا.

ناوی خێزانی زوهرا مشهدی (ناظری) بوو. هەموو خزمەتکارەکانی کۆشك، بە (خاتو ناظری) بانگیان دەکرد، بەلام ئەگەر خۆی لەوێ نەبوایە بە (زوهرا مشهدی) ناویان دەبرد.

شاژنی دایک پاش لەدایکبوونی محمد ڕەزا و ئەشرەف پەیوەندی ژن و پیاوی لەگەڵ خوالێخۆش بوو ڕەزا شادا نەبوو و من ئەم حەقیقەتەم لە زمانی خودی محمد ڕەزاوە بیست.

محمد ڕەزا باسی کرد بۆم کە بۆچی ڕەزا شا دوای دایکی دوو هاوسەری دیکەی هەڵبژاردوە. محمد ڕەزا هۆکاری ژن هێنانەوەی ڕەزا شای گەڕاندەوە بۆ ئەو ئەخلاقە توند و تەحەمول نەکراوەی دایکی. هەرچەندە هاوسەرەکانی ڕەزاشا لە ژیاندا بوون و لێشیان منداڵی هەبوو و هەمووشیان بە خوشك و برای محمد ڕەزا دادەنران، بەلام شاژنی دایك تەحەمولی بینینی شاژنە عصمت (عصمت الملوك دولتشاهی) و شاژنە توران (دایکی شاهپور غلامرزا)ی نەبوو و نەدەکرا دانیشتنێك هەبێت و ئەم سێ کەسە لەو دانیشتنەدا ئامادەگیان هەبێت.

من لەگەڵ شاژنە عصمت دۆستایەتێکی پاك و بێگەردم بەستبوو. هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە هەردووکمان حەزێکی زۆرمان هەبوو بۆ مەسەلە عیرفانی و تەصەوەفیەکان و لە زۆرێك لە کاروبارەکانی دیکەش هاوشێوەیەکی فراوانمان هەبوو.

شاژنە عصمت و شاژنە توران هەریەکەیان خانوویەکی سەربەخۆیان هەبوو لە دەوروبەری جادەی پەهلەوی[1] و زیاتر پێیان خۆش بوو زۆر لە میوانیەکان و بانگهێشتەکانی کۆشکدا ئامادە نەبن.

لەسەردەمی ژیانی ڕەزاشا، (شاژنە عصمت) ژنی خۆشەویستی ڕەزاشا بوو. عصمت لە خێزانێکی بە شەخسیەت و بە بنەما و خوێنەدەوار و خاوەن کەمال بوون.

تاوەکو ساڵی ١٩٦٢ سەرەڕای محمد ڕەزا و کچەکەم، ئەشرەف، شەمسە و تاج الملوك و شانازیش لە کۆشکی تایبەتی خۆیان لە ناوچەی فراوانی سعد ئابادا

---

[1]-وەلیعصر ی ئێستا

دەژیـان. هاتوچـۆی زۆری میوانـان، بـەرپاکردنی ئاهـەنگ و بانگهێـشتە جۆراوجـۆر و هەندێکجاریش هاوکاتەکانی کۆشکی شاژنی دایك، ئەشرەف و کچەکانی تری شا و کوڕەکانی شا بووە هۆی ئەوەی کە کچەکەم بۆ خۆی بیر لـە شوێنێکی تازە بکاتـەوە. ساڵی ١٩٦١ محمد ڕەزا کۆشکی مەرمەرە کە لـە بیناسازیە دەگمەنـەکان و پاشماوە هونەریـەکانی سـەردەمی ڕەزاشـا و دروسـتکراوی زەوق و داهێنـانی هونەرمەنـدە گەورەکانی ئێرانی بوو درا بـە شارەوانی تـاوەکو بیکاتـە مۆزەخانـە. کۆشکی مەرمەرە کە لـە سـەردەمی ڕەزاشا وەکو نوسینگەی ئیشەکەی دروستکرا پاش کۆچی دوایی خۆی بەجێما بۆ محمد ڕەزا.

لەم شوێنەدا، سەرەڕای کۆشکی مەرمەرە و کۆشکی سپی، کۆشکی خاتو ئەشرەف و کۆشکی شاژنی دایکیش هەبوون کە دەرگای چوونە ژوورەوەی هەر چوار کۆشکەکە بەرامبەر بە یەك بوون.

لەم دواییانەدا، هەرچەندە کۆشکی مەرمەرە وەکو مۆزەخانە درا بە شارەوانی تاران، بەڵام کۆشکی سپی هەر وەکو شوێنی سەرۆك وەزیران مابوویەوە و کۆشکی شاژنی دایکیش درا بە شاهپور عبدالڕەزا بەڵام ئەشرەف هەر کۆشکەکەی خۆی پاراست کە پێی دەوت کۆشکی شاری.

محمد ڕەزا، پـاش پێـدانی کۆشـکی مەرمـەرە بـە شـارەوانی، نوسـینگەکەی خـۆی گواسـتەوە بـۆ کۆشـکی صـاحبقرانیە و هـەموو دیـدارە نـاوخۆیی و دەرەکیـەکانی لـەو کۆشکە بەجێماوەی سەردەمی قاجاری ئەنجام دەدا.

صاحبقرانیە لە سەرەتای سەڵتەنەتی ناصرالدین شا دروستکرا بوو و بەشێوەیەکی زۆر جوان و ڕاوازە بنیادنرابوو.

پشتی کۆشکەکە کە زۆر فراوان و پڕبوو لـە دارودرەخـت بـۆ دروستکردنی کۆشکی تازەی سەڵتەنەتی دانرابوو.

کـچەکەم پـاش تـەواوکردنی خوێنـدنی پـردی تـەکنیکی و ئەنـدازیاری لـە پـاریس، هەرگیز ئەو هەلـەی بۆ نەڕەخسابوو کە لـەو بـوارەی خۆیدا کار بکات و بەشێوەیەکی کـرداری ئیـشێك ئـەنجام بـدات، بـەڵام ئـەم بۆشـاییە گەورەیـەی پـشتی کۆشـکی صـاحبقرانیە هـەلێکی گونجاوی بۆ ڕەخساند کە نەخشەی کۆشکی تازەی نیاوەران

خـۆی ئامـادەی بکـات و لـە قۆنـاغی دواتریـشدا لەگـەڵ ئەنـدازیاران و شـارەزایان دروستکردنی کۆشکەکی دەستپێکرد کە نزیکەی سێ ساڵ درێژەی کێشا.

لـەناو کۆشـکی نیـاوەران بینایـەکی تایبـەتیش بـۆ وەلیعەهـد دروسـتکرا. هـەروەها فێرگەیەکیش دروستکرا بۆ ئـەوەی وەلیعەهد و هاوپۆلـەکانی قۆنـاغی سـەرەتایی تێدا بخوێنن.

پێش دروستکردنی ئەو کۆشکە، شا بـۆ چوونە سەر ئیشەکەی هـەموو ڕۆژێك لـە کۆشکی سعد ئابادەوە لە مەیدانی تەجریشەوە تاوەکو کۆشکی مەرمەرە بە ئۆتۆمبێل دەیـبڕی و بە بۆچـوونی مـن ئەمـەش دەبـووە هـۆی ئـەوەی کـە شـا دەیتـوانی سـەیری خەڵکی ئاسای و دوکان و ناوچەکانی شار بکات و تاڕادەیەك ئاگاداری بارودۆخی ئەو خەڵکە ببێت و بەمەش هەستی دەکرد بە کێشە و گیروگرفتەکان.

ئەمە هەڵەیەکی گەورە بوو، کە محمد ڕەزا شوێنی نیشتەجێبوونی کار و خوێندنی خـۆی منداڵەکـەی لـەناو چوارچێوەیەکی دیـوارێکی داخـراودا دانـا و پەیوەنـدی خـۆی بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ خەڵکی گشتی پچڕاند.

ئـەو ئیدی تەنانـەت خـەڵکی ئاسـای نـەدەبینی و تـەنها لـە بۆنـە و یـان لـە مەیدانـە وەرزشیەکاندا ئەویش لـە دوورەوە ئەو خەڵکانـەی دەبینـی کە چەپڵەیان بۆ لێدەدا و هۆتافیان بۆ دەکێشا و ئەویش دەستی بۆ بەرز دەکردنەوە.

محمـد ڕەزا لـەوەودوا لـە بەیانیـەوە تـاوەکو ئێـوارە کاتـەکانی خـۆی لـەناو کەسـانی دەسـەڵاتدار و فەرمانـدەکانی سـوپا و فەرمانبەرەکانـدا دەگوزەرانـد کـە ئـەوانیش بـەردەوام پێیـان دەوت: ( هەمووشـتێك ئـەمن و ئارامـە و خـەڵکی خۆشـبەخت و دڵخۆشن!)

کۆشـکی سـەرەکی نیـاوەران خـاوەنی تـەلارێکی گـەورەی نزیکـەی ٥٠٠ مـەتری چوارگۆشە و لەناوەوەشدا سێ قات بوو.

کۆشکە سەرەکەیەکە کە فەرەنسیەکان دروستیان کردبوو سەقفەکەی دەسوڕایەوە.

لەگــەڵ ئــەوەی کــە کۆشــکەکە چــەندین ژووری جۆراوجـۆری تێـدا بـوو، بـەڵام لەبەرئەوەی کە محمـد ڕەزا هەمیشە ترسـی هـەبوو لـە بومەلـەرزە و بـەڵای سروشتی لە

ڕێڕەوێکی باریکدا کە لەنێوان دیوارە بتونیەکانی کۆشکدا بوو دەخەوت بۆ ئەوەی لەکاتی ڕوودانی بومەلەرزە و حاڵەتێکی سروشتی پارێزراو بێت!

کاتێك کە کچەکەم هات بۆ ئەم کۆشکە تازەیە دیدارەکانمان لەگەڵ ئەندامانی خێزانی پەهلەوی زۆر سنوردار بوون و بەتایبەتی من زۆر هەوڵم دەدا زۆر بەکەمی بیانبینم.

کۆشکی نیاوەران تەلارێکی ڕازاوەی جوانی سینەمایی تەیار بە پێشکەوتووترین ئامێری دەنگی و وێنەیی تێدا بوو کە زیاتر لە سەد کەس بە ئاسانی ڕێگەیان دەبوویەوە و زۆرجاریش بەردەوام لەو هۆڵەدا پڕ دەبوو لە میوان و سەیری فلیمیان دەکرد و کاتی خۆشیان بەسەر دەبرد.

محمد ڕەزا، عاشقی فلیمەکانی وێسترن بوو. لەناو ئەکتەرەکانیشدا زۆر حەزی لە فرانك سیناترا و مارگریت بوو و زۆرجار کاتی واهەبوو لە ساڵێکدا نزیکەی دە جار سەیری فلیمێکی دەکردەوە.

لەو سەردەمەدا کاروباری فلیم و سینەما لە ئێرادا سەر بە وەزارەتی ڕۆشنبیری و هونەر بوو. ئەم وەزارەتە لەلایەن (مهرداد پهلبد برای ژەنراڵ غلامعلی مین باشیان)ەوە بەڕێوە دەبرا.

مهرداد پهلبد لەسەر خواستی شەمسە لە کاتی گرێبەستیدا(!) ناوی خۆی لە مین باشیانەوە گۆڕی بۆپهلبد و لەگەڵ ئەوەشدا کەمانچە ژەنێکی زۆر لێهاتوو بوو و تاوەکو پێش هاوسەرگیری لەگەڵ شەمسە لە ڕادیۆی ئەو سەردەم و لە کافتریا مۆزیکیەکانی جادەی شا ئاباد کەمانچەی دەژەنی.

پهلبد، هەر فلیمێکی تازە و جوان کە بازرگانەکانی فلیم هاوردەیان دەکرد بۆ نمایش لە سینەماکانی تاران و شارەکانی دیکەدا پێش ئەوەی دۆبلاژ بکرێت بۆ فارسی دەیهێنا بۆ کۆشك و لەوێ بۆ پاشا و میوانەکانی نمایش دەکرا.

هەندێك کاتیش کاتێك فلیمێکی جوان و سەرکەوتوو لە ئەورووپا و ئەمریکا نمایش دەکرا بەبێ دواکەوتن نوسخەیەك لە فلیمەکە لە ڕێگەی سەفارەتخانەکانی ئێرانەوە ئامادە دەکرا و بەتایبەتی دەنرا بۆ جەنابی محمد ڕەزاشا.

زۆر بەکەمی فلیمە فارسیەکان لێ دەدران. شا فلیمەکانی (وحدەت) کە ئەکتەرێکی ئێرانی بوو خۆشدەویست و لەم ساڵانەی دواییشدا سەیری چەند فلیمێکی (پەرویز صیاد)ی کرد کە لە فلیمەکاندا ڕۆڵی لادێیەکی سادە و پێکەنیناوی(!) بەناوی (صمد)ەوە دەبینی و منیش ئەو فلیمانەم بینی.

حەزی محمد ڕەزا بۆ سینەما بووە هۆی ئەوەی فەرمانی دەرکرد بۆ چەند دەرهێنەرێکی ئێرانی تاوەکو پرۆژەیەك بخەنە بەردەستی و داوای هاوکاری بکەن و ئەویش یارمەتیێکی زۆر فراوانی دارایی پێشکەش کردن.

ئەشرەفیش بەهۆی حەزکردنی لە فلیم و سینەما هەمان هەستی براکەی هەبوو و لەسەر پێشنیاری ئەویش بوو وەزارەتی ڕۆشنبیری و هونەر، قەرزی زۆر گەورەی خستە بەردەست دەرهێنەرە ئێرانی و تەنانەت بیانیەکانیش.

هەرکاتێك هونەرمەندە گەورەکان بهاتنایە بۆ ئێران ئەو چانسەیان هەبوو کە چاویان بکەوێت بە محمدڕەزاشا و ئەندامانی خێزانی پەهلەوی.

ئەو هونەرمەندانەی کە لەبیرمە هاتن بۆ کۆشك و بوونە میوانی محمدڕەزا بریتی بوون لە (یول براینەر) هونەرمەندی گەورەی فلیمەکانی ویسترنی ئەمریکی کە بۆ بەشداریکردنی وێنەگرتنی چەند دیمەنێکی فلیمێك هاتبوو بۆ ئەسفەهان[1]

ئەو فلیمە ناوی (گوڵی حەشیشە) بوو کە چیرۆکی فلیمەکە باسی قاچاخیکردنی تریاك و حەشیشەی دەکرد لە ئەفغانستانەوە بۆ ئێران.

شا فلیمەکانی یوڵ براینەریشی خۆشدەویست و لەوانەیە زیاتر لە پەنجا جار سەیری فلیمێکی بکردایە.

---

[1] –یوڵ براینەر هونەرمەندی ناسراوی فلیمەکانی ویسترن کەبە فلیمی سینەمای حەوت دۆلار، بوو ناوبانگێکی جیهانی دەرکرد جارێکیان بۆ ڕۆڵێك لە فلیمی (گوڵی شەیتان) هات بۆ ئەسفەهان.
یول براینەر چەند ساڵێك پێشتر بەهۆی توشبوونی بە شێرەپەنجە کۆچی دوایی کرد.
(یۆل براینەر) کچێکی هەبوو پاش هەڵهاتنی شا لە ئێران و چوونی ڕەزا پەهلەوی بۆ ئەمریکا بووە جێگەی سەرنجی ڕەزا و ئەحمەد علی ئەنصاری (کوڕی پوری فەرەح) لە کتێبی یادەوەریەکانی خۆیدا (پاش کەوتن) باس لە پەیوەندی نامەشروعی ڕەزا پەهلەوی و ئەم کچە دەکات.

چەندین جار پێی دەوتم ئەگەر شا نەبوومایە حەزم دەکرد ئەکتەرێکی فلیمەکانی ویسترن و یان خاوەن کێڵگەیەکی گەورەبوومایە لە ئەمریکا!

هونەرمەندێکی دیکە کە گۆرانیبێژێکی گرنگ بوو، و یەکێك بوو لە هاورێ نزیکەکانی محمد رەزاش (فرانك سناترا) بوو کە خۆشم زۆر حەزم لە گۆرانیەکانی دەکرد و جارێکیشیان لەسەر داواکاری من گۆرانی بەناوبانگی (گودی، گودی) بەبێ مۆسیقا وت.

فرانك سیناترا زۆرجار دەهات بۆ سەردانی محمد رەزا و هەڵبەتە ئەم سەفەرانە زۆرجار بە نهێنی و بێدەنگ بوون.

هونەرمەندانی دیکەی وەکو گریگۆری پیك، ئستیومك کویین، شارل ئازناور، ژوداسن، دمیس رۆسیس، کریك دۆگلاس، لی میجەرز و... هیتد لەماوەی ئەو ساڵانەدا هاتن بۆ ئێران و ئێمەش چاومان پێیان کەوت.

چاوپێکەوتن و دیدار لەگەڵ هونەرمەندەکاندا بۆ من زۆر جێگەی دڵخۆشی بوو، ئەوان لەچاو خەڵکانی دیکەدا جیاواز بوون گرنگترین جیاوازیشیان بوونی رۆحیەتێکی نەرم و هەستیار و معامەلەیەکی هەستیاری گوماناویانە بوو!

زۆرجار فەرەح ژوداسن و شارل ئایزناهاوەر و دمیس روسیسی بەبۆنەی ئاهەنگی لەدایکبوونی رەزا و منداڵەکانی دیکەیەوە بانگهێشت دەکردن تاوەکو منداڵەکانی خوو بگرن بە مۆسیقای فەرەنسیەوە. بەشێوەیەکی گشتی، فەرەح وابەستەبوونێکی زۆری لەگەڵ فەرهەنگی فەرەنسیدا هەبوو چونکە سەردەمێکی دووروودرێژ لەگەڵ فەرەهەنگ و کەلتوری فەرەنسیدا ژیا بوو.

بەڵام لەبەر ئەوەی کە محمد رەزا لە ئەوروپا (سویسرا) سەردەمی منداڵی و هەرزەکاری گوزەراندبوو زۆر حەزی لەشێوازی ژیانی ئەمریکی بوو و فەرهەنگ و شێوەی ژیانی وڵاتەکانی دیکەی بەکەم دەزانی[1]

---

[1] —ئەگەر محمد رەزا لەبری ئەوەی بەردەوام شەیدا و عاشقی ئەمریکا بوایە، نیو ئەوەندە گوێی بە وڵاتەکەی خۆی بدایە و باوەری بە خەڵکەکەی خۆی ببوایە هەرگیز توشی ئەو مەینەتیە گەورەیە نە دەبوو کە هات بەسەریدا.

ئەشرەفیش ئەو هونەرمەندانەی کە خۆشی دەویستن لە هەر شوێنێکی ئەم کونج و کەلەبەرەی دنیادا ببوونایە بانگهێشتی دەکردن و میوانداری دەکردن.

من کە لە دڵەوە حەزم لە بواری هونەری دەکرد زۆر سودم لەم حاڵەتانە وەردەگرت و هەوڵمدەدا لە نزیکەوە ئەو هونەرمەند و گۆرانیبێژ و ئەکتەرانە بناسم و لە نزیکەوە هەستیان پێ بکەم کە لە هەموو جیهاندا بە ملیۆنەها بینەر و گوێگر و لایەنگریان هەبوو. بەڵام لە بانگهێشتی هونەرمەندانی وەکو (ئشتاك هاوزن) کە مۆزیکی ئەلیکترۆنی دەژەنی و یان تەنانەت یهودی منوهین کە بە پارەیەکی زۆر گران هات بۆ ئێران بێتاقەت و نیگەران بووم چونکە باوەڕم وابوو کە کەمانچە ژەنەکانی خۆمان وەکو بەڕێز یاحقی، کە هەمیشە ڕێزم لێ دەگرت و هانم دەدا، زۆر بەسۆزتر و هونەرمەندانەتر کەمانچەی دەژەنی تاوەکو کەسێکی وەکو یهودی منوهین!

دانیشتنە هونەریەکان تەنها تایبەت نەبوون بە هونەرمەندە ئەمریکی و فەرەنسیەکانەوە، بەڵکو گۆرانیبێژ و هونەرمەندە ئینگلیزی و ئیتاڵیەکانیش بانگهێشت دەکران.

ڕۆژێکیان بیستمان کە (کارلوپونتی) ئامادەکاری بەناوبانگی ئیتاڵی و دەرهێنەری فلیمە نەمرە سینەماییە مێژووییەکان هاتوە بۆ ئێران.

هەموو خۆشحاڵ بووین. هەڵبەت نەك لەبەر کاروپونتی. کارلوپونتی لەبەر ئەوە لە ئێران ناوبانگی هەبوو چونکە هاوسەری (سوفیالورین) ئەستێرەی شاجوانی ئیتاڵی بوو و هەمووکەس دەیانویست سویالورین لە نزیکەوە ببینن. (بەتایبەتی محمد ڕەزا کە کوژراوی دەستی سوفیالورین بوو!) بەڵام کارلوپونتی تەنیا هاتبوو و سوفیالورنیش هەرگیز ئامادە نەبوو سەفەر بکات بۆ ئێران و هیچ بانگهێشتێکی قبوڵ نەکرد.

لەبری ئەو (جینا لولو بریجیدا) هات بۆ ئێران کە بەیەکێك لە جوانترین ئەستێرەکانی مێژووی سینەما دادەنرا.

بۆ من بەشداری کردن لە میوانیەکان و دانیشتنە ئاهەنگیەکانی کۆشك هەمیشە بێتاقەتکەرانە بوو چونکە لە تەمەنێکدا نەبووم کە وەکو گەنجەکان بتوانم سەما بکەم و لە شادی و خۆشیاندا بەشداربم.

له میوانیەکانی کۆتایی شەو کە زۆرتر بە وەرەقێن کۆتایی دەهات و معامەلەی گەورەی تێدا دەکرا بەشداریم نەدەکرد. بەڵام هەرکاتێك ئاگاداری ئەوە بوومایە کە هونەرمەندێکی گەورە یان گۆرانیبێژێکی ناسراو لە دەرەوە هاتووە ئەو هەلەم لەدەست نەدەدا و خۆم دەگەیاندە میوانیەکە تاوەکو لە نمایشە هونەرەکانیان چێژ وەرگرم. لە ساڵی ١٩٦٥ لە سەفەری ئیتاڵیادا کە لەگەڵ عالم خانم (پورێی محمد رەزا) ڕۆیشتبووین بۆ ڕۆما ڕۆیشتین بۆ (چینە چیتای) شاری سینەمایی بەناوبانگی ئیتالیا و لە نزیکەوە چۆنیەتی وێنەگرتنەکانم بینی و لەگەڵ چەند ئەستێرە و هونەرمەندێکی بەناوبانگی ئیتاڵیش دیدارمان کرد.

ڕۆژەکانی من زۆرتر بەم شێوەیە تێدەپەڕین کە پاش ئەوەی نانی بەیانیم دەخوارد تەلەفۆنم دەکرد بۆ هەندێك لە هاوڕێکانم کە نزیکترینیان عالم خانم (پورێی محمد ڕەزا)، فێروزە ئەمیرینا (هاودەم و خزمەتکارەکەم)، سورەیا صدیقی (پورێی فەرەیدون جوادی)، پەری ئەباصلتی (ڕۆژنامەنوس)، ئیلی ئانتونیادیس (ئەمریکی و بەئەسڵ یۆنانی و نیشتەجێی ئێران و کارمەندی کۆنی وەزارەتی دەرەوە)، ئەکرەمە ئەهاوەندی (خوشکە گەورەی هۆشمەند)، خاتو مزینی (هاوسەری فەرمانده مزینی) و هیتد- باسی ئەوەمان دەکرد کە ئەو ڕۆژە چی بکەین.

لەناو بازنەی هاوڕێکانم کە زیاتر لە پەنجا کەس دەبوون بەتەمەنترینیان عالم خانم (پورێی محمد ڕەزا) و گەنجترینیان فەیروزە ئەمیرنیا بوو.

فەیروزەم وەکو کچەکەم خۆشدەویست و شەو و ڕۆژ لەگەڵمدا بوو تاوەکو پیاوێکی بەدڵی خۆی هەڵبژارد و بەیارمەتی من شوی کرد.

ئێستاش لەئەمریکادا کۆمەڵێك لەو هاوڕێیانەم هەر کۆدەبینەوە و وەکو جاران بەردەوامی دەدەین بە دانیشتنەکانمان، لەوانە فەیروزە کە بەردەوام دەیبینم و منداڵەکانیشی وەکو نەوەکانم خۆشم دەوێن.

هەندێکجار بڕیارماندەدا بەشێوەیەکی نەناسراوانە و بە سەرپۆش و عەینەکەوە بڕۆین بۆ بازاڕی تاران.

هەندێکجاریش دەیدا لەسەرمان و دەڕۆیشتین بۆ گەڕان بۆ شارەکانی دیکەی ئێران و بێ بەرنامە دەڕۆیشتین دەچوینە شیراز، ئەسفەهان یان یەزد و مەشهەدو

ڕۆژێکیشیان ڕۆیشتین بۆ ئەهواز و ڕۆژێکیشیان سەرمان لە رامسەرەوە دەرچوو و هەڵبەتە لە هەموو شارەکانیشدا هۆکاری میوانداری و شوێنی مانەوە بەشێوەیەکی تەواو ئامادە بوو.

محمد ڕەزا لە زۆربەی شارەکاندا کۆشکی تایبەتی هەبوو و هەڵبەتە دەرگای ئەم کۆشکانە لەبەردەم مندا کراوەبوون لەبەر ئەوەی کە دایکی شاژنی وڵات بووم.

کاتێك هاوڕێکانم ئامادەیی خۆیان دەردەبڕی بۆ سەفەرێك تەنها ئەوەندە بەس بوو کە خزمەتکارە تایبەتەکەم تەلەفۆنێکی بکردایە ئیدی هەمووشتێك ئامادە دەکرا و تەنانەت لەشارەکان و قەزاکان و ناوچەکانی دیکەش بەرپرسەکانی ئەو ناوچانە ئاگادار دەکرانەوە.

من ئەو سەفەرانەم زۆر خۆشدەویست و هەرگیز هیچ یەك لەو سەفەرانە لەبیر ناکەم. ئەوەندە ساتەکان بە خۆشی و شادیەوە تیَ دەپەڕین کە هەرگیز هەستم بە تێپەڕینی کات نەدەکرد.

لەبیرمە شەوێکیان لە شیراز بووین. بڕیارماندا بۆ گەڕانی شەوانە بڕۆین بۆ دەورووبەری شار.

پارێزگاری فارس کەسێك بوو بەناوی پیروز. میوانداریێکی زۆر گەرموگوڕی کردین. من و هاوڕێکانم لە باغی ئیرەم دانیشتبووین. ناوەڕاستی مانگی تەموز و گەرمەی گەرما بوو. هەڵبەتە ئاو و هەوای شیراز مامناوەند و خۆشە وەکو خواجە حافز دەڵێت:

(خوشا شیراز و وضع بی مثالش....)

پیروز کە هاوتەمەنی من بوو لە شیراز چەند شەوماینەوە بۆ ساتێکیش وازی لیَ نەهێناین. شەوێکیان لەسەر پێشنیاری من و هاوڕێکانم لە گەڵماندا هات بۆ دەرەوەی شار. کاتێك گەیشتینە جادەی فڕۆکەخانە، کە تازە دروستکرابوو. توشی ڕیستۆرانێکی تازە بووین کە ناوێکی زۆر جوانی هەبوو بەناوی (گوڵی سور). وەستاین تاوەکو لە ڕستۆرانەکەدا شتێك بخۆین و بخۆینەوە. پاش نان خواردن و خواردنەوەکەمان کاتێك هاتینە دەرە لە ڕستۆرانەکە ڕێك بەرامبەر جادەی فڕۆکەخانەکە کەمانچە ژەنێکی بەتەمەنم بینی لەگەڵ کوڕێکی بچوکی تەپڵ ژەن و کچۆڵەیەکدا کە سەمای دەکرد و جلی ناوچەیی لەبەردا بوو.

ئەم گروپە سێ کەسیە کاتێك ئێمەیان بینی زانیان لە مشتەریە پارەدارەکانین، بۆیە بە پەلە هاتن بە پیرمانەوە و دەستیان بە ژەنین کرد. مۆسیقای ناوچەییان دەژەنی زۆر بە گەرم و سۆزدارانە.

لەگەڵ ژەنیارەکاندا بەرەو ناوچەی باخەکەی ڕێگەی فرۆکەخانە ڕۆیشتین و وەکو خەڵکی ئاسایی لەسەر چیمەنەکە دانیشتین و ئەوانیش چەند گۆرانێك و ئاوازێکی ناوچەییان بۆ ژەنین. پاشان ئێمەش هەستاین و دەستمان کرد بە سەما کردن!

ئەم کارە وای لێکردم بیر لەسازکردنی ئاهەنگێك بکەمەوە بۆ هونەرمەندە شیرازیە ناوچەییەکان و ئەم بیرۆکەیەش بگەیەنم بە فەرەحی کچم.

کاتێك گەڕاینەوە بۆ تاران وتم بە فەرەح لە شیراز توشی کۆمەڵێك هونەرمەندی ناوچەیی بووم کە مۆسیقایان لە قوڵای هەست و سۆزیانەوە دەژەنی.

زۆر پێی خۆش بوو و بە حەزێکی زۆرەوە داوای لێکردم هەمووشتێکی بۆ بگێڕمەوە. باسی ئەوەم کرد کە چۆن ئەو گروپە سێ کەسی یە (باوك، کوڕ و کچ) گۆرانیان دەوت و مۆسیقای ناوچەییان دەژەنی!

فەرەح وتی: ئەم جۆرەی کە تۆ باسی دەکەیت من بیری ژەنیارە گەڕیدەکان و قەرەچەکانی فەرەنسا و ئیسپانیا دەخاتەوە.

ئەگەر ئێمە ئاهەنگێکی مۆسیقی ناوچەییمان هەبێت دەتوانین هەموو ساڵێك لە کاتێکی دیاریکراودا ئەو ئاهەنگ و مۆسیقیانە پێشکەش بکەین و بیکەینە ئاهەنگێکی ساڵانە.

ئەم ڕووداوە سادە و گفتوگۆیەی من و فەرەح (!) بوو بە بنەمای یەکەمین ئاهەنگی هونەری لە شیراز.

چەند ڕۆژ دواتر، فەرەح لە نوسینگە تایبەتەکەی خۆی لەگەڵ ڕاوێژکارە هونەری و ڕۆشنبیریەکانی لەوبارەیەوە گفتوگۆی کرد.

(فەرخی غفاری) کە لە فەرەنسا خوێندبووی و ژیابوو، یەکێك بوو لە دەرهێنەر و هونەرمەندە باوەڕپێکراوەکانی فەرەح، سەرەڕای پێشوازی کردن لەم بۆچوونە پێشنیاری کرد کە بازنەی کارکردنەکە هەندێك فراوانتر بکرێت بۆ ئەوەی بتوانرێت لەسەرتاسەری دنیاردا لایەنگرانی هونەری و هونەرمەندان بانگهێشت بکرێن بۆ شیراز

و فیستیڤاڵێکی مۆسیقی نێونەتەوەیی دروست بکرێت و نوێنەرانی هونەری وڵاتە جیاوازەکانیش بانگهێشت بکرێن بۆ ئێران.

دواتر لەماوەی دانیشتنەکان و بڕیار دەرکردنەکان بۆ ئەم مەبەستە هەرکەس پێشنیارێکی دەکرد و بەرەبەرە بیر لە ڕەهەندەکانی ئەنجامدانی فستیڤاڵەکە کرایەوە.

دەرئەنجام ئاهەنگی هونەری شیراز کە سەرەتا بڕیار بوو تەنها فیستیڤاڵی تایبەتی مۆسیقای ئێرانی بێت، بوو بە ئاهەنگێکی فراوانتر و لەو فیستیڤاڵەدا هەموو جۆرە گروپێکی هونەری و نوێنەرەکانی هونەری سینەما، مۆسیقا، شانۆ، پەیکەرساز و بەتایبەتی گروپە هونەریە تازە و گەورەکانی جیهانیش ئامادەبوون.

لەهەمووی گرنگتر بەشی مۆسیقاکەی گۆڕا بۆ شوێنی ژەنینی مۆسیقای تازەی ئەلیکترۆنی(!)

من تەنها یەکجار لەم فیستیڤاڵەدا بەشداریم کرد و بیرم لەوە کردەوە کە چۆن ڕووداوێکی سادە و چەند کاتژمێرێك گەڕان لە دەرەوەی شاری شیراز و توشبوونمان لەگەڵ ژەنیارە گەڕۆکەکان بووە هۆی سەرەتای بیرۆکەیەك بۆ دامەزراندنی فیستیڤاڵێکی هونەری لە ئێراندا.

هەڵبەتە من هەرگیز لەم جۆرە هونەرانەدا چێژم وەرنەگرت. چونکە نەوەی من و هاوتەمەنەکانم زیاتر حەزمان بەوە دەکرد کە زیاتر گوێ بۆ مۆسیقای سونەتی ئێران بگرین.

خۆم هەمیشە ئاهەنگ و گۆرانیە ناوچەییەکانی گیلکی و بەتایبەتی دەنگی (ناصر مسعودی)یم حەز لێ بوو.

هەندێکجاریش گوێم لە مۆسیقای ئازەری دەگرت بە یادی هاوسەرە ئازەریەکەم و ئەو سەردەمە کورتەی کە پێکەوە بووین. لەناو گۆرانیبێژە ناسراوەکانی ئەو سەردەمیش پوران شاپوریم خۆش دەویست. دەنگی یاسمین، ئالهە و ڤیگنیشم زۆر خۆشدەویست.

هەڵبەتە لەناو ئەستێرەکانی مۆسیقای ئەو سەردەمیشدا دلکش و گوگوش پێگەیەکی تایبەتیان هەبوو بەلامەوە.

ئێستا کە قسە هاتە سەر هونەر و هونەرمەندان پێم خۆشە لەم بوارەشدا باسی چەند بیرەوەرێکم بکەم.

لەناو ئەو کچ و ژنانەی کە لە کۆشك و تەلارە جیاوازەکاندا کاریان دەکرد و بەشێوەیەکی ڕەسمی کارمەندی تەشریفاتی کۆشك یان بەڕێوەبەرایەتی گشتی کۆشکەکان بوون دوو خوشکی بەڕەگەز شیرازیان تێدا بوو کە دواتر بە ناوی خوازراوی (هایدە و مهستی) ناوبانگی زۆریان لە جیهانی مۆسیقای ئێراندا پەیدا کرد.

بەداخەوە یەکێك لەو دوو خوشکە هایدە، چەند ساڵێك پێشتر لە لۆس ئەنجلس بەهۆی جەڵدەوە کە پاش پێشکەشکردنی بەرنامەیەك جەڵدەکە لێیدابوو کۆچی دوایی کرد. ئەم دوو خوشکە لەسەردەمی هەرزەکاریاندا لە کۆشکی سعد ئاباد گەورە بوون و سەر بە خزمەتکارە تایبەتەکانی (شاژنی دایك) بوون.

ئەم دوو خوشکە، بە ڕەگەز شیرازی بوون و لە خزمانی شیرازی (ئیحترام ملوك) بوون کە ژنێکی زۆر مهرەبان و خوێن گەرم و تووڕە بوو، ئەم خاتونە پاش (زوهرا مشهدی) (خزمەتکاری تایبەتی شاژنی دایك) بە دووەمین ژنی دەسەڵاتداری کۆشکەکەی تاج الملوك (شاژنی دایك) دادەنرا.

ناوی ئەسڵی ئەم دوو خوشکە واتە هایدە و مهستی بریتی بوون لە سکینە و خەدیجە.

لێرەدا پێویستە ڕوونکردنەوەیەك بدەم تاوەکو خوێنەرانی ئەم یاداشتە وێنایەکی باشتریان لە ژیانی شاژنی دایك هەبێت.

شاژنی دایك ژنێکی زۆر خوو توند و بەهێز و ڕۆحیەتێکی پیاوانەی هەبوو. دەڵێن بەتایبەتی ئەو کاتەی کە منداڵی کوڕی بینی بۆ ڕەزاشا و بووە دایکی وەلیعەهد خۆی بە کەسێکی زۆر بالاّتر دەزانی لە ژنەکانی دیکەی ڕەزاشا و دوای ڕەزاشاش خۆی بە هاوسەری ڕەزاشا (بنیادنەری سولالەی پەهلەوی) و دایکی شای وڵات دەزانی و زۆر خۆبەزل زان بوو لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا.

ئەگەر بڵێم شاژنی دایك شاژنی بێ هاوتای کۆشکی سعد ئاباد و تەنانەت کوڕەکەشی (محمد ڕەزا) بوو بەهیچ شێوەیەك زیادەڕەویم نەکردوە. ڕاستیەکەی ئەوە

بوو کە خودی منیش هەمیشە هەوڵم دەدا زۆر ڕووبەڕووی نەبمەوە چونکە پێشبینی ڕووبەڕووبونەوەی نەگونجاو و تەصور نەکراوبوو.

شاژنی دایك خزمەتکارێکی تایبەتی هەبوو لەو کاتەوە لەگەڵیدا بوو کە ڕەزاشا هێشتا قەزاقستانێکی سادەبوو خزمەتی تاج الملوکی دەکرد و لەتەمەنیشدا هاوتەمەنی تاج الملوك بوو.

زوهرا مشهدی کە ناوی خێزانیەکەی (ناظر) بوو هەمیشە لەگەڵ تاج الملوك بوو. بەیانی لەگەڵ تاج الملوکدا هەڵدەسا تاوەکو شەو کاتێك دەخەوت لەگەڵیدا بوو. پەیوەندی ئەم ژنە لەگەڵ شاژنی دایك زۆر لە پەیوەندی دوو خوشك نزیکتر و گیانی بەگیانی تر بوو و ئەمەش بەچەشنێك دەسەلاتی پەیداکردبوو کە زۆرجار تەنانەت سوکایەتی دەکرد بە ژنەکانی دیکەی ڕەزا شا واتە عصمت الملوك دولتشاهی (دایکی ئەحمد ڕەزا و حمید ڕەزا و فاتمە پەهلەوی) و خاتونە توران!

پاش ڕووداوی ئۆگۆستی ١٩٤١ و هەڵهاتنی ڕەزاشا لە ئێران کە ئازادی ژنانی کۆشك زیاتر بووبوو شاژنی دایك پیاوێکی هەڵبژارد و زوهرا مەشهدیش لەگەڵ سەرپەرشتیاری تەویلەکانی ڕەزاشادا هاوسەرگیری کرد. یەکەمین پیاوی شاژنی دایك (صاحب دیوان) برای ئەم زوهرا مشهدییە بوو. پاش ئەوەش پێی ژنێکی دیکە بەناوی ئیحترام ملوك شیرازی هاتە ناو کۆشکەوە و ئەم ژنەش زۆر زوو بووە جێگەی سەرنجی تاج الملوك. ئەو دوو کچە هەرزەکارەش کە پێشتر باسم کردن واتە سکینە و خەدیجە شیرازی ئیحترام ملوك لە ساڵی ١٩٦١ هێنانی بۆ تاران و لە کۆشکدا ڕایهێنان بۆ کاروبارەکانی میوانی و پێشوازی و بەڕێوەبردنی ژورەکانی کۆشکی شاژنی دایك.

پێشتر باسی ئەوەم کرد کە شەوانە لە کۆشکی شاژنی دایك ڕایەخی شەونشینی و زەرب و ژەنین دەستیپێدەکرد. من هەندێکجار ئاواتم بۆ ئەو خۆشحاڵی و گەرموگوڕی و بیرکردنەوەیەی تاج الملوك دەخواست. خەم و خەفەت بۆ ئەم ژنە بێ مانا بوو و هەرگیزیش باوەڕی بە پیری نەبوو.

هەموو شەوێك ژمارەیەك ژەنیار لە ڕادیۆی ئێرانەوە دەهێنران بۆ کۆشك و ئەو گۆرانیبێژەشی کە تاج الملوك خۆشی دەویست خاتو ملوك ضرابی بوو.

لەم دواییانەشدا عاشقی جوڵە سەرنجڕاکێشە ژنانەکانی فەریدونی فروخزاد و سەما و ئاوازەکانی بووبوو و دەڵێن هەموو شەوێك فەریدونی بانگهێشت دەکرد بۆ کۆشکەکەی.

لە بەرنامەکانی شەوانەدا، ئەم دوو کچە کە دەنگێکی گەرم و دڵنشینیان هەبوو هەندێکجار بەهاندانی ئیحترام ملوك شعریان دەخوێندەوە و سەمایان دەکرد.

یەکێك لە ژەنیارەکان و ئاهەنگسازەکانی ئەو سەردەمی ڕادیۆ کاتێك کە دەنگی ئەم دوو خوشکە دەبیستێت داوا لە شاژنی دایك دەکات کە ڕێگەی پێبدات بیان بات بۆ ستۆدیۆ و تێستێکیان بکات.

شاژنی دایکیش کە هەمیشە هاندەری هونەر و هونەرمەندان و بەتایبەتی ئاهەنگساز و ژەنیارەکان بوو قبوڵی کرد. و ئەو دوو خوشکەی کە بۆ بەڕێوەبردنی ژوورەکان و خزمەتکردن لە کۆشکدا ڕاهێنرابوون، زۆر زوو بوون بە ناسراوترین گۆرانیبێژی ژن لە ئێران و نازناوی مهستی و هایدەیان بۆ خۆیان هەڵبژارد.

ئەم دوو کچە زۆر پەیوەندیان لەگەڵ شاژنی دایك هەبوو و پاش ئەوەش کە بوون بە گۆرانیبێژی ناسراو زوو زوو دەهاتن بۆ کۆشك و شاژنی دایکیان ماچ دەکرد.

من دەنگی هایدەم زۆر پێ خۆشتر بوو لە دەنگی مهستی. دەنگی خوالێخۆش بوو هایدە زۆر نەرم و بەهێز و وەکو خۆمان دەڵێین زۆر مەخمەلی بوو. لەوانەیە بتوانم بڵێم لە مێژووی مۆسیقای هاوچەرخدا دەنگی وەکو هایدە بێ وێنەبوو.

مهستی شوی کرد بە پیاوێك کە پاش چەند ساڵێك پیاوەکەی بە تاوانی گەندەڵی لە داهاتی دەوڵەت دا دەستگیرکرا و کرایە زیندانەوە[1]. بەڵام شاژنی دایك بەهۆی ئەو پەیوەندیەی کە لەگەڵ مهستی دا هەیبوو لەم بوارەدا دەستوەردانی کرد و پیاوەکەی مهستی دوای چەند ڕۆژێك لە زینداندا ئازاد کرد.

من تاوەکو پێش هاوسەرگیری کچەکەم لەگەڵ پاشا وەکو هەموو خەڵك وێنایەکی خەیاڵی و سەیرم هەبوو بۆ ژیانی شاهانە. ئەم وێنایەش لەسەر بنەمای ئەو چیرۆك و

---

[1] —پیاوی یەکەمی مەهستی بەڕێوەبەری کۆمپانیای یەکەی گواستنەوەی منشەکانی ئابادان بوو و لەم بوجەی ئەم دامەزراوەیە بڕێکی بۆخۆی بردبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کە هاوسەرەکەی هونەرمەند(!) بوو توشی سزادان نەبوو و لە شوێنێکی دیکەدا کارێکی دیکەی پێ درا.

باسانە بوون کە بە منداڵی و هەرزەکاری لەبارەی ژیانی ئەفسانەیی و شاهانەی پاشاکان و سوڵتانەکانەوە خوێندبومەوە.

بەڵام دواتر کاتێك کە بەهۆی هاوسەرگیری کچەکەم لەگەڵ محمد ڕەزا چوومە ناو کۆشکەکانی شاهانەوە گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە ژیانی پاشاکان بەڕاستی ژیانی پاشایانە نیە!

گرنگترین بابەت کە ژیانی ئەم شاهانەیەی تێکدەدا و دەیکردە ژیانێکی دۆزەخی پەیوەستبوو بەو چاودێر و حەرەسە زۆرە توندانەی کە هەیانبوو، بەتایبەتی پاش ڕووداوی هێرشکردنە سەر کۆشکی نیاوەران بە مەبەستی تیرۆر کردنی محمد ڕەزا ئیدی چاودێریەکە زۆر توند و فراوان بوو.

چاودێرانی گاردی شاهنشاهی تاوەکو پشتی دەرگای ژووری نوستن، تایبەتیترین شوێنی ژیانی شەخسی هەرکەسێك، بوونیان هەبوو.

من سەیرم دەکرد کچەکەم و نەوەکانم کەوتونەتە ناو بازنەی چاودێرە یەك ڕەنگ و جل شەخسیەکانەوە.

پرسیارم لەخۆم دەکرد ئایا ئەمە چ جۆرە ژیانێکی شاهانەیە کە دەبێت لە پشت دەرگای ژوری نوستنیشەوە چەند پیاوێکی چەکدار وەستابن!

کاتێك هاوینان دەچووین بۆ نوشەهر لەگەڵ شا و فەرەح و نەوەکانم تەنانەت ژمارەیەك چاودێریش دەنێردرانە ناو دەریاوە! وەکو بڵێی هیچ شوێن و ژینگەیەکی تایبەتی بۆ شای وڵات و هاوسەر و منداڵەکانی بوونی نەمابوو!

من زۆر لەم بارودۆخە بێتاقەت و نیگەران بووم و هەوڵمدەدا زۆربەی کاتەکانی خۆم لە دەرەوەی ئەو کۆشکی شاهانەیەی کە هەمیشە لەژێر چاودێریدابوو بگوزەرێنم.



کۆشکی نیاوەران یەکێك لە کۆشکەکانی محمد ڕەزا شا





کۆشکی سعد ئاباد، یەکێك لە کۆشکەکانی محمد ڕەزاشا

کۆشکی گوڵستان یەکێکی دیکە لە کۆشکەکانی محمد ڕەزا پەهلەوی



ئەشرەف پەهلەوی لەسەر دەمی گەنجیدا



تاج الملوك به پیری دایکی محمد ڕەزا شا



ڕەزا شا لەگەڵ محمد ڕەزاشا (ڕەزاشا
بڕۆشتایە بۆ هەرشوێنێك
بەردەوام کوڕە گەورەکەی واتە محمد
ڕەزای ئەبرد لەگەڵ خۆیدا.



محمد ڕەزا شا



فەرەح دیبا ( خێزانی سێیەمی محمد ڕەزا شا، کچی فەریدە دیبا )



شاو فرح لە سەردانێکدا بۆ ئەردەن ساڵی ١٩٥٢



سهراب دیبا "باوکی فرح" دیبا

## لەناو بازنەی هاوڕێیان دا

مرۆڤ بونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە. هەرکەسێك لە هەر پێگە و پلە و پۆستێکدا بێت پێویستی بەوە هەیە کە هاوڕێی باش و دڵسۆزی هەبێت تاوەکو بتوانێت پێویستیە سۆزداری و دەرونیەکانی خۆی لەلا باس بکات و دڵنەوای یەکتر بکەنەوە. منیش لەم پێویستی و چوارچێوەیە بەدەر نەبووم.

هەرچەندە لە سەردەمی هەرزەکاری و گەنجیدا هاوڕێی هاوتەمەن و خۆشەویستی خۆم هەبوو لە ڕەشت بەڵام دواتر بە ڕۆیشتنم بۆ تەبریز هەموویانم لەدەستدا.

دواتر مەسیری ژیانم لەوانیش جیابوویەوە. ژمارەیەکیان شویان کرد و ڕەشتیان بەجێهێشت. منیش هاتم بۆ تاران و دۆست و هاوڕێ خۆشەویستەکانم پەرتەوازە بوون، لەسەردەمی دووەمی ژیانم، واتە پاش مردنی پیاوەکەم و کۆچکردنم بۆ تاران بوومە خاوەنی هاوڕێی تازە کە لەگەڵ دوو لەو هاوڕێیانەم تاوەکو ئەوکاتەی کە لەئێران بووین بەردەوام هاوڕێیەتیمان هەبوو. بەڵام دوای شۆڕشی ئیسلامی و چوونە دەرەوەم لە ئێران ئەم پەیوەندیە کۆتایی هات و نەمزانی چارەنوسیان چیان بەسەردا هات؟

ئەم دوو خانمە یەکێکیان خاتونێکی پۆڵەندی بوو کە لە سالۆن ئیشی دەکرد لەسەردەمی جەنگی دووەمی جیهانیدا ئاوارەی ئێران بووبوو.

ئەم ژنە پۆڵەندیە لە تاران لەگەڵ ئەفسەرێکی سوپادا هاوسەرگیری کردبوو و لە پیاوەکەشی خاوەنی چەند منداڵێك بوو. بەڵام دواتر لە پیاوەکەی جیابوویەوە و لەگەڵ منداڵەکانی لە دەورووبەری فردەوسی دەژیا. پیاوە بێ وەفاکەشی هاوسەرێکی گەنجی دیکەی هێنابوو.

ژنی دووەم (خاتو ڕۆستەمی) بوو لەڕاستیدا مامۆستای کاری تازەم بوو لە تاران. چونکەن کاتێك لە تەبریزەوە هاتم بۆ تاران. پێش ئەوەی بە یارمەتی براکەم دووکانێکی بەرگدروومانی سەربەخۆ دابنێم ماوەیەك لەلای ئەم خاتونە ئیشم دەکرد.

پاش هاوسەرگیری فەرەح بەهۆی هاتوچۆوە لەگەڵ خێزانی پەهلەوی و پیاوانی پلەیەك و بەرپرسەکانی سوپا و بەشداریکردنی میوانی و دانیشتنەکان، بوومە خاوەنی هاوڕێی تازە کە هەندێکیان خۆشەویستێکی ڕاستەقینەیان هەبوو و هەندێکیشیان هەوڵیاندەدا بەهەر هۆکارێك بووە هەستی خۆیان بلکێنن پێمەوە بۆ ئەوەی لەڕێگەی منەوە لە فەرەح نزیك ببنەوە.

من لەبەر ئەوەی کە سەردەمی منداڵی و هەرزەکاریم بە سەختی و دژواری تێپەڕاندبوو و توانیبووم لەسەر پێی خۆم بوەستم و ژیانی زۆرم ئەزموون کردبوو زۆر بەباشی جیاوازی نێوان خۆشەویستی ڕاستەقینە و خۆشەویستی دروستکراوم جیا دەکردەوە.

لەناو بازنەی هاوڕێکانیشدا هەموو جۆرە مرۆڤێك دەبینرا. زۆرجاریش هەوڵمدەدا هاوڕێ هەڵنەبژێرم و کەسانێکی دیاریکراو نەکەم بە دۆست. چونکە باوەڕم وابوو کە بوونی کەسانی جیاواز لەناو خێزانی جیاواز و شێوەی بیکردنەوەی جۆراوجۆر هەلێکی زێڕینی بۆ دەڕەخساندم تاوەکو بە ڕەوشی تایبەتی خۆم زانیاری و بابەت لەبارەی خۆم و کچەکەمەوە بدۆزمەوە و شتەکانم بۆ دەرکەوێت.

ژمارەیەك لەو هاوڕێیانە سەرەتا دەیانناسێنم و پاشان هەندێك لە بیرەوەریەکانم لەگەڵیاندا باس دەکەم.

## هەندێك لە خاتونەکان:

ئالی ئانتونیادیس، هاودەم السلطنە (کچی یەکەمی ڕەزاشا)، ئازەر و مهین صنیع، ناتاشا ڕەحیمی، قدیسی مسعودی، فەیروزە فەلسفی، فاتمە پەهلەوی، صدیقە شا باجی، سیما علم، ستارە فرمانفرماییان، سەحر ئەنصاری، عصمەت الملوك

دولتشاهی، منیره دولو، خاتو ئینشا، ژاله و شهرزاد ئەفراهی، ملکه ئعتضادی[1]، ربابه ئیقبال، پەروین ئەباصلتی و ژمارەیەکی دیکه که لەکاتی باسەکاندا ئاماژەیان بۆ دەکەم.

## هەندێك لە پیاوەکان:

ئەو پیاوانەی کە لەناو بازنەی هاوڕێ نزیکەکانم بوون و هێشتا لەگەڵ هەندێکیشیان هێشتا لەم بەری دنیاشەوە پەیوەندیم هەیە لەگەڵیاندا بریتین لە:

پێش هەموویان براکەم کە لە گیانم خۆشترم دەویست محمد علی قطبی، ئینجا ژەنراڵ بهرام ئارینا، خسرەو ئەقبال، عباس مسعودی، حسنعلی ئەمیر ئەرجومەند، علینقی ئەنصاری، ژەنراڵ قرەباغی، عزیزاللە پالیزبان، ڕەسول پەرویزی، ئیرەج پزیشك زادە، دکتۆر حاجبی، پەروێز خوانساری، ئەحمەد دیبا، جعفەر شەریف ئیمامی، تەیمور کلالی، غلامرەزا کیانپور، محمود مصلح، سەرلەشکر ناصر مقدەم، قلی ناصری، نعمەت الله نصیری، محمد وەرقا...

هەندێك لەم هاوڕێیانە لە ڕاستیدا هەم لەناو بازنەی هاوڕێیانی من بوون و هەمیش لەناو بازنەی هاوڕێیانی نزیکی فەرەح و کەمێکیشیان وەکو دکتۆر حاجبی و دولو بە نزیکترین هاوڕێیانی شا حساب دەکران.

هەڵبەتە هەندێك هاوڕێیانی پیاوی دیکە هەبوون کە جاروبار لە دانیشتنەکانی مندا ئامادە دەبوون بەڵام بە هاوڕێ جێگیرەکان حساب نەدەکران.

بەوشێوەیەی کە دیارە لەناو بازنەی هاوڕێ نزیکەکانمدا لەهەموو جۆرێك دەبینرێت. لە نوسەرەوە بیگرە تاوەکو بگاتە فەرماندەکانی سوپا و پزیشك و ئارایشگەر و سەرمایەدار و تەنانەت گاڵتەچیش! وەکو (قلی ناصری) کە هونەرمەندێکی گەورە و دەگمەن بوو و کاتێك دەمبینی هاوڕێیانی (قلی) بانگیان دەکرد بە (کەریم شیلەیی جەنابی حەزرەتی شا) زۆر بێتاقەت دەبووم!

---

[1] – چ هەڵبژاردنێکی سەیرە! لەبەر ئەوەی کە ئەمە لە ژنە ناسراوە چەتاوە ڕووەکان بوو و لە ڕووداوی ۱۹۵۳ ڕۆڵی کۆکەرەوەی ژنە خراپەکانی هەبوو بۆ دەربڕینی پشتیوانی خۆیان بۆ گەڕانەوەی شا.

(قلی ناصری) تەنها کەسێك بوو کە دەیتوانی لەناخەوە بمخاتە پێکەنین!

زۆر بەجوانی تەقلیدی هەموو کەسێکی دەکرد. کەسێکی جەستەباریك و دەمووچاو سەوزباو و مامناوەند بوو. هەر بۆیە زۆر بەجوانی دەیتوانی تەقلیدی ڕۆیشتن و قسەکردنی جەنابی شا بکات.

جارێکیان لە دانیشتنێکی میوانیدا کە لە کۆشکەکەی شەمسە لە مهر شهر سازکرا بوو لە بەردەم شادا (قلی) دەستیکرد بە تەقلیدی شێوەی دەنگ و جوڵە ژنانیەکانی هەویدا تەقیلدەکەی بەشێوەیەك کردەوە و بەجۆرێك ئەو تۆنی دەنگەی دەگۆڕی و ژنانە هەڵسوکەوتی دەکرد کە کت و مت لە هەویدا دەچوو. شا و میوانەکانی ئەوەندە پێکەنین و قاقایان لێدا، کە هەندێکیان خەریك بوو ببورێنەوە!

هەویدا ڕەنگی پەڕیبوو داماوە وەکو کەسێکی لێ هاتبوو کە کارەبا گرتبێتی و وشك و بێ جوڵە لەشوێنی خۆیدا وەکو مێخ داکوترا بوو و واقی وڕمابوو لە جوڵە و تەقلیدەکانی (قلی ناصری).

خۆشی میوانەکان زۆر درێژەی نەکێشا و ساردی و بێدەنگێکی هەستپێکراو باڵی کێشا بەسەر دانیشتەنەکەدا ئەویش ئەو کاتە بوو کە (قلی) زیاتر لە سنوری خۆی پێی ڕاکێشا و دەستیکرد بە تەقلیدکردنی جوڵە و شێوەی قسەکردنی محمد ڕەزاشا.

شا هەر لە سەرەتاوە بە دەست ئیشارەتێکی کرد بۆ (قلی) کە لەسەر شانۆکە بێتە خوارەوە. پاشان فەرمانی دەرکرد کە لە دانیشتنەکەدا بیکەنە دەرەوە.

(قلی) ماوەیەکی زۆر جورئەتی ئەوەی نەدەکرد کە لە دووریشەوە سەیری کۆشك بکات. بەڵام لەو دانیشتن و میوانیانەی کە لە ماڵی مندا ساز دەکران بەردەوام بەشداری دەکرد و دەبووە هۆی خۆشی و سەرچاوەی شادی پێکەنینی میوانیەکە.

هەڵبەتە هەندێکجار هونەرمەندانمان بانگهێشت دەکرد بۆ ئەوەی بەشداری بکەن. بەڵام لەناو بازنەی هاوڕێیان، هونەرمەندی لێهاتوو زۆر هەبوون. یەکێك لەو هاوڕێیانە بەڕێز غلامرەزا کیانپور وەزیری داد و (وەزیری ئیتلاعاتی دواتر) بوو کە کەمانچە ژەنێکی زۆر لێهاتووبوو و زۆر هونەرمەندانەش سەمای دەکرد. کیانپور جلی ژەنانەی لەبەر دەکرد و تەقلیدی ڕۆیشتن و جوڵەی ژنی دەکرد و لە کاتی گۆرانی وتن و

هۆنراوە و زەڕب لێداندا سەمای دەکرد و دەبووە هۆی سەرچاوەی چێژ و خۆشی دانیشتنەکان.

من لە هەموو تەمەندا کەسێکم نەبینیوە وەکو کیانپور بتوانێت کەمەر و ناو قەدی خۆی بسوڕێنێت و چەقەنەی بەرز لێ بدات[1]. دەنگی چەقەنەکانی کیانپوری زۆر بەهێز و بەرزبوون!

هەڵبەتە کیانپور هەمیشە لەگەڵ هەویدا بوو و ئێمە تەنها کاتێك ئەومان دەبینی کە هەویداش بهاتایە بۆ دانیشتنەکانمان. ئەم دوو کەسە ڕۆحێك بوون لەناو دوو جەستەدا.

دەڵێن کیانپور پێش ئەوەی بچێتە ناو جیهانی سیاسەتەوە لەناو کافتریا و نادیەکانی شەوانەدا کەمانچەی ژەنیوە و سەمای کردوە. قسەش لەبارەی ئەوەوە دەکرا کە زۆر حەزی لە ژن نەبووە و زیاتر حەزی لە نێربازی بووە کە هەرچەندە من بەهیچ شێوەیەك هیچ شتێکم پێوە نەبینی بەلام دەبێت بڵێم هەویدا و کیانپور ئەو پیاوانە نەبوون کە ببنە جێگەی سەرنجی ژنان. بەڵکو بەبۆچونی من جوڵە و هەڵسوکەوتیان زیاتر بۆ پیاوان جێگەی سەرنج بوو!

هونەرمەندێکی دیکەشمان هەبوو زۆر نزیك بوو لە بازنەی هاوڕێیانی فەرەح. ئەم پیاوە دواتر گەیشتە سەرۆکایەتی دامەزراوەی بوجە و کاروباری بالای دەوڵەت و بەڕاستی بەمانایەکی تەواو پارچەیەك بوو لە پیاوی واقعی.

عبدالمجید مجیدی سەرۆکی دامەزراوەی بەرنامە و بوجەش زۆر بەباشی شارەزای ئامێرە مۆسیقیەکان بوو و زۆر بەجوانیش سەمای دەکرد. هاوسەرەکەشی گۆرانیبێژی ئۆپێرای تاران بوو. من لە هونەر و نمایشەکانی ئەم ژن و پیاوە زۆرجار سودم بینیوە.

(عبدالمجید مجیدی) زۆر حەزی دەکرد لە میوانیەکاندا تەقلیدی (هارۆلڤید) هونەرمەندی ئەمریکی بکاتەوە و میوانەکان بخاتە پێکەنین!

دەبێت ئەوە ڕوون بکەمەوە کە لە ماڵەکەی مندا لەچەشنی بەزم و ڕەزمەکانی شەوانە و میوانی و دەعوەت و دەعوەتکاریە بەردەوامەکانی ئەندامان و خێزانی

---

[1] – محمد رەزا بەم جۆرە پیاوانە دەیویست ئێران بگەیەنێتە سەرەتای (شارستانیەتی گەورە)! بەلام سەرئەنجام خۆی و خێزانەکەی سەریان لە باهاما وپەنەماوە دەرهات...

شایانە نەبوو. من تەنها لەبەر چەند بۆنەیەکی جۆراوجۆر، کە ئەویش نەدەکرا نەکرێن، میوانی و بانگهێشتی پڕ مشەمەرم ساز دەکرد. هەڵبەتە ئەویش زۆر کورت و سنوردار.

(هامدم السلطنه) کچی گەورەی ڕەزاشا لە ژنێك بوو کە ئێمە هەرگیز نەمانبینی. دەڵێن ئەو کاتەی کە ڕەزاشا لەناو کۆمەڵە قەزاقستانیەکاندا لە هەمەدان خزمەتی کردوە لەگەڵ دایکی ئەم کچە هاوسەرگیری کردوە.

هامدەم ژنێکی سیفەت عارف و ئەهلی شیعر و زۆر خۆشەویست و چاکەکار بوو.

بەداخەوە لەبەر چەند هۆکارێك کە هەرگیز بۆ من ڕوون نەبوونەوە، محمد ڕەزا و برا و خوشکەکانی، زۆر حەزیان لە چارەی نەبوو و زۆر بەکەمی لە دانیشتن و بۆنەکاندا ئامادە دەبوو.

لەو هەموو سامان و سەروەتەی ڕەزاشا شتێکی کەمیش نەبووە نسیبی و بەوشێوەیەی کە فەرەح لێکۆڵینەوەی کردبوو و (لەوانەیە محمد ڕەزاش پێی وتبێت) دایکی هامدەم ژنی صیغەی ڕەزاشا بووە و ڕەزاشاش چەند مانگێك پاش بەجێهێشتنی هەمەدان دەزانێت کە ژنە صیغەکراوەکەی منداڵێکی بووە.

ڕەزاشا ئەو سەردەم کە بارودۆخێکی ئابوری خراپی هەبووە ناچێت بۆ هەمەدان بۆ بینینی منداڵەکەی (هەڵبەتە لەو سەردەمەشدا ناسنامە و هەویە بوونی نەبووە بۆیە ناسنامەشی بۆ دەرناهێنرێت!)

ژنە صیغەییەکە کە یاساییەن نەیدەتونی هیچ بکات لە هەمەدان دەمێنێتەوە و منداڵەکە تاوەکو تەمەنی سێ ساڵی گەورە دەکات.

هامدەم کاتێك دەبێتە تەمەنی چوار ساڵ بازی بەخت و چانس دەنیشتە سەر ڕەزاشا و سەربازی سادە دەبێتە دەسەڵاتدار و کەسی یەکەمی هەموو ئێران. پاش گەیشتنە دەسەڵاتی ڕەزاشا، هامدەم و دایکی دێن بۆ تاران و ڕەزاشاش فەرمان دەکات بۆ هاوسەرە صیغەییەکەی موچەیەکی بۆ ببڕنەوە و کچەکەشی تەسلیمی چاودێری پەروەردە و فێرکردن بکرێت.

هەڵبەتە هامدەم خوێندێکی لەو شێوەیەی نەخوێند و لە شێوەی قسەکردن و هەڵسوکەوتیشیدا لەکەسێك دەچوو کە شەشی سەرەتایی تەواو نەکردبێت. لەگەڵ

ئەوەشدا حەزی لە وتن و نوسینی شیعر هەبوو، کە بەداخەوە شیعرەکانیشی زۆر وەزن و قافیەی ڕاستیان نەبوو!

هامدەم کۆمەڵێك شیعری تاڕادەیەك وەزن و کێشی دەنوسی و ئینجا دەیدان بە شاعرێکی بەناوبانگ تاوەکو کێشەکانیان چارەسەر بکات و ڕێکیان بخات.

ئەم شاعرە بەهەست و زەوقە تەنها بوو و تاوەکو کۆتایی تەمەنیشی شوی نەکرد. قەد و قیافەیەکی جوانیشی هەبوو و وەکو خۆمان دەڵێن ڕوو بە بازاڕ بوو. زۆر بە هەست و ئەدیبانەش قسەی دەکرد. ناوبانگێکی باشیشی هەبوو و لایەنگرێکی زۆریشی هەبوو. لەگەڵ ئەم پێناسانەدا نازانم چ نەخۆشیێکی هەبوو کە بەردەوام بەشوێن ژنانی بەتەمەنی کۆشکەوە بوو و هەمیشە حەزی دەکرد لەگەڵ ژنانی پیردا هەڵسوکەوت بکات!

مرۆڤ بونەوەرێکی ئاڵۆزە من باوەڕم وایە ئینسان لەوانەیە لە ئایندەدا زۆر لە نهێنیەکان ئاشکرا بکات (و بێگومان بەم پێشەکەوتنی زانستە سەرسوڕهێنەرەش لەوانەیە نەناسراویەکان و نهێنیەکانی جیهان ئاشکرا بن و بدۆزرێنەوە.) بەڵام بەدووری دەزانم هەرگیز ئینسان بتوانێت دەستی بگاتە نهێنیەکانی دەروونی خۆی و تێ بگات لە دەروونی ئاڵۆزی خۆی.

هامدەم زۆر ڕقی لە باوکی بوو چونکە هیچ خێرێکی لێ نەبینی بوو. هەرچەندە هەرگیز ئەم ڕق و قینەی ئاشکرا نەکرد و نەیخستەڕوو. بەڵام لەو قسە و باسە تایبەتیانەی کە دەمانکرد هەمیشە ئەم پرسیارەی دەکرد کە بۆچی ڕەزاشا ئەوی خۆش نەدەویست و پاش گەیشتنە دەسەڵات کچە چوار ساڵەکەی نەهێنایە لای خۆی و ڕێگەی نەدا لەگەڵ برا و خوشکەکانی دیکە گەورە بێت و پەروەردە ببێت؟

هەمیشە وەکو قوربانی ناوی دایکی دەبرد و دەیوت لەگەڵ ئەوەی کە ڕەزاشا گەیشتە دەسەڵات و بووە فەرمانڕەوای هەموو وڵات لەبری ئەوەی ژنی یەکەمی خۆی بهێنێت بۆ تاران و دڵنەوای بکاتەوە ژنانی دیکەی هەڵبژارد. ڕەزاشا پاش ئەوەی کە لە هەمەدانەوە دەگوازرێتەوە بۆ ناوچەی ئازەربایجان و گەیلان و پێش کودەتای ١٩٢٠ هاوسەرگیری کرد لەگەڵ تاج الملوك کە کچێکی ئەفسەرێکی قەزاقستانی یان قزاقی بوو.

ڕەزاشا بۆ تـاج الملـوك لـە سـعد ئابـاد کۆشـکێکی تایبـەتی دروسـتکردبوو کـە بـە کۆشکی شاژنی دایك بەناوبانگ بوو. تاج الملوك لەبەر ئەوەی کە دایکی محمد ڕەزاشا بـوو پلـە و پێگـە و نزیکێکـی تایبـەتی هـەبوو لەگـەڵ ڕەزاشـا و بـە کەسـی یەکـەمی سعدئاباد دادەنرا.

ڕەزاشا لە ساڵی ١٩٢٧ هاوسەرێکی دیکەی هێنا کە ناوی ملکە توران (تـوران ئـەمیر سـلیمانی)[1] بـوو و غلامـرەزا پەهلـەوی کـوڕی ئـەو بـوو. تـوران لـە خێزانـی قاجـار و خاوەنی جوانی و ڕووخسارێکی سەیر بوو، هـەر لـەم ڕوانگەیـەوە بوو کە کەوتـە بـەر ئامـانجی دوژمنکاریـە ژەهراویـەکانی تـاج الملـوك و بەخیلیـە ژنانەیەکانەیـەوە و پـاش ساڵێك ژیان لە سعد ئاباد لە ڕەزاشا جیا بوویەوە.

دواتر ڕەزاشا لەگـەڵ کچی مجلل الدولـە (نـەوەی فتحعلیشاه قاجار) هاوسـەرگیری کـرد کـە دەرئـەنجامی ئـەم هاوسـەرگیرەش ٥ منـداڵ بـوون بـەناوەکانی (عبـدالرزا، ئەحمدڕەزا، محمودڕەزا، حەمیدڕەزا و فاتمە).

هەڵبەتـە مـن بـە چـاوی خـۆم نـەمبینی بـەڵام هامـدەم الـسلطنە باسـی زۆر سـەیر و توندوتیژانـەی تـاج الملـوکی دەکـرد و دەیـوت تەنانـەت تـاج الملـوك لەڕێگـەی خزمـەتکارەکانی خۆیـەوە بـە دار و شـەلاق هێرشـی دەکـردە سـەر عـصمت الملـوك و دارکاری دەکرد.

(عصمەت) لەبەر ئەوەی کە دایکی ٥ منداڵ بوو لە ڕەزاشا جێگەی گرنگی تایبـەتی ڕەزاشا بـوو. هـەر لەبـەر ئـەوە بـوو ڕەزاشـا عـصمەتی لـە سـعد ئابـاد لابـرد و بـردی بـۆ کۆشکێك لە باکوری مەیدانی ئەرەك بۆ (کۆشکی گوڵستان).

ڕەزشا زۆربەی کاتـەکانی خـۆی لەگـەڵ عـصمەتدا دەگوزەراند و زۆر گرنگـی بـە تـاج الملوك نەدەدا، هەر لەبـەر ئـەوەبوو پـاش بەجێهێـشتنی ڕەزاشـا لـە ئێران (تـاج الملـوك) تۆڵـەی خـۆی سـەندەوە و عـصمەتی لـە کۆشـکی گوڵستان دەرکـرد و عـصمەت تـاوەکو ئەو ڕۆژەی کە ئێمە لە ئێران بووین لەماڵێکدا لە جادەی سعد ئاباد (لـەو جادەیـەی کە لە تەجریشەوە بەرەو کۆشکی سعد ئاباد دەڕوات) دەژیا.

[1] – خاتو توران ئەمیر سلیمانی هاوسەری ڕەزاخان یەك ساڵ زیاتر نەیتوانی لەگەڵیدا بژی.

هامدەم باوەڕی وابوو بەخیلی و دوژمنایەتی تاج الملوك بووە هۆی ئەوەی ڕەزاشا دایكی دەربكات و ئامادە نەبێت.كچە گەورەكەی لە كۆشكدا قبوڵ بكات.

ڕەزاشا مانگانە ٢٠ تمەنی بڕیبوویەوە بۆ دایكی هامدەم كە لەسەر هەموو مانگێك بەڕێكوپێكی دەدرا. ئەم ژنە تاوەكو كۆتایی تەمەنی لە هەمەدان ژیا و هیچكاتێك ڕەزاشای نەبینی.

هەندێكجاریش، ڕۆحیەتی شەڕانگێزی تۆڵەسەنێرانەی هامدەم وای دەكرد بۆ ئەوەی وەكو خۆی دەڵێت زەربەیەك بدات لە كەرامەت و ناوبانگی براكەی محمد ڕەزا بۆیە بە ئەنقسەت ئیشێكی دەكرد و زۆرجاریش دەگیرا و دەبرا بۆ پۆلیس بۆ لێكۆڵینەوە و لێپرسینەوە.

بۆ نمونە بە سەیارە لەكاتی ڕۆیشتندا دەیدا لە سەیارەیەكی حكومی تاوەكو پۆلیس دەستگیری بكەن و بیبەن بۆ بنكەی پۆلیس!

جارێكیان بە ئەنقسەت بۆ سەرنجڕاكێشانی خەڵك بە سەیارەكەی دەڕواتە ناو سەوزاییەكەی مەیدانی فردەوسی، كە ئەو كاتە ئەو مەیدانە یەكێك بوو لە چوار مەیدانە ئەسڵیەكەی تاران و سەیارەكەی خستبویە ناو ناوەڕاستی حەوزی ئاوەوەكەوە!

كاتێك دەیبەن بۆ بنكەی پۆلیس سەرەتا خۆی ناناسێنێت و ناونیشانی سەیر و سەمەرە باس دەكات تاوەكو سەر لە پۆلیسەكان تێكبدات.

كاتێك كە هەراكە پەرە دەسێنێت و كێشەكە قەیراناوی دەبێت بڕیار دەدەن بیبەن بۆ دادگا، لەوكاتەدا ناسنامەی ئەسڵی خۆی ئاشكرا دەكات و كارمەند و پۆلیسە داماوەكانیش كاتێك تێ دەگەن كە خوشكی شایە هێنراوەتە بنكەی پۆلیس و گیراوە توشی واقوڕمان دەبن و ترسیان لێ دەنیشێت.

ئەم فیڵ و بەزم و هەرا نانەوە دەبووە هۆی ئەوەی لەبارەی ئەم خوشكە گەورەیەی شاوە قسە و باسی زۆر بڵاوببێتەوە و ببێتە هۆی ئەوەی زیان بدات لە ئابڕو و حەیای شا. (بۆ نمونە دەیانوت خوشكی گەورەی ڕەزاشا گێل و گەمژەیە!)

محمد ڕەزا چەندینجار پێی دەوتم بێتاقەت و نیگەرانی ئەم ژنە خراپەم. داوای لێ دەکردم تاوەکو ئامۆژگاری بکەم و پێی بڵێم ئاگاداری ئابڕو و حەیای بنەماڵی خێزانی پەهلەوی بێت و کارێك نەکات کە لەناو خەڵکدا باسمان بکرێت.

دووبارە دەبێت ئەوە بڵێم کە هەندێك باس و خواست هەیە خۆم نەمبینیون بەڵام لەلایەن کەسانی ئاگادار و جێگەی متمانەوە بیستومن. بۆ نمونە دەیانوت ڕەزاشا لە ژنێکی صیغەی دیکەش کوڕێکی هەبوو کە گەورەتر بووە لە محمد ڕەزا.

(فەرەح) ئەوی بینی بوو دەڵێن شێوەی زۆر لە شاهپور غلامرەزا دەچوو[1].

محمد ڕەزا بێتاقەت دەبوو بە قسەکردن لەبارەی ژیانی تایبەتی و شەخسی ڕەزاشای باوکی و حەزیشی نەدەکرد لەبارەی هامدەمەوە قسە و باس بکرێت. و بەتەواوی بێزار و نارەحەت دەبوو بە بانگهێشتکردنی هامدەم و شاهپور حمید ڕەزا بۆ میوانی و دانیشتنەکان. تەنانەت فەرمانی دەرکردبوو کە نازناوی سەڵتەنەتی حمیدڕەزا لابەرن بەناوەکەیەوە و تەنها بە ناوی ئاغای حمید ڕەزا پەهلەوی بانگ بکرێت. لەکاتێکدا براکانی دیکەی محمد ڕەزا بە ڕێزێکی زۆری وەکو جەنابی حەزرەت ناو دەبران.

لەسەرەتاوە کە ئاگاداری ئەم کێشە هەستیارانە نەبووم لەو ئاهەنگانەی کە بەبۆنەی ساڵ ڕۆژی لەدایکبوون یان هاوسەرگیری یان ڕۆژانی نەتەوەیی وەکو جەژنی نەورۆزەوە سازم دەکردن بانگهێشتی حمید ڕەزا پەهلەویشم دەکرد.

حمید ڕەزا زۆر لە دایکی ملکە عصمەت دەچوو، من عصمەتم خۆشدەویست. یەکەم لەبەرئەوەی کە خەڵکی ناوچەی خۆم بوو و کاتێك لەگەڵیدا دەبووم جۆرە هەستێکی شیرینی نزیکی سۆزداریم پەیدا دەکرد کە زۆر خۆش و دڵنشین بوو بۆم.

---

[1] – پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی هەندێك لە بڵاوکراوەکان ئەم کەسەیان دۆزیەوە و چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەنجامدا. بەو شێوەیەی کە خاتو فەریدە دیبا دەڵێت، هاوشێوەیەکی سەیر لە نێوان ئەم پیاوە و غلامرەزا پەهلەوی هەبوو. سەرپەرشتیاری کرێکارێك لە هێڵی ئاسنی (راه اهن) بەناوی ڕەزا پور ئیشی دەکرد، دەیوت من کوڕی ڕەزا شام و دایکم قەزوینی بووە لە کۆشك جارجار بڕێك پارەم وەردەگرت.

دووەم لەبەرئەوە کە ملکە[٢] عصمەت بەهیچ شێوەیەك خاوەنی ئەو لوت بەرزی و خۆبەزلزانینە نەبوو کە خێزانە دەوڵەمەندەکان هەیان بوو و لەگەڵ ئەوەی کە لە بنەماڵەی خێزانی قاجار و نەوەی فتحعلیشاە و خاوەنی ئەسڵ و نەسەبێکی گەورەش بوو، بەڵام هەرگیز بەشێوەیەك هەڵسوکەوتی نەدەکرد کە نیشانەی جیاوازی و چینایەتی پێوە دیار بێت لەگەڵ کەسانی دیکەدا.

حمید ڕەزا مێبازێکی زۆر سەیر بوو. لەچەند ناوچەیەکی تاراندا چەند خانوو و شوێنێکی گەورەی هەبوو، کە لەهەر شوێنێکیاندا ژنێکی جوانی تێدا ڕاگیر کردبوو.

خانوویەکی گەورەی هەبوو لە تهران پارس، کە من چەندجارێك ڕۆیشتوم بۆ ئەو ماڵە. بەڵام دواتر کە تێگەیشتم لە هەستیاری محمد ڕەزا هاتوچۆم لەگەڵ محمد ڕەزا پەهلەوی بەتەواوی کەم کردەوە.

حمید ڕەزا پاش شۆڕشی ئێران لەگەڵ منداڵەکانی و دایکی لە تاران مایەوە و ناوی خێزانی خۆی لە پەهلەویەوە گۆڕی بۆ ئیسلامی.

ملکە عصمەت کە لە ئێران مابوویەوە ساڵی ١٩٩٥ لە نەخۆشخانەی (دی) لە تاران لە تەمەنی ٩٠ ساڵیدا بەهۆی پیری و سستی دڵیەوە کۆچی دوایی کرد و مەیتەکەی لە گۆڕستانی بەهەشتی زەهرا نێژرا.

حمید ڕەزاش لە تاران کۆچی دوایی کرد و لە بەهەشتی زەهرا نێژرا.

دەوڵەتی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران لەگەڵ هاوسەرەکەی ڕەزاشا و منداڵەکانی بە نەرمی هەڵسوکەوتی دەکرد و ئەوان لە ماڵی خۆیان لە زعفرانیە لە تاران ژیانێکی ئارامیان هەبوو.

یەکێکی دیکە لە ئەندامانی خێزانی پەهلەوی کە ئێمە ڕێگەمان پێ نەدەدرا لە ئاهەنگ و کۆبوونەوە و میوانیەکانی خۆماندا میوانداری بکەین شاهپور علیڕەزا بوو.

علیڕەزا تەنها برای باوك و دایکی محمد ڕەزا بوو کە لە تەمەنی ٣٢ ساڵی بەهۆی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەوە کوژرا. علیڕەزا لە ساڵی ١٩٤٥ لەگەڵ کچێکی ئاوارەی پۆڵەندی کە (لە ئاوارەکانی جەنگی جیهانی دووەم بوو) بەناوی (کریستیم کڤیلوسکی) هاوسەرگیری کرد و کوڕێکیشی لێ بوو بەناوی (علی).

---

[٢] – خاتو عصمت دولتشاهی کچی مجلل الدولە بوو لە شازادەکانی کرماشان.

علی (لەدایکبووی ١٩٤٦) بوو لەبەر ئەوەی کە بەردەوام مامی واتە (محمد ڕەزای) بە هۆکاری کوژرانی باوکی دەزانی دەستیکرد بە چالاکی سیاسی لەدژی محمد ڕەزا.

لە ساڵی ١٩٧٦ پیاوەکانی ساواك شوێنی شاهپور علی پەهلەوی و هاوسەرەکەیان لە ئەشکەوتێکی چۆڵ لە دەوروبەری قەزوین دۆزیە و زۆر دڕندانە هێرشیان کردە سەریان.

بەڵام علی لەم هێرشەی ساواك ڕزگاری بوو و پاش ماوەیەك لە دەستبەسەری ئازاد کرا، بەڵام لە خێزانەکەی کرایە دەرەوە و بێ بەری کرا.

علی پەهلەوی تاوەکو چەند ساڵێکیش دوای شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران مایەوە، بەڵام ئێستا لە ئەمریکا دەژی.

لەگەڵ ئەندامانی دیکەی پەهلەوی کێشەیەکی لەو شێوەیەمان نەبوو. بەڵام هەوڵمدەدا لەو میوانی و ئاهەنگانەی کە ئەشرەف و منداڵەکانی ئامادە دەبوون کەمتر بەشداری بکەم و ئەمەش بەهۆی پێگەی تەمەن و پەروەردەی خێزانی و ئەو حەیا و حورمەتەوە بوو کە من بەشێوەی سونەتی لەناویدا گەورەبووبووم و لەناو قوڵای جەستە و گیانمدا ڕەگی داکوتابوو.

جەنابی خاتو ئەشرەف هەرچەندە لە مەراسیمە ڕەسمیەکان و لە بەردەم خەڵکیدا زۆر بەجدی ئامادە دەبوو، بەڵام بەڕاستی ژنێکی ئازاد و لایەنگری یەکسانی بێ چەند و چۆنی ژنان بوو لەگەڵ پیاواندا.

ئەشرەف ئەم ڕۆحیەتەشی لەناو منداڵەکانیشیدا پەروەردە کردبوو و هاوسەرەکەشی بچوکترین ڕێگری نەدەکردن بۆ چێژوەرگرتنەکانیان.

من هاوسەرەکانی پێشوتری جەنابی خاتو ئەشرەفم نەبینی بوو. بەڵام ئەوەم دەزانی کە ئەو یەکەمجار لەسەر داواکاری ڕەزاشا شوی کردبوو بە یەکێك لە موڵکدارە گەورەکان بەناوی (علی قەوام) و پاش ئەویش شوی کردبوو بە سایق تەکسیێکی میسری بەناوی (ئەحمد شفیق).

ئەشرەف لە هاوسەرگیری یەکەم و دووەمی خۆیدا خاوەنی چەند منداڵێك بوو. شەهرام منداڵی پیاوی یەکەمی و شەهریار و ئازادە شفیقیش لە منداڵی شوی دووەمی بوون.

شەهریار بوو بە ئەفسەری هێزی دەریایی ئێران و دواهەمین پۆستیش کە وەری گرت بووە فەرماندەی هێزی دەریایی. شەهریار پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی، لە پاریس کوژرا.

کچی دکتۆر (منوچهر ئیقبال)، سەرۆکی کۆمپانیای نەوتی ئێران کە ناوی مریەم بوو، هاوسەری شەهریار بوو کە ماڵیان لە جادەی فریشتە بوو لە تاران.

ئەشرەف پاش جیابوونەوەی لە هاوسەری دووەمی ماوەیەك بە تەنهای مایەوە و سەرئەنجام شوی کرد بە (مهدی بوشهری پور)، سەرۆکی نوسینگەی فرۆکەوانی ملی ئێران لە پاریس.

ئەم دووانە هەرچەندە بەشێوەیەکی ڕەسمی ژن و پیاو بوون بەڵام لە کۆبوونەوە و ئاهەنگ و مەراسیمەکاندا حەقیان بەسەر یەکترەوە نەبوو و من لەو دیمەن و نمایشانەی کە لەم دوو کەسەم دەبینی ئازارم دەکێشا و بێتاقەت دەبووم.

هەر لەبەر ئەوەش بوو کەسانێك منیان بە ژنێکی کۆنەپەرستی سەردەمی سەدەکانی ڕابردوو دەزانی.

ئەشرەف چەندینجار لەژێر چاودێری پرۆفیسۆر (تسە)، نەشتەرگەری زۆر گرانبەهای پلاستیکی و جوانکاری ئەنجامدەدا تاوەکو چرچ و لۆچیەکانی دەموچاوی لابەرێت و گەنج بنوێنێت.

(پرۆفیسۆر تسە پزیشکی تایبەتی خێزانی پەهلەوی و زۆر جێگەی ڕێزی محمد ڕەزا و کچەکەم بوو) لێرەدا حەز ناکەم بڕۆمە ناو باسێکەوە کە تایبەت بێت بە ژیانی شەخسی کەسانێکەوە. من باوەڕم وایە ژیانی تایبەتی هەرکەسێك پەیوەندی بە خودی خۆیەوە هەیە و هەموو کەس ئارەزوی خۆیەتی چۆن بڕیاری ژیانی خۆی دەدات. بەڵام لەبەر ئەوەی کە خۆم جۆرێکی دیکە ژیانم قبوڵ دەکرد و لەتوانامدا نەبوو خەڵکانی دیکە ناچاربکەم وەکو من بژین و بیر بکەنەوە ناچار دەبووم خۆم لەم جۆرە ئاهەنگ و کۆبوونەوانە جیا بکەمەوە و لەم ڕووەوە تاوەکو ڕادەیەك گۆشەگیریانە بژیم.

هەندێك کات هەستم بە پوچی و بێ هودەی دەکرد. کەسایەتی و شەخسیەتی خۆم بەتەواوی لەدەستدا بوو. هەموو کەس منیان وەکو دایکی شاژن دەناسی. دەمزانی

ئەگەر بانگهێشتێك بكرێم تەنها لەرووی ناچاریەوەیە و ئەگەر دایكی شاژنی وڵات نەبوومایە هەرگیز ئامادە نەبووم بڕۆمە ئەو جۆرە كۆبوونەوە و بانگهێشتانەوە.

هەندێكجار دەیدا لەسەرم بۆ ئەوەی لەنێوان ئەو هەموو خوازبێنیكەرانەی كە لە هەموو جۆرە كەسێكەوە بیگرە لە فەرماندەی سوپاوە تاوەكو بگاتە پزیشك و سیاسەتمەدار و بازرگان و لە هەر كۆمەڵەیەكی تەمەندا بێت تەنانەت گەنجانیش یەكێك هەڵبژێرم و بۆ دەرچوون لەو گۆشەگیریە بۆ ئەوەی ژیانێكی تازەی هاوسەرگیری دەستپێبكەم.

تەنانەت جارێكیان بۆ دەستبردنی ئەم ئەزموونە تازەیە زۆر چوومە پێشەوە و زۆر بەجدی یەكێك لە خوازبێنیكەرەكان بووە جێگەی سەرنجم، بەڵام ڕووداوێكی تاوان لە تاران منی لەم بڕیارە پاشگەز كردەوە و بۆ هەمیشە بیركردنەوە لە شوكردنم لە سەردا دەرهێنا. لەو سەردەمەدا سوخۆرێكی ناسراوی تارانی كە موڵك و ماڵی زۆر فراوانی هەبوو لە تاران بە دەستی یەكێك لە قەرزدارەكانی كوژرا.

ئەم پیاوە بەتەمەنە ناوی (عبدالله شرخر) بوو. (ڕۆژنامەكانیش هەر بەم ناوە ناویان بردبوو).

(عبدالله شرخر) لە ڕێگەی سوخۆری و پێدانی قەرز بووبوویە خاوەنی سەدان خانوو و لە هەموو ناوچە جیاوازەكانی تاران. پاش كوژرانیشی ڕۆژنامەكان نوسیبوویان خانوویەكی دوو قاتی تایبەت كردبوو بە هەڵگرتنی سەنەد و تاپۆ و بەڵگە جۆراوجۆرەكانی!

دواتر كاتێك كە ڕۆژنامەكان بابەتی تازەتریان پەیدا دەكرد هەواڵ و ڕاپۆرتیان لەبارەی عبداللە شرخرەوە دەخستەڕوو و بە ئاسانی وازیان لێ نەهێنا و پاش كوشتنی ئەو پیاوە پیرە ڕۆژنامەكان زانیاریان بڵاوكردەوە كە تەنها وارسی ئەو سامانە ئەفسانەییەی عبدالله شرخر دایكە پیرە بەتەمەنەكەیەتی!

سوخۆری ناسراوی تاران ژن و منداڵی نەبوو و تەنها خاوەنی ئەو دایكە پیرە بوو، بەپێی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەكان پاش مردنی كوڕەكەی ژمارەیەكی زۆر خوازبێنیكەر پەیدابووبوون بۆی، كە دیار بوو ئەم خوازبێنیكەرانە لەڕاستیدا خوازبێنی سامان و

موڵەکەی ژنەکەیان دەکرد، ئەگەرنا کام گەنج هەیە بیەوێت لەگەڵ ژنێکدا هاوسەرگیری بکات کە لە تەمەنی نەنکیدا بێت!

من کاتێک ئەم هەواڵەم خوێندەوە توشی گومان بووم. توانای جیاکردنەوەی پێویستم نەبوو کە بزانم ئایا خوازبێنیکەرەکەم دەیەوێت لەگەڵ مندا هاوسەرگیری بکات یان دەیەوێت ئەو پێگە تایبەتە بەدەست بهێنێت کە من لەناویدا بووم بۆ ئەوەی لەو ڕێگەیەوە ئەو کەسە گەورە ببێت و ئەوە بەدەستبهێنێت کە دەیەوێت. باسی ئەم کابرایە بووە هۆی ئەوەی کە بۆ هەمیشە دووبارە بیرکردنەوە لە شوکردن لەسەرم دەربێنم. کاتێک کە فەرەح لەگەڵ محمد ڕەزاشا هاوسەرگیری کرد ژنێک بووم تازە بەتازە پێم دەخستە ناو میان سالّی و تەمەن وەستاویەوە و هێشتاش هەر ئەو چانسەم هەبوو کە بتوانم هاوسەرگیری بکەم. بەڵام هەر ئەم گومان و دوودڵیانە بوونە هۆی ئەوەی کە بیری چانسی بەدەستهێنانی ژیانێکی هاوبەش و گەرمی خێزانی بۆ هەمیشەی لەبیرکردنەوەمدا دەرکەم.

بەها و نرخی هاوسەرگیری و بوونی هاوسەر لە ڕۆژگاری پیریدا زۆرتر هەستپێکراوتر و بەنرخە. ئێستا کاتێک کە ئەو ژن و پیاوانە دەبینم کە لە ڕۆژگاری پیریدا مهرەبانانەتر بەیەکەوە هەنگاو دەنێن و دەگەڕێن هەستی بێزاری و بێتاقەتی دڵم دەگرێت و بە قوڵی بیر دەکەمەوە لەوەی کە ئەو ساڵانی شکۆمەندی و گەورەییە بەها و نرخی ئەم ڕۆژە تەنهاییانەیان نیە.

کاتێک کە کچێکی هەرزەکار بووم کەوتمە ژێر کاریگەری هەستی تایبەتی هەرزەکاریەوە و بوومە عاشقی کوڕە مامێکم. کوڕە مامەکەم هەرچەندە کاتێک کە هەلێکی بۆ دەڕەخسات و دوور لە چاوی خێزانەکەم منی بە پاکی ماچ دەکرد، بەڵام کاتێک کە بڕیاریدا ژن بهێنێت لەبەر ئەوەی کە باوکم مردبوو و بارودۆخی دارایی خێزانیمان باش نەبوو کەوتە دووی خێزانێکی دەوڵەمەندتر و باشتر لە ئێمە و لەگەڵ کچێکی دیکەدا هاوسەرگیری کرد.

ئەم کوڕە بێ سۆزەی مامەم کاتێک بینی من گەیشتبوویمە پێگەکەیەکی باش هەوڵیدەدا بەهەر شێوەیەك بووە ئاگری عشقی کۆن لەناومدا زیندوو بکاتەوە و لەگەڵمدا هاوسەرگیری بکات.

کاتێك پێم وت ئێستا تۆ خاوەنی هاوسەر و چەند منداڵێك و تەنانەت نەوەشت هەیە وتی بۆ تۆ ئامادەم هەموویان فڕێ بدەمە ناو دەریاوە!

من لەو هەموو بێ وەفاییەی ئاگرم دەگرت و سەرئەنجام دەرم کرد و بە ڕوونی پێم وت ئیدی مافی ئەوەت نیە جارێکی دیکە بێیتەوە بەلامدا.

پاش هاوسەرگیری فەرەح لەگەڵ محمد ڕەزا، زۆرێك لە خزمە نزیك و دوورەکانی (دیبا) کە هەندێکیشان بەڕاستی باش نەمدەناسین بەرەو کۆشك دەهاتن. خزمەکانی خۆشمان هەرچی قطب و قطبی بوون هەموو هاتن بۆ لامان.

فەرەح میوانداری هەموو ئەو کەسانەی دەکرد و وەڵامی خواستەکانیشی دەدانەوە. بەڵام من سەیری نیەتیانم دەکرد و پرسیارم لە خۆم دەکرد ئایا ئەمانە لەماوەی ئەو هەموو ساڵانەی بەدبەختی و کەم دەستیدا لە کوێ بوون و بۆچی نەدەگەڕان بە شوێن من و کچەکەمدا؟ هەڵبەتە دیار بوو ئەگەر ئێستا فەرەح هاوسەری شای نەبوایە و ئێمەش ئەم پێگە باشەمان نەبوایە، هەرگیز ئێمەیان لەبیر نە دەبوو.

پەندێکی پێشینان هەیە دەڵێت: (ئینسانەکان هاوڕێی ڕۆژە خۆشەکانی خەڵکن!) هەندێك کات زۆر خەڵکم دەبینی کە هەریەکەیان بەڕێگەیەك هەوڵیاندەدا خۆیان لە فەرەح نزیك بکەنەوە و زۆرجاریش لە دەربڕینی خۆشەویستیان و دووپاتکردنەوەی هاوڕێیەتیان زیادەڕەوی زۆریان دەکرد و بەشێوەیەکی زۆر زیاد لەڕادە دۆستایەتی خۆیان دووپات دەکردەوە، زۆرجار سەرەڕای ئەو پەندە پێشینانەیە کە باسم کرد هەمووجارێك ئەو جۆرە کەسانەم دەبینی ئەم پارچە شعرەم بیر دەکەوتەوە کە دەڵێت:

(ئەم هاوڕێ قەڵبانەی کە دەیانبینی، کۆمەڵە مێشێکن لە دەوری شیرنی!)

بەم شێوەیە کەوتبوومە ناو کۆمەڵێك دۆست و هاوڕێوە کە هەریەکەیان بەشێوەیەك بەدووی ئامانجی خۆیانەوە بوون.

هەڵبەتە لەناو ئەم کۆمەڵەیەشدا یەك یان دوو کەسێك هەبوون کە دڵنیام تەنها خۆم گرنگ بووم بۆیان و ئەگەر ژنێکی باش و ئاساییش بوومایە ئەوا بەردەوامیمان دەدا بە هاوڕێیەتیم.

فەرەح کە بۆ خۆی دەزگایەکی گەورەی بەڕێوە دەبرد بەناوی (نوسینگەی تایبەتی جەنابی خاتو فەرەح پەهلەوی) و لەو دەزگایەدا کاری خێرخوازی دەکرد و لەگەڵ

ئەوەدا تەواوی ئەو نامە و گلەیی و داواکاریانەشی وەردەگرت کە لەسەرتاسەری ولاتەوە دەنێردران، هەڵبەتە لە چوارچێوەیەکی بچوکتریشدا دامەزراوەیەکی دیکەی ڕێکخستبوو تاوەکو من و هاوڕێکانم بۆ بەرژەوەندی گشتی و جۆرە کارێکی خێرخوازانە لە ڕێگەی ئەو نوسینگەیەوە بەڕێوەبەرین. بەلاّم من زۆر حەزم لە ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ئەم جۆرە کارە زرق و برق و پڕ تێچونانە نەبوو.

هەموو هەفتەیەك نامەی زۆر لەسەرتا سەری ولاتەوە دەگیشتە دەستم کە نەمدەتوانی هەموویان بخوێنمەوە و تەنانەت نەمدەتوانی وەلاّمی نیوەشیان بدەمەوە.

نامەکان نارەحەتکەر و هەندێکیشیان جێگەی نیگەرانی بوون. سەرەتا هەندێك لە نامەکانم دەخوێندەوە. بەلاّم دواتر داوام کرد لەفەرەح کە فەرمان بدات بە نوسینگەکەی تاوەکو هەموو ئەو نامانە بخوێنێتەوە کە دێن بۆ من. فەرەحیش ئەم کارەی کرد و خوێندنەوە و بەدواداچوون و چارەسکردنی ئەو داواکاریانەشی خستە ئەستۆی بەڕێز مصلح.

نوسەری نامەکان بەزۆری کەسانێك بوون کاتێك بەدواداچوونێکیان دەکرد بۆ کێشەیەکیان یان کاتێك دەیانویست بەرپرسێك ببینن نەیاندەتوانی یان لەکاتی جێبەجێکردنی ئیش و کارەکانیان بەهۆی ڕۆتیناتەوە توشی دنیایەك کێشەی لابەلای بووبوون بەم شێوەیەش بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان پەنایان دەهێنا بۆ ئێمە.

ئەو کەسانە بەهۆی ئەوەی کە لە کردنەوەی گرێ کوێرەکەیان بێ هیوا دەبوون لەو کاتی بێ تاقەتی و نیگەرانیە دەستیان دەکرد بە نوسینی نامە بۆ نوسینگەی تایبەتی محمد ڕەزا، فەرەح یان بۆ من. بەلاّم من دەمتوانی چی بکەم؟

ژنێك لە بەندەر عەباس شکاتی دەکرد دەیوت پیاوەکەم بەسەرمدا ژنێکی هێناوە و ئێستا خەرجیم ناکێشێت و داوای لێ دەکردم کێشەکەی بۆ چارەسەر بکەم!

ژنێکی دیکەی شکاتی ئالودەبوونی پیاوەکەی دەکرد بەوەی کە مادەی بێهۆشکەر بەکار دەهێنێت. ژنێك داوای سوك کردنی حوکمی پیاوەکەی دەکرد کە بەتاوانی قاچاخی مەوادی مەخەدەر گیرا بوو و حوکمی درێژخایەنی بەسەردا سەپێنرابوو.

ژنێکی هەژار داوای لە پارە دەکرد بۆ باوانی کچەکەی. کچی وا هەبوو نوسیبووی چەند ساڵێکە لەبەرئەوەی نەیتوانیوە کنکور بکات داوای دەکرد یارمەتی بدرێت بۆ ئەوەی بەبێ ئەنجامدانی کنکور بڕوات بۆ زانکۆ و بخوێنێ!

پیاوی واهەبوو داوای دەکرد تەکسیێکی بۆ بکڕم بۆ ئەوەی ئیشی پێ بکات و بێ ئیش نەبێت.

نەخۆش هەبوو وەصڵی نەخۆشخانەکەی دەنارد بۆ ئەوەی پارەی وەصڵەکانی بدەم.

داواکاریەکان زۆر جۆراوجۆر بوون.

سەرەڕای ئەوەی زۆربەی نوسەری نامەکان داوای یارمەتی مادی و هاوکاری یاساییان دەکرد زۆربەشیان کێشەی شەخسیان هەبوو. هەندێك لە نامەکانیش بانگهێشتنامە بوون بۆ ئەوەی بەشداری بکەم لە مەراسیمی بوکیان یان کوڕیان کە ژنی دەهێنا.

پاش بەجێهێشتنی ڕەشت چەندین ساڵ بوو نەڕۆیشتبوومەوە بۆ شارەکەم، لەڕێگەی پیاوێکی پیری ڕەشتیەوە نامەیەکی هاوپۆلی سەردەمی قۆناغی سەرەتایی خۆم پێگەیشت کە بانگهێشتی کردبووم بۆ بەشداریکردنی ئاهەنگی گواستنەوەی بوك بۆ کوڕەکەی، بە خۆشحاڵیەوە ئەم بانگهێشتەم قبوڵ کرد و لەگەڵ دوو کەس لە هاوڕێ نزیکەکانم، خاتو شاه باجی و ئەنصاری ڕۆیشتین بۆ ڕەشت و بەشداریمان کرد لەو ئاهەنگەدا.

ساڵانێکی دووروودرێژ بوو چێژی ژیانی سادە و بێ فێڵ و تەڵەکەی خەڵکی ئاساییم لەبیر کردبوو. ئێمە هەر وەکو سێ ژنی ئاسایی ڕۆیشتین بۆ ئەم ئاهەنگە. خواردنی ناوچەییمان خوارد و لە ئاهەنگی بوکی (قاسم ئابادی) سەمامان کرد، وەکو خەڵاتێکیش بۆ زاوا، کە کرێکاری گومرگی بەندەری پەهلەوی بوو بڕێك پارەم پێشکەش کرد تاوەکو لە شوێنێکی باشی شاری ڕەشتدا خانوویەکی سەربەخۆ بکرێت .

ئەم سەفەرە خۆش و شیرینە بە ڕادەیەك درێژ بوو کە فەرەح تەلەفۆنی کرد و وتی: دایکە ترسی ئەوەم هەیە لە ڕەشت بمێنیتەوە و نەگەڕێیتەوە بۆ تاران! سەرەڕای

ئەوەی فەرەح شاژنی ئێران و لەو کاتەشدا دایکی وەلیعەهد و فەرحناز بوو. (هێشتا علیرەزا و لەیلا لەدایك نەبوو بوون) کەچی لە تاراندا هەستی بە تەنهای دەکرد و من ئارامکەرەوە و نزیکترین کەسی بووم.

هەموو ئەو کەسانەی کە کچیان هەیە دەزانن کە پەیوەندی نێوان دایك و کچ زۆر بەهێز و سۆزدارانەیە. بەڵام لەبەر ئەوەی کە فەرەح بە هەتیوی گەورە بووبوو و جگە لە منیش هیچکەسی نەبوو پەیوەندی ئێمە لەچاو دایکەکانی دیکە لەوانەیە بەهێزتر بووبێت.

پێم وت: ئەگەر لەبەر تۆ نەبوایە هەرگیز ئامادە نەبووم (بەهەشتی گەیلان) بەجێبهێڵم و بگەڕێمەوە بۆ تاران.

بەم حاڵەشەوە، دە ڕۆژی دیکە لە ڕەشت و پەهلەوی مامەوە و زۆر بەباشی گەڕان بەناو دیاری عاشقاندا. بە یادی ڕۆژانی خۆشی سەردەمی منداڵی لە ڕەشت، دووبارە ڕۆیشتمەوە بۆ هەمان جادە و ناوچەکانی سەردەمی منداڵی و لەبەردەم دوکانی بەرگدرورومانیەکەی خاتو شەرەفی کە کرابوو بە دوکانێکی مەی فرۆشی چەندین جار هاتم و ڕۆیشتم و بیرەوەریەکانی ڕابردووم دەهێنایەوە پێش چاوم.

مرۆڤ کاتێك منداڵە هەمیشە بیر لە ئاینده و داهاتوو دەکاتەوە و بۆ گەورە بوون و پێگەیشتن هەمیشە پەلە پەلیەتی، بەڵام کاتێك دەگاتە ترۆپکی سەرکەوتنە ڕووکەشیەکانی دنیا ئارەزووی ئەوە دەکات هەموو ئەوشتانەی کە بەدرێژایی ساڵانێکی دووروودرێژ بە نارەحەتی و ڕەنج و ماندووبوون بەدەستی هێناوە بیاندات تەنها بۆ ئەوەی یەکجاری دیکە بگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژە خۆشانەی منداڵی و بێ ئاگایی و ساڵانی شادی و خۆشی و پڕ لە وزە و توانایی.

بەداخەوە هەمووشتێك قەرەبوو دەکرێتەوە بەڵام ئەو تەمەنەی کە دەڕوات هەرگیز ناگەڕێتەوە.

لە سەفەرەکانی تاراندا هەمیشە دوو هەندێکجاریش سێ و تەنانەت چوار پاسەونم لەگەڵدا بوون و پێش ئەنجامدانی هەر سەفەرێکیش لەتارانەوە بۆ هەر ناوچەیەکی دیکە پێشتر هەواڵ دەنێردرا تاوەکو (ساواك) ئەو ناوچەیەی کە بۆی دەڕۆم لەڕووی ئاسایشیەوە دڵنیا بێت لێی و چاودێری بخاتە سەر. من زۆر حەزم لەم کارانە نەبوو و

وابیرم دەکردەوە کە ساواك بەم کارانەی ناهێڵێت ئێمە چێژ لە سەفەرەکانمان وەرگرین.

بۆ نمونە لەسەفەرێکدا بۆ ئەسفەهان خەڵکیان لە بازاڕەکە دەرکرد و تەواوی ناوچەی بازاڕی ئەسفەهانیان چۆڵ کرد تاوەکو ئێمە بتوانین لە بازاڕەکەدا پیاسکە بکەین و لە دوکانەکاندا شت بکڕین!

کاتێك بازاڕ خۆشە کە خەڵکی ئاسای و سادەش بوونیان هەبێت و بتوانیت هەموو جۆرە کەسێك ببینیت و چێژ لەو جۆراوجۆریانە وەرگریت. بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەبوو کە بوونت لەناو خێزانی شایانەدا وەکو ئەندامێکی ئەو خێزانەیە خۆی لەخۆیدا دەبووە هۆی جیابوونەوەیەکی نەخوازراوانە لەگەڵ خەڵك.

ئەو کەسانەی کە لە شوێنی مندا نەبوون و لە دوورەوە سەیریان دەکرد لەوانەیە وابیریان کردبێتەوە کە دوورخستنەوەی خەڵکی لە بازاڕ و یان چاودێری خستنە سەر شوێنەکان جۆرە ئیمتیازێکی تایبەتیە، لەکاتێکدا بەهیچ شێوەیەك بەم شێوەیە نیە ئایا بەڕاستی ئەوە ئیمتیازە کە مرۆڤ بەهۆی پێگەیەکی تایبەتی کۆمەڵایەتیەوە خۆی لەدەست بدات.

من هەمیشە دەمویست لەگەڵ هاوڕێکانمدا بە ئازادانە بڕۆم بۆ بازاڕی تاران، ئیمامزادە صالح، ساحەی شارەوانی، دەربەند یان بڕۆین بۆ خواردنی کەباب و گۆشت. بەڵام لەو کاتەوەی کە فەرەح شوی کرد بە محمد ڕەزا ئازادی من بەتەواوی وەکو مرۆڤێکی ئاسای نەما.

ناچاربووم لەناو بازنەی ئەو هاوڕێیانەدابم کە هەموو ژیانیان لەژێر چاودێری ساواکدا بوو و یان لەژێر چاودێری کەسانێکدا بن کە لەلایەن ساواکەوە دەستنیشان کرابوون. من مەبەستم هیچ لێکدانەوەیەکی هەڵە نیە بۆ ئەم بابەتە و دڵنیام کە ساواك بۆ دابینکردنی ئاسایشی من و خێزانی شاهانە ئەم ئامادەکاریانەیان دەکرد، بەڵام ئەو حەقیقەتەی کە نەدەکرا ئینکاری بکرێت ئەوەیە کە ئەو ئامادەکاریانەی پێشوو و ئەو چاودێریەی کە دەکرا پێش هەموو کەسێك ئازادی سروشتی خۆمیان نەهێشتبوو.

بەڕاستی ئەگەر لەپشت حەوشەکەتەوە چەند چەکدارێك و چاودێرێك هەبن بەهیچ شێوەیەك چێژ وەرناگریت لە ژیان و ناتوانیت خۆشی ببینیت و هەمیشە هەست بە ترس دەکەیت.

هەرکاتێك کە ئۆتۆمبێلەکەم بڕۆشتایە بە جادەیەکی تاراندا سەیارەیەك لە پێشەوە و سەیارەیەك لە دواوە پاسەوانیان دەکرد. هەرچەندە ئەم پاسەوانیە هەست پێنەکراو بوو، بەڵام بەم بارودۆخەوە من چۆن دەمتوانی ژیانێکی تایبەتیم هەبێت؟

هەندێکجار بۆ ئەوەی سوڕێك بخۆین بە جادە و کوچەکانی تاراندا دەڕۆیشتم بۆ ماڵی (ئالی ئانتونیادیس) لە جادەی حافزی تاران-کۆڵانی کیمیا.

ئالی کەسێکی ئەمریکی بەڕەگەز یۆنانی بوو کە شارەزایەکی زۆری هەبوو لە زمان و ئەدەبیاتی فارسیدا و بەشێوەیەك شعرەکانی حافز و مەولانای دەخوێندەوە کە هەرکەس گوێی لێبوایە بێ گومان چێژی لێ وەردەگرت.

ئالی هاوتەمەنی من بوو. فەرەحیش زۆری خۆشیدەویست بۆیە ئالی هەم لە بازنەی هاوڕێکانی من بوو و هەمیش لە بازنەی هاوڕێکانی فەرەح بوو. ئەم دۆستایەتیەش ئێستاش هەر بەردەوامە و پاش ڕۆیشتنمان لە ئێران، ئالی بە ڕێکوپێکی سەردانی دەکردین. جارێکیشیان بەیەکەوە لە ساڵی ١٩٨٤ سەفەرێکمان کرد بۆ ئالاسکا.

(ئالی) سەرەتا لە ئێران مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو لە ئەنجومەنی ئێران-ئەمریکا. پاشان لە دامەزراوەی کۆمەڵەی نەتەوەکان، کە ڕێکخراوێکی سەر بە وەزارەتی دەرەوەی ئێران بوو بەشێوەیەکی ڕەسمی دامەزرا، ماوەیەکیش کارمەندی ئەنجومەنی وەزیران بوون لەلای ئەمیر عباس هەویدا. دواتر (ئالی) هات بۆ دامەزراوە تایبەتیەکەی فەرەح و بووە بەرپرسی یەکەمی دامەزراوەکە.

من لە ژیانی خۆمدا وەکو دایکی ژنی شای وڵات هەمیشە سێبەری قورسی چاودێرە ئاسایشیەکانم هەستپێدەکرد. هەر لەبەر ئەوەیە لە دەرگای ماڵەکەی خۆم، کە نزیك بە کۆشك بوو، یان لەو میوانیەی کە بەسەدان چاو سەیریان دەکردم تەنانەت کەوچکی خواردنەکەشم بە شێوەیەك بەکار دەهێنا کە گەورە و بەویقارانە بێت. لەکاتێکدا کە هەموو مرۆڤێك پێویستی بە ژیانی تایبەتی و ئازاد هەیە.

لەم ڕووەوە ماڵی (ئالی) شوێنێکی گونجاو بوو بۆ چاوپێکەوتنە تایبەتیەکانم (هەرچەندە لەوێشدا دڵنیا نەبووم کە ساواك گوێگری نەبێت و چاو و گوێکانی بێ ئیش بن!)

لەم ساڵانەی دواییدا بوو زانیم (مورتەزا قلی) خزمەتکارە شەو و ڕۆژەکەی (ئالی) یەکێك بووە لە ئەفسەرەکانی ساواك!

لە ماڵی (ئالی) خۆمان خواردن و چێشتمان دەکرد. سەرمان دەخستە سەر یەکتری و لەو بەرگە دروستکراوە دەهاتینە دەرەوە کە بەهۆی کاریگەری ئەو پێگە کۆمەڵایەتیەوە دروستبوو بوو بۆمان چەندین کاتژمێر بەمانایەکی تەواو بەخۆشی کاتمان بەسەر دەبرد.

هەندێکجاریش هاوڕێیانی ئەمریکی (ئالی) یان ئەو کەسانەی کە لە ئەنجومەنی ئەمریکا و ئێران یان لە باڵوێزخانەکەی ئەمریکا و یان لە دامەزراوەکانی ئەمریکا وەکو (ئای-بی-ئیم) کاریان دەکرد، لەو دانیشتنانەدا ئامادە دەبوون.

شێوەی سەردانم بۆ ماڵی (ئالی) سەرەتا شۆفێرەکەم تاوەکو بەردەم ماڵەکەی دەیبردم و پاش ئەوەی کە من دەچوومە ژوورەوە سەیارەکە لەو شوێنە دوور دەکەوتەوە و دەچوو بۆ شوێنێك کە وزێگەیەکی سەر بە ساواك بوو لە نزیك بینای سەرۆك وەزیران لە جادەی پاستور و لەوێ دەوەستا و هەرکاتێکیش بمویستایە یان پێویستم بە سەیارەکە هەبوایە تەلەفۆنم دەکرد بۆ ئەو شوێنە و سەیارەکە دەگەڕایەوە و بۆ ئەوەی بمگەڕێنێتەوە بۆ شوێنی خۆم. ئەم وێزگەیە کە بنکەیەکی سەر بە ساواك بوو، نزیك سەفارەتی سویسرا و دراوسێی گۆرانیبێژ کورس سەرهەنگ زادەش بوو کە من هەمیشە حەزم لێی بوو.

هەندێکجار بۆ ئەوەی کەیف و خۆشیەکانمان بەچێژتر و خۆشتر بێت بەرنامەی ژەنینیشمان هەبوو. جاری واهەبوو (ئالی) مامۆستایەکی سەمای بانگهێشت دەکرد بۆ چەند کاتژمێرێك تاوەکو میوانەکان فێری سەمای سك بکات.

سەمای سك، بۆ ئێمە جۆرە وەرزشێك بوو بۆ بچوك کردنەوەی سك. زۆرینەی ژنەکانی ئێران ورگ و سکی گەورەیان هەیە. بەتایبەتی ژنە بەتەمەنەکان خاوەنی

سکێکی گەورە و ناشیرینن. بەڵام من توانیم بەهۆی سەمای سکەوە تاوەکو ڕادەیەکی باش ئەندامی خۆم ڕێك بکەم و سکم بچوك بکەمەوە.

خودی جەنابی شەمسە بۆی باس کردم کە سەمای عەرەبی لەلایەن سەماکەرێکی ناسراوی میسری بەناوی (سەمیرە تارق) فێربووە.

ئەشرەف وتی (سەمیرە تارق) بۆ ئەنجامدانی چەند کۆنسێرتێك بانگهێشتکرا بوو بۆ ئێران و شەمسەش سودی لەم بانگهێشتە وەرگرتبوو و لەژێر چاودێری ئەودا فێری سەمای سك بووبوو. هەڵبەتە نابێت پەیوەندی خاتو شەمسە بە ڕۆڵی هونەری هاوسەرە هونەرمەندەکەی مهرداد پهلبد فەرامۆش بکرێت.

ئاغای پهلبد کە تاوەکو پێش هاوسەرگیری لەگەڵ خاتو شەمسە پەهلەوی بەناوی خێزانی ئەسڵی خۆیەوە واتە (مین باشیان)ەوە ناودەبرا ژەنیارێکی پلە یەك بوو کە لە گروپە مۆزیکیەکانی ئەو سەردەم لە کافتریاکانی تاران کەمانچەی دەژەنی. برا گەورەکەی، کە گەیشتە فەرماندەی هێزی زەمینی، ژەنراڵ غلامعلی مین باشیانیش بەڕادەی براکەی کەمانچەی دەژەنی. هەڵبەتە ئێمە زۆر لەگەڵ شەمسە هاتوچۆمان نەبوو و تەنها لەهەندێك کاتدا نەبێت کە لە کۆشکی مهر هشر، کۆشکی مرواريد، میوانی ساز دەکرا و ئێمەش ئامادە دەبووین و بەزۆری لە کۆتایی شەودا کە میوانیەکە تایبەت دەبوویەوە شەمسە و پیاوەکەی سەمایان دەکرد و ئامادەبوانیش چەپڵەیان بۆ لێدەدا.

لە گەڕان و کات بەسەربردنەکانی دیکەی ئێمە سەفەر کردن بوو بۆ دوورگەی کیش لە زستاناندا و بۆ دەریاچەی ئورومیە لە هاویناندا.

لەو سەردەمەدا هێشتا دوورگەی کیش نەبووبوویە شوێنێکی گشتی. تەنها بنکەیەکی هێزی ئاسمانی و بنکەیەکی هێزی دەریایی تێدا بوو. دوورگەنشینەکانیشی تێدا بوو. محمد ڕەزا فەرمانی دەرکرد کە شوێنێکی تێدا دروست بکرێت بۆ کات بەسەر بردنی خێزانی سەڵتەنەتی.

کاتێك کە ئەم شوێنە دروستکرا هەرکاتێك کە شا و فەرەح لەوێ نەبونایە من و هاوڕێکانم بە فڕۆکەی تایبەتی دەڕۆیشتین بۆ کیش و لە کەناری دەریاکەدا لەسەر لمە درەوشاوەکەی کیش ڕامان دەکرد و لە ئاوە پاك و بێگەردەکەیدا مەلەمان دەکرد.

پیاوانی مەلەوانی هێزی دەریایی لەو سەردەمەدا چاودێری ئێمەیان دەکرد تاوەکو کۆسە و قرش نزیکمان نەبنەوە.

ئێمە هەرگیز کۆسە یان قرشمان نەبینی بەڵام لە دوورەوە دۆڵفینەکان یان بەرازە ماسیەکانمان دەبینی کە لە ئاوەکەدا بەرز دەبوونەوە و دەچوونەوە بە ناو ئاوەکەدا.

من دواتر لەبارەی سەفەرە زۆرەکانم بۆ کیش قسەتان بۆ دەکەم.

لەناو هەموو ئەو دانیشتنی هاوڕێیانە و لەناو هەموو ئەو کاتانەی کە لەناو بازنەی هاوڕێکانمدا بووم هەوڵم دەدا هیچ قسەیەك ئەگەر زۆر کەمیش بوایە، لە بارەی پرسە سیاسیەکانەوە نەکرێت و نەبێتە تەوەرەی باسەکان.

ژنە هاوڕێکانم وابیریان دەکردەوە کە ئەگەر لەلای من باسی محمد ڕەزا و فەرەح بکەن خۆشحاڵ دەبم. بەڵام من حەزم دەکرد لەبارەی پرسەکانی وڵاتەوە هیچشتێك نەبیستم و پێمخۆش بوو ژنەکان تەنها لەبارەی پرسی ژنان و ئەو بابەتانەی کە پەیوەندی بە چینەکانی ژنانەوە هەیە قسە بکەن.

هەرکاتێك (قلی ناصری) و (سەر لەشکر خەسرەوانی) بهاتنایە ناو دانیشتنە ژنانیەکانی ئێمەوە دانیشتنەکە ڕەونەقێکی زۆرتری پەیدا دەکرد. (قلی ناصری) کە لە کیشانی موادی مەخەدەردا زیادەڕەوی زۆری دەکرد بە (کەریم شیلەیی کۆشکی محمد ڕەزا) بەناوبانگ بوو. پیاوێکی زۆر خۆش و هونەرمەند بوو بە جوڵە و حەرەکاتەکانی ئێمە دەخستە پێکەنین. خەسرەوانیش کە وەرزشکارێکی بەتواناش بوو لەگەڵماندا ئەوەندە قسەی خۆشی دەکرد هەموو ژنەکان لەگەڵ ئەوەی کە زۆربەمان لە تەمەنێکی وەستاودا بووین کەچی هەستمان بە گەنجی و تەڕی دەکرد.

لە مارچی ساڵی ١٩٧٤ کاتێك کە نەشتەرگەری مەعیدەم بۆ کرا هەچەندە لە نەخۆشخانەیەکی تیار و پێشکەوتووی کۆشکدا لەژێر چاودێری ژمارەیەکی زۆر پزیشك و پەرستاری ڕاهێنراودا بووم بەڵام خەسرەوانی (پەروین) تاوەکو بەیانی لەسەر سەرم مایە تاوەکو چاوی لێم بێت و من بۆ ئەم کارەی هەمیشە مەمنونم.

براکەم (محمد علی) لە سەرەتای جادەی چالوس لە تەنیشت ڕووباری کەرەج خانوویەکی هاوینەی گەورەی دروستکرد بوو کە زۆربەی شەوانی هاوینان، دانیشتنی گۆرانی و ژەنیاری بە بەشداری هونەرمەندانی ناوداری وڵات و کەسایەتیە گەورەکان

ساز دەکرد. من و هاوڕێکانیشم زۆرجار بەشداریمان لەم میوانیانە دەکرد. لە گۆرانیبێژە ناودارەکانی ئەو سەردەمیش کە دەهاتن بۆ میوانداری براکەم یەکێکیان حەمێرا بوو کە هاوسەرگیری لەگەڵ کەمانچە ژەنێکی بەناوبانگ کرد و پاش چەند ساڵێك تەلاقی لێ وەرگرت.

پاشان چەند شویەکی دیکەی کرد و هەرکاتێکیش حەمێرا بهاتایە بۆ ئەم دانیشتنانە پیاوەکەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا کاتێکیش دەیخواردەوە و سەری گەرم دەکرد پیاوێکی دەناساند بە پیاوەکەی خۆی و دەیوت ئەم پیاوە داوای کردوم و دەڵێت ئەگەر تەلاقت لێ وەرگرم ئامادەیە بمهێنێت!

پێشتر باسی ئەوەم کرد کە یەکێك لە هاوڕێکانم پەروین ئەباصالتی بوو کە ئێمە بە (پەری) ناومان دەبرد. (پەری) ژنێکی ڕۆژنامەنوس و سەرنوسەری گۆڤارێکی ژنانە بوو کە دواتر هەڵبژێردرا بۆ نوێنەری ئەنجومەنی شورای نەتەوەیی.

ڕۆیشتنی پەری بۆ ئەو ئەنجومەنە بە پشتگیری من بوو. من وتم بە فەرەح و ئەویش فەرمانی کرد بە وەزیری وڵات تاوەکو ناوی پەریش وەکو نوێنەری تاران لە ئەنجومەنەکەدا ڕابگەیەنێت.

خەڵکی لە هەڵبژاردنەکاندا یان بەشداری نەدەکرد یان ژمارەی بەشداریکەرەکان تەواو کەم بوو. هەرچەندە هەڵبژاردن ئەنجام دەدرا، بەڵام من دەمزانی کە ناوی ئەو کەسانەی کە دەبێت بڕۆن بۆ ئەنجومەن لەلایەن سەرۆك وەزیرانەوە دەگەیەنرا بە محمد ڕەزا و محمد ڕەزاش ناوی هەندێکیانی دەسڕیەوە و پشتگیری هەندێکیشیانی دەکرد. ئەم ناوانە ساواك ئامادەی دەکردن و هەوڵی ساواکیش ئەوە بوو کە لە شارەکان و قەزاکاندا بگەڕێت و کەسانێك بدۆزێتەوە کە سەرەڕای ئەوەی وەفایان هەبێت بۆ حکومەت لەلایەن خەڵکیشەوە پشتگیری بکرێن.

ساواك خشتەی کۆتایی دەدا بە سەرۆك وەزیران و ئەویش هاوبۆچوونی خۆی کاری لەسەر دەکرد و لە دواجاردا دەخرانە بەردەست محمد ڕەزا.

لە ساڵی ١٩٧١ بە دواوە، محمد ڕەزا پرسیاری لە فەرەح دەکرد و فەرەحیش بەلایەنی کەمەوە لەبارەی هەڵبژاردنی ژنەکان بۆ نوێنەری ئەنجومەن و یان سیناتۆرەکانی ئەنجومەنی سینا قسەی کۆتایی دەکرد. منیش سودم لەم دەسەڵاتە

وەرگرت و (پەری)یش کە خۆشەویستێکی زۆری لەناو پیاوانی سیاسی و کەسانی دەسەڵاتدار و تەنانەت کۆشکیەکانیشدا هەبوو، ناردم بۆ ئەنجومەن.

پەری نمونەی لایەنگری ژیان و ژنێکی تەواو ئازاد بوو کە هەمیشە دەیوت دەبێت ئەو ئازادیەی کە پیاوان هەیەتی ژنانیش هەیان بێت.

ماڵی (پەری) لەنزیك پردی ڕۆمی بوو و من هەندێکجار دەچووم بۆ ماڵیان. پەری نمونەی ژنێکی ئازاد و خۆڕاگربوو.

لە گەنجیدا لە قۆناغی دواناوانديدا حەزی لەکاری ڕۆژنامەنوسی دەبێت و سەرەڕای بوون بە ئەندام لەناو ئەنجومەنی کیژان و خانمانی سەر بە دامەزراوەی چاپەمەنی و زانیاری دەبێتە ڕۆژنامەنوسێکی بەتواناش، دواتر ناسراوی پەیدا دەکات لەگەڵ عباس مسعودی و ئینجا دەبێتە سەرنوسەری یەکێك لە گۆڤارە تایبەتەکانی ژنان.

من زۆر لەگەڵ توندڕەویەکانی پەری دا نەبووم، بەڵام هەمیشە هانم دەدا. (پەری) دەیوت ژنان دەبێت وەکو پیاوان ئازادی جنسیان هەبێت و کاتێك پیاوان دەتوانن چەند ژنێکیان هەبێت ژنانیش دەبێت ئازادبن کە چەند پیاوێکیان خۆش بووێت!

پەری لەبەر چاو پیاوەکەی کە کارمەندی وەزارەتی دەرەوە بوو لەگەڵ پیاوانی دیکەدا ئەویندارى دەکرد و سەیر لەوەدایە هەر کاتێك پیاوەکەی ماچ ماچێنی بکردایە لەگەڵ ئەو پیاوەدا کە پەری خۆشەویستی لەگەڵدا دەکرد پەری دەیوت بە پیاوەکەی (سوپاس) بۆ ئەو خۆشەویستیەی کە دەریدەبڕی بۆ هاوڕێکەم!

پەری زۆر تایبەت بوو لە کارە هەیجانهێنەرەکاندا.

بۆ نمونە میوانی بێ شەرمانە و بێ گوێدەرانەی لەژێرناوی (کلیلی واستە) ڕێکدەخست کە لەو میوانیەدا پیاوان لەگەڵ ژنەکانی خۆیاندا بەشداریان دەکرد.

ئەم میوانیانە کە لە میوانسەرای بەناوبانگی تاراندا ساز دەکرا لایەنگری زۆری هەبوو. لە کۆتایی شەوەکەدا کاتێك هەموو میوانەکان بە ڕادەیەکی زۆر سەرخۆش دەبوون و باشیان دەخواردەوە هەریەکە لە ژنەکان دەچوونە ئەو ژوورانەوە کە لەو میوانسەرایەدا گرتبوویان.

پاشان پیاوەکان هەموو کلیکی ئەو ژوورانەیان کۆ دەکردەوە کە ژنەکانی لەناودا بوو و پاشان بە چاوبەستراوی هەڵبژاردنیان دەکرد بۆ کلیلەکان و هەرکەس کلیلێکی

هەڵدەبژارد و دەچوو بۆ ئەو ژوورەی کە بەو کلیلە دەکرایەوە و لەوێش لەگەڵ ئەو ژنەدا دەخەوت کە بۆی دەردەچوو.

هەندێکجاریش بۆ کچانی شوو نەکردوو ئەم جۆرە میوانیانە ساز دەکرا کە پیاوانی هونەرمەند و وەرزشکاری بەناوبانگ بانگهێشت دەکران.

ئەم جۆرە میوانداریە لە کۆیلە فرۆشتنەکانی سەدەکانی ڕابردوو دەچوو.

پاش ئەوەی کە هەموو بەباشی دەیانخوارد و دەیانخواردەوە باش لەگەڵ یەکتریدا سەمایان دەکرد تاوەکو درەنگ شەوانێك، پاشان پیاوەکان بانگهێشت دەکران بۆ سەر مێزێك بۆ ئەوەی بەدەوری یەکتریدا کۆببنەوە هەر وەکو چۆن دانیشتنی فرۆشتنی هەراجی هەیە بەو شێوەیە. ئەگەر پیاوێك ببوایە بە جێگەی سەرەنج ئەوا کچەکان بۆ بەدەستهێنانی دەستیان دەکرد بە کێبەرکێ و هەریەکەیان ڕێژەیەکی زیاتری پێشنیاری دەکرد تاوەکو ئەو پیاوە بۆ ئەو شەوەی کە ماوە بیبا لەگەڵ خۆیدا!

هەڵبەتە ئەم کارە سەرەڕای ئەو هەیجانەی کە هەیبوو زۆرتری بۆ کۆکردنەوەی پارە بوو بۆ ئەنجامدانی کاری خێرخوازی[1].

---

[1] – لە کۆتایی حکومەتەکەی محمد ڕەزا پەهلەوی گەندەڵی و خراپەکاری ئەخلاقی لە کۆمەڵگەی ئێراندا بەڕادەیەك تەشەنەی کردبوو کە هیچ شەرم و حەیایەك نەمابوو.

ئەم قسانە ئەگەر کەسێکی سەر بە دەسەڵاتی شۆڕشی ئێران بیکردایە، ئەوا سەڵتەنەتیەکان دەیانکردە هەراوهوریا و دنیایان پڕ دەکرد و دەیانوت درۆ هەڵدەبەستن بە حکومەتەکەی محمد ڕەزاوە!..

تێبینی بکەن بزانن دایکی ژنی شا چی دەڵێت....

هەڵبەتە تێگەیشتنەکەی فریدە دیبا لەگەڵ تێگەیشتنی ئێمە بۆ ئەو مەسەلەیە جیاوزە.

فەریدە دیبا لەبارەی ئەو ئاهەنگەی کە بە (کلیلی واستە) دەناسرێت وەکو شتێکی سەرگەرمی و هەیجانی باسی دەکات و دەڵێت سەرەڕای خۆشیەکانی ئەو کارانە بە مەبەستی کۆکردنەوەی پارە بۆ مەسەلەی خێرخوازی ئەنجام دەدرا!.

زۆر سەیرە لەم کارە خێر خوازانەی کە ئەنجامدراوە لەسەر بنەمای بێ فرۆشتنی جەستە، دامەزراوە خێرخوازیەکانی دیکەشیان هەموو بەم شێوەیە بردوە بەڕێوە.

لەبارەی کار و کردەوەکانی دیکەی (پەری) هەرچی بڵێم هێشتا کەمە، (پەری) نەك هەر ژنێکی ڕۆژنامەنوس و ئەندامی ئەنجومەن بوو، بەڵکو ژنێکی لێهاتوو و بەزەوق و دروستکەری هەیجان بوو!

کەم کەم عاشقان و لایەنگران و بەشداریکەرانی میوانیەکانی پەری بەشێوەیەك زۆر بوون کە نەدەتوانرا هەموو ئەو کەسانە بانگهێشت بکرێن کە حەزیان لێ بوو، هەر بۆیە توانی پارەیەکی زۆر فراوان لەم ڕێگەیەوە بەدەست بهێنێت.

ژمارەیەك کە پارە بەلایانەوە گرنگ نەبوو ئەم پارەیان زۆر بەخۆشیەوە دەدا، بەڵام گروپێکی دیکە کاتێك کە مەسەلەی پارە هاتە ناوباسەوە ڕاستەوخۆ کشانەوە و وازیان لە دانیشتن و میوانی و هەموو بەزم و ڕەزمێك هێنا!

خاتو فاتمە پەهلەوی پاش ڕووداوی دڵتەزێنی بەرکەوتنی باڵی فڕۆکەی ژەنراڵ محمد خاتەمی بە دیواری سەدی (دز) و کوژرانی، زیاتر لەم میوانیانەدا بەشداری دەکرد و کەم کەم هاتنە ناو بازنەی هاوڕێیەتی هەمیشەییمانەوە.

ڕەزا (قطبی) کوڕی براکەم، کە لەگەڵ فاتمەشدا هاوڕێیەتی پەیدا کردبوو و بۆ بینینی فاتمە دەهات بۆ میوانیەکانی ئێمە و لەگەڵ فاتمەدا سەمای دەکرد و تاوەکو فاتمە لەو بێتاقەتی و بێزاری و خەمۆکیەی کە توشی بووبوو بەهۆی کوژرانی پیاوەکەیەوە لەبیری بچێتەوە. بەڵام بەداخەوە ئەم دڵناسکیەی ڕەزای برازام، بووە هۆی ئەوەی کە بەخراپی لێکبدرێتەوە و شهرزاد (ئەفشار) هاوسەری ڕەزای برازام، لەلایەن کەسانی قین لەدڵ و بەخیلەوە ئاگادار کرابوویەوە و واتێگەیەنرا بوو کە پەیوەندی هەیە لەگەڵ فاتمەدا، بۆیە ژیانی ڕەزای کردە دۆزەخ و لەسەر فاتمە چەندین جار لەنێوان ڕەزا و شەهرزاددا ڕووبەڕووبوونەوەی توند ڕوویدا و هەردووکیان تاوەکو لێواری جیابوونەوە ڕۆیشتن.

فاتمە کە ژنێکی گەورە بوو و ڕەزای دڵنیا کردەوە کە پەیوەست بێت بە ژیانی خۆیەوە و گرنگی زیاتر بدات بە خێزان و ماڵەکەی و بۆ ئەو ژیانی هاوبەشی خۆی وێران نەکات.

داواتر فاتمه لەگەڵ نوسەر و ڕۆژنامەنوسێکی گەنجدا کە لە دامەزراوەی ڕۆژنامەی ئیتلاعاتدا کاری دەکرد و لەگەڵ ئەوەدا لە هێزی ئاسمانیش کارێکی دیکەی هەبوو بووە هاوڕێ و تاوەکو ئەو ڕۆژەی کە لە ئێران بوو لەگەڵ ئەم گەنجەدا دەژیا.

من ناوی ئەو گەنجە ڕۆژنامەنوسە ناهێنم چونکە ئێستا لە ئێران دەژی. گەنجێکی جوان و بە هەیکەل بوو. ژەنراڵی خوالێخۆش بوو محمد خاتەمی دایمەزراندبوو. ئەم گەنجە خۆی هاوڕێی و هاویاری گۆڵفی ژەنراڵ خاتەمی بوو لە زستانانیشدا دەچوون بۆ خلیسکێنەی سەر بەفر.

هەموو هەفتەیەك وێنەیەکی زۆری ئەم گەنجە لە ڕۆژنامەی ئیتلاعاتدا بلاو دەکرایەوە و ناوبانگێکی زۆری هەبوو.

فاتمە ئەم گەنجەی زۆر خۆشدەویست. ماڵی فاتمە لە دەوروبەری هێزی ئاسمانی بوو. بەلام پاش کۆچی دوایی

ژەنراڵ خاتەمی ئەو ماڵەی بەجێهێشت و خانوویەکی دیکەی لە باکوری شاری تاران گرت.

(پەری ئەباصلتی)یش عاشقی ئەم کوڕە گەنجە بوو و لە بابەتەکانی بۆ گۆڤارەکانی ژنانە سودی لێوەردەگرت و هەوڵیدەدا وابەستەی بکات بە خۆیەوە. بەلام ئەم گەنجە کە ڕۆحیەتێکی لۆتیگەری و جومێرانەی هەبوو ڕەفزی پەری کرد و لەخۆی دایڕنی و بە ئاشکرا سەرزەنشتی پەریشی دەکرد بەوەی کە خاوەنی هاوسەرە و ناخۆشە ئەو جۆرە داوایانە بکات.

لەبەرامبەر ئەم کاردانەوانەش (پەری) دەیوت: (دەی با بزانیت من عاشقی ئەم بێ گرنگیدان و ئیهیمال کردنەم!)

من چەندینجار لەگەڵ ئەم گەنجە ڕۆژنامەنوسەدا دانیشتووم و زۆر چێژم لە قسە و باسەکانی وەردەگرت بەتایبەت لەبارەی ئەوەی کە زۆر بەشێوەیەکی سادە و ساکارانە و بەبێ گرنگیدان بە کەسایەتی بەرامبەر کە لە چ پلە و پێگەیەکی کۆمەلایەتیدایە بۆچوونەکانی خۆی دەردەبڕی و منیش زۆر حەزم لەم ڕەوشە و شێوازی قسەکردنە بوو.

بەهیچ شێوەیەك بەلایەوە گرنگ نەبوو کە من دایکی شاژنی ئێرانم یان فاتمە خوشکی شای ئێرانە یان هەویدا سەرۆك وەزیرانی وڵاتە.

بەهیچ شێوەیەك گرنگی بەهیچ کەس نەدەدا بەمانایەکی دیکە هیچکەس بەلایەوە گرنگ نەبوو ئەوەی کە خۆی مەبەستی بوایە بە ئاسانی لەبارەیەوە قسەی دەکرد. دەستی هیچکەسیشی ماچ نەدەکرد و تەنها دەموچاوی ژنە جوانەکانی ماچ دەکرد!

زۆر شیرین کەلام و قسە شیرین بوو. هەرچەندە لە میوانیەکاندا بە گەنجترین کەس دادەنرا، بەڵام لە زۆربەی زەمینە و لایەنەکاندا شارەزایەکی باشی هەبوو و ئاگاداری شتەکان بوو و ئەگەریش ڕستەیەك یان قسەیەکی بکردایە بەشێوازێکی گاڵتەجاڕیانە و تەنزئامێزانە باسی دەکرد و دەبووە هۆی جێگەی خۆشحاڵبوونی ئامادەبوان.

جۆری ئەم میوانیانە لەگەڵ یەکتریدا جیاوازێکی زۆری هەبوو. بۆ نمونە (علینقی ئەنصاری) کە لە مهر شهری کەرەج کۆشکێکی جوانی دروستکردبوو، لە هاویناندا (گاردن واستەی) ساز دەکرد و ژەنیارانی پلەیەکی تارانی بانگهێشت دەکرد و لە فەزایەکی کراوەدا ئاهەنگیان ساز دەکرد بۆ میوانەکان.

هۆشەنگ دولو میوانداری زۆری جەم و جۆری ساز دەکرد بۆ کەسانی تایبەتی کە زۆرجار دەگەیشتنە بیست کەس.

کۆمەڵێك هەبوون، تەنها سەرمایەدارە گەورەکانیان بانگهێشت دەکرد. هەندێکی دیکەش سەفیرە پلە یەکەکانی تاران و خاتونەکانیانیان بانگهێشت دەکرد و بە ئاشکرا ئەوەیان نیشاندەدا کە حەزیان لەوەیە لەگەڵ کەسانی بیانیدا تێکەڵی بکەن.

لەهەندێك لە میوانیەکاندا ژمارەی هونەرمەندەکان زۆر زیاتر بوو لە ژمارەی میوانەکان بوشهری پور ئەم جۆرە میواندارییانەی ساز دەکرد. ئەو میواندارییانەی کە هونەرمەند و سەماکارەکان زۆرتربوون لە میوانەکان.

بۆ ژنان و پیاوانی گەنج، ئەم میوانیانە خۆشیێکی زۆری هەبوو. بەڵام من زۆر لەم دانیشتن و میواندارییانەدا تەحەمولم نەدەکرد و هەر لە کاتژمێری یەکەمی ئاهەنگەکەوە شوێنەکەم بەجێدەهێشت.

لەم میوانیانەدا زۆربەی خاتونی پیاوە گەورەکانی وڵات و سەرمایەدارەکان و فەرماندەکان هەوڵیاندەدا خشڵ و زێڕی گرانبەها بکەن بەخۆیاندا و لەو ڕێگەیەوە

سامان و سەروەتی خۆیان نیشان بدەن و لەم ڕێگەیەوە بەرزی و گەورەیی خۆیان لەچاو خەڵکانی دیکەدا بخەنەڕوو. جارێکیان ئەم مەسەلەی خشڵ و زیوە بووە هۆی دۆزینەوەی دزیەك كە لەو تاوانەدا سەرۆكی شارەوانی تاران دەستی هەبوو لەناویدا!

سەرۆكی شارەوانی ئەو كاتی تاران گروپێك لە دزە سەیرەكانی تارانی دەستگیر كردبوو و موڵك و ماڵێكی زۆری گرانبەهایان لابوو كە زۆرێكی خشڵ و زیوی گران بەها بوو، سەرۆكی شارەوانیش پارچەیەك لەو خشڵ و زێڕانەی بردبوو و پێشكەشی ژنەكەی كردبوو!

پاش هەڵسەنگاندنی ئەو مەسەلانە و چوون بە دوای ئەو خشڵ وزێڕانەدا دەركەوت كۆمەڵێكیان موڵكی خاتو ئازەر صنع، هاوسەری بەڕێز ئیبتهاج بوون كە دزەكان لە ماڵەكەیدا دزیبوویان.

بەڵام لەبەر ئەوەی كە ڕێژەی خشڵە دزراوەكان زۆر بوون لەكاتی لێپرسینەوەدا دزەكان لەبیریان نەمابوو كە كام خشڵ و زێڕیان لە چ ماڵێكدا هێناوە.

سەرۆكی شارەوانی لەگەڵ دزەكاندا معامەلە دەكات و بە وەرگرتنی خشڵ و زێڕ و زیوەكە لێیان بەبێ دەنگ هەموویان ئازاد دەكات.

لەو میوانیەی كە منیش لەوێ بووم ئازەر صنیع بە بینینی خشڵ و زێڕەكانی خۆی لە ملی هاوسەری سەرۆكی شارەوانی دەچێتە لای و پاش كەمێك قسە و باس لێی دەپرسێت كە ئەو زنجیر و دەستبەند و خشڵ و زێڕانەی لە كوێ بوو.

هاوسەری سەرۆكی شارەوانیش كە نازانێت خشڵ و زێڕی دزراون دەڵێت ئەم خشڵ و زێڕانە لەلایەن هاوسەرەكەیەوە پێشكەشی كراوە. ئازەر ژنێكی گەورە بوو[1].

---

[1] – بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی (گەورەیی!) خاتو ئازەر صنیعەوە پێویستە بزانیت كە ئازەر صنیع ژنێكی گەنجی خاوەن پیاو بوو كە تازە بەشی ددان پزیشكی تەواو كردبوو و بەشێوەیەكی ڕێكەوت لە زانكۆ دەكوێتە بەرچاوی دكتۆر (سعید حكمەت) سەرۆكی پزیشكی یاسای وڵات.
دكتۆر (سعید حكمەت) نوێنەری ئەنجومەنی شورای ملی و سەرۆكی پزیشكی قانونیش بوو بێ ئەخلاقترین كەس و بێ ئەدەبترین كەس بوو و گەورەترین هونەری هەڵخەڵەتاندنی ژن و كچی جوانی هەبوو بۆ كاری سێكسی و زۆرجاریش هەڵیدەخەڵەتاندن بۆ بەرپرس و سەرمایەدارە گەورەكان.
(هەرچەندە نوێنەری ئەنجومەنی شورای ملی و پیشەیەكی شەریفی هەبوو بەڵام ئەو كابرایە ئیشەكانی بەكار دەهێنا بۆ مەبەستە پیسەكانی خۆی!)

لە میوانیەکەدا بابەتەکە سەری نرایەوە بۆ ئەوەی حەیای هاوسەری سەرۆکی شارەوانی تاران پارێزراو بێت. بەڵام ئیبتهاج بۆ بەیانیەکەی بابەتەکە لە ڕێی بەرپرسە باڵاکانەوە پەیگیری دەکات و سەرۆکی شارەوانی تاران بە تاوانی هاوکاری لەگەڵ دزەکاندا لەسەر کارەکەی لادەبرێت.

لەو سەردەمەدا لە تاراندا وا بڵاوبوو کە خشڵ و زێڕە دزراوەکان موڵکی شاژنی دایك (تاج الملوك) بوون. بەڵام ئەمە ڕاست نەبوو و خشڵ و زێڕەکان موڵکی ئازەر صنیع (ئیبتهاج) بوون کە زۆر گرانبەها بوون و ئیبتهاج ئەم خشڵە گرانبەها و دەگمەنانە کە دەگەڕانەوە بۆ سەردەمی ڤیکتۆریا لە هەراجی فرۆشێکی خشڵ فرۆش لە لەندەن کڕیبوونی.

یادەوەرێکی دیکە کە لەم میوانیانەدا هەمە کارە شێتانەکانی میوانەکان بوو لە کاتژمێری کۆتایی شەوەکاندا.

بۆ نمونە ژنێکی حەیادار ئامادەبوو بۆ ئەو گرەوە گەورانەی کە دەکرا لەبەرامبەر ئامادەبواندا بەشێوەی سەمای ڕۆژئاوای خۆی ڕووت بکاتەوە.

---

حیکمەت بەهۆی ئەو پێگەیەی کە هەیبوو دەگرێت بە شوێن ئیشێکدا بۆ پیاوەکەی خاتو ئازەر بۆیە پاش ئەوەی کە ئیشێك دەدۆزێتەوە بۆ پیاوەکەی، بە نەرمی و فێڵ صنیع هەڵیدەخەڵەتێنێت و پاش ئەوەی کە بەکاری دەهێنێت بۆ خۆی دەیناسێنێت بە ئەبوالحسن ئیبتیهاج و ئیبتیهاجیش بۆ پاداشتی ئەم ژنە گەورەیە (بە قسەی خاتو دیبا) ئیشێکی باش بۆ پیاوەکەی دەدۆزێتەوە!

هاتوچۆی ئازەر صنیع لەگەڵ ئەبو الحسن ئیبتهاج ئەوەندە بەردەوام دەبێت تاوەکو پیاوەکەی ئازەر کە کارمەندی خودی ئیبتیهاج دەبێت لە دامەزراوەی بەرنامە، تێدەگات کە چ بەهایەکی قورسی داوە بۆ پەیداکردنی ئیشەکەی.

هەر بۆیە ژنەکەی تەڵاق دەدات و ئازەر کە ماوەیەکی زۆر لەگەڵ ئەبوالحسن (ئەبدل خان!) پەیوەندی نامەشروع و حەرامی هەبوو شوی پێ دەکات و دەبێتە هاوسەری! (ئیبتیهاج خاوەنی هاوسەریش بوو و پێشتر لەگەڵ کچی معزز الدولەی نبوی هاوسەرگیری کردبوو).

ئەبوالحسن ئیبتیهاج سامانێکی زۆر هەبوو و خاوەنی منداڵیش نەبوو.

لە کۆتایی تەمەنیشیدا هەر دوو پێ فەلەج بوون و چەند ساڵێك پێش ئێستا لە ئەمریکا مرد و سامانێکی زۆری خۆی بۆ ئازەر بابلی (صنیع) بەجێهێشت.

ئـەم ڕووت بوونـــەوە تایبـــەت نـــەبوو بـــە ژنەکانـــەوە بـــەڵکو لـــەلای هەنـــدێك لـــە پیاوەکانیشەوە عادەت بوو لەبەرامبەر ئەو گرەوە گەورانەی کە لەسەر بڕێکی زۆر پارە دەکـــران. کـــاری دیکەشـــیان ئەنجامـــدەدا کـــە بەبۆچـــوونی مـــن بـــەهیچ شـــێوەیەك سەرنجڕاکێش نەبوو بەڵکو زۆر جلْفانە و بێزارکەرانە بوو. هەربۆیە بڕیارمدا ئیدی نەچمە ناو ئەم جۆرە میوانیانەوە.

بەتایبەتی ئەو میوانیانەی کە ترسی ئەوەیان هەبوو بەتەواوی ئالودەی مەوادی مەخەدەر و ماددە ئەلکحولیەکان ببم.

لە میوانیەکاندا خواردنەوە ئەلکحولیەکان زۆر ئاسای بوو، بەلاّم لە هەندێك لە میوانیەکانیشدا جارجار تریاك و حەشیشە کێشانیشی تێدا بوو.

بەکارهێنان و کێشانی تریاك بۆ نەجیبزادە و چینە بالاّکان بەشێوەیەك ئاسایی بووبوویەوە کە زۆربەیان لە ناو خانە باخەکانی خۆیاندا تەلاری تایبەتیان بۆ کێشانی تریاك کردبوویەوە و لە ناوەڕاستی تەلارەکاندا (سۆبای دیواری) یان ئاگردانی تایبەتیان بۆ کێشانی تریاك و حەشیشە دروستکردبوو بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زۆر بە ئاسانی و بەبێ دروستبوونی کێشە بتوانن بیکێشن.

من تەنها خۆم لەم میوانیانە نەکێشایەوە، بەڵکو ئامۆژگاری کچەکەشم کرد کە بەهیچ شێوەیەك نەڕوات بۆ ئەم جۆرە میوانیانەی شەوانە و خۆی بەدوور بگرێت لەم جۆرە کۆڕ و کۆبوونەوانە. خۆشبەختانە محمد ڕەزا ئەهلی ئەو کێشان و بەزم و ڕەزمە نەبوو و بەلاّم جاروبار حەزی لە شەرابی گیلاس (کنیاك هێنسی) دەکرد و جگەرەیەکی (هاڤانا) (چروت)ی دەکێشا کە زیاتر بۆ سەرگەرمی بوو تاکو وەکو کەسێك کە فێربوو بێت، چونکە دووکەڵەکەشی هەڵنەئەمژی. محمد ڕەزا لە کۆتای ساڵی ١٩٧٦ بە دواوە کە ئازاری شێرەپەنجە فشاری بۆ هێنا بوو لەسەر پێشنیاری (دولو) ڕوی کردە کێشانی تریاك.

محمد ڕەزا خۆی باسی دەکرد کە باوکی ڕەزاشا عادەتی وابووە هەموو ڕۆژێك بەیانیان پاش خواردنی نانی بەیانیان کاتێك ویستویەتی بڕوات بۆ کۆشکی مەڕمەڕ بۆ نوسینگەی کارکردنەکەی بڕێك تریاکی کێشاوە!

بەداخەوە لەبارەی محمد ڕەزاشەوە پڕوپاگەندەی ناپەسەند بڵاو دەکرایەوە کە زیاتر دوژمنەکانی سەڵتەنەتی بوون.

بۆ نمونە کاتێک کە هۆشەنگ دولو لە ساڵی ۱۹۷۲ بە بڕێک تریاکەوە لە فڕۆکەخانەی جنێف دەستگیرکرا بەهۆی هاوکاتی سەفەرەکەی محمد ڕەزا و فەرەحیش بۆ سویسرا لەگەڵ ئەم ڕسواییەدا، لە چاپەمەنیەکانی ئەورووپا هەواڵ و بابەتی درۆزنانە چاپ دەکرا لەبارەی ئەوەی کە دولو ئەم تریاکەی بۆ محمد ڕەزا بردوە بۆ سویسرا بە قاچاخی؟

لەکاتێکدا کە هەمووکەس دەزانێت محمد ڕەزا و کچەکەم زستانان دەچوون بۆ شوێنی زستانەی خۆیان لە (سن مورتیس) تاوەکو ئیسکی سەر بەفر بکەن کە یەکێك بوو لەو یاریانەی کە حەزێکی زۆریان هەبوو بۆی. ئێستا چۆن کەسێکی تریاکی دەتوانێت ئیسکی و خلیسکێنەی سەر بەفر بکات کە ئەمەش پرسیارێکە دەبێت ئەو کەسانە وەڵامی بدەنەوە کە ئەو جۆرە درۆ و دەلەسانەیان بڵاو دەکردەوە.

ئێستا کە قسە هاتە سەر دولو خراپ نیە کە هەندێك لەبارەیەوە قسە بکەم. (ئەمیر هۆشەنگ دولو قاجار) خانوویەکی گەورە و فراوانی لەبەرامبەر بەنزینخانەی تەجریش لە جادەی شەمیران هەبوو. دولو سوڵتانی خاویاری ئێران بوو و بازرگانی خاویار بەتەواوی لەژێر دەستی ئەم کەسەدا بوو. سەرهەنگێکی لە (دورگەی ئاشورادە) دانابوو هەرکەس خاویاری دەستبکەوتایە ڕاستەوخۆ تەحویلی ئەمیر هۆشەنگی دەدا. ئەمیر هۆشەنگ چەندجارێك منی بانگهێشت کردوە بۆماڵەوە. چەند کچێکی جوانی بیانی لە ماڵەکەیدا بوون کە تایبەت بوون بە مەساژکردنەوە.

دولو هاوینان لە مەسبەحی کراوەدا مەلەی دەکرد و ئەم کچانەش لەو مەسبەحەدا مەساژیان بۆ دەکرد و ناوشانیان دەشێلا. لە زستانانیشدا حەوزێکی هەبوو پڕی دەکرد لە شیری تازەی مانگا و لەناویدا دەخەوت و پاش چەند کاتژمێرێك کە شیرەکە بەرە بەرە گەرم دەبوو بە مەساژ دەکەوتنە گیانی و لە سەرەوە بۆ خوارەوە باش باش مەساژیان دەکرد!

من ئەم شێوازە لەوەوە فێر بووم و وتم بە فەرەح، محمد ڕەزاش زۆر ئەم کارەی پێ خۆش بوو ئێمە ئەم ڕەوشی چارەسەرە شیریەمان بەکار دەهێنا کە زۆر زۆر سودی

هەبوو چ بۆ لابردنی چڵك و چۆڵیەكانی سەر پێست و هەروەها كاریگەرێكی زۆر باشیشی هەبوو بۆ لایەنی دەروونی.

ئەمیر هۆشەنگ زۆر جێگەی گرنگی محمد ڕەزا بوو، محمد ڕەزا پێی دەوت (مشكی مردوو!) هۆكاری بەكارهێنانی ئەم نازناوەش بۆ ئەوە بوو كە هۆشەنگ دولو بەهۆی زۆری كێشانی تریاكەوە ڕەش و زەعیف بووبوو و بەردەوامیش بۆنی تریاك و دوكەڵی لەچەند مەترێكەوە هەستپێدەكرا!

محمد ڕەزا هەفتەی دوو یان سێ جار دەچوو بۆ ماڵی ئەمیر هۆشەنگ، كچەكەشم زۆر بێتاقەت دەبوو بە چوونی محمد ڕەزا بۆ ماڵی ئەمیر هۆشەنگ.

دواتر، فەرەح بەتایبەتی پێی وتم: (وانەزانیت كە دۆزینەوەیەكی تازەت كردوە محمد ڕەزا بۆ ئەم مەساژ و بەزمو ڕەزمە دەڕوات بۆ ماڵی دولو!)

دولو هەمیشە لەماڵەكەیدا چەندین كچی جوانی ئێرانی و بیانی هەبوون.

(سەر لەشكر ئەیادی) پزیشكی تایبەتی محمد ڕەزاش هەمیشە لە ماڵی ئەو بوو. لەڕاستیدا ماڵی دولو بووبوویە نوسینگەی كار و شوێنی هەمیشەیی ئەیادی.

(ئەمیر هۆشەنگ دولو) و (ئەیادی) زۆر هاوڕێ بوون و هەردووكیشیان بەیانیان پێش ئەوەی محمد ڕەزادا لەسەر جێگە خەوەكەی هەستێت بە یەكەوە خۆیان دەكرد بە ژوورەكەیدا بۆ قسە و باس و گفتوگۆ.

قسە و باسێك كە تەنانەت هەرگیز فەرەحیش نەیتوانی سەری لێ دەربكات. لە تەنیشت ماڵی كۆنی دولو باخێكی پڕ لە درەختی جوان هەبوو كە دولو بە یارمەتی ئەندازیارێكی فەرەنسی كۆشكێكی جوانی لەناودا دروستكردبوو. ئەو كەسانەی كە لەوانەیە هەموو ڕۆژێك لەگەڵ دولو پەیوەندیان هەبوو خاتو ئەشرەف و كچەكەی (ئازادە شەفیق) بوون.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەمیر هوشەنگ سیناتۆر بوو محمد ڕەزا ئەم پۆستەی وەكو خەلاتێك پێ بەخشیبوو.

من لەبەر ئەوەی لە سەفەرەكاندا نەدەچووم لەگەڵ محمد ڕەزا و فەرەح زۆر زانیاریم لەبارەی سەفەركانیانەوە نیە. محمد ڕەزا زۆر دانیشتن و میوانی تایبەتی و جیاوازی هەبوو كە كۆمەڵە دۆستێكی تایبەتی خۆی هەبوو و لەبارەی ئەو باس و ڕوودا و

دانیشتنانەشەوە کچەکەم فەرەح زۆر شتی بۆ باس نەدەکردم و زۆر شتی لێ دەشاردمەوە.

جارێکیان زۆرم هێنا بۆ ئەمیر هۆشەنگ و تۆمەت بارم کرد بەوەی کە محمد ڕەزا لەبەر چەند هۆکارێك هاوڕێیەتی دەکات سوێندی خوارد کە ئەو بەهیچ شێوەیەك ئەو کارانە ناکات و (محمود صدقی) ڕاوێژکاری جنسی جەنابی محمد ڕەزاشایە!

لە کۆمەڵگەیەکی داخراوی وەکو ئێران لەو سەردەمەدا، قسە کردن لەبارەی ژیانی تایبەتی محمد ڕەزا سەرکەشێکی گەورە بوو. بەڵام لەناو بازنەی هاوڕێ نزیکەکاندا بابەتی زۆر قسە و باسیان لەبارەوە دەکرا.

هەموو هاوڕێکانم بەشێوەیەکی باوەڕپێنەکراو شتەکانیان لەلای من نادیدە دەگرت. من دڵنیام ئەوان لەبەر دوو هۆکاری سەرەکی بێ گوێدان لەلای من هەرچیان دەبیست و دەزانی باسیان دەکرد.

هۆکاری یەکەم لەبەر ئەوە بوو کە دڵنیا بوون من زۆر ئارامگر و لەسەرخۆم و تاقەتی ئەم بابەتانەم هەیە. دووەم پەیوەندی ئەوان بوو لەگەڵ من و فەرەحدا. ئەوان بەم شێوەیە هەستی هاودەردی خۆیان بۆ من و کچەکەم دەردەخست.

ئەوان وایان دەزانی فەرەح بێ ئاگایە لە ژیانی نهێنی پیاوەکەی. هەروەها بۆ ئەوە ئەو باسانەیان دەکرد کە من باسی بکەمەوە بۆ کچەکەم.

دەبێت ئەوە بڵێم کە محمد ڕەزا پاش لەدایکبوونی منداڵی چوارەمی بەشێوەیەکی تەواو لە فەرەح دوورکەوتەوە و ژووری نوستنەکەی خۆی گواستەوە بۆ بەشی قاتی دووی ڕۆژئاوای کۆشکی نیاوەران و ئەم ژن و پیاوە زۆر پەیوەندیان بەیەکەوە نەمابوو.

فەرەح کە گەنجی خۆی لە ئەورووپا بەسەر بردوو پەروەردەیەکی ئەورووپی وەرگرتبوو بۆیە سەبارەت بە بێ وەفای محمد ڕەزا زۆر هەستیاری پیشان نەدەدا و گوێی پێ نەدەدا. منیش هەرچیم دەبیست باسم نەدەکرد بۆ کچەکەم چونکە وەکو دایکێك حەزم نەدەکرد نیگەرانیەکانی کچەکەم زۆر بکەم.

چەندینجار فەرەح پێی دەوتم شا و خێزانەکەی وەکو (مانگایەك) سەیری من دەکەن کە گوێرەکەیان بۆ ببینم!

ناکرێت ئەو حەقیقەتە لەبەرچاو نەگیرێت کە کەسێکی وەکو محمد ڕەزا لەکاتێکدا ئەو هەموو توانا فراوانەی لەبەردەستیدایە بە ئاسانی دەیتوانی دەستی بگات بەو پێگە تایبەتیە ژیانە نهێنیەی کە هەر پیاوێکی بێ بنەما دەیەوێت پێ بگات.

ئێستا بە پێویستی دەزانم خاڵێکی مێژوویی هەیە دەمەوێت ڕوونی بکەمەوە. لە کتێبە مێژووییە فراوانەکاندا کە پاش کەوتنی سەڵتەنەتی ئێران بڵاوکراونەتەوە زۆربەیان هۆکاری تەڵاقی شاژنە فەوزیە و شاژنە سورەیایان گەڕاندوەتەوە بۆ دەستێوەردانەکانی خاتو ئەشرەف و خوشکەکانی و دایکی شا.

ئەم نوسەرە بێ زانیاریانە کە لەسەر خەون و گومان کتێبیان نوسیوە، ئەو ژینگە فراوانە خێزانیەی محمد ڕەزایان لەبیر کردوە کە چەند فراوانە و  هەموو ئەو ژیانەیان بەستوەتەوە بەوەی کە وەکو بڵێی ئەو خێزانی پەهلەوی یە لە  بچوکی لادێیەکی دووردا دەژین کە بوك و خەسو و خوشکی پیاوەکە لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی دیکە لەیەك ژووردان و ماڵی خەسوش بەردەوام دەستیان خستوەتە ناو ژیانی بوکەوە!

من پاش ئەمە لەبارەی خاتو ئەشرەفیشەوە قسە دەکەم. بەڵام لێرەدا بە پێویستی دەزانم و بە ڕوونی و ئاشکرا بڵێم کە خاتو ئەشرەف یان شەمسە و فاتمە و تەنانەت خاتو (تاج الملوك)یش بچوکترین دەستوەردیانیان لە ژیانی ژن و پیاوی محمد ڕەزا و کچەکەمدا نەبوو.

من بە زیرەکی خۆم لە ژێر زمانی زوهرا مەشهەدی، خاوەنی دیوان و بەرپرسی کاروبارەکان (ئاغای یعسوبی)، ئیحترام ملوك و ئەو کەسانەی کە ئاگاداری ڕووداوەکانی پەیوەست بە ژیانی نهێنی محمد ڕەزا بوون زانیارێکی فراوانم بەدەستهێنا و ئێستا بەدڵنیاییەوە دەڵێم کە محمد ڕەزا لەو دەستە پیاوە زۆرزان و شەیتان ئاسایانە بوو کە قەناعەتی نەدەکرد بە ژنەکەی خۆی. (فەوزیە) نەیتوانی تەحەمولی ئەم بارودۆخە بکات و لەسەر داوای خۆی لە محمدڕەزا جیابوویەوە.

محمد ڕەزا (فەوزیەی) خۆشدەویست و بەهیچ شێوەیەك ئامادە نەبوو تەڵاقی بدات. هەموو دەزانن کە (فەوزیە) هەم بێ ڕدە جوان بوو و هەمیش توانای منداڵبوونی هەبوو و دایکی یەکەمین منداڵی محمد ڕەزا (شاناز)یش بوو و لەکاتێکیشدا لەوانەیە لە منداڵبوونەکانی دواتریشدا چەندین  کوڕی هەبووایە.

(سورەیا ئەسفەندیاری) هەر لەبەر ئەم ئەخلاقەی لە محمد ڕەزا جیابوویەوە.

هەرچەندە بابەتی منداڵ نەبوونی (سورەیا ئەسفەندیاری) کێشەی سەرەکی بوو، بەڵام سورەیا ئامادە نەبوو وەکو هاوسەر لەگەڵیدا بمێنێتەوە تاوەکو محمد ڕەزا بۆ منداڵ لەگەڵ ژنێکی دیکەدا هاوسەرگیری بکات.

خودی محمد ڕەزا بۆ من باسی کرد کە چۆن هەوڵیداوە تاوەکو سورەیا قەناعەت پێ بکات لەگەڵیدا بمێنێتەوە.

محمد ڕەزا هەم سورەیای خۆشدەویست و هەمیش لەگەڵیدا هەستی ئارامی دەکرد.

محمد ڕەزا دەڵێت کاتێك کە لە رامسەرەوە هەڵهاتین بۆ بەغداد، زۆر بێتاقەت و دەروونیە تێکچووبووین. لەو ڕۆژە سەخت و دژواریانەدا سورەیا هەمیشە دڵنەوای منی دەدایەوە و بەردەوام ئومێدی پێ دەبەخشیم.

کاتێك پێم وت لەوانەیە ئیدی هەرگیز نەتوانم بگەڕێمەوە بۆ ئێران. سورەیا وتی: (من دەمەوێت هاوسەری تۆ بم نەك هاوسەری شای ئێران!)

پاشان بڕیارماندا بڕۆین بۆ ئەمریکا و لەوێ خەریکی کاری کشتوکاڵی بین. کاتێك کە کودەتای ۱۹۵۳ لە ئێراندا سەرکەوت و گەڕاینەوە بۆ وڵات هەمیشە خۆشەویستیە بەردەوامەکانی سورەیام لەو ڕۆژە سەختانەدا لەبەرچاو بوو و هەر ئەم هۆکارە بوو کە بەردەوام خۆشەویستێکی تایبەتیم هەبوو بۆی....)

کاتێك کە چارەسەرەکان سودیان نەبوو لەبارەی توانای منداڵبوونی سورەیا. محمد ڕەزا بۆ ئەوەی ببێتە خاوەنی وەلیعەهدێك دوو ئەگەری هەبوو.

یەکەم پێویستە هاوسەرێکی دیکە بهێنێت بۆ ئەوەی ببێتە خاوەنی منداڵ. لەم حاڵەتەشدا هەرچەندە سورەیا پێگەی خۆی وەکو شاژنی ئێران لەدەستدەدا بەڵام وەکو هاوسەری یەکەمی شای ئێران پێگەی تایبەتی خۆی دەپاراست. محمد ڕەزا بۆ ڕاکێشانی سەرەنجی سورەیا هەوڵیدا و زۆر دڵنیای کردەوە کە باوکی (ڕەزا شا)ش چوار ژنی هەبووە.

سورەیا ئەم پێشنیارەی محمد ڕەزای قبوڵ نەدەکرد. هەموو ژنەکان ئە بارودۆخەی سورەیا زۆر بەباشی هەست پێدەکرد. هیچ ژنێك ئامادە نیە لە نیوەی دڵی پیاوەکەیدا شوێنێکی هەبێت و نیوەی دیکەی بدات بە ژنێکی دیکە.

محمد ڕەزا کە پەیوەندیکی زۆری هەبوو لەگەڵ سورەیادا بۆ ئەوەی لە دەستی نەدا بڕیارێکی دیکەی دا لەسەر بنەمای ئەو بڕیارە شاهپور غلامرزا وەکو وەلیعەهدی خۆی قبوڵ بکات.

محمد ڕەزا لە ناساندنی شاهپور غلامرەزا بۆ وەلیعەهدی زۆر سور بوو بەلام سورەیا کە ژنێکی هەستیار و مغرور بوو لەگەڵ ئەوەی کە بۆ یەکەمجار بە ئاشکرا لەسەر زمانی هاوسەرەکەی خۆی باسی هێنانی ژنی دووەمی کرد توشی شۆکێکی گەورە بوو و بەشێوەیەکی نەخۆشانە سەیری محمد ڕەزای دەکرد. لەو سەردەمەدا، خزمەکانی سورەیا لە وەزارەتی کۆشك و ناو کۆشکەکانی سەڵتەنەتی کاروبارێکی زۆریان بەدەستەوە بوو و تەنانەت شۆفێری تایبەتی محمد ڕەزا لە خزمانی سورەیا و خێڵی بەختیاری بوو.

سورەیا هەموو ڕۆژێك لە شوێنێکەوە هەواڵی پێ دەگەیشت کە محمد ڕەزا خەریکی دۆزینەوەی ژنە و دەیەوێت هاوسەری دووەمی بهێنێت.

ئەگەر محمد ڕەزا بەهەر هۆکارێك هەبوایە چاوی بە کچێکی جوان بکەوتایە ئەوا دەوروبەرەکەی شاژنە سورەیا بەخێرایی بۆ ئەوەی خۆیان بەرنە پێشەوە یان بۆ ئەوەی پاداشتێك وەرگرن ئەوەندەی دیکە ترش و خوێیان دەکرد بە سەر بابەتەکەدا و مەسەلەکەیان دەگەڕاندەوە بۆ سورەیا. (خەیرخان گودەرزی) کە یەکێك بوو لە خەڵکی ئیلی بەختیاری و کەسێکی نزیك سورەیا بوو ماوەیەك پێش ئێستا لە ئەمریکا کۆچی دوایی کرد باسی کرد بۆم کە شا بەهیچ شێوەیەك حەزی نەدەکرد سورەیا تەلاق بدات. بەلام کاتێك کە محمد ڕەزا باسی وەلیعەهدی کرد و باسی هێنانی ژنی دووەمی کرد و سورەیاش هەر پێشتر دەیزانی کە پیاوەکەی بە وەفا نیە لەگەڵیدا بۆیە بەردەوام فشاری دروست دەکرد لەسەر ئەوەی کە جیاببێتەوە لێی.

بێ گرنگی سورەیا وەکو شاژن و ئەو پێگە تایبەتەی کە هەیبوو زۆر سەرسوڕهێنەر بوو، سورەیا لە دایکێکی ئەڵمانی بوو و سەردەمی گەشەکردن و پێگەیشتن و خوێندنی لە ئەڵمانیا تەواو کردبوو و پەروەردە و تەربیەتێکی تایبەتی هەبوو.

پاش وەرگرتنی تەلاق لە محمد ڕەزا لەبەر ئەوەی کە لە ترۆپکی جوانیدا بوو و خوازبێنیکەری زۆری هەبوو تەنانەت لەشازادەکانی ئەوروپا و کەسایەتیە

ناسراوەکانەوە بیگرە تاوەکو دەگاتە هونەرمەندەکانی هۆلیود، بەلام ئەو هەرگیز هاوسەرگیری نەکرد. سورەیا چەند سالێك پێشتر دایکی لەدەستدا و منیش پەیامێکی سەرەخۆشیم بۆ نارد.

ئاغای (ئەسفەر ئەمیر صادقی) شۆفێری تایبەتی محمد ڕەزا دەیوت: (شاژنە سورەیا ژنێکی زۆر خۆشەویست و تاوەکو ڕادەیەکی زۆریش شەرمن بوو. هەموو ژنەکانی کۆشك خۆشیان دەویست و شەمسە و فاتمەش پەیوەندێکی تایبەتیان هەبوو لەگەڵیدا).

من و کچەکەم فەرەح دەمانزانی کە ئەگەر بمانەوێت لەبارەی ژیانی نهێنی (و زیاتری شەوانەی) محمد ڕەزاوە هەستیاری پیشان بدەین بێ گومان ژیانی هاوبەشی فەرەح و محمد ڕەزا وێران دەبێت.

بۆ محمد ڕەزا وەلانانی ڕابواردنەکانی شەوانە، کە خووی پێوەگرتبوو، بەڕاستی سەخت و نەگونجاو بوو.

تەنانەت ئەگەر سەرۆك کۆمارێك یان پاشای ولاتێکیش بهاتایە بۆ ئێران و میوانی محمد ڕەزا بوایە فەرمانی دەردەکرد بە خزمەتکارەکانی کۆشك بەرنامەی خوانی ئێواران بەشێوەیەکی ڕەسمی ئامادە بکەن و لە فلانە کاتژمێردا کۆتایی پێ بهێنن.

ئەگەر محمد گرنگترین کاریشی هەبوایە لە کاتژمێر ١٠ شەوی وازی لێ دەهێنا و دەچوو بەدەم ژیانی شەوانەی خۆیەوە و نزیکی بەیانی دەگەڕایەوە بۆ کۆشکە تایبەتیەکەی خۆی[1]

بۆ ڕۆژی دواتریش واتە بەیانیەکە بە بیانوی ئەوەی کە شا پشوو دەدا تاوەکو ١٠ بەیانی لەخەودا بوو.

بوونی ئەم بازنەی هاوڕێیانە لە لای من زۆر گرنگ بوو، چونکە هەندێك لەوانە لە هاوڕێیانی محمد ڕەزا و کەسانی دەوروبەری بوون.

---

[1] –پاش ئەوەی محمد ڕەزا شا لە پاسارگارد لەبەردەم گۆڕەکەی کورشدا وەستا و بەدەنگی بەرز وتی: (کۆرش ئاسودە بەخەوە ئێمە بەخەبەرین!) قسەیەکی لەخۆوە نەبوو! چونکە بەوشێوەیەی کە خەسوی دەڵێت هەموو شەوێك تاوەکو بەیانی کە کەڵەشێر دەیخوێند بەخەبەر بووە!

هاوڕێکـانم ئاگاداریـان دەکردمـەوە کـە بـۆ نمونـە شـەوی ڕابـردوو لـە میـوانی و دانیشتنەکەی (عەلەم) چی ڕوویداوە.

یان من دەمزانی کە محمد ڕەزا شەوی ڕابردوو لەگەڵ (گیتـی خطیر) کچە خاڵەکەی کاتی بەسەر بردوە.

(ئەسـدالله علـم) هەرچـەندە ڕۆژانـە کاتێـك لەگـەڵ ئێمـەدا هەڵـسوکەوتی دەکـرد دەیویـست خـۆی وەکـو پیـاوێکی جێنتڵمـانی واقعـی پیـشان بـدات بـەڵام لـە ڕاوێـژکارە جنسیەکانی محمد ڕەزا بوو و ئاگاداری ئەوە نەبوو کە من و کچەکەم لەڕێگەی ئەو هاوڕێیانەمانـەوە کـە هاتوچـۆیان لەگـەڵ میوانیـەکانی ئەوانـدا هەیـە هەمووشـتێك دەزانین.

لەوانەیە ئەگەر ژنێکی ئاسایی، بێ وەفایەکی لـەم شێوەیەی لە پیاوەکەی ببینایە بـەبێ دواکـەوتن داوای جیابوونـەوەی لـێ بکردایە، بـەڵام فـەرەح وەکـو وەلیعەهـد و شاژنی ئێران خاوەنی ئەرکێکی مێژوویی بوو و نەیدەتوانی ئەو مەسەلانە بگۆڕێتەوە بە حەسودیە ژنانەکانی!

پاش تاج لەسەرنانی ڕەسمی ساڵی ١٩٧١ پێگەی کچەکەم جێگیر بوو.

فەرەح و محمد ڕەزا نـەك وەکـو ژن و پیـاو بەڵکو وەکـو دوو بەرپرسـی ڕەسمـی وڵات خـاوەنی کۆمەڵــە بەرپرســیارەتێك بــوون و کــچەکەم هەوڵیــدەدا خــۆی نــوقمی بەرپرسیاریەتە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان بکات.

فــەرەح بــەو کەســایەتیە بــەهێزەی کــە هــەیبوو بێتاقــەتی بــێ وەفــای و گــوێ پێنەدەریەکانی پیاوەکەی نەبوو و لەبری ئەوەی کە ژیـانی خـۆی لەناوبـەرێت هەوڵیدا لـەپاڵ منداڵەکانیـدا بمێنێتــەوە و ئـەو ناتەواویــەی ژیـانی لـە ڕێگـەی ئـەو مهـر و خۆشەویستە زۆرەی کە هەیبوو بۆ منداڵەکانی قەرەبووی بکاتەوە.

فـەرەح بەڕاسـتی لەخۆبوردوانـەی پیـشان دەدا. هەنـدێکجار کـە لـە دانیـشتنێکی تایبـەتی و زۆر هاوڕێیانـەدا دادەنیـشتین و نهێنیمـان باس دەکـرد هـاوڕێ نزیکـەکانی زۆر سەرسامی خۆیان پیشان دەدا لە تەحەمول و خۆڕاگری فەرەح.

گویێ نەدەری فەرەح سەبارەت بە هەڵسوکەوتەکانی محمد ڕەزا بووە هۆی ئەوەی کە چەتاوە ڕوویی محمد ڕەزا بکاتە ئاستێك کە بە ئاشکرا یەکێك لەو خۆشەوسیتانەی کە کچێکی ئەفسەرێکی هێزی ئاسمانی بوو بیهێنێت بۆ کۆشك لەگەڵ خۆیدا.

ئەم کچە ناوی (گیلدا ئازاد) بوو. محمد ڕەزا لە کۆشکدا شوێنێکی تایبەتی پێدا بوو.

هەرچەندە فەرەح دەیویست سەبارەت بەم مەسەلەیە زۆر گوێ نەداتێ بەلام جارێکیان زۆر بە توندی زلەیەکی لێ دەدات.

فەرەح کە تاوەکو ئەو کاتە تەحەمولی هەموو ساختەچیەتیەکانی شای کردبوو و بەلام ئەو بارودۆخەی قبوڵ نەکرد و ئەوەندە کێشەی بۆ ئەم کچە دروستکرد تاوەکو محمد ڕەزا ناچاربوو لە کۆشك بیکاتە دەرەوە.

من جارێکیان باوکی ئەم کچە (فەرماندە ئازاد)م لە میوانیێکی ئەفەسەرکاندا بینی.

ئەو هاتە پێشەوە تاوەکو دەستم ماچ بکات. بەلام من ڕێگەم پێ نەدا. پاشان بەهێواشی پێیوتم: (لە ناخەوە داوای لێبوردن دەکەم) پاشان وتی بۆ ئەو مەسەلەیە هیچ توانایەکی منی تێدا نیە و خۆشم هیچ مەبەستێکم نیە ئەوەی کێشە بۆ تۆ و کچەت دروست بکەم.

(گیلیدا) پاش ئەوەی فەرەح زلەکەی لێ دەدات ئەویش دەستی ماچی دەکات و دەڵێت بەکچەکەم: (خەتای منی تێدا نیە دەبێت جەنای خاتوون بمبەخشێت!)

پاشان لە ڕێگەی پەری (ئەباصلتی) کە لە سەفەرێکی محمد ڕەزا بۆ ئەصفەهان وەکو ڕۆژنامەنوسێکی ڕۆژنامەی ئیتلاعات لەگەڵیدا بوو، بیستم ئەم کچە لەگەڵ باوکیدا لەو فرۆکەیەدا دەبن کە شای پێ بوو هەر بۆیە لەناو فرۆکەکەدا دەستدرێژی دەکاتە سەر.

لەناو بازنەی هاوڕێکانمدا سەرەڕای قسە و باسی خۆش و قسەی گاڵتە و گەپ(!) گفتوگۆ و بابەتی جدی و قسەی نهێنی زۆریش دەکران.

جگە لە سەفەرەکان و بەشداریکردن لە میوانیەکان و بانگهێشتە جۆراوجۆرەکان هەندێکجار ژنەکانیش کۆمەڵێك کاریان ئەنجام دەدا بە مەبەستی کاری خێرخوازی.

ژنەکان لە هەر ڕەگەز و هەر چینێکدا بن لە پیاوان دڵناسکترن.

ئێستا کە نزیکەی بیست ساڵە لە ئەمریکا دەژیم زۆر بە قوڵی هەست بە سۆزداری ئێرانییەکان دەکەم لە چاو نەتەوەکانی دیکەی جیهان، بەتایبەتی ڕۆژئاواییەکان.

هەرچەندە ئەو ژنانەی کە لە ناو بازنەی هاوڕێکانی ئێمەدا بوون لە ژنانی چینە باڵاکانی کۆمەڵگە بوون و لە هیچ لایەنێکەوە چ لایەنی مەعنەوی و چ لایەنی ماددی کەم و کورتیان نەبوو لەگەڵ ئەوەدا پرسەکانی چاوپێکەوتن و پرسی چینەکانی خوارتی کۆمەڵگەیان لەبەرچاو دەگرت.

یەکێك لەو کارانەی کە ئێمە ئەنجاممان دەدا سەردانکردنی یانەکانی چاودێری و هەتیوخانە سەرەکیەکانی وەکو جەوادیە، تاران پارس و جادەی سی مەتری تاران بوو.

تەنانەت ئێمە سەردانی کورەخانەکانی باشوری تارانمان دەکرد کە هەژارترین خەڵکی تێدا دەژیا و هەوڵماندەدا یارمەتی ماددیان پێشکەش بکەین.

چەندجارێك پاش ئەم کار و سەرکەشیانە وتم بە فەرەح خەڵکی لەم ناوچانەدا زۆر هەژار و کەم دەرامەتن.

فەرەح ئەوەی لە منەوە بیستبووی هەمووی گەڕاندبوویەوە بۆ محمد ڕەزا و محمد ڕەزاش فەرمان دابوو بە سەرۆکی دەوڵەت کە ئەو سەردەم ئەمیر عباسی هەویدا بوو چاودێریان بکات و بزانێت کێشەکانیان چییە.

دەرئەنجام بووە هۆی ئەوەی کە سەرۆکی ساواکی تاران هاتە لام و پاش باس و خواستێکی زۆر، بە ڕاشکاوانە داوای لێ کردم کە دەبێت بەهەموو شێوەیەك خۆم بەدوور بگرم لەم جۆرە سەردان و چاوپێکەوتنانە.

ئەو وێنەیەکی زبر و ناخۆشی ئەم خەڵکەی لەلای من نەخشاند و وتی تەنانەت لەوانەیە ڕووبەڕووی کوشتن ببیتەوە و ئەوان لەبری پیاوەتی و ئەو چاکەکاریەی کە تۆ ئەنجامی دەدەیت زیانێکی گەورەت پێ دەگەیەنن! من لەبەر ئەوەی کە خۆم لە چینێکی بێ بەش و هەژاردا گەورە بووبووم لە ناخی دڵەوە وابەستەی ئەم جۆرە کەسانە بووم و ئازارم دەکێشا بۆیان. لەلایەکی دیکەشەوە حەزم دەکرد کە بەپێی توانا یارمەتی ئەو کەسانە بدەم کە پێویستیانە و چاویان لە یارمەتیە.

سەرئەنجام هەردووکمان ڕێککەوتین لەسەر ئەوەی کە سنوری سەردان و یارمەتیەکانمان بگۆڕین بۆ ناوچەکانی باکوری تاران کە لەوێدا تەنها باخچەیەکی ساوایان و خەڵوەتگەیەکی ژنانەی لیّ بوو.

هەروەها بڕیاردرا پێش سەردانەکانمان بۆ ئەو شوێنانە ئاگاداری ساواك بکەین بۆ ئەوەی لەڕووی ئاسایشیەوە چاودێری ئەو ناوچەیە بکەن و (پاکی) بکەنەوە.

دواتر تێگەیشتم کە مەبەستیان لە (پاك) کردن لە زمانی ئاسایشی بەمانای ئەوە بوو کە پێش ئەوەی ئێمە بڕۆین بۆ سەردانی ئەو شوێنانە، دۆشەك و لیفەکان دەگۆڕن و گوڵدان لەتەنیشت شوێنی خەوتنەکانەوە دادەنێن و کۆڵانەکە پاك دەکەنەوە، بەکورتی بۆ ئەوەی بارودۆخەکە بەشێوەیك بێت کە لە هۆتێلێکی پلە یەکی تاران بچێت!

مەسەلەکەش بۆ ئەوە بوو لەبەر ئەوەی من بارودۆخەکە بەخراپی نەبینم و ئەو بارە ناهەموارەی کە ئەوان هەیانە نەیگەیەنمە محمد ڕەزا شا و ئەویش تووڕە نەبێت لە بەرپرسەکان بۆیە ئەم کارەشیان دەکرد بۆ ئەوەی ئێمە واتێ بگەیەنن کە ئەو شوێنانە خزمەتگوزاری باشیان هەیە و هیچ کێشەیەکیان نیە و ئەمەش وادەکات هەواڵی خۆش بگاتە محمد ڕەزا!

بەدرێژای ئەم ساڵانە بەردەوام بیری ئەوەم دەکردەوە کە بۆچی تاج و تەختی شاهنشاهی ئێران کەوتە لەرزین و پایەکانی هەرەسی هێنا. وەڵامی جۆراوجۆر دەهات بە مێشکمدا. بەڵام بە بۆچوونی من سەرەکیترین هۆکاری گەندەڵبوونی پایەکانی ئەم ڕژێمە (درۆ) بوو. بەتایبەتی لەم ساڵانەی کۆتایی هەمووکەس لەگەڵ هەمووکەسدا درۆی دەکرد[1].

---

[1] - محمد حسن هیکل ڕۆژنامەنوسی بەناوبانگی میسری (سەرنوسەری ڕۆژنامەی پێشووی الاهرام و وەزیری پێشووی کابینەکەی جمال عبدالناصر) لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی (ئێران-ئەو چیرۆکەی کە هەرگیز نەوترا) دەنوسێت: (جیاوازی محمد ڕەزاشا لەگەڵ باوکی (ڕەزا شا پەهلەوی) ئەوە بوو کە لەبەرامبەر ڕەزاشادا هیچکەس جورئەتی ئەوەی نەبوو درۆ بکات، بەڵام لەبەرامبەر محمد ڕەزاشدا هیچکەس جورئەتی ئەوەی نەدەکرد (ڕاستی) بڵێت!

ئێمەش کە ناچار نەبووین درۆ بکەین هەرگیز پرسیارمان لێ نەدەکرا. من هەرچی دەهات بە مێشکمدا لەگەڵ کچەکەمدا گفتوگۆمان لەسەر دەکرد.

کاتێک کە سەرەتا فەرەح هاوسەرگیری کردبوو لەگەڵ محمددا هەوڵیدەدا کێشە و بابەتەکان بگەیەنێتە محمد ڕەزا. بەڵام زۆر زوو فەرەح تێگەیشت کە محمد ڕەزا تەنها دەیەوێت هەواڵی خۆش ببیستێت. تەنانەت ئەگەر بابەتەکەش درۆ بێت!

ماستاوکردن و درۆکردن و و ڕووپامای لە سەرەتای حکومەتەکەی سەرۆک وەزیرانی هەویدا بەشێوەیەك خێرا پەرەیسەند کە کەم کەم خەریك بوو دەگەیشتە ترۆپکی خۆی!

هیواش هیواش هەمووشتێك شێوە نمایشێکی لەخۆی دەگرت.

جارێکیان ئاغای معینیان سەرۆکی نوسینگەی تایبەتی، بەسەرهاتێکی بۆ گەڕاندمەوە تاوەکو من جیاوازی نێوان ئەم باوك و کوڕە (محمد ڕەزا شا) تێ بگەم.

معینیان وتی:

(جارێکیان جەنابی ڕەزاشا خۆی ئامادە دەکات بۆ ئەوەی سەفەرێك بکات بەرەو ئەهواز یەکێك لە بەرپرسە ناوچەییەکانیش بیستبووی کە ڕەزاشا حەزێکی زۆری لە ناشتنی درەخت و سەوزاییە فەرمانی دەرکردبوو کە ژمارەیەکی زۆر دارخورما لە ئابادان ببڕن و بیانهێنن بۆ سەر ڕێگەی تێپەڕینی ڕەز شا.

پاشان درەختەکان لە ناوەڕاستی بیابانێکی بێ ئاو و گیادا یەك بەدوای یەك دەیاننێژن بۆ ئەوەی ڕەزاشا کە لەوێیوە تێ دەپەڕیت ئەو دارخورما بێ ڕەگ و ڕیشانە(!) ببینێت.

ڕەزاشا کە سەربازێکی کۆنەکار و دنیا دیدە بوو زۆر هۆشیار دەبێت و تێدەگات کە ئەو درەختانە ڕاستی نین. بۆیە لەسەر ڕێگەکە لە سەیارەکەی دادەبەزێت و بەرەو لای یەکێك لە دارخورماکان دەڕوات بەبیانوی پشوودان لە ژێر سێبەرەکەیدا لەو کاتەدا دەستی دەخاتە پشتیەوە و پاڵ دەداتەوە و هێزی خۆی دەخاتە سەر درەختەکە!

پاڵ پێوەنانەکەی ڕەزا شا دەبێتە هۆی ئەوەی کە دارخورماکە بکەوێت.

ڕەزشا چەند درەختێکی دیکە بەم شێوەیە تاقی دەکاتەوە و پاشان فەرمان دەدات ئەو بەرپرسە ناوچەییە بە تاوانی درۆکردن و فێڵ لێدان شەلاّق کاری بکەن!

بەڵام چەند کاتژمێرێك پێش سەردانی محمد ڕەزا بۆ بنکەی ڕاوکردنی مهر ئاباد، فەرماندەی ئەو کاتەی بنکە سەربازیەکەی ئەو ناوچەیە کاتێك دەزانێت محمد ڕەزا نیازی سەردانی هەیە بۆ ئەو ناوچەیە، بە فڕۆکە لە ناوچەی باشوری ئێران گوڵدانی پڕ لە گوڵی سور دەهێنێت و بەو چلەی زستانە کە بەفرێکی قورسیش باری بوو لە تاران ئەم گولانەی بە گوڵدانەکانەوە کردبوو بە ژێر خاکەوە!

محمد ڕەزا نەك هەر پرسیاری نەکرد کە لەم زستانە سارد و لەژێر ئەم بەفرە سەهۆڵبەندانەدا چۆن ئەم هەموو گوڵە سورە بەم شێوەیە ڕواون. بەڵکو خەڵاتێکی باشی فەرمانده‌ی بنکە سەربازیەکەشی کرد بۆ ئەو خەمخۆری و گوڵکارییە جوانەی کە کردبووی!

معینیان وتی جیاوزی ئەم باوك و کوڕە (ڕەزاشا و محمد ڕەزا) لێرەدایە کە لەبەرامبەر ڕەزاشادا کەس جورئەتی ئەوەی نەدەکرد (درۆ) بکات. و لە بەرامبەر محمد ڕەزاشدا کەس جورئەت ناکات ڕاستی بڵێت!)

لەناو بازنەی هاوڕێکانی ئێمەشدا دوو سێ درۆزن هەبوون، کە وەسف و سەنای هەمووکەسێکیان دەکرد و بە درۆوە هەمووشتێکیان دەوت.

منیش لەم هەموو درۆ و دەلەسانە تێکدەچووم. بەڵام بۆ گۆڕینی ئەم بارودۆخە نەدەکرا هیچ شتێك بکەم. دڵنیام خودی (شا)ش نەیدەتوانی هیچ کارێك بکات جگە لەوەی کە دەیکرد.



ئارامگای ڕەزاشا لە شاری ری کە لەسەر شێوەی ئارامگای ناپلیۆن بۆناپەرت دروستکرا بوو، پاش شۆڕشی ئیسلامی ئێران ئەم شوێنە بەفەرمانی ئایت الله خلخالی تێکدرا و لەبری ئەو حەوزەی زانستگەی شاری ری (عبدالعظیم) دروستکرا.



جەستەی مۆمیاکراوی ڕەزاشا کە ئێستا لە مزگەوتی الرفاعی یە لە قاهرە



ئەمیر عباس هویدا لەکاتی وتارداندا (سەرۆك وەزیرانی سەردەمی محمد ڕەزاشا)



نعمت الله نصیری سەرۆکی ساواك ، لەکاتی دەست ماچکردنی محمد ڕەزاشادا




محمد ڕەزا شا و
ریچارد نیکسۆن
جیگری سەرۆکی ئەمریکا



هاودەم (هامدم) السلطنە
کچی محمد ڕەزا شا



غلامرەزا لە تەمەنی پیریدا



سورەیا و محمد ڕەزا شا




١- عبدالله ريازى

٢- جعفر شريف ئيمامى

٣- جمشيد ئاموزگار

٤- اشرف پهلوى

٥- منوچهرى ئيقبال

٦- محمد رەزاشا پەهلەوى

٧- علينقى عاليخانى

٨- هادى هيدايەتى

٩- منوچهرى شاهقلى

١٠- جواد ئاشتيانى

١١- محمد صفى اصفهانى

١٢- مستەفا مصباح زاده

١٣- يوسف خوش كيش

١٤- نصرالله كاسمى

١٥- تاهر زيائى

# سەفەرەکانی دەرەوە

لە سەفەرەکانی دەرەوە و دیدارەکانم لەگەڵ کەسایەتیە جیهانیەکاندا بیرەوەری شیرینم هەیە.

هەندێکجار کاتێك کە یادەوەریە خۆشەکانم دهێنمەوە بەرچاوی خۆم دەگەمە ئەو دەرئەنجامەی کە ژیانی مرۆڤ هیچ نیە جگە لە کۆمەڵێك یادەوەری...

یەکەمین سەفەری دەرەوەم بۆ پاریس بوو لەگەڵ کچەکەم بۆ کرینی جلوبەرگ و خشڵ و زێڕ و پێویستی و کەلوپەلەکانی بوك گواستنەوە.

ساڵانێکی زۆر کچەکەم لە پاریس مابوویەوە و خەریکی خوێندن بوو و من پێشتر باس و شێوەی پاریسم لەو نامانەدا خوێندبوویەوە کە فەرەح بۆی دەناردم.

کاتێك کە بۆ یەکەمجار ڕۆیشتم بۆ پاریس و شاری گوڵ و باخچە پڕ لە درەخت و فوارەکانم بینی نوقمی ئەو هەموو جوانی و ڕزاوەیەی پاریس بووم و تازە تێگەیشتم کە بۆچی خوالێخۆش بوو ئەحمەد شا قاجار مانەوە و ژیانی پاریسی بەلاوە پەسەندتر بوو لە سەڵتەنەتی ئێران.

کەسێك کە هەرگیز لە وڵاتەکەی خۆی نەچووبێتە دەرەوە و ژیانی تەنها لە شارێکی بچوك و بیّ بەشدا بەسەر بردبێت کاتێك دەڕوات بۆ پایتەختی وڵاتی گوڵەکان ڕێك وەکو ئەوە وایە کە بڕۆیت بۆ دنیایەکی دیکە. جیهانێکی تەواو سەرسوڕهێنەر. ئەگەر بڵێم بەڕاستی توشی حەپەسان و واقوڕمان بووبووم هەرگیز زیادەڕەویم نەکردوە.

ڕۆژنامە و گۆڤارە ناسراوەکانی فەرەنسا کە ئاگاداری ئەوە بووبوون بەم نزیکانە کچێکی خوێندکاری ئەندازیاری پاریس لەگەڵ شای ئێراندا هاوسەرگیری دەکات

بەرەو هۆتێلەکەی ئێمە هاتبوون و لەگەڵ من و جەنابی خاتو ئەشرەف و کچەکەم فەرەح چاوپێکەوتنیان دەکرد.

بڵاوبوونەوەی وێنەکانی ئێمە لەناو ژمارەیەك بڵاوکراوە ناسراوەکانی فەرەنسا بووە هۆی ئەوەی هەر لەیەکەم ڕۆژی چوونمان بۆ پاریس ببین بە کەسایەتێکی ناسراو. دەچووین بۆ هەرشوێنێك خەڵکی دەورەیان دەداین و خۆشەویستی خۆیان بۆ دەردەبڕین. پاریسیەکان زۆر خوێن گەرم و مهرەبانن. فەرەنسیەکان بە سەر سوڕمانەوە سەیری فەرەحیان دەکرد کە جل و بەرگی مۆدەی ڕۆژئاوایی لەبەرکردوە.

هەندێك دەیانوت چاوەڕوانی ئەوە بووین کە کچێك ببینن بە جلوبەرگی زێڕینی نمونەی سەدەکانی ناوەڕاست!

زۆربەیان بوکی ئایندەی دەرباری ئێرانیان وەکو وڵاتێکی نهێنی ئامێزی ڕۆژهەڵات، وێنای شەهرزادی چیرۆك گێڕەرەوەی کتێبی هەزار و یەك شەویان لە مێشکدا بوو. زۆرێك لە خەڵك کە پێیان دەزانین داوایان لێ دەکردین وێنەمان لەگەڵدا بگرن.

ئەم پێشوازی و دەربڕینی خۆشەویستی پاریسیانە زۆر دڵنشین بوو.

لەبەر خۆمەوە وابیرم دەکردەوە ئەگەر من لەبری فەرەح بوومایە هەرگیز شوم بە محمد ڕەزا نەدەکرد. هەر لەم پاریسە دەمامەوە و ئیش و کاری خۆم دەکرد. وەکو دایکم دەیوت خوا عەفوی بکات: (ژیان درێژیەکەی گرنگ نیە، پانیەکەی گرنگە!)

بێ گومان، ژیان لە پاریسدا وەکو کەسێکی ئازاد، لە ژیانی کۆشکی ئێران کە تەنانەت دەبێت مۆدێلی قژەکان و جۆری لەبەرکردنی جلوبەرگەکەت ڕاوێژکارەکانی جەنابی حەزرەت دیاری بکەن، زۆر خۆشتر و بەچێژترە.

فەرەح چەندین ساڵ لە پاریس خوێندبووی و بووبوو بە ئەندازیار، بەشێکی تەواوکردبوو کە تەنانەت لە فەرەنساشدا ئایندەیەکی باشی هەبوو. زمانی فەرەنسیەکەی زۆر باشتر بوو لە زمانی فارسیەکەی و شارەزایەکی تەواوی کونج و کەلەبەری ئەدەبیاتی فەرەنسیشی هەبوو.

نازانم بۆچی بە بیستنی پێشنیارەکەی شا بەیەکجار هەمووشتێکی فەرامۆش کرد و وازی لێهێنا و تەنانەت دەستگیرانی خۆیشی لەگەڵ کەریم پاشا (بهادری) تێکدا و شای هەڵبژارد.

لەوانەیە بتوانرێت بوترێت کە هۆکارەکەی بەرز فڕی و فراوانخوازی کچێك بوو لە تەمەنی فەرەحدا. بەڵام هەموو ئەوانەی کە فەرەح دەناسن دەزانن کچەکەم بەهیچ شێوەیەك خوازیاری ئەم فراوانخوازیە نەبووە و حەزی لێ نەبووە!

من هەموو ئەوشتەی کە بە ساتێك دەهاتە پێش چاوم لەگەڵ فەرەحدا باسم نەکرد، بەڵام چەند ڕۆژ دواتر کە ڕۆیشتین بۆ سەردانی هاوپۆلەکانی و هاوڕێی ژوورەکانی، ئەوەی کە من نەموت خاتو ناهید کلهر لەگەڵ فەرەحدا باسی کرد. فەرەح لەسەردەمی خوێندنیدا لە قوتابخانەی ژاندارك لە تاران هاوپۆلێکی بەناوی ناهیدەوە هەبوو کە کچی یەکێك لە خاوەن موڵکە دەوڵەمەندە گەورەکانی ئەو سەردەمی ئێران بوو.

فەرەح لەسەردەمی مانەوەی لە پاریس چەند هاوڕێیەکی دڵسۆز و گیانی بەگیانی هەبوو کە من تاوەکو ئەو کاتەی سەفەرم کرد بۆ پاریس نەمبینی بوون و نەمدەناسین تەنها لەناو هەموو هاوڕێکانی فەرەحدا ئەم ناهیدە کلهرەم بینیی بوو ئەویش یەکجار لە تاران بە منداڵی.

خاتو (ناهید کلهر) لە پاریس بە پلەیەکی بەرز بەشی ئەندازیاری پردی تەکنیکی تەواو کرد و لە پاریس لەگەڵ پیاوێکی پاریسی بە ناوی (لافرانس) هاوسەرگیری کرد. (لافرانس) لە زانکۆدا هاوپۆلی فەرەح و ناهیدە بوو. بەڵام دواتر ڕووی کردە خوێندنی سیاسی و بووە کارمەندی وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا و پاشان گەیشتە پلەیەکی بەرزی ئەم وەزارەتە. ماڵی خاتو ناهید کلهر لە سن فۆژە لە پاریس بوو و ئێمەش نەماندەزانی بە یاریەکانی ڕۆژگار کە سورەیا ئەسفەندیاری هەر لەو کۆڵانەدا چەند ماڵێك لەسەروی ماڵی ناهیدەوەیە دەژی.

سورەیا پاش وەرگرتنی تەلاق ڕۆیشتبوویەوە بۆ ئەڵمانیا بۆلای دایکی، بەڵام دوای ماوەیەك ڕۆیشتبوو بۆ پاریس و لە جادەی (سن فوژە) بە تەنهای دەژیا.

فەرەح بە بینینی ناهیدە، هاوڕێی و هاوپۆلی دڵسۆزی خۆی یەکتریان لەباوەش گرت و باش یەکتریان ماچ کرد.

پاش هەندێك گفتوگۆی ئاسای (فەرەح) ناهیدی بۆ بەشداری کردن لە ئاهەنگی بوکیەکەی بانگهێشت کرد بۆ تاران.

ناهید زۆر بە جدی وتی ئەگەر بێم بۆ تاران لەوانەیە توشی کێشە ببم.

لە کاتی قسەکردنەکانیدا تێگەیشتم کە ناهید یەکێك بووە لەو خوێدکارانەی کە دژی حکومەتی شا خۆپیشاندی کردوە و چالاکی هەبووە و ئەندامی فدراسیۆنی چالاکیە فراوانەکانی دژی شا بووە.

باوکیشی کە موڵکێکی زۆری خۆی لەدەستدا بوو لەگەڵ چەند کەسێکی دیکەی سەرۆك خێڵ و عەشایرەکانی ئێران لە پاریس و بین و بەرلین دەژیان هەر بۆیە هۆکار و بەڵگەی زۆری هەبوو بۆ ئەوەی بانگهێشتەکەی فەرەح قبوڵ نەکات.

ناهید بەبێ پێشەکی و پەردەپۆشی سەرزەنشتی فەرەحی کرد بۆ ئەو هاوسەرگیریەی کە بڕیارە بیکات لەگەڵ محمد ڕەزادا.

دیار بوو کە دەیویست لەبەر منیش چاوپۆشی بکات لە هەندێك باس و خواستی دیکە. بەلاّم من باش ئاگاداری ئەوە بووم کە ناهیدە زۆر سەیر سەری سوڕما لەوەی کە فەرەح شو دەکات بە کەسێك کە ساڵەهای ساڵە دژی حکومەتەکەی بەشداری خۆپیشاندانەکانی کردوە.

هەروەها ناهیدە زۆر بێتاقەت بوو لە بێ وەفای فەرەح بەرامبەر بەڵێنەکەی بۆ دەستگیرانەکەی کریم پاشا.

هەندێك مەسەلەی دیکە بێ پەردە باسکران. من زۆر خۆشم هات لەم ئازایەتی و ڕاشکاوانە و چاونەترسیەی ناهید کلهر.

سەرئەنجام ناهید ئەوەی کە لە مێشکی مندا بوو و جورئەتی ئەوەم نەکرد بوو بیڵێم بە فەرەح ئەو هێنایە سەر زمان و هەمووی وت بە فەرەح:

(ئایا فەرەح تەصور ناکەیت کە ئەگەر لە پاریس بمێنیتەوە و لەگەڵ ئەو پیاوەدا هاوسەرگیری بکەی کە خۆشتدەوێت خۆشبەختر دەبیت؟) پاشان بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی وەلاّم بێت درێژەی پێدا و وتی: (چۆن دەکرێت تۆ بە دوو چاوپێکەوتن لەگەڵ محمد ڕەزا ڕازی ببیت؟!) (ناهید خاتون) بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی وەلاّمی فەرەح بێت بەبێ پەردە بۆچوونەکانی خۆی پێوت و پاشان ئاماژەی بە چارەنوسی (فەوزیە) و (سورەیا)ش کرد و هەروەها هەر ئەو بوو پێی وتین سورەیا چەند سەد مەترێك لەسەرتر لە شوقەیەکی بەتەنها دەژی)

ناهید سەرەڕای  ئەوەی کە لەسەرتاوە سور بوو لەسەر ئەوەی کە ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئێران بەلاّم لەگەڵ هاوسەرە فەرەنسیەکەی هاتەوە بۆ تاران و لە ئاهەنگی بوك گواستنەوەکەی فەرەح و محمد ڕەزادا بەشداری کرد. تاوەکو ئەو شوێنەی کە من زانیاریم هەبوو ئەمە دواهەمین سەفەری ناهید بوو بۆ ئێران و لە ساڵی ١٩٦٠ەوە تاوەکو ئەمڕۆ ناهید نەڕۆیشتوەتەوە بۆ ئێران.

ساڵی ڕابردوو، لە لەندەن کتێب فرۆشێکی ئێرانی کتێبێکی بلاّوکردەوە کە نوسخەیەکیشی بۆ من ناردبوو.

بەداخەوە لەم کتێبەدا خاتو ناهید کلهر نەیتوانیوە مافی دۆستایەتیەکەی بدات و هەندێك (نهێنی نەوتراوە) کە لەوانەیە هەر کچێك لە تەمەنی سەرەتاییدا لە ژیانی تایبەتیدا هەیبێت باسی کردوە بۆ نوسەری کتێبەکە و ئەویش نازانم چ نیەتێکی هەبووە لە بلاّوکردنەوەی کتێبەکە، یاداشتەکانی خاتو کلهری بە ترش و خوێوە بلاّوکردوەتەوە.

نازانم بۆچی خەڵکی لەم سەردەمەدا ئەوەندە بێ وەفا بوون؟ ئەم نوسەرە ڕۆژنامەنوسێکی گەنج بوو لە ڕۆژنامەی ئیتلاّعات کە بووە جێگەی سەرەنجی کچەکەم و فەرەحیش چاکەی زۆری لەگەڵدا کرد. ئەوەندە هاوکاری کرد گەیشتە ڕادەیەك کە پاش کردنەوەی سەنتەری هونەری نیاوەران ئەم کەسە خەڵکی دەهێنا و فەرەحیش دایدەمەزراندن بۆی.

هاوڕێیەکی دیکەی فەرەح کە لە پاریس بینیم مهناز ئەفخمی بوو کە ئەو کات لە تۆلۆن دەژیا.

بۆ من ڕووداوە یەکەمینەکان هەمیشە بیرەوەری خۆشن و لەبیریان ناکەم. لەبارەی سەفەرەکانی دەرەوەشم ئەم مەسەلەیە ڕاستە. لەگەڵ ئەوەی کە دواتر سەفەرەم کرد بۆ زیاتر لە چل ولاّتی جیهان بەلاّم هەمیشە سەفەری یەکەمم بۆ پاریس ئەویش لەگەڵ کچەکەمدا هەرگیز لەبیر ناکەم.

من لە ژیاندا، هیچکەس و هیچ شتێکم ئەوەندەی کچەکەم خۆشنەویستوە و خۆشیش ناوێت. باوەڕی من ئەوەیە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆتایی نەهاتوو و تیانەچووە. هیچکەس تەواوبوو نیە چونکە منداڵەکان دەبنە درێژە پێدەری باوك و

دایکیان. هەرکەسێك کە سەیری منداڵەکانی دەکات و سەیری هەڵسوکەوت و جوڵە و شێوەیان دەکات بە ئاسانی دەتوانێت هاوشێوەیەکی زۆری منداڵەکان لەگەڵ باوك و دایکیان هەست پێ بکات.

عەشقیش بۆ منداڵ خەڵاتێکی خوداییە کە پەروەردگار لەناو بوونی مرۆڤدا خوڵقاندویەتی. کاتێك کە بینیم فەرەح بڕیارە بە زووی ببێتە هاوسەری شا و شاژنی ئێران و لەناو پێستی خۆیدا ڕێگەی نابێتەوە و لەخۆشی و شادیدا خەریکە دەفڕێت من بە هەموو ئەو نیگەرانیانەشەوە کە هەمبوو بەشداربووم لە خۆشی و شادیەکانی.

فەرەح دەیوت هەرچەندە چەندین ساڵە لە پاریس بووم بەڵام ئەم سەفەرەم زۆر سەیرە و وەکو بڵێی ئەمە یەکەمجارمە دەتوانم تامی پاریس بکەم.

خوێندن و ئیش ڕێگەی بە فەرەح نەدابوو تاوەکو چێژ لە ژیانی خۆی وەرگریت لەناو ئەم شارە بۆندارەدا.

فەرەح بۆ دابینکردنی پێویستی و ژیانی خۆی ناچار بوو کار بکات. بۆ کچێك کە بڕیارە بخوێنێت و لەگەڵ ئەوەدا کاریش بکات و هەوڵی خوێندن و تەواوکردنی کارەکەی بدات گەڕان و چێژ وەرگرتن زۆر مانای نەبوو.

فەرەح تەنها هەندێك یادەوەری هەبوو ئەویش لە هەندێك لە ڕۆژەکانی یەك شەمەدا کە لەگەڵ کەریم پاشا و ناهیدە و لیلی ئەمیر ئەرجومەند بۆ هەندێك بەسەر بردنی کاتی خۆش دەچوون بۆ کەناری ڕووباری سن.

لەم سەفەرەدا بە سەیارەی تایبەتی و لەگەڵ ئەو هاوکارانەی کە لە کۆشکی تاران و سەفارەتی ئێران لە پاریس کاریان دەکرد هاتبوون لەگەڵماندا و بمانویستایە بڕۆین بۆ هەرشوێنێك دەیانبردین و هەرچێکمان بمانویستایە بۆیان دەکڕین.

لە گرانترین ئەو فرۆشگا و خشڵ و زێرفرۆشانەدا کەلوپەل و پێداویستیەکانمان دەکڕی کە ناوبانگی جیهانیا هەبوو. لەیەکێك لە فرۆشگاکاندا بە ڕێکەوت توشی شاژنە موناکۆ بووین.

ئەویش زانی بە ئێمە تەوقەی کرد لەگەڵ فەرەح و ئارەزووی خۆشبەختی بۆ خواست. ئێمە دواتر شاژنی مۆناکۆمان وەکو میوانێکی تایبەتی بانگهێشت کرد بۆ ئاهەنگی بوکیەکەی فەرەح.

باسی ئەوەم کرد کە لەیلی ئەمیر ئەرجومەند هات لەگەڵ فەرەحدا بۆ کڕینی کەلوپەلەکان و تاوەکو کۆتایی دەسەڵاتی سەڵتەنەتیش لە ئێران لەگەڵ فەرەح مایەوە و سکرتێری تایبەتی و دۆست و نهێنی پارێزی بوو.

لیلی بە ڕادەیەك پەیوەندی لەگەڵ فەرەح هەبوو کە تەنانەت لە جلوبەرگ لەبەرکردن و ئارایشتکردنیشدا دەیویست چاو لە فەرەح بکات.

هەڵبەتە من لە گوێنەدەی و بێ باکی سێکسی لیلی ناڕازی بووم. بەتایبەتی لە سەفەرەکانی نوشهر و کیشدا هەمیشە عادەتی وابوو بە ڕووت و قوتی مەلەی دەکرد و ئەو شتانە بەلایەوە گرنگ نەبوون کە دەیان کەس لە پاسەوانەکان و گاردی تایبەتی سەیری دەکەن.

چەند جارێك باسی ئەم مەسەلەیەم لەلا کردوە. بۆچوونی منی قبوڵ نەبوو و دەیوت ئێستا لە ئەورووپا ئەوە مۆدێلە کە هەموو خەڵکی بەبێ جیاوازی بەڕووت و قوتی دەچنە ناو دەریاوە!

جارێکیشیان بەرپرسی خزمەتکارەکانی کۆشکی سەڵتەنەتی کە بەتەمەنترین ئەندامی تەشریفاتی کۆشکی شاهنشاهیش بوو وەکو دەڵێ ڕیش سپی کۆشك بوو وتی بە لیلی ئەرجمەند ئەم شێوە مەلەکردنەی تۆ بە ڕووتی لە ناو دەریادا بووەتە هۆی ئەوەی کە جۆرە منافەسەیەك دروستبێت لەناو تیمی چاودێری و گاردی تایبەتی بۆ ئەوەی کامیان چاودێری ئەم ناوچەیە بکەن!

من کە ئاگاداری ئەو گفتوگۆیەی نێوان (عباسعلی یعقوبی) بەرپرسی خزمەتکارەکانی کۆشك و لیلی بووم سەبارەت بەو هەڵسوکەوتەی زۆر خۆشحاڵ بووم لەو شێوە قسەکردن و ڕەخنە و سەرکۆنەکردنەی کە دەیکرد.

سەفەرێکی دیکە کە هەرگیز لەبیری ناکەم ئەو سەفەرە بوو کە ڕۆیشتین بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٦٣ کە لەو سەفەرەدا حکومەتی ئەمریکا پێشوازێکی زۆر شکۆمەندانەی کرد لە محمد ڕەزا و فەرەح.

لەسەر بانە بەرزەکانی سەر ئەو بینایانەی کە چووبوون بەناو ئاسماندا، شریتی ڕەنگا و ڕەنگیان دەکرد بەسەر کەژاوەی ئۆتۆمبێلەکانماندا.

لە دانیشتنی خوانێکی تایبەتیدا محمد ڕەزا دەستەیەك لە خشڵی زۆر جوان و گرانبەهای تایبەتی کە لە جیهاندا وێنەی نەبوو پێشکەش بە ژاکلین کەنەدی کرد.

ئەم خشڵ وزێڕانە کاتی خۆی موڵکی ژنەکەی (ریچارد شیردل) بوون.

ژاکلین بە شێوەیەك کەوتە ژێر کاریگەری بەخشندەیی محمد ڕەزاوە کە لەبەردەم هەموو ئەو میوانە پلە بەرزانەوە محمد ڕەزای ماچ کرد و چەند ساتێك دواتر خشڵ و زێڕەکانی خۆی کردەوە و خەڵاتەکەی محمد ڕەزای کردە ملی. خشڵەکان تاقمێکی تەواوبوون پێکهاتبوون لە: (ملوانکەیەك، گوڵە سنگێکی ئەڵماس، بازنەیەکی خشڵ بەند، ئەڵقەیەکی ئەڵماس و گوارەی برلیانی شێوە ئەڵماس.)

لەبەرامبەر ئەم بەخشندەییە بێ وێنەیە کەنەدی وێنەیەکی دەستی خۆی بەخشی بە فەرەح و وتی ئەم وێنەیە لەکارەکانی خۆم بووە لەسەردەمی زانکۆدا!

ژاکلین بۆینباخێکی ڕەنگ کاڵی بەخشی بە محمد ڕەزا و وتی ئەمە بۆینباخی تایبەتی (جۆرج واشنتۆن) بووە!

خەڵاتەکانی سەرۆك کۆماری ئەمریکا و هاوسەرەکەی تەنانەت دۆلارێك بەهایان نەبوو! لەکاتێکدا من دەمزانی کە محمد ڕەزا بۆ کڕینی خشڵ و زێڕە دەگمەنەکانی سەردەمی ریچارد شێر دل سەدان هەزار دۆلاری بەفیڕۆ داوە!

کاتێك کە گەڕاینەوە بۆ شوێنی مانەوەی خۆمان، فەرەح لە بەردەم محمد ڕەزا دەستیکرد بە قسە وتن بە کەنەدی و هاوسەرەکەی ژاکلین و وتی: (ئەمانە.... هەر میوانێکی بیانی هات بۆلایان بۆینباخێکی ڕزیو و کۆنی پێ دەدەن و دەڵێن ئەمە بۆینباخی جۆرج واشنتۆن یان ئابراهم لینکۆلنە؟)

جۆن کەنەدی، بەهۆی ئەو فشارە زۆرەی کە هێنابووی بۆ محمد ڕەزا تاوەکو فەزای سیاسی ئێران بکاتەوە لە ئێراندا خۆشەویستێکی زۆری هەبوو.

لەوانەیە لە ئەمریکاشدا خۆشەویسترین سەرکردەی سەردەمەکەی خۆی بووبێت.

ژاکلین ژنێکی بەژن ڕێك و لاواز بوو. دەیانوت ژنێکی ڕۆژنامەنوس بووە و لە خێزانێکی ئاسای و ناوەندیشدا بووە. بەڵام جۆن کەنەدی لە خێزانێکی دەوڵەمەند و دیار و وەکو دڵێن پیشەدار بوو.

من كە تاوەكو ئەو كاتە لە نزيكەوە ئەمريكام نەبينى بوو و ئاگادارى ئەو بارودۆخە نەبووبووم زۆر پێم سەیر بوو کە پیاوەکان لەبەردەم یەکتریدا ژنەکانی یەکتری ماچ دەکەن و زۆر بە پاکی لە ئاهەنگەکاندا لەگەڵ ژنەکانی یەکتریدا سەما دەکەن!

سەرسوڕمانی من زۆر درێـژەی نەکێشا چونکە کەنـەدیش چـەند سوڕێك لەگـەڵ فەرەحدا سەمای کرد و محمد ڕەزاش لەگەڵ ژاکلیندا چەند سوڕێك سەمایان کرد.

هەرچەندە من هیچ ئەزموونێکم لەبارەی ئەو سەما دوو کەسیانەوە نەبوو و وەکو دڵێن ناشی بووم، بەڵام ناچار بووم بۆ ڕەچاوکردنی ئاداب و عادەت خواستێکی سەرۆکی شارەوانی نیۆیۆرکم قبوڵ کرد و لەگەڵیدا سەمام کرد!

شارەوانی نیۆیۆرك لە کۆتایی سەماکەدا بانگهێشتی کردم بۆ ئەوەی بڕۆم بۆ نان خواردنێکی سبەی نیوەڕۆ کە تایبەت بوو و بڕیار بوو خۆیشی دروستی بکات.

لەبەرئەوەی کە زمانی ئینگلیزیم باش نەدەزانی، فەرەح تەرجومەی دەکردم بۆم و سوپاسێکی زۆری سەرۆکی شارەوانی نیۆیۆرکی کرد و بەناوی منەوە بانگهێشتەکەی قبوڵ کرد و منیش وتم هیچ ڕێگەیەکم نیە جگە لەوەی کە ئەم بانگهێشتەی سیاسەتمەندارە گەورەیە قبوڵ بکەم و پاشان فەرەح وتی دەبێت ئەم بانگهێشتە قبوڵ بکەیت!

ریچارد نیکسۆنیش کە دواتر بوو بە سەرۆك کۆماری ئەمریکا، بۆ یەکەمجار لەم میوانیەدا بینیم. نیکسۆن لەو سەردەمەدا کارمەندی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بوو، و دواتریش دۆستایەتێکی زۆر لەنێوان نیکسۆن و محمد ڕەزا پەیدا بوو.

هەر لەم میوانیەدا (فرانك سناترا) بەناوبانگترین گۆرانیبێژی ئەو سەردەمیشم بینی. (فرانك سیناترا) هاوڕێیەتێکی نزیك و دۆستانەی لەگەڵ محمد ڕەزاشادا هەبوو بەڵام فرانك سیناترا لەگەڵ کەسێکی دیکە خۆشی دەهات کە ئەو کەسە دوژمنی شا بوو، هەر بۆیە شا زۆرجار پشتە ملە گلەی ئەم هەڵوێستەی فرانك سناترای دەکرد.

هاوڕێکەی فرانك سیناترا و دوژمنەکەی محمد ڕەزا (خەیر خان گودرزی) لە خێڵی بەختیاری بوو.

هەڵبەتە خەیر خان دووژمنی سیاسی نەبوو بەڵکو لەگەڵ محمد ڕەزادا لەسەرکێشەی دارایی کەوتبوویە نێوانیان و کێشەی بۆ جەنابی حەزرەت دروستکردبوو.

خـبیر خـان، لـه ئـەمریکادا سـەرمایەدارێکی گـەورە و هـاوڕێی یـاریکردنی گـۆڵفی (فرانـك سـیناترا) بـوو. فرانکـی (ئـەو نـاوەی کـە ئەمریکیـەکان نابوویـان لـە سـیناترا) ئەوەنـدە خبیرخـانی خۆشدەویـست کـە گـۆرانی بەناوبانگی (گـودی، گـودی) خـۆی کـە کـورتکراوەی گـودەرزی بـوو لەبەرخۆشـی و بـە شـانازی خبیرخـان وتبـوو. هەڵبەتـە، هەموو ئەم شتانە بۆ محمد ڕەزاخان ناخۆش و ئازاردەر بوون!

دەبێت ئەوە بڵێم کە محمد ڕەزا زۆر زۆر حەسود بوو و ئەمەش یەکێکبوو لە خاڵە لاوازەکانی.

لەبارەی خبیرخانەوە دوای ئەمە زیاتر قسەی لەسەر دەکەم.

من کە بۆ یەکەمجار بوو لەگەڵ محمد ڕەزا ڕۆیشتم بۆ دەرەوە زۆر سەیرم لە شێوە و قسەکردن و جۆری هەڵسوکەوتی ئەمریکیەکان دەکرد لەبەرامبەر سەرۆکەکەیان.

لـە ئێـران هـەموو پیاوەکـان و کەسایەتیەکان تەنانـەت سـەرۆك وەزیـرانیش دەسـتی محمد ڕەزایان ماچ دەکرد و هەندێکیشیان بەتایبەتی ژەنراڵ و سەرکردە سەربازیەکان خۆیان دەخست بەسەر پێی محمد ڕەزاشادا.

بەڵام لـە ئـەمریکادا تەنانـەت کەسـانی ئاسـایش تـەنها تەوقەیـەکی ئاسـاییان لەگـەڵ سەرۆکەکەیاندا دەکرد و زیاتر لەمە ڕێزیان لێ نەدەگرت.

لەوەش گرنگتر هەندێکجار لەگەڵ سەرۆکەکەیاندا بە توڕەییەوە قسەیان دەکـرد، کـە بە ئاشکرا نیشانەی بێ ڕێزی بوو!

لە ئێوارە خوانێکدا کە لەسـەر شـەرەفی محمـد ڕەزا سـاز کـرا بـوو بـۆ سـەرۆك کـۆمار کەنەدی و ژاکلینی هاوسەری، من بە ئاشـکرا ئـەوەم بینـی کـە کارمەنـدە ئاساییەکان و کەسانی چینەکانی ناوەندی وەکو کارمەندەکانی وەزارەتی دەرەوە، ڕۆژنامەنوسـەکان، ئەندامانی ئەنجومـەن و بازرگانـەکان زۆر بەشێوەیەکی ئاسـایی لەگـەڵ سـەرۆکەکەیاندا هەڵسوکەوتیان دەکرد و تەنانەت هەندێکجار ئەوە کەنەدی بوو کە ئەوانی بانگ دەکـرد و هەواڵی دەپرسین و قسە و باسی لەگەڵدا دەکردن.

ڕۆژێکیـان لەگـەڵ محمـد ڕەزا و فـەرەح و هاوڕێکـانی ڕۆیـشتین بـۆ سـەردانی کێڵگـە شەخسیەکەی سەرۆك کۆمار.

لە ئەمریکادا زۆربەی دەوڵەمەندەکان خاوەنی موڵك و کێڵگەی گەورەن. کەنەدیش بەدەر نەبوو لەم چوارچێوەیە.

لەو کێڵگەیەی کە موڵکی بنەماڵەی کەنەدیەکان بوو و لە باوکەوە و بۆ کوڕ بە میرات بەجێمابوو بۆیان خەڵکی ئاسای و ئیشکەر لە کێڵگەکەیاندا هەبوون و زۆرێکیان کە دەیانویست ڕێز لە سەرۆك بگرن تەنها لە دوورەوە سوچێکی کلاوەکەیان بۆ لار دەکردەوە یان کلاوەکەیان لەسەر سەریان بەرز دەکردەوە.

تەنانەت، هەندێکیان بە نازناو سەرۆکیان بانگ دەکرد و بە دەنگی بەرز دەیان وت های جان!

بۆ ئێمە جێگەی سەرسوڕمان بوو کە لە ئێران گەورە بووبووین و ژیابووین بارودۆخی ژێر دەستە و کرێکارە نەگبەتەکانی خۆمان بینیبوو کە گیان و ماڵ و ناموسیان هەموو لە ژێر دەستی دەرەبەگەکاندا بوو و تەنانەت هەندێك لە موڵکدارەکان بوکی ژێر دەستەکانی خۆیان لەشەوی یەکەمدا دەبردە لای خۆیان، بەڵام ئەو شێوە هەڵسوکەوتەی کە لەلای ئەمریکیەکان بوو و بەتایبەتی ئەو هەڵسوکەوتە سادە لێبوردوانەی کە سەرۆکی ئەمریکا دەیکرد لەگەڵ دەوروبەری و ژێر دەستەکانی باوەڕپێنەکراو بوو.

محمد ڕەزا کە سەرۆك کەنەدی خۆشنەدەویست دەیوت: ئەمریکیەکان نەتەوەیەکی بێ ئەدەب و بێ ڕێزن و (بێ ئەدەبی) بۆ ئەمانە جۆرێکە لە (بەها)!

منیش زۆر پێم سەیر بوو و کاریگەر بووم بەوەی کە کڕنوش نابەن بۆ سەرۆکەکەیان. نە ئەو هەموو ماستاوکردن و پیاهەڵدانە زۆرەی خۆمان پێ باش بوو کە دەستی پاشایان ماچ دەکرد و نە ئەم جۆرە هەڵسوکەوتەی ئەمریکیەکانیشم پێ خۆش بوو کە کرێکارێکی ئاسایی لە کێڵگەکەی خۆیدا دەیوت های جان!

بۆ محمد ڕەزا کە بە پەروەردەی ڕۆژئاوای لە سویسرا گەورە بووبوو و بۆ فەرەحیش کە لە پاریس خوێندبووی و ئاداب و ژیانی ڕۆژئاوایەکانی قبوڵ بوو، ئەم هەڵسوکەوتانە زۆر ئاسایی بوو بەلایانەوە بەڵام بۆ من جێگەی سەرەنج بوو!

سەرەڕای ئەو خەڵات و پێشکەشکاریانەی کە محمد ڕەزا و فەرەح هێنابوویان بۆ سەرۆك کەنەدی و ژاکلین سەرۆکی ئەنجومەن و کۆنگرێس و ئەندامانی کۆنگرێس و

زۆرێك لە سیناتۆر و ئەندامانی ئەنجومەن و سیاسەتمەنداران و تەنانەت هەندێك لە ڕۆژنامەنوسەکان و سەرۆکی شارەوانیەکانیش خەڵات و دیاریان وەرگرت، کە زۆربەی ئەم خەڵات و دیاریانە قاڵی بچوك و شتی دەستکردی ئێرانی بوون.

من لەبەر ئەوەی کە لەبارەی پرسە سیاسیەکانەوە بێ ئاگا و نەزانبووم هۆکاری ئەم بەخشندەیی و سەخاوەتمەندیانە تێنەگەیشتم.

(فەرەح) منی لەم بێ ئاگاییە دەرهێنا و وتی لە ئەمریکادا بڕیارەکانی دەوڵەت لەژێر کاریگەری فشارەکانی کەسانی خاوەن دەسەڵاتە و ئەگەر بتوانین ئەم کەسانە ڕاکێشین بۆلای خۆمان ئەوا لە بڕیارەکانی کۆنگرێسی ئەمریکا و کۆشکی سپی بە سودی ئێمە کار دەکەن.

کاتێك دەمبینی کچەکەم وەکو ژنێك زۆر شارەزای ئاگاداری نهێنی و ئاماژە سیاسی و پرسە گرنگەکانە، چێژم وەردەگرت.

لەم سەفەرەدا بوو کە پەیم بە لاوازی و نەزانی خۆم برد و تێگەیشتم ئەگەر کەسێك زمان نەزانێت لەدەرەوەی وڵاتەکەی وەکو مرۆڤێکی کەڕ و لاڵە و هیچ شتێك نازانێت.

کاتێك گەڕاینەوە بۆ ئێران بڕیارمدا دەبێت بەباشی خۆم فێری ئینگلیزی بکەم. بابەتەکەم لەگەڵ ئالی ئانتۆنیادیس باس کرد و ئەویش مامۆستایەکی ئینگلیزی لە ئەنجومەنی ئێران و ئەمریکا بۆ دامەزراندم تاوەکو بەتایبەتی بە ئینگلیزی قسەم لەگەڵدا بکات.

ئەم مامۆستایە کە ماوەیەکیش لە سوپای سەرۆك کەنەدیدا خزمەتی کردبوو زۆر باش زمانی فارسیشی دەزانی. گەنجێکی نوسەر و حەزی لە فەرهەنگی ئێران و شیعر و عیرفانیش بوو.

ئەم مامۆستایە نزیکەی دە ساڵێك لە ئێران مایەوە و لەگەڵ ئەوەی کە جیاوازی تەمەنمان زۆر بوو بەڵام زۆر بە زووی بووین بە هاوڕێی زۆر نزیك و گیانی بەگیانی یەکتر و زۆربەی کاتەکانی شەو و ڕۆژمان پێکەوە دەگوزەراند.

هەرچەندە من هەرگیز نەمتوانی بە باشی زاڵبیم بەسەر زمانی ئینگلیزیدا بەڵام تاوەکو ڕادەیەك توانیم بەشی خۆم فێربیم و پێویستیەکانی خۆمی پێ جێبەجێ بکەم.

یەکەم ئەزموونی قسەکردنیشم بە ئینگلیزی کاتێك بوو کە لەگەڵ کچەکەم بۆ سەفەرێکی تایبەتی ڕۆیشتین بۆ لەندن.

محمد ڕەزا دەیویست موڵکێك لە ساری (لەباشوری لەندن) بکڕێت کە کۆشکێکی تایبەتی بوو کە دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی ڤیکتۆریا و یەکێك بوو لە کۆشکە تایبەت و دەگمەنەکانی لەندەن. ئەم کۆشکە لە شوێنێکدا بوو کە زەویەکەی لە دە هیکتار زیاتر بوو.

بڕیار وابوو کە ئەگەر فەرەح ئەم کۆشك و ناوچەیەی پێ باش بێت ئەوا بیکڕێت و بیکات بەناوی کچەزاکەمەوە ڕەزا. (کارەکەش ئەنجامدرا)

کۆشکێکی زۆر بەشکۆ بوو و ئەندازیارە فەرەنسیەکانیش (کە لە نۆژەنکردنەوەی شوێنەوارە کۆنەکاندا پسپۆڕن) دووبارە بەشێوەیەکی جوان نۆژەنیان کردبوویەوە.

باخە دەیان هیکتارەکەی دەورووبەریشی زۆر جوان و دڵگیر بوو، بەتایبەتی ئەو جۆگە ئاوە پاکانەی کە دەچوو بەناویدا کە نیشانەیەك بوو لە پاکی و جوانی.

فەرەح بەبێ دواکەوتن کۆشکەکەی بەدڵ بوو بۆیە وەکیلەکانمان دەستیان کرد بە ئامادەکاری و لەگەڵ فرۆشیارەکە کە کۆمپانیایەکی ئینگلیزی بوو بەڵگە و سەنەدی پێویستیان ئامادەکرد بۆ معامەلەکە.

فەرەح بە مشتەرێکی باش بەرچاو کەوت، هەر بۆیە کۆمپانیاکە پێشناری کرد تاوەکو شوقەیەکی دیکەش هەیە لە ڕۆژئاوای لەندن بیکڕێت کە شوێنی نەجیبزادە و خانەدانەکانە.

ئێمە سەرێکیشماندا لەو شوقەیەدا کە ئەخیر قات بورجێکی تازەی لەسەر دروستکرابوو ڕووبەرەکەشی ئەوەندەی ساحەیەکی یاریکردن هەبوو!

(فەرەح) شوقەکەی بۆخۆی کڕی و لەم کڕینەش زۆر خۆشحاڵ بوو چونکە ئەم شوقەیە ڕێك لە شوقەکەی خاتو ئەشرەف دەچوو لە نیۆیۆرك.

دەوڵەتی ئێران، پاش کەوتنی ڕژێم، هەوڵیدا ئەم موڵکانە وەرگرێتەوە بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

لەو ماوەیە کە بۆ سەردان و کڕین لە بەریتانیا بووین هەوڵم دەدا بەبێ وەرگێڕ قسە بکەم و بەهەر شێوەیەك هەبووە وەکو دەڵێن کاری خۆمی پێ بەڕێ بکەم.

هەرچەندە سەفەرەکەمان بۆ لەندەن نارەسمی و تەنانەت لە ڕۆژنامەکانی وڵاتیشدا بڵاونەکرایەوە و تارادەیەك نهێنی بوو بەڵام شازنە ئەلیزابێتی دووەم بانگهێشتی کردین بۆ خواردنەوەیەکی عەصران لە کۆشکی باکینگهام.

ئینگلیزەکان لە چینەکانی خوارەوە بیانگرە تاوەکو دەکاتە خێزانەکانی شاهانە عەسرانێکی سونەتیان هەیە کە پێی دەڵێن (چای کاتژمێر پێنجی دوانیوەڕۆ).

خۆشترین خواردنەوە لەلای ینگلیزیەکان چاییە. چای لەگەڵ پسکیت و تەشریفاتێکی فراواندا دەهێنن. ئێمە لە حەوشە سەوزایە فراوانەکەی کۆشکی باکینگهام لەگەڵ شازنە ئەلیزابێت و هاوسەرە بە ویقارەکەی (شازادە فیلیپ) چاییمان خواردەوە.

بەپێچەوانەی ئەمریکیەکان، ئینگلیزیەکان زۆر بەشێوەیەکی سەیر ڕەچاوی ئاداب دەکەن و ڕێز و پێزانینێکی زۆریان دەردەبڕی بۆ شازنە ئەلیزابێت.

شازنە ئەلیزابێت لەو تەصویرانەی کە پێشتر بینی بووم، کەمێك پیرتر دەردەکەوت. زۆر جل و بەرگی سادەی لەبەرکرد بوو و هیچ جۆرە ئارایشت و خۆجوانکردنێکیشی نەکردبوو.

فەرەح وتی: بانگهێشتی شازنی بەریتانیا بۆ خواردنی عەسران دەرخەری ئەو گرنگیدانەیە کە ئینگلیزەکان هەیانە بۆ ئێرانیەکان.

هەرچەندە میوانێکی سادە و تایبەتی شازنی بەریتانیا بوو بۆ شازنی ئێران بەڵام نوێنەرێك لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیاش لە دانیشتنەکەدا لەگەڵماندا بوو.

پاشان فەرەح هۆکاری ئامادەبوونەکەی نوێنەرەکەی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیای بۆ ئەوە گەڕاندەوە کە لە بەریتانیادا شاژن تەنها ڕۆڵی تەشریفاتی هەیە و لە ڕاستیدا تەنها هەر وەکو هێما و ڕەمزێکە. هەر بۆیە نوێنەری وەزارەتی دەرەوە (وەکو نوێنەری دەوڵەت) لەم میوانیە عەسرانەیەدا ئامادە بوو تاوەکو ئاگاداری ئەو گفتوگۆیەی نێوان ئەو دوو شاژنە بێت و ئەگەریش شاژنی بەریتانیا پێویستی بە زانیاری و شتێك بێت لەبەرچاوی ئەوانەوە بیخاتەڕوو.

من و فەرەح لەگەڵ شاژنی بەریتانیا گفتوگۆمان کرد. من هێشتا زۆر شارەزای ئینگلیزی نەبووم هەوڵمدەدا زۆر نەچمە ناو گفتوگۆوە. بەڵام ئەم چاوپێکەوتنە

کاریگەرێکی دڵنیاکەرانەی لەسەر من هەبوو و وای لێکردم ئەو توانایییەی کە پەیدام کردبوو لە زمانی ئینگلیزیدا بە دڵنیاییەوە بەکاری بهێنم و ترسم نەبێت لە بەکارهێنانی وشەکاندا.

شاژنی بەریتانیا هەواڵی محمد ڕەزای پرسی و داوای کرد لە فەرەح تاوەکو سەلامی خۆی و شازادە فیلیپی پێ بگەیەنێت.

لەماوەی قسەکردنەکانی شاژندا تێگەیشتم کە شاژن زانیارێکی زۆری هەبوو لەسەر ئێران. تەنانەت دوو بەیتە شعری لە خەیام بە ئینگلیزی بۆ وتین. فەرەح باسی بۆ کردم کە شاژن وەرگێڕانێکی ئینگلیزی چوارینەکانی عومەر خەیامی لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسێکەوە بەناوی (فینتەر جرالد) خوێندوەتەوە و لەوێوە حەزی لە شیعرەکانی عومەر خەیام کردوە.

لەم چاوپێکەوتنەدا لەبارەی پرسە سیاسیەکانەوە قسە و باس نەکرا و لە کۆتایی دانیشتنەکەدا شاژنی بەریتانیا داوای کرد لە فەرەح تاوەکو ئەمجارە لەگەڵ محمد ڕەزا بەشێوەیەکی ڕەسمی سەردانی بەریتانیا بکەن.

پاش چاوپێکەوتنەکە، فەرەح بەدرێژی باسی خێزانی شایانەی بەریتانیا و ڕۆڵیان لە بەڕێوەبردنی وڵات (کە لەوانەیە هیچ بێت) و شێوەی ژیانیان و پەیوندیەکانیانی کرد.

هەمووشتێك بۆ من جێگەی سەرنج بوو. بەتایبەتی کاتێك دەمبینی کە پاشای وڵات لە بڕیارەکانی دەوڵەتدا هیچ دەستێوەردانێکی نیە و هیچکەس حساب بۆ قسەی ناکات زۆرم پێ سەیر بوو.

بەیەکجاری کاتێك توشی سەرسوڕمان بووم کە بیستم دەوڵەتی بەریتانیا مەعاشێکی دیاریکراو دەدات بە شاژنی بەریتانیا و مانگانەیەکی دیاری کراوی هەیە و بۆ دابینکردنی بەشێکی ئەم موچەیەش ڕێگەی بە گەشتیار و خەڵکی بەریتانیاداوە کە دەتوانن سەردانی بەشێك لە کۆشکی شاژن بکەن و هەموو ڕۆژێکیش گروپێکی زۆر لە خەڵکی بەریتانیا و تەنانەت گەشتیاران و خوێندکارانی ناوخۆ و دەرەوە سەردانی بەشی کۆشکەکانی ویندزور و باکنگهام دەکەن. (و تەنها بەشێکی بچوك لە کۆشکی

بانکینگهام ناتوانرێت سەردانی بکرێت ئەویش شوێنی تایبەتی نیشتەجێی بنەماڵەی شاهانەیە.)

شـاژنی بـەریتانیا، لـە هەمانکاتـدا شـاژنی کەنـەدا و نیوزلەنـدە و ئوسترالیاشـە. پێشتریش شاژنی هیندستان و دەیان داگیرگەی گەورە و بچوك بووە بەلآم ئەم وڵاتانە پاش ڕزگاربوونیان لەژێر دەسەلآتی بەریتانیا ئیدی ئازادی خۆیان ڕاگەیاند.

بـە بـڕوای مـن هـەموو ئـەم شـکۆمەندی و جـەلال و گەورەیـە ڕووکەشـیە بـێ نـرخ دەکەوتـە بەرچاو، ئەمـە چ جـۆرە پاشـایەتیەکە کـە دەبێـت گـوێ بـۆ دەوڵـەت بگرێـت و حکومـەت مانگانـە موچـەیەکی دیـاریکراوت پـێ بـدات! لـە ڕاسـتیدا لـەو شـاژنە دەسەلآتدارەی بەریتانیا لە سەردەمی داگیرگەکاری و سەردەمی شاژنە ڤیکتۆریا تـەنها ڕمزێك و پەیکەرێکی ڕووکەش ماوەتەوە لەو پاشایەتیە!

پاش نزیکـەی دە ڕۆژ، فـەرەح دەیویـست بگەڕێتـەوە بـۆ ئێـران. بـەلآم من بڕیارمـدا سـەرێك بـدەم لـە ئۆسکـەتلەند و لیـز و ئێرلەنـدە و تـاوەکو کۆتـایی مـانگ لـە بەریتانیا بمێنمەوە. کچەکەشم لەبەر ئەوەی کە بەریتانیام بەلاوە خۆش بوو دەمویست زیاتر بمێنمەوە زۆر خۆشحاڵ بوو و داوای لە سەفارەتی ئێران کرد کە ڕێوشوێنی پێویست بگرنەبـەر. لـە لایـەن سـەفارەتەوە لەگـەڵ وەزارەتـی دەرەوەی بـەریتانیا قـسە کـرا و کارمەنـدانی بـەریتانیا لـە بازنـەی ئاسـایـشی پارێزگـارێکی هەسـت پێنـەکراوی منیـان گرتـە ئەسـتۆ. هـەروەها سـەفارەت سـەیارەیەکی ئاسـای لەگـەڵ شـۆفێریکدا خـستیانە بەردەسـتم و کارمەنـدێکی سـەفارەتیش لـە پێـشەوەی سـەیارەکە لەگـەڵ سـایقەکەدا ڕێنوێنی منیان دەکرد.

سەفارەتی ئێران ژمارەیەك سەیارەی ڕازاوە، بۆ نمونە سەیارەیەکی ڕولزرڤیسی دژە فیشەکی هەبوو. بەلآم بەریتانیەکان ئامۆژگاری سەفارەتیان کردبوو لەبری ڕولوزرڤیس کـە ئۆتـۆمبێلێکی تایبـەتی نەجیبزادەکانـە، ئۆتـۆمبێلێکی ئاسـای بخەنـە بەردەسـتم تاوەکو نەبمە جێگەی سەرنجی خەڵکی.

خـاڵێکی دیکـە کـە جێگـەی سـەرنجم بـوو پارێزگارییـە هەسـتپێنەکراوەکەی کارمەندانی بەریتانیا بوو.

له تاران دەچووین بۆ هەر شوێنێك سەیارەیەكی ساواك لە پێشەوە و سەیارەیەكی ساواك بە لورە لور لەگەڵماندا بوون.

كاتێك دەچووین بۆ شوێنە گشتیەكانیش كارمەندەكانی ساواك زۆر بەباشی دەردەكەوتن و ئەوان بەشێوەیەك هەڵسوكەوتیان دەكرد وەكو بڵێی حەزیان لەوە بوو خەڵكی بزانێت ئەوە ئەوانن و لەناو خەڵكیدا.

بەلاّم لە بەریتانیا لەگەڵ ئەوەی كە لەژێر چاودێری كارمەندانی دەزگادا بووین بەلاّم ئەوان بەشێوەیەك هەڵسوكەوتیان دەكرد كە بەهیچ شێوەیەك خەڵكی هەستی پێ نەدەكردن كە ئەوانە پاسەوانەی دەكەن.

كاتێك كە فەرەح گەڕایەوە بۆ تاران بۆ ئەوەی من لە لەندەن بە تەنیا نەبم بە فڕۆكە ڕۆژی دواتر (هاوسەری براكەمی) نارد بۆ لام.

دەبێت ئەوە بڵێم من و هاوسەری براكەم لوییز پەیوەندێكی زۆر پاك و تەنانەت نزیكتر لە پەیوەندی دوو خوشكمان هەبوو.

بەهاتنی لوییز بۆ لەندەن جەماعەتەكەمان بە ژنەكەی سەفیری گەورەی ئێرانیشەوە بووین بە سێ كەس. من ڕێگەم نەدەدا لەكاتی قسەكردن لەگەڵ خەڵكی ناوچەیی و لەكاتی گەشت و گوزار لەناوچەی جیاواز كەس قسەكانم وەربگێڕێت و یان لە وەرگێڕانی قسەكانی خەڵكی یارمەتیم بدەن.

ئەم ڕەوشی قسەكردنە وای لێكردم زیاتر هەست بە خۆم بكەم و زمانەكەم بەتەواوی باش بكەم.

بەڕاستی زیاتر پێویستم بە فێربوونی زمان هەبوو. دواتر كاتێك كە زیاتر دەچووم بۆ سەفەرەكانی دەرەوە و لە تاران لەگەڵ میوانە بیانیەكان و هاوسەرەكانی سەفیرەكان و كەسانی بیانی دیدار و گفتوگۆمان دەكرد، لێهاتووی زمانم گەیشتە ڕادەیەكی زۆر باش. ئامادەگیم بۆ فێربوونی زمان زۆر باش بوو.

هەرچەندە چەند ساڵێك زیاتر نەژیام لەگەڵ هاوسەرەكەم، بەلاّم هەر ئەم ژیانە كورتە و دواتریش چەند ساڵێك ژیان لە تەبریز لەگەڵ خەسومدا بووە هۆی ئەوەی كە توانیم زاڵ ببم بەسەر زمانی ئازەریدا.

خاڵێکی دیکەی جێگەی سەرەنج لەبارەی فەرەحیشەوە ئەم مەسەلەی توانای فێربونی زمانە بوو. هەرچەندە فەرەح تەمەنی زۆر بچوك بوو کە باوکی لەدەستدا و لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە بەهیچ شێوەیەك فەرەحمان فێری تورکی (ئازەری) نەکردبوو بەڵام لە منداڵی و هەرزەکاریدا توانی لە ڕێگەی هاوڕێ و هاوپۆلەکانیەوە تاوەکو ڕادەیەکی زۆر خۆی فێری ئازەری بکات.

خاتونە ناهیدە کلهر کە هاوڕێی سەردەمی منداڵی و هاوپۆلی بوو لە تاران لە قوتابخانەی ژاندارك و لە پاریسیسش لەگەڵیدا بوو ئازەری بوو، ڕۆڵێکی سەرەکی بینی لە فێربوونی زمانی تورکی (ئازەری) کچەکەم

فەرەح دەیوت: (زمان لە دایکەوە دەگوازرێتەوە بۆ منداڵ. هەر لەبەر ئەوەشە هەمیشە دەڵێن: زمانی دایك(!) بەڵام لەبەر ئەوەی کە من وێنایەکی تەواوی باوکم نەبوو لە مێشکمدا، هەمیشە حەزم دەکرد زمانی باوکم فێر ببم!)

لە باسەکە دوور کەوتمەوە. بەکورتی بەهاتنی لوییز بەرنامەکانی ڕۆژانەمان گۆڕان و لوییز بوو بە ڕێنوێنیکەری ئەم سێ کەسە.

سەرەتا پێشنیاری ئەوەی کرد بڕۆین بۆ سکۆتلەندا کە بە باوەڕی ئەو یەکێکە لە جوانترین ناچە سروشتیەکانی جیهان.

من پاش سەفەرەکەمان بۆ سکۆتلەندا بۆم دەرکەوت ئەم بۆچوونە ڕاستە، سکۆتلەندا سەرزەمینی سەرچاوە و جۆگە و دەریاچە سروشتیەکانە و باوەڕناکەم لە جیهاندا جگە لە چەند شوێنێکی کەم نەبێت هاوشێوەی ئەم سروشتە هەبێت. خۆشبەختانەش وەرزی سەفەرەکەمان باشترین کات بوو بۆ سەردانی سکۆتلەندا. کاتی بارینی مەوسومی بەهاری تازە تەواو بووبوو و خۆرێکی پاك و جوان ئەوەندەی دیکە ئەو سەرزەمینە سەوزپۆشەی جوانتر کردبوو.

(لویین) پێشتر لەگەڵ براکەم هاتبوو بۆ بەریتانیا و ناوچە جۆراوجۆرەکانی بەریتانیا و ئێرلەندە و لیزی بینی بوو زیاتر شارەزا بوو و ئەو زانیاری و ئەزموونانەی بۆ ئێمە سودیان هەبوو.

وتم بە لوییز من عاشقی ئەم سەرزەمینە بووم و زۆر حەز دەکەم بۆ هەمیشە بێم بۆ ئێرە و لێرە بمێنمەوە. بەڵام لوییز وتی ئێرە زستانێکی سەختی هەیە. ئەم قسەیەی

لوییز بۆچوونەکەی گۆڕیم. چونکە هەر لە منداڵییەوە بێزار بووم لە سەرما. تەنانەت دەبێت دان بەوەشدا بنێم کە لە بەفر و سەرما دەترسم. دایکم خوالێخۆشبوو بەهۆی سەرمای زستانەوە توشی نەخۆشی بوو و ئیدی هەر بەو نەخۆشیەش کۆچی دوایی کرد.

ئازارە هەمیشەییەکانی ئێسقانەکانی باوکیشم بەهۆی سەرمای زستانەوە بوو و کە بەردەوام هاواری ئازار و ئیشی ئێسقانەکانی دەکرد.

دواتر کاتێك کە ڕۆیشتم بۆ ئیسپانیا و کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست تێگەیشتم کە بۆچوونەکەی ئەو ڕۆژەم بۆ مانەوە لە سکۆتلەندە هەندێك بە پەلە بوو.

دەچووم بۆ هەرشوێنێك وامدەزانی ئەو شوێنە جوانترین شوێنی جیهانە و حەزم دەکرد لەوشوێنەدا ڤیلایەك بکڕم و هەموو ساڵێك ماوەیەك لەو شوێنە کات بەسەر بەرم، بەڵام کاتێك دەڕۆیشتم بۆ وڵاتێکی دیکە بۆچوونەکەم دەگۆڕا!

خۆشبەختانە زاوا خۆشەویستەکەم لە زۆربەی ئەو ناوچانەی جیهاندا کە ئاو و هەوای خۆشی هەبوو شوێنی تایبەتی و خۆشی هەبوو کە منیش لەکاتی سەفەرەکانمدا دەڕۆیشتم بۆ ئەو شوێنانە و لەکاتی سەفەرەکامندا لەو شوێنانەدا دەمامەوە، یەکێکی دیکە لە بیرەوەریەکانم سەردانم بوو بۆ مۆزەخانەی بەریتانیا.

لەبەر ئەوەی بەریتانیا لە کۆندا خاوەنی داگیرگەی فراوان بوو لە هەموو کونج و کەلەبەرێکی ئەم جیهانەدا، مۆزەخانەیەکی زۆر دەوڵەمەندی هەیە کە هەرچی کەلوپەلی کۆنی جیهان و ناوچە جیاوازەکان و کەلتورەکانی جیهان هەیە لەناویدایە.

کاتێك سەردانی ژوورەکانی پەیوەست بە بەرهەم و کەلوپەلە ئێرانیەکانم کرد وابیرم دەکردەوە هەرچی لە ئێران هەبووە بارکراوە و لە مۆزەخانەی لەندن خراوەتە بەردەست گەشتیاران!

(ئەو کەسانەی سەردانی کەلو پەل و پاشماوە کۆنەکانی ئێرانیەکانیان کردبێت لە مۆزەخانەی بەریتانیا زۆر بەباشی دەتوانن لە مەبەستم تیٚ بگەن.)

بەڵام کاتێك ڕۆیشتم بۆ پاریس و مۆزەخانەی لۆڤەرم بینی تێگەیشتم بەریتانیەکان لەم تالانکاریەی پاشماوە کۆنەکانی ئێران بەتەنها نەبوون. هەروەها لە مۆزەخانەی (ئارمیتاژ)یش لە سن پیترسبۆرگ دنیایەك کەلوپەلی گرانبەها و بەنرخی ئیرانی هەبوو.

لەكاتی گەڕانەوە ئەم باس کرد لەگەڵ فەرەحدا. فەرەح وتی: (بوونی ئەم کەلوپەلە ئێرانیانە لە دەرەوە بەجۆرێك لە جۆرەکان بەسودی ئێرانە چونکە لە ئێراندا خەڵکی زۆر حەزیان لە سەردانی ئەم جۆرە کەلوپەلانە نیە. بەلاّم لە لەندەن ساڵانە بە ملیۆنەها خەڵکی خارجی و بیانی سەردانی مۆزەخانەی بەریتانیا دەکەن و لەو سەردانانەشیاندا سەردانی بەشی ئێران دەکەن و لەم ڕێگەیەوە دەتوانن مێژووی شکۆمەند و گەورەی ڕابردووی ئێران ببینن و بەم شێوەیە ئاشنای ئێران بن.

کاتێك سەفەرم کرد بۆ لەندەن زۆر خاڵی گرنگم لە ژیانی بەریتانیەکان بۆ دەرکەوت هەر لە ڕۆیشتنیان و پەڕینەوەیان لە جادەکانەوە بیگرە تاوەکو دەگاتە سەردانیان بۆ دوکان و ناوەندە گشتیارەکان کە زۆر بەشێوەیەکی ورد چاودێریم دەکردن و سەرنجم دەدان.

نەزم و ڕێکوپێکی بەریتانیەکان زۆر جێگەی سەرنج بوو. ئێمە بە ٢٥٠ ساڵ فەرهەنگی شاهنشاهی(!) کاتێك کە لە جادەکاندا دەڕۆین هەموو شان دەدەین لە یەکتری و پال پاڵێنێکە بەبێ ئەوەی کەس داوای لێبوردن بکات لەکەس. لە شوێنەکانی پەڕینەوە و ڕۆیشتنی سەر جادە و شۆستەکان لەبەریتانیا مەحاڵە هیچکەس بلکێت بە هیچ کەسێکی دیکەوە و یان شەق بدات لە هیچکەسی دیکە. هەموو بەلایەکدا دەپەڕنەوە بێ دەنگ و ئارام.

لە شوێنی ڕۆیشتن و پیادەڕەویەکانی ئێراندا هەموو کەس دەیەوێت لەبەردەمی دووکانەکاندا تێ پەڕێت و هەر بۆیە لە سەدا نەوەدیان دەدەن لەیەکتر و یان فەوزا و پاڵ پاڵێن دروست دەبێت!

زۆرترین وشەیەك کە لە بەریتانیا لەخەڵکم دەبیست داوای لێ بوردن و پۆزش هێنانەوە بوو. هەمووکەس داوای داوای لێبوردنی لەهەمووکەس دەکرد و ئەم وشەیەش زۆر بە ڕێزەوە دەوترا.

مەوعید و پەیوەستبوونی بەریتانیەکان بە کاتەوە زۆر جێگەی گرنگی بوو بۆم. بۆ نمونە کاتێك کە سایقە بەریتانیە سرپەکەی سەفارەت هات بۆ ئەوەی لەگەڵماندا بێت کاتژمێر شەشی بەیانی دەهات بە شوێنماندا و ڕێك لەسەر سەعات شەش هۆرێنێکی بۆ لێ دەدایەن. بەبێ ئەوەی یەك چرکە نە دوا بکەوێت نە پێش بکەوێت!

له چاوپێکەوتن و دیدارەکانیشدا هەستم بەم مەوعیدە ورد و دیاریکراوەیان دەکرد و بینیم یەك چرکە دوا ناکەون لە کاتی خۆیان.

من هۆکاری ئەم باڵادەستی بەریتانیانە دەگەڕێنمەوە بۆ پەیوەستبوونیان بەم کات و مەعیدانەوە. هەڵبەتە لەبەر ئەوەی ئێمە لە ئێران گەورەبووین و پەروەردە بووین زۆر ئاگاداری ئەم مەوعید و پەیوەستبوون بەم کات و شتانەوە نەبووین.

بۆ نمونە دەمانوت بە شۆفێرەکە کاتژمێر ٦ وەرە بەشوێنماندا. کاتێك دەهات زیاتر لە کاتژمێرێك لەبەردەم شوێنی مانەوەمان دەوەستا بە دیارمانەوە تاوەکو ئێمە ئامادە دەبووین!

یەکێکی دیکە لەو خاڵەی بەریتانیەکان کە زۆر جێگەی سەرنجم بوو، بریتی بوو لە یەکسانبوونی هەموو چین و توێژەکانی بەریتانیا لەبەرامبەر یاسا.

(لوبین) ڕۆژنامەیەکی بەریتانی پیشاندام و کە باسی ئەوەی دەکرد پۆلیسی لەندەن سەیارەکەی (شازادە چارلزی) کوڕی شاژنی بەریتانیای، بە تاوانی وەستاندنی لە شوێنی قەدەغەکراودا جەریمە کردوە!

ڕۆژنامەکە نوسیبووی شازادە چارلز سەیارەکەی لە بەردەم ڕیستۆرانێکدا وەستاندوە و بۆ خواردنەوەی قاوەیەك ڕۆیشتبوو بۆ ڕیستۆرانەکە.

هەر لەم کاتەدا کاتێك پۆلیس دەزانێت بە مەسەلەکە بە پەلە دەگاتە شوێنەکە و دەست دەکات بە نوسینی وەصڵی جەریمە بۆی.

کاتێك شازادە ئاگادار دەبێت دێتە دەرەوە و دەچێت بۆلای پۆلیسەکە، و پۆلیسەکەش کاتێك دەیبینێ ڕێزێکی زۆری دەگرێت و دەڵێت هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەم نە دەکرد کە ئەندامێکی خێزانی شاهانە سەرپێچی بکات! من کاتێك ئەمەم بینی توشی واقوڕمان بووم.

یەکەم توشی واقوڕمان بووم کە چۆن پۆلیسێکی سادە جورئەتی ئەوەی کردوە کە شازادەیەکی بەریتانیا جەریمە بکات کە نەك هەر هیچکەس پێیشی ناڵێت بەری چاوت کلی پێوەیە، بەڵکو هانیش دەدرێت و ڕێزیشی لێ دەگیرێت.

دووەم چۆن شازادەیەکی بەریتانیا دەچێت بۆ ڕیستۆرانێك کە هەموو خەڵکێکی بۆ دەچێت لە شوێنێکی گشتیدا تاوەکو قاوە بخواتەوە!

هاوسەری سەفیری گەورەی ئێران کە بەو شێوەیە منی بینی  توشی سەرسوڕمان و واقوڕمان بووم بە دەربڕینێکی حسابکرا و وردەوە وتی: لە بەریتانیادا هەمووکەس لەبەرامبەر یاسادا یەکسانن و تەنانەت هیچ جیاوازێك نیە لەبەردەم بنەماڵی پاشایەتی بەریتانیا و بچوکترین کەسی ئەم وڵاتە.

هەروەها وتی: تەنانەت هەندێکجار شاژن زۆر بەشێوەیەکی ئاسای لەناو خەڵکی و لە شوێنی گشتیدا دەبینرێت و دەڕوات بۆ هەموو شوێنێك.

ئاخر بۆ کەسێکی وەکو من کە کاتێك دەمبینی محمد ڕەزا بڕۆشتایە بۆ شوێنێکی گشتی چ کارێکی بۆ دەکرا و چ مەراسیمێك ساز دەکرا جێگەی سەرسوڕمان بوو!

کاتێك محمد ڕەزا بیویستایە لە سعد ئابادەوە بڕوات بۆ بینای ئەنجومەن یان بۆ فڕۆکەخانە چەند ڕۆژێك ڕێگەکە بە وردی دەخرایە ژێر چاودێریەوە و تەنانەت لەسەر بان و بیناکانیشەوە کارمەندانی نهێنی چاودێری دادەنران و جێگیر دەکران.

پیاوەکانی ساواك و گاردی شاهنشاهی بەجلی مەدەنی و سادەوە لەناو خەڵکدا و لە تەنیشت جادەکان و لەناو ڕێڕەوەکاندا دادەنران و لەکاتی ڕۆیشتنی شا سەرەڕای سەیارەکانی پاسەوانی و ماتۆڕسوارەکانی پێشەوە و دواوە دەیان سەربازی پلە بەرز و فەرماندەی سوپای شاهنشاهی لە سەیارە سەربازیەکاندا هاوڕێیەتی محمد ڕەزایان دەکرد!

کاتێك هاوسەری سەفیر ڕۆیشت و لەگەڵ لوییز تەنیا بووینەوە براژنم وتی دەتوانی ئەوە بهێنیتە بەرچاوت کە کارمەندێکی پۆلیسی هاتوچۆی تاران سەیارەکەی محمد ڕەزا یان برایەکی یان خوشکیکی جەریمە بکات و وەصڵی بۆ بکات بتوانێت بەسەلامەتی دەربچێت بۆی و نەکوژرێت؟

من نامەوێت ڕەخنە لە زاوا کۆچکردوەکەم یان شێوەی حوکمڕانیەکەی بگرم. بەڵام دەبێت بڵێم ئەم جیاوازیە دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی فەرهەنگ و عادەتەمان. من لە سەفەرەکانمدا بۆ ئەمریکا، بەریتانیا، فەرەنسا، ڕوسیا و وڵاتەکانی دیکەی ئەورووپا و تەنانەت ماداگاسکار و گینەش لە ئەفریقا هەرگیز نەمبینی کەسێك دەستی سەرۆك کەنەدی یان سەرۆکی دوگڵ و یان سەرۆکی پادگورنی ماچ بکات.

دەبێت ئەوە بڵێم بۆ مێژوو کە خەڵکی خۆیان دەستی محمد ڕەزایان ماچ دەکرد و خۆیان دەدا بەسەر پێڵاوەکانیدا.

محمد ڕەزا هەرکاتێك لە سەردانێکدا بگەڕایەوە چەندین جار دەستی دەرمانی دژە ئیلتیهاب و نەخۆشی لێ دەدا و دەیوت ڕەعیەتەکەم هەرچی تف و لیکی دەمیان هەیە دەیماڵن لە دەستم!

هەمووکەس دەیزانی ممحد ڕەز بێ ڕادە توشبی ڕاڕای بووبوو و زۆریش دەترسا لە میکرۆب و نەخۆشی بەڵام ئەیوت ئەگەر دەستی خۆم نەدەم ماچی بکەن ئەوا خەڵکی بێتاقەت و نارەحەت دەبن[1]! خەڵکی دەستی من بۆ تەبەڕك ماچ دەکەن و دەیانەوێت بەو شێوەیە و بە قوڵی پەیوەندی و پەیوەستبوونی خۆیان پیشانم بدەن!

هەڵبەتە ماچکردنی دەستی ژن کێشە نەبوو و بۆ دەربڕینی جۆرێك لە ڕێز بەکار دەهێنرا. لە ڕۆژئاوادا عادەت وایە ئەو کەسانەی کە تێکەڵیان هەیە و لەگەڵ یەکتریدا ئاشنایەتیان هەیە لە چاوپێکەوتن و دیدارەکانیاندا تەنانەت یەکتریش ماچ دەکەن.

خەڵکی دیکەش لەکاتی بینینی ژنێکدا کە شوی کردبێت و پیاوی هەبێت بۆ نیشاندانی ڕێز دەستی ماچ دەکەن.

لە ئێرانیشدا کەم کەم خەریك بوو ماچکردنی دەستی خاتوونەکان دەبوو بە باو، و ئەم ماچکردنە تەنها دەستی فەرەح یان خوشکەکانی جەنابی شای نەدەگرتەوە.

من سەرەتا کە ڕۆیشتمە ناو خێزانی شاهنشاییەوە بەهۆی ئەو بیروباوەڕە ئاینیەوە کە هەمبوو نەمدەهێشت خەڵکی نامەحرەم دەستم ماچ بکەن. بەڵام بەزووی تۆمەتبار کرام و دەیانوت: (دەتەوێت سوك نەبێت، وەکو جەماعەت بە!) بەڵام بەرە بەرە منیش عادەتم کرد بەو خووەی ئەوان.

لەم ساڵانەی دوایی کە هاتم بۆ دەرەوەی ئێران هەلێکی باشم هەبوو بۆ خوێندنەوە. بەتایبەتی بۆ خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی کە لە ئێراندا بلاو دەبنەوە و گرنگن. لە هەندێك لە کتێبەکاندا دەبینم زۆرجار محمد ڕەزا بەوە تاوانبار کراوە کە کەسێکی زۆر لە خۆبایی و خۆ پەسەند بووە.

---

[1] – وەکو بڵێی محمد ڕەزا ئەم پەندە بەناوبانگە چینیەی بیستبوو کە دەڵێت: (بێ متمانەترین کەس، ئەوکەسەیە کە دەستت ماچ دەکات!)

دەبێت ئەوە بڵێم کاتێک یەکەمجار محمد ڕەزام ناسی بە کەسێکی شەرمن و گۆشەگیر دەهاتە پێش چاوم. بەڵام دواتر شایەتی ئەوە بووم کە چۆن خەڵك و کەسانی بەرپرس دەهاتن بۆ بینینی بە ماستاوکردن و خۆبردنە پێشەوە و بەکارهێنانی ڕستەی سەیر و سەمەرە و نامۆ محمد ڕەزا لەخۆبای دەکەن لە خۆیان و واپیشانی محمد ڕەزا دەدەن کە ئەو جیاوازترە لە هەموو کەس، وەکو بڵێی ئەو مرۆڤێکە لە جیهانێکی دیکەوە هاتبێت!

پاش گەڕانەوەم لە بەریتانیا وەکو دایکێکی دڵسۆز هەموو ئەزموونەکانم گەڕاندەوە بۆ کچەکەم، و فەرەحیش وتی: دایکە! ئەو سیستەمە بە کەڵکی بەریتانیا دێت و ئەو عادەت و شێوازە کە تۆ باسی دەکەیت بۆ ئێران ناشێت. خەڵکی ئێران پاشا بە سێبەری خودا دەزانن و فردەوسی شاعری نەتەوەییمان دەیوت:

(چ فەرمانی یەزدان چ فەرمانی شاه!)

ئەگەر شا بیەوێت چاو لە پاشای بەریتانیا بکات و وەکو خەڵکی ئاسایی بڕوات بۆ ناو شار ئەوا پێنج خولەك لەسەر حوکم نامێنێت. خەڵکی ئەوەندە نەگەیشتونەتە ئاستێك وەکو خەڵکی ئاسایی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەیت و بڕۆیتە ناویانەوە!

کچەکەم وتی: تێڕوانینی ڕۆژهەڵاتیەکان بۆ تەختی پاشایەتی لەگەڵ تێڕوانینی ڕۆژئاواییەکان زۆر جیاوازە! و بۆ پشتگیری قسەکانیشی ڕژێمی سەڵتەنەتی یابانی هێنایەوە بە نمونە... لەو وڵاتەدا پاشا لەدیدی خەڵکی یابانەوە بە خودای ئەو سەرزەمینە دادەنرێت!

ئێستا کە چەندین ساڵ دەبێت ئەو ژیانەم بەجێهێشتوە و ئێستاش لە غەریبیدا ڕۆژەکانی کۆتایی تەمەنم دەگوزەرێنم دەبینم کە کچەکەشم لە هەڵەدا بووە.

هیچ چێژێك خۆشتر نیە لەوەی کە خەڵکی بەبێ هیچ ڕێگری و پاسەوانێك و دیوارێك بتوانێت لەناو هاونیشتیمانەکانیدا بژی. ئەمە چێژێکە کە دڵنیام محمد ڕەزاش هەرگیز نەیتوانی چێژی لێ وەرگرێت و کچەکەشم لەو کاتەوەی کە شوی کرد بە محمد ڕەزا بێ بەش بوو لێی.

تەنانەت بێ بەش بووین لەو مەراسیم و سەردانانەی کە دەڕۆیشتین و گفتوگۆمان دەکرد لەگەڵ خەڵکی ئاساییدا.

ئێستاش خراپ نیە باسی بیرەوەریەك بكەم تاوەكو تێبگەیت لە رادەی جیاكردنەوەی خێزانی سەڵتەنەتی لە خەڵكی ئاسایی. (جیاوازیەك كە لە كۆتاییدا بە زیانی خێزانی شاهانەی ئێران كۆتایی هات)

ماوەیەك پاش رووداوی بومەلەرزەكەی (كوار) لە شیراز، محافزی شاری فارس پیروز بانگهێشتی فەرەحی كرد تاوەكو سەردانی ئەو هەنگاو و كارانە بكات كە ئەنجامدراون بۆ دووبارە دروستكردنەوەی ئەو ناوچەیەی كە بومەلەرزەكە لێیداوە. منیش لەم سەفەرەدا لەگەڵ كچەكەم رۆیشتم. لە (كوار) ئێمەیان برد بۆ سەردانی گوندێكی نۆژەنكراوە وەكو نمونەیەك.

دە بۆ پانزە خانووی بچوك كە پێكهاتبوون لە ژورێك و هۆڵێكی بچوك و مەتبەخێك و هەندێك كەلوپەل كە لە سوچێكی حەوشەكەدا دانرابوون دروستكرابوون، بە پێی ئەو هەڵسەنگاندن و لێكۆڵینەوەیەی كە كرا و سەبارەت بە ژیانی ئەو رۆژگارەی خەڵكی گوندنشینەكانی ئەو سەردەمەی ئێران شتێكی زۆر باش و خوازراو بوو، ئەو كەلوپەلانەشی كە لە خانووەكاندا هەبوون پێكهاتبوون لە دوو سێ پارچە فەرشی تازە و جێگە و بانی خەوتن و رادیۆ و تەلەفزیۆن و سەلاجە.

سەرەتا پێم سەیر بوو كە بۆچی سەلاجەكانیان لەبری ئەوەی كە لە مەتبەخدا دایبنێن لەلای تەلفزیۆن و لە شوێنی خەوتنەكانیاندا دانراون.

دواتر ئەوەندەی دیكە توشی سەرسوڕمان بووم، چونكە بینیم ئەو ژنانەی كە بەحساب ژنی لادێیین لەماڵەكاندا نینۆكی درێژ و رێككراویان هەیە!

هەروەها زمانیان بە لەهجەی ناوچەیی ناخوات و زۆر جوان و رێكوپێك قسە دەكەن! پاش كۆتایی سەفەرەكە فەرەحم ناچار كرد كە لێكۆڵینەوە بكات لەو بوارەدا. دواتر دەركەوت بەهۆی لایەنی ئەمنی و ئاسایشیەوە هەموو خەڵكی گوندەكەیان دەركردوە و هەندێك لە ژنانی بەرپرسەكانی شارەكانیان وەكو ژنانی لادێیی جلوبەرگی ناوچەییان لەبەركردوون و هێناویانن بۆ پێشوازی ئێمە!

سەلاجەكانیشیان بە پەلە پەل و نەزانانە لە ژووری دانیشتن و میوانیەكاندا داناوە و ئەم كارەشیان بۆ ئەوە بوو تاوەكو فەرەح واتێبگەیەنن كە پارێزگاری شار چ

هەوڵێکیـــداوە بـــۆ گرنگیـــدان بـــە لادێنـــشینەکان و چ خـــەمێکی خـــواردوون بـــۆ خۆشگوزەرانی ئەو کەسانەی کە بومەلەرزە لێیداون!

دڵنیابووم کە لەهیچ شوێنێکی دیکەی ئەو ناوچانەی کە بومەلەرزە لێیدابوو هیچ کارێك نەکرابوو و ئەم دە پانزە ماڵەش کە ئێمە سەردانمان کردن بەتایبەتی بۆ ئەو ڕۆژە ئامـادەکرابوون! بـەڵام هیچـشتێك نـەدەکرا بکرێـت چـونکە بەپرسـە ناوچـەییە گەندەڵەکان! فێڵباز و ساختەچی بوون. محمد ڕەزا بەتـەنهای نەیدەتوانی هـەموو ئەو وڵاتـــە فراوانـــە بگـــەڕێت و لێکۆڵینـــەوە بکـــات لـــەو هـــەموو بارودۆخـــە بەداخـــەوە بەرپرسەکانیش هەرچی زیاتر دووربوونایە لە ناوەندەوە کەمتر کاریان دەکرد.

بـەم شـێوەیە لـە سـەردانەکاندا شـتەکانیان بـەجۆرێك ڕێکدەخـست تەنانـەت ئـەو خەڵکەی کە لەوێ ئامادە دەبوون هەڵبژێردراو و ڕاهێنرابوون. خـەڵکانێك دەهێنـران بۆ بینینـی محمـد ڕەزا و فـەرەح هـیچ خواسـتێکیان نـەبوو جگـە لـەوەی کـە ئـارەزووی سەرکەوتن و خۆشبەختیان دەکرد بۆ شا و خێزانەکەی و تەنها هەمیشە ئەو قسانەیان دەکـرد کـە دەلالـەتیان لـە خۆشـبەختی و سـەربەرزی و ئومێـدی سـەرکەوتنی پاشـا دەکرد!

سەفەرێکی دیکە بۆ دەرەوە کە هەرگیز لەبیری ناکەم ئەو سەفەرە یەك مانگەیە بوو کە ڕۆیشتم بۆ یابان لەبەهاری ساڵی ١٩٧٠.

محمد ڕەزا زۆر حەزی لە یابان بوو. هۆکارەکەی ئەوە بوو یابان لە جەنگی دووەمی جیهانیدا هاوپـەیمانی ئەڵمانیای هیتلـەری بـوو و ئێـرانیش لەو سـەردەمەدا لایـەنگری وڵاتانی بەرە بوو کە پێکهاتبوون لە (ئەڵمانیا، یابان و ئیتاڵیا).

محمـد ڕەزا بـاوکی بـە ئەسـتورەیەکی ئەفسانەی دەزانـی و هـەموو قسە و باسـێکی باوکی لەبیر بوو.

لەبـەر ئـەوەی کـە ڕەزاشـا چـەندینجار بـاس و وەسـفی یابانیـەکانی کـرد بـوو بـۆی، محمد ڕەزاش هەر لەخۆیەوە هەمیشە باس و وەسفی یابانیەکانی دەکرد!

هەمیشە کۆمەڵە باسێکی ڕەزاشای لەبارەی یابانیەکانـەوە بـاس دەکـرد. بـۆ نمونـە دەیوت: (لە جەنگی جیهانی دووەمدا فڕۆکەوانە خۆکوژەکانی یابان (کامیکازە) خۆیان

دەتەقاندەوە بە کەشتیە فرۆکە هەڵگرەکانی ئەمریکادا و بەفیداکاری گیانی خۆیان لە ڕێگەی ئیمپراتۆرەکەیان، کەشتیە جەنگیەکانی دووژمنیان لەناو دەبرد!)
هۆکارێکی دیکەی پەیوەستبوونی محمد ڕەزا بە یابانەوە ئەوەبوو کە لە ئۆڵۆمپیاتی تۆکیۆ ئیمپراتۆریەتی (هیروهیتو) محمد ڕەزای بانگهێشت کردبوو و ئیمپراتۆریەتی یابانیش لەگەڵ ئەودا لەکاتی ئیفتیتاحی ئۆڵۆمپیاتەکەدا ئامادە بووبوو!
محمد ڕەزا زۆر بە غرورەوە باسی ئەوەی دەکرد کە ئیمپراتۆر (هیروهیتۆ) گرنگی پێ دەدات و سەفەرەکانی بۆ تۆکیۆ بە خۆشترین و باشترین سەفەرەکانی دەرەوە باس دەکرد.
من لە سەرەتای هاوینی ساڵی ١٩٦٧ ڕۆیشتم بۆ یابان. وابزانم سەرەتای مەی ساڵی ١٩٦٧ بوو خاتونی سەفیری گەورەی یابان لە تاران لەگەڵ کارمەندێکی یابانی سەفارەتدا هات بۆ بینینم و بانگهێشتی کردم بۆ یابان. پرسیاریشم لە ناوی ئەو کارمەندە یابانیەش کرد و زۆر پێم سەیر بوو کە بەو شێوە باشە بە فارسی قسەی دەکرد بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەیت.
یابانیەکان هەموو ساڵێك دوو بۆ سێ کەسیان لە ئەندامانی خێزانی سەڵتەنەتی بانگهێشت دەکرد بۆ سەفەرێکی تایبەتی بۆ تۆکیۆ. تەنانەت منداڵەکانی خزم و کەسەکانی شا و خێزانە پلە سێیەمەکانی پەهلەویشیان بانگهێشت دەکرد.
من کە هەمیشە مشتاقی ئەم سەفەرانە بووم زۆر بە خۆشحاڵیەوە ئەم سەفەرەم قبوڵ کرد و بڕیاریشمدا کە دەبێت (ئەفسەر ملوك)ی خزمەتکاریشم بەرم لەگەڵ خۆمدا.
ئامادەکاریەکانی سەفەرەکە بەچاوتروکانێك فەراهەم کران و هەفتەی دواتر من و (ئەفسەر ملوك) بە فرۆکەی (ئیران ئێر) بەرەو تۆکیۆ کەوتینە ڕێ.
شوێنی ئێمە لە فرۆکەکەدا لە شوێنی (پلە یەکەکاندا) بوو، و واشم بیست کە هیچ بلیتێکی دیکەی پلە یەکیان نەفرۆشتوە، بۆ ئەوەی من و خزمەتکارەکەم بە ئارامی دابنیشین و کەس ئیزعاجمان نەکات.
زیاتر ناچمە ناو ڕوونکردنەکەوە، چونکە ئەمڕۆ چینە ناوەندیەکانیش دەچن بۆ سەفەر و زۆر باشتر لەمن لە کاروبارەکانی فڕین و میوانداریەکانی ناو فرۆکە شارەزان.

فڕۆکەکە نزیکەی حەوت کاتژمێر فڕی دەبوو کاتژمێرێکیش بوەستایە تاوەکو سوتەمەنی وەرگرێت و هەندێك پاك کردنەوە و ئیسراحەتێکیش وەرگرێت.

لێرەدا ئەو کەسانەی کە مەبەستیان سەفەرکردن بوو بۆ پەکین دابەزین و ئەوانی دیکە کە مەبەستیان ڕۆیشتن بوو بۆ یابان لە فڕۆکەکەدا مانەوە.

من و (ئەفسەر ملوك) حەزمان کرد بڕۆین بۆ کۆتای فڕۆکەخانەکە بۆ ئەوەی قاوەیەك بخۆینەوە و هەندێك پشو بدەین تاوەکو دووبارە خۆمان ئامادە بکەینەوە بۆ سەفەرەکە.

فڕۆکەوانەکە بەبێ دواکەوتن ئامادەکاری کرد بۆ ئەو خواستە و بە ئۆتۆمبێلێکی تایبەتی بردینی بۆ قاوەخانە و شوێنی پشوی فڕۆکەخانەکە.

تەصوری من لە کۆتای فڕۆکەخانەکەی پەکین شتێکی وەکو فڕۆکەخانەکانی ئەوروپا و ئەمریکا بوو. کاتێك ڕۆیشتین بۆ شوێنی تەلاری گەشتیارەکان و بە بینینی کورسیە بێ ڕەنگ و کاڵ بووە دارینەکان و بینا شەق و شڕەکان ڕێك لە شارێکی پلە دووی ئێران دەچوو زۆر دواکەوتوو و خراپتریش.

نە کافتراییەك نە ریستۆرانێك. تەنها فرۆشگایەکی بچوك هەبوو ئەویش هەندێك کەلوپەلی پێویستی و کاڵای دەستی تێدا بوو خاوەنەکەشی لەوێ نەبوو و بە دەرگایەکی تەختە دووکانەکە داخرا بوو!

لەم کاتەدا چاوم کەوت بە چەند تابلۆیەکی گەورە کە لەناو تەلاری گشتیارەکاندا کەوتبوون و بە زمانی ئینگلیزی لەسەریان نوسرا بوو: بەخێرهاتن بۆ (بیجنگ)! من بە خوێندنەوەی ئەم دەربڕینە زۆر توشی شۆك بووم. هەر لەو کاتەدا وتم بە (ئەفسەر ملوك): ئەفسەر! باشە بۆچی مەگەر فڕۆکەکە بڕیار نەبوو تەنها لە پەکین بنیشێتەوە ئەی بۆچی لە (بیجینگ) نیشتوەتەوە؟

ئەفسەریش لە من بێ ئاگاتر. (کوێرێکی گاڵۆك بەدەست کوێرێکی تری پێ بوو!)

لە گەڕانەوەماندا بۆ فڕۆکەکە: وتم بە فڕۆکەوانەکە مەگەر ئێمە بڕیار نەبوو تەنها کاتژمێرێك لە پەکین بمێنینەوە؟

فڕۆکەوانەکەش وتی وایە: منیش وتم کەواتە بۆچی لە (بیجینگ) نیشتوینەتەوە؟ فڕۆکەوانەکە کە لە شێوەی دەموچاویدا دیار بوو بزەیەك گرتی، بەڵام جورئەتی زەردەخەنەی نەبوو (چ بگات بە پێکەنین!)

وتی: خاتونی بەڕێز. (بیجینگ) هەر پەکینە. بەریتانیەکان بە پەکین دەڵێن (بیجینگ)!

منیش زۆر تەریق بوومەوە لەو بێ ئاگاییە، و لە دڵی خۆمدا وتم تۆبڵێی ئێستا ئەم فڕۆکەوانە چۆن لەبارەی منەوە بیر بکاتەوە.

ئەمە بووە ئەزموونێك و وانەیەکی لەبیرنەکراو بۆم. لەوەو دوا بڕیارمدا تاوەکو دڵنیا نەبم بەهیچ شێوەیەك پرسیار نەکەم لە هیچکەس. بابەتەکە ئەوە نیە کە مرۆڤ دەبێت هەرچی نەزانی پرسیار بکات. بابەتەکە ئەوە بوو کە من وەکو دایکی شاژنی ئێران ئەو حەقەم نەبوو ئەوەندە بێ زانیاری و بێ ئاگابم کە نەزانم (بیجینگ) یەکێکە لە ناوە ناسراوەکانی پایتەختی چین!

ڕاستیەکەی ئەوەیە زۆرێك لە خەڵك زۆر شت هەیە نایزانن، بەڵام ئەوانەی کە سیاسەتمەندار و دانا و ژیرن بەشێوەیەك خۆیان دەردەخەن کە دەزانن! یابانیەکان گەڕانێکی دوو هەفتەییان بۆ ڕێکخستین کە هەموو سات و کاتێکی پڕ بوو لە چێژ و خۆشی.

سەردانی هەموو ناوچە گەشتیاری و خۆشەکانی (تۆکیۆ)، (ئۆزاکا)، (نارا)، (هێرۆشیما)، (کوبە) و (ئۆکیناوا)مان کرد.

لە (تۆکیۆ) ڕۆیشتین بۆ سەردانی کۆشکی (ئیمپراتۆر). لە (نارا) سەردانی کۆنترین و ناسراوترین پەرستگەی بودایی بەناوبانگی سی و سێ قەدیسمان کرد.

لە ئۆکیناش سەردانی ڕێڕەوە ژێر زەویەکانی سەردەمی جەنگی جیهانی دووەم و بنکەی فەرماندەی هێزی دەریایی یابان و شوێنی حەشاردانی سەربازەکانمان کرد. بەڵام تەنها شتێك کە سەرنجراکێش بوو بۆم و ئێستاش لەبیرمە، بوونی دووشتی کۆنی ئێرانی بوو لە مۆزەخانەی شاری (نارا) و دار خورمایەکی ئێرانی کە لە دوورگەی ئۆکۆیناو بوو.

دوو قاپی شوشەی کە دەگەڕانەوە بۆ سەردەمی (ساسانیەکان) لە مۆزەخانەی شاری (نارا) بوون یابانیەکان دەیانوت ئەم دوو قاپە ئێرانیە گرانترین و کۆنترین کەرەسەن لە یابان!

لە (ئۆکیناوا)ش درەختێکی خورما هەبوو یابانیەکان دەیانوت بە نەمامی لە دوورگەی ئابادان هێناویانە و لێرە ناشتویانە. (دارخورماکە لەکاتی هێرشی هێزەکانی ئەمریکا بۆ ئۆکیناوا گولەیەك بەر ساقەکەی کەوتبوو!)

بۆ خوێنەری ئەم یاداشتە چ سودێکی هەیە کە من بڵێم لە یابان چیم بینیوە و چیم خواردوە و بۆکوێ ڕۆیشتم.

وابزانم خۆشترین و سەرنجڕاکێشترین بەشی بیرەوەریەکانم لە یابان چاوپێکەوتن و دیدارمان بوو لەگەڵ ئیمپراتۆر (هیروهیتۆ) و هاوسەرەکەی.

لەو دیدارەدا تەنها پانزە خولەك دانرا بوو بۆ ئەوەی ئەو چاوپێکەوتنە ئەنجام بدەین.

من پێشتر بیستبووم کە ئیمپراتۆریەت لەلای یابانیەکان ڕێز و پلەیەکی زۆر گەورەی هەیە، و تەنانەت تاوەکو کاتی خۆبەدەستەوەدانی یابان لە جەنگی دووەمی جیهانیشدا خەڵکی ئاسای نە دەنگیان بیستبوو و نەڕەنگیشیان بینی بوو.

تەنانەت تاوەکو سەرەتای سەدەی بیستەم خەڵکی یابان ئیمپراتۆرەکەیان پلەی خواوەندی هەبوو لەلایەن.

کاتێك کە ڕۆیشتین بۆ لای ئیمپراتۆر (هیرهیتو). یەکەمین پرسیار کە کردی ئەمە بوو: (چۆن یابانتان بینی؟)

من هەندێك لەبارەی جوانی سروشتی یابانەوە قسەم کرد. ئیمپراتۆریەتیش زۆر خۆشحاڵ بوو لەو باس و پیاهەڵدانانەی من و وتی: (ئێمەی یابانیەکان پەندێکی بەناوبانگمان هەیە دەڵێت: (کاتێك کە خوداوەند زەوی دروستکرد لەبیری چوو یابانی لەناودا دابنێت، هەر لەبەر ئەوە پارچەیەك لە بەهەشتی هێنا بۆ زەوی و یابانی لەناودا دانا. و یابانیش بوو بەشێك لەو بەهەشتە!)

ئەم دەربڕینەی ئیمپراتۆریەت نیشانەی تروپکی خۆشەویستی بوو بۆ یابان. کاتێکیش دەچووین بۆ ناو خەڵکی ئاسای، دەمانبینی خەڵکی گشتیش زۆر بەشێوەیەکی سەیر پەیوەستن بە وڵاتەکەیانەوە و خۆشیان دەوێت!

من ئەم خۆشەویستی و وڵات دۆستیەی ئەم یابانیانەم بەراورد دەکرد بە بۆچوون و پەیوەندی ژمارەیەك لە خانەدانەکانی پەهلەویەوە کە هەموو ساڵێك دوانزە مانگە لە دەرەوەی وڵات ژیان بەسەر دەبەن و لەگەڵ بیانیەکاندا هاوسەرگیری دەکەن و لە ئەمریکا و ئەوروپا موڵك و خانوو دەکڕن و سەرمایەگوزاری دەکەن!

لێرەدا حەز ناکەم ناوی کەس بهێنم بەلآم دەمەوێت ئەوە بڵێم تەنها محمد ڕەزا بەرپرس نەبوو لە هەرەسهێنانی ڕژێمی سەڵتەنەتی.

برا و خوشکەکانی شاه بەهیچ شێوەیەك ڕوویان نەدەکردە نەتەوەکەی خۆیان و مەملەکەتەکەیان خۆشنەدەویست.

چەندە ڕەزاشا وڵاتەکەی خۆی خۆشدەویست و حەزی لە ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکەی بوو بەلآم منداڵەکانی بەهیچ شێوەیەك بەو شێوەیە نەبوون.

خاڵێکی دیکە کە جێگەی سەرنجم بوو پەیوەستبوون و پابەندبوونی ئیپمراتۆریەت (هیروهیتۆ) بوو لەگەڵ ژنە ناشیرینەکەی!

لەگەڵ ئەوەی کە ئیمپراتۆریەت بۆ خەڵکی لایەنێکی پیرۆزی هەبوو و دەیتوانی بە ئارەزووی خۆی هەرچی ژن و کچی جوان هەیە بیکاتە هاوسەری خۆی. بەلآم هەرگیز بەخراپ سودی لەم دەسەلآتەی وەرنەدەگرت و تەمەنێکی دوورودرێژ لەگەڵ ئەو ژنە ناشیرینەدا ژیانی بەسەر بردبوو!

لە دڵی خۆمدا وتم ئەگەر ڕەعیەتێکی ئێرانی پانتۆڵەکەی هەڵبکەڕێتەوە هاوار دەکات بەسەر ژنەکەیدا. بەلآم ئەم پیاوە گەورە بەم هەموو نیعمەتەی کە لەبەردەستیدایە تەمەنی خۆی لەگەڵ ئەم ژنە ناشیرینەدا بردوەتە سەر. هەر بژی بۆ ئەو شەرەفە!

یابانیەکان لە زۆر ڕووەوە هاوشێوەیەکی تەواویان لەگەڵ ئێرانیەکاندا هەیە. هەر وەکو ئێمە لەماڵەوە لەسەر دۆشەکە دادەنیشن و پاڵ پشتیشیان هەیە.

تەوالێتەکانیشیان بە پێچەوانەی تەوالیتە ئەوروپیەکانەوە لەوانەی ئێمە دەچن.

لەهەمووی سەرنجڕاکێشتر ئەوەبوو کە لە پەرستگەیەکدا لە شاری کۆنی (نارا) پەیکەرێك هەبوو کە خەڵکی پەڕۆیان پێوە دەبەست بۆ هاتنە دی نیاز و خواستەکانیان.

لەبارەی ئەو پەیکەرەوە پرسیارم کرد. وتیان ئەمە پەیکەرێکی (قەدیسێکە) کە شفای کوێرەکانی دەکرد. ئێستا هەرکەسێك نەخۆشێکی چاوی هەبێت دێت بۆ ئێرە و تکای لێ دەکات تاوەکو شفای بدات. زۆر سەیر بوو بەلامەوە. ئەم تکا کردن و پەڕۆ بەستنەی یابانیەکان منی خستەوە بیری ئەو کاتانەی کە لەگەڵ دایکی ڕەحمەتیمدا دەچوینە سەر مەرقەدی کابرایەك و دایکم پەڕۆی دەبەست بە مەرقەدەکەوە و داوای لێ دەکرد خواستەکانی جێبەجێ بکات و شفای دایکم بدات. (کە هەڵبەتە مەرقەدەکە شفای دایکمی نەدا و کۆچی دواییشی کرد!) من زۆر شوێن گەڕاوم لە دەرەوە. بەڵام کاتێك کە ڕۆیشتم بۆ یابان هەستم کرد بۆ ڕەشت چووم. بەتایبەتی کاتێك کە شەوانە باران دەباری شەوانی ڕەشتی بیر دەخستمەوە.

ئاو و هەوا و جۆری گیاکان و تەنانەت جیڕجیڕەکەرەکانی دارستانەکانیشی شێوەی ناوچەی گەیلان بوون.

کاتێك کە گەڕاینەوە بۆ تاران محمد ڕەزا وتی چۆن (هیروهیتۆ)ت بینی؟ وتم بە بۆچوونی من کەسێکی ئاسایی بیوو. زۆریش ئاسای!

محمد ڕەزا وتی بەڵام کەسی ئاسای ناتوانێت ببێتە ئیمپراتۆر.

وتم: بەوشێوەیەیە کە جەنابەت دەفەرمووی!

بەڵام فەرەح کە ئاگاداری قسە و باسەکەی ئێمە بوو تەحەمولی نەکرد وتی: ئیمپراتۆریەت ئەم پێگە و نازناوەی لە باوکیەوە بە میرات بردوە. چ زۆرن ئەو باوکانەی کە بە شایستەی و لێهاتووییەوە منداڵی بێ شایستە و بێ توانایان تەسلیمی کۆمەڵگە کردوە!

محمد ڕەزا هیچی نەوت: بەڵام دیار بوو زۆر بێتاقەت بوو لەم بۆچوونەی فەرەح!

یەکێکی دیکە لە سەفەرە خۆشەکانی دیکەم، سەفەر بوو بۆ ڕووباری زیا و ئەفریقای باشور و سەردانی (دوربان) بوو.

ڕەزاشا لەکاتی ڕاکردنەکەی ماوەیەك لە (دوربان) بوو. ئێمە سەردانی ئەو شوێنەمان کرد کە ڕەزاشا لێی مابوویەوە و ئێستاش لەژێر چاودێری سەفارەتی ئێراندا بوو و کرا بوو بە مۆزەخانە.

ئەو کاتە ئەفریقای باشور لە لایەن ئیدارەی سیاسی بەریتانیاوە سەرپەرشتی دەکرا. بەپرسێکی بەریتانی پێشوازی کرد لە ئێمە و میوانداری کردین. ئێران نەوتی دەفرۆشت بە ئەفریقای باشور و پەیوەندی ئابوری-سیاسی نێوان ئەفریقا و ئێران زۆر بەهێز بوو.

کاتێك لە ئەفریقا بووم پێشنیاری ئەوەم کرد سەردانی خێڵێکی سونەتی بکەین.

(کیپ تاون) و شارە سەرەکیەکانی دیکەی ئەفریقای باشور زۆر تازە و هاوشێوەی شارە ئەوروپیەکان بوون. من دەمویست فەزای ئەفریقا بەو شێوەیە ببینم کە لە تەلەفزیۆنەکاندا پیشان دەدرێت. پیاوانی ڕەشی نێزە بەدەست کە بازنەی گەورە لە گوێ و لوتیانە. ژنانی نیوە ڕووت کە دەموچاو و ڕووخساریان بە خوێنی ئاژەڵ سور کردوە و پەڕی جۆراوجۆری باڵندەیان کردوە بە سەر و گوێلاکیاندا.. و ئەم جۆرە دیمەنانە.

ئەم خواستەم قبوڵ کرا و ڕۆژی دواتر سواری سەیارەیەك بووین و ڕۆیشتین بۆ ناوچەیەکی جەنگەڵی و دارستانی.

لەلای بەریتانیەکانەوە چەند ڕێنوێنیکەرێك و وەرگێڕێکی زمانی ئەفریقیشمان لەگەڵدا نێردرابوو.

سەرئەنجام گەیشتنە خێڵێکی ئەسڵی ناوچەیی کە لەناو کوختێکی دارینی حەساریدا دەژیان. پیاوان و ژنانی خێڵەکە لەکاتێکدا کە بەدەست دەیاندا لە ناو دەمیان و دەنگی سەیرو غەریبیان دەردەکرد و بازنەیەکیان لە دەووری ئێمە کرد.

دیمەنەکە ڕێك ئەو شێوەیە بوو کە من هەمیشە بیرم لێ دەکردەوە. ئارایشی سەیر و غەریب و جوڵە و سەمای سەرسوڕهێنەر.

هەندێك لە ژنەکان گوێی خۆیان کون کردبوو پاشان ڕایانکێشابوون و شتیان کردبوویە گوێیان، هەندێکیان لێوی خوارووبان بڕیی بوو و هەندێکیش دەمووچاویان بە ڕەنگی سپی و سور ڕەنگ کردبوو و (ڕێك وەکو تابلۆکانی کوبیسم!)

پیاوانیش بە پەڕی باڵندەکان توانیبوویان وەکو شۆرت و تەنورەیەکی خڕ دروست بکەن بۆ خۆیان و بەو پەڕانە عەورەتی خۆیان داپۆشی بوو و ئێسقانی دەم و کاکیلەی ئاژەڵیان کردبوو بە خۆیاندا.

ئەهلی خێڵەکە بەپێی ئەو نەریت و عادەتەی کە هەیانبوو لە دەوری ئێمە کۆبوونەوە و بە تەپڵ لێدان و سەماکردنەوە دەستیان کرد بە سوڕانەوە و سەماکردن و ئەنجامدانی جوڵە و حەرەکاتی سەیر و سەمەرە.

لەم کاتەدا، پیاوێک کە لەناوەڕاستی مەراسیمەکەدا بوو و دەموچاوی خۆی شێوەیەکی سەیری لێ کردبوو هاتە پێشەوە و سەرنجی ئێمەی ڕاکێشا و بەرەو کەسێکی دیکە ڕۆشت کە شێوەیەکی جیاوازی لەوانی هەبوو و شتێکی پێوت و لەگەڵیدا کە تاجێکی گەورەی لەسەر بوو کە بە ئێسقانی ئاژەڵ دروستکرابوو و هاتە پێشەوە و ڕێک وەکو کەسێک کە چۆن ئاژەڵێک دەکڕێت و لەکاتی کڕینیدا سەیری دەکات هەندێک سەیرێکی ئێمەی کرد و سوڕایەوە بەدەورماندا و بە دەستی دەیدا لە پشتی سەری و پاشان ڕۆیشتە ناو خەڵکەکەوە و دەستی خۆی بەرز کردەوە. بە بەرزکردنەوەی دەنگی هەموویان بێدەنگ بوون. پاشان هاتە پێشەوە و بە سەرنجدان لەمن وەستا و بە زمانی ناوچەیی خۆیان کۆمەڵێک قسەی کرد. ئەو ورگێڕەشی کە لەلایەن وەزارەتی دەرەوە نێردرابوو وەڵامی دایەوە.

ئێمە هیچ شتێکمان حاڵی نەبوو لەم گفتوگۆیە. بەڵام دەرکەوت کە وەرگێڕەکە و پیاوەکە کە دواتر زانیمانە سەرۆکی خێڵەکەیە نەگەیشتنە ڕێکەوتنێك. چونکە کەم کەم دەنگی هەردووکیان بەرز دەبوویەوە و قسە ئارام و لەسەرخۆکان گۆڕان بۆ قسە و باسی توند و بەرز!

شکۆ ساداتی (هاوڕێم- هاوسەری سەفیری ئێران لە ئەفریقای باشور) دوای کرد لە وەرگێڕەکە تاوەکو پێمان بڵێت چی بووە. بە پێداگیری شکۆ سادات وەرگێڕەکە کە دەیوست بابەتەکە لابدات و پەردە پۆشی بکات و ویستی مەسەلەیەکی دیکە بهێنێتە پێشەوە وتی سەرۆکی خێڵەکە لەم ژنە واتە من خۆشی هاتووە و بە زۆر دەیەوێت هەر ئێستا هاوسەرگیری بکات لەگەڵیدا! (نایەوێت کات بە فیڕۆ بدات!)

واتە حەزی لە من کردوە و دەیەوێت هاوسەرگیریم لەگەڵدا بکات.

منیش بەو تەمەنە پەنجا ساڵیەوە کە بووبوومە جێگەی سەرنجی کەسێك هەرچەندە ئەفریقی و لە خێڵی زولوش بوو خۆشحاڵ بووم و جێگەی سەرنجم بوو.

منیش بەخێرای وتم بە وەرگێڕەکە لەلایەن منەوە سوپاسی سەرۆکی خێڵی زولوەکان بکە!

وەرگێڕەکە بابەتەکەی وت بە سەرۆك و سەرۆکیش زەردەخەنەیەکی کرد. بەهەر شێوەیەك بوو سەرۆك خێڵی ئەفریقیەکانم تێگەیاند کە لەسەر ئەم شەڕی شەیتانە بێتە خوارەوە و واز لەو خوازبێنیە بێنێت.

ئەم مەسەلەیە نەك هەر نەبووە هۆی ناڕەحەتی من و هاوڕێکانم ( جگە لە وەرگێڕەکەی وەزارەتی دەرەوەی ئەفەریقای باشور) بەڵکو یادەوەرێکە هەرگیز لەبیری ناکەم.

لە کۆتاییدا چەند وێنەیەکمان لەگەڵ سەرۆکی خێڵەکەدا گرت و لەکاتی خواحافیزی سەرۆك ڕوونی کردەوە کە زۆربەی ژنە گەشتیارە ئەمریکی و ئەوروپیەکان کە دەێن بۆ ئێرە بە ئارەزووی خۆیان چەند شەوێك لێرە دەمێننەوە و بۆ هاوسەرگیری کاتی لەگەڵ سەرۆك و پیاوانی خێڵەکە و تەنانەت پارەشمان پێ دەدەن و زۆربەی داهاتی ئەم پیاوانەی ئێرە زۆرتری لەسەر ئەم جۆرە کارانەیە!

لە ڕێگەدا، وەرگێڕەکەی وەزارەتی دەرەوە ڕوونی کردەوە لێرە جۆرێك لە توریستی جنسی ژنانە دروست بووە و ژنانی ئەمریکی و بەریتانی و ئەڵمانی و لەوانەشە وڵاتانی دیکەی ئەوروپا بۆ ئە ئەزموونە تایبەتە دێن بۆ ئێرە و لەگەڵ پیاوانی خێڵە ئەفریقیەکاندا بە عادەت و ڕەسمێکی سونەتی هاوسەرگیری دەکەن لەگەڵیاندا.

هەڵبەتە هاوسەرگیریەکە نەك بەو مانایە کە مەراسیمەکە گرێبەستێکی ڕەسمی بێت. بەڵکو لەسەر بنەمای کەلتوری خێڵەکان! (بۆ نمونە لەسەر جەستە و دەموچاویان بەڕەنگی تۆخ هێڵی سەیر و سەمەرە دەکێشن و شاخی بزن و ددانی گورگ دەکەنە ملیان و سەمای خێرا دەکەن بە دەووری ئاگردا...!)

ئێستا مادامەکی قسە هاتە سەر پیاوانی سەیری زولوە و سەرۆکە مێبازەکەیان(!) خراپ نیە کە چەند بیرەوەرێکیش لە پیاوانی سەیری دیکەتان بۆ باس بکەم.

پاش سەردانمان بۆ ئەفریقای باشور ڕۆژێکیان لەسەر بانگهێشتی پارێزگاری ڕودزیا و هاوسەرەکەی ڕۆیشتین بۆ سەردانیان بۆ شوێنی مانەوەیان (ماوەی نێوان ڕودزیا و ئەفریقای باشور کەم بوو)

پارێزگارەکە بەریتانێك بوو بەناوی (یان ئەسمیت) کە هەرگیز ناتوانم شێوە و ڕووخساری لەبیر بکەم.

شێوەی ئەم پیاوە بەشێوەیەکی ئەوەندە سەرسوڕهێنەر سپی و مات بوو. نازانم هەستم چۆن دەربخەم. وابیّ دەچوو ڕووخساری ئەم پیاوە هیچ جۆرە ڕەگێك و هەستێکی ژیانی تێدا نەبوو و لەڕاستیدا لەشێوەی کەسێکی مردوو بوو.

کاتێك تەوقەی لەگەڵدا کردم بە ئاشکرا هەستم بە ساردی جەستەی کرد. وابیّ دەچوو ئەم پیاوە ڕۆحی تێدا نیە بەڵام پیاوێك بوو دەجولاً. وا دەکەوتە بەرچاوم کە (فرانکشتاین) یان دراکولایەکە بەڵام بەبیّ ددانی تیژی گەورەی ژەهراوی!

سەرەتای قسەکردنمان هەواڵی محمد ڕەزای پرسی و پاشان باسی ئەوەی کرد لە سەردەمی ڕاکردنی ڕەزاشا بۆ دوربان ئەو کوڕێکی گەنجی ١٤ساڵی دانیشتوی ئەفریقای باشور بووە و ڕەزاشای بینیوە.

وادیاربوو ئەم قسانەی زیاتر بۆ ئەوە بوو کە خۆشحاڵم بکات.

دواتر، لەبارەی پەیوەندی باشی نێوان ئێران و ڕودزیاوە قسەی کرد. محمد ڕەزا لە هاوڕێیانی (یان ئسمیت) بوو[1].

کاتێك باسی ئەزموونەکانی سەفەرەکە کرا بۆ ئەفریقای باشور و ڕودزیا و سەردانەکانم بۆ ناو خێڵە سور پێستەکان. (یان ئەسمیت) بە ئاشکرا بەبیّ هیچ

---

[1] – (یان ئسمیت) دەسەڵاتدارێکی ڕەگەزپەرست بوو لە ئەفریقا و یەکێك بوو لە ڕەگەزپەرستە زۆر توندڕەوەکان کە هەزاران ڕەشپێستی کوشتبوو.

تاوانەکانی (یان ئسمیت) ئەوەندە ترسناك بوون و بەڕادەیەك نائینسانی بوون کە ڕۆژئاوا و تەنانەت بەریتانیا گەمارۆیان خستە سەر ڕودزیا (زیمبابۆی ئێستا).

لەم کاتەدا محمد ڕەزا فریای ئەم ئسمیتە کەوت و بەناردنی بارەی نەوت ئابوری وێرانی ئەم ڕودزیا (زیمبابۆیەی ئێستای) ڕزگار کرد و حکومەتی ڕەگەزپەرستی ئەفریقای باشوری بۆ ماوەیەك هێشتەوە. محمد ڕەزا یەکێك بوو لە هاوپەیمانە سەرەکیەکانی ڕودزیا و ئەفریقای باشور لە سەردەمی نەژادپەرستیدا.

شەرمێك بێتاقەتی و نیگەرانی خۆی دەربڕی بۆ بوونی ئەو ڕەش پێستانەی کە هەیە و وتی دەوڵەتەکەی هەوڵدەدات لە بەرنامەی درێژماوەدا هانی سپی پێستانی زیاتر بدات بۆ کۆچکردن بۆ ئەم وڵاتە و هاوکات ڕەش پێستەکانیش دەربکەن.

ئەو بە ئاشکرا هەستی نەژادپەرستانەی خۆی دەرخست. و بە دڕندە و کێوی باسی ڕەش پێستە ئەفریقیەکانی کرد.

لەکاتی دیدار و قسەکردن لەگەڵ (یان ئەسمیت) توشی ترس بووم. چاوم حاڵەتێکی بێ ڕۆحی و شێوەیەکی بەستووی لێ هاتبوو.

کاتێك ڕزگارم بوو لە دیدارەکەی. شکۆ (هاوسەری سەفیری ئێران لە ئەفریقای باشور) وتی لێرەدا پیاوانی سپی پێستی ڕگەزپەرست دەڕۆن بۆ ڕاوکردنی پیاوانی ڕەش پێست و بەوشێوەیەی کە عادەتە لەلای ڕاوچیەکان بە داو و تیر و تفەنگ دەکەونە گیانیان و پیاوان و ژنانی ڕەش پێست لە دارستانەکاندا ڕاودەنێن و بە تیربارانیان دەکەن! شکۆ باسی ئەوەی کرد کە چۆن سپی پێستەکان بۆ خۆشی و کات بەسەربردن گەمارۆی کوڵیتە و لادێ زەلیەکانی ڕەشەکان دەدەن و دەیانوستێنن.

دەیوت: سەردەستەی ئەم نەژاد پەرستانە (یان ئەسمیت)ە و خۆی نەك هەر تەنها یەکێکە لە ڕاوچیەکان، بەڵکو بەناوبانگترینیانە! (یان ئەسمیت تەنانەت لە ئەفریقای باشوریش لایەنگری زۆری هەیە لەناو سپی پێستە ڕەگەزپەرستەکاندا، کە زۆرترینیان بەریتانی و ئینگلیزەکانن.)

کاتێك کە شکۆ ئەم بابەتەی باس کرد، ئینجا تێگەیشتم کە بۆچی دەموچاو و شێوەی (یان ئەسمیت) ئەوەندە سارد و بێ ڕۆح و ترسناکە و لەناوچاوانیدا بۆنی مەرگت هەست پێدەکرد.

لە (کیپ تاون) و شارە گەورەکانی ئەفریقای باشور شوێنی هاتوچۆی ڕەشەکان و سپیەکان (تەنانەت لە پادەڕەویەکانیشدا) جیاواز بوو و لە زۆرێك لە شوێنە گشتیەکانیشدا تابلۆ هەڵواسرابوو کە لەسەریان نوسرا بوو (هاتنە ژوورەوەی سەگی ڕەش پێست قەدەغەیە!)

کابرایەکی دیکە کە جێگەی سەرنج بوو بۆم و بیرکردنەوەکانی سەیر بوو بەلامەوە (نیکۆلای چاڤشسکۆ) سەرۆکی کۆماری ڕۆمانیا بوو.

من سەفەریشم کرد بۆ ڕۆمانیا و چائۆشسکوشم لە سەفەرێکی تاراندا بینی بوو.

بە بۆچوونی من (چائۆشسکۆ) پێش ئەوەی ڕێبەری حزبێکی کۆمۆنیستی ڕۆمانی و پیاوێکی بەهێزی ئەورووپای ڕۆژهەلاتی و سەرۆکی کۆماری ڕۆمانیا بێت لادێیەکی ساکار بوو!

ڕۆمانیا ولاتێکی سەوز و چڕە. ژن و پیاوی سپی پێستەوە و هەندێك مەیلە و سورن، سەرگۆناکانیان خوێنیان لێ دەچۆڕا.

(بخارست) پایتەختی ڕۆمانیا بەو بینای سوك و ئاسمانی پاك و سایقەیەی کە هەیبوو، لە هیچ شوێنێکدا نەمبینی بوو.

پیاوان و ژنان، پاش نیوەڕوان، پاش کۆتابی کاری ڕۆژانە، لە پارکەکان و ناوچە سەرسەوزەکانی بەردەم شوقەکاندا کۆدەبوونەوە و دەستیان دەگرت بە کەمەری یەکترەوە و خەریکی سەما و چەپلە لێدان بوون.

هەموو پاشنێوەڕۆیەك لە هەموو کونج و کەلەبەرێکی ئەو شارەوە گۆرانی و ئاواز دەگەیشتە گوێ.

چائۆشسکۆ بە بۆچوونم بە پیاوێك دەهاتە پێش چاوم کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا دەژی و کات وەستاوە بۆی!

پیاوێك بوو بە هیچ شێوەیەك پێشکەوتن و شارستانیەتی ڕۆژئاوای پێ قبول نەبوو.

کاتێك لەگەڵ محمد ڕەزا و فەرەح ڕۆیشتین بۆ بخارست و بووینە میوانی چائۆشسکو بە ئاشکرا هەوڵیدەدا ئامۆژگاری محمد ڕەزا بکات!

لە سەفەرێکیشدا کە خۆی و هاوسەرەکەی هاتن بۆ تاران هەر دووبارە ویستی ئامۆژگاری محمد ڕەزا بکاتەوە و هەمان بابەتی پێشوی دووبارە کردەوە.

محمد ڕەزا باوەڕی وابوو کە ولاتانی بچوك ناتوانن بەبێ دۆستە گەورەکان لەسەر پێی خۆیان بوەستن و پەرە بە خۆیان و ولاتەکەیان بدەن، بەلام چائۆشسکو دەیوت: (ئەوە ولاتە گەورەکانن کە ناتوانن بەبێ تالانکاری ولاتە بچوکەکان بەردەوامی بدەن بە ژیانی خۆیان!)

محمد ڕەزا دوو لە ڕێبەرەکانی جیهانی بە شێت دەزانی و چەندین جار لەکاتی بۆنە جیاوازەکاندا کاتێك کە گفتوگۆی تایبەتیمان دەکرد ئەم بابەتەی لەگەڵ ئێمەدا باس دەکرد.

یەکێکیان عەقید قەزافی ڕێبەری لیبیا و ئەویتریان ئەم چائۆشسکۆیە بوو!

چائۆشسکۆ لە دیدارەکەیدا لەگەڵ محمد ڕەزا وتبووی: (ئێران و وڵاتە خاوەن نەوتیەکانی ڕۆژهەڵات دەبێت یەکێتیەکی بەهێز دروست بکەن و نەوتی خۆیان بە ئازادی دەربهێنن و بەدەستی خۆیان بیفرۆشن)

وتبووی کاتێك ڕۆمانیا تاوەکو پێش جەنگی دووەمی جیهانی وڵاتێکی هەناردەکاری نەوت بوو لە ئەوروپادا کۆمپانیا تاڵانکارەکان، نەوتی ئەم وڵاتەیان تاوەکو دواهەمین بەرمیل نەهێشت و ژینگەیەکی وێران و کاولیان بۆ بەجێهێشتین.

وتبووی: (ئەوروپیەکان نەوتەکەی ئێوە دەکڕن. بەڵام لەبەرامبەریدا ئەوەندە پارەتان دەدەنێ کە بیدەن بە کەلوپەلی دەرهێنانی نەوتەکە و تێچوونی هونەری و پێویستیەکانی چاڵە نەوتەکان و هەندێکی کەمیشتان بۆ بمێنێتەوە و تاوەکو هەندێك خواردنی پێویستی پێ بکڕن و لە برساندا نەمرن تاوەکو بتوانن نەوت دەربهێنن و بیدەن بە ڕۆژئاواییەکان!

ئەو کۆمپانیا ڕۆژئاواییەکانی بە کۆمپانیا بێ بەزییەکان وەسف دەکرد کە نەوت و سەرچاوە کانزاییەکانی وڵاتانی جیهانی سێیەم بە تاڵان دەبەن و لە بەرامبەر ئەم سەرچاوە گرنگانەشدا کەمێك پارە، وەکو خێر دەدەن(!) پارەیەك کە تەنها بەشی دەرهێنانی ئەو سەرچاوانە دەکات!

محمد ڕەزا دەیوت: (ئەم پیاوە شێتە. لەبری ئەوەی کە زیاتر بیر لەوە بکاتەوە پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئێراندا بەهێز بکات زیاتر کاتی خۆی بۆ بانگەشەکردنی دژە ئەوروپی تەرخان دەکات!

لە تاران چائۆشسکۆ لەگەڵ محمد ڕەزا سەردانی کارگەی ئێران ناسیۆنالی کرد کە جۆرە سەیاریەکی بەریتانی دروست دەکرد.

محمد ڕەزا بە لە خۆبایبوون و خۆشحاڵیەوە ئۆتۆمبێلی پەیکان کە تازە یەك دوو ساڵ بوو لە ئێراندا دروست دەکران وەکو یەکێك لە دەستکەوتەکان پیشانی چاڤشسکۆی دابوو.

بەلاّم چاڤشسکۆ وتبووی بە محمد ڕەزا: (ئێوە ئەگەر ئەسپ بەخێو بکەن باشترە لەوەی کە سەیارەی بەریتانی بەسودی ئابوری بەریتانیا پەرەپێبدەن و بیفرۆشن بە خەڵکی خۆتان!)

محمد ڕەزا دەیوت: (ئەم پیاوە بچوکە لادێییە! تەنانەت ئادابی سیاسەتیش نازانێت!)

من دەمزانی هەرچەندە شێوەی بیرکردنەوە و بۆچونی محمد ڕەزا لەگەڵ چاڤشسکۆ وەکو ئاسمان و زەوی بوو، و سەرەڕای ئەوەی کە محمد ڕەزا چاڤشسکۆی بە لادێی و سادە دەزانی و بەدرۆی دەخستەوە، بەلاّم لە دڵەوە ڕێزی لێ دەگرت و قسەکانی، محمد ڕەزای دەبرد بە قولاّی بیرکردنەوەوە!

لەو سەفەرەی ئێمە، کە وەکو دەسەوامی سەفەرەکەی چاڤشسکۆ ڕۆشتین بۆ ڕۆمانیا سەردانێکی جیاواز بوو لە هەمووسەردانەکانی دیکە.

من تاوەکو ئەو کاتە نەڕۆیشتبووم بۆ هیچ ولاّتێکی ئەوروپای ڕۆژهەلاّتی. پێشتر سەردانی ولاّتانی وەکو فەرەنسا و بەریتانیام کردبوو. بەلاّم ڕۆمانیا ژیانێکی دیکەی هەبوو، ئاوازی ژیان بە ئارام بەرچاو دەکەوت. بە پێچەوانەی جادەکانی پاریس و لەندن خەڵکی زۆر بەپەلە لە شۆستەکاندا نەدەهاتن و دەچوون. واپێدەچوو کە مێشکی خەڵکەکەی ئارامتر بوو. ڕووخسارەکان بە ئاشکرا دیاربوو ڕوونتر و شادتر بوون.

ڕێگاکان و قەرەباڵغی شارەکان لە ولاّتانی ڕۆژئاوایی نەدەچوو.

ئاسمان سافتر بەرچاو دەکەوت. درەختەکان سەوزتر بوون. من باسی ئەم بابەتەم کرد لەگەڵ کچەکەمدا.

فەرەح وتی: (هۆکارەکەی ئەوەیە ڕۆمانیا و ولاّتانی دیکەی ئەوروپای ڕۆژهەلاّتی لەڕووی پیشەسازییەوە دواکەوتوون و لەم ولاّتە هێشتا ئابوری لەسەر بنەمای

کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بەڕێوە دەچێت! هەر لەبەر ئەو هۆکارەیە هێشتا ئاو و هەوا پیس نەبووە و ژینگە پاکتر بەرچاو دەکەوێت لەچاو وڵاتانی ڕۆژئاوا.

محمد ڕەزا کە ئاگاداری ئەم قسەکردنەی ئێمە بوو پێی وتم: (نەموت ئەمانە لادێین!)، چائۆشسکو لە بخارست ئێمەی برد بۆ سەردانی کارگەیەکی سەیارە دروستکردن کە جۆرێك لە سەیارەی بچوکی دروست دەکرد.

سەیارەکانی ئەم کارگەیە زۆر بچوك بوون و بە بۆچوونم سەیارەی زۆر دواکەوتوو بوون.

چائۆشسکو کاتێك زانی ئێمە بە چاوێکی سوکەوە سەیری ئەو سەیارانە دەکەین وتی: (ئەم سەیارانە لەچاو سەیارەکانی دیکە مواصفاتی زۆرتریان هەیە و باشترن!)

کاتێکیش زانی ئێمە سەرمان سوڕما لە بیستنی ئەم قسەیە درێژەی پێدا و وتی: (باشیەکەی و مواصەفاتەکەی ئەوەیە ئێمە خۆمان هەموو پارچەکانی دروست دەکەین و بەرهەمی خۆماڵییە!)

شەوانە کارەبای بخارست بەسەرە لە کۆڵانەکاندا دەپچڕا.

ئێمە چەند ڕۆژ لە بخارست بووین بەردەوام کارەبا دەبڕا. چائۆشسکو لەم بارەیەوە وتی: (توانامان بۆ دابینکردنی سوتەمەنی ناوەندەکانی بەرهەمهێنان کەمە، نامانەوێت لە وڵاتانی دەرەوە قەرز وەرگرین و بۆ چەند کاتژمێرێك کارەبای زیاتر قەرزاری جیهان خۆرەکان و جیهانویستەکان بین!)

ئیدی تێگەیشتم بۆچی محمد ڕەزا ئەم پیاوە بە شێت دەزانێت. ئەو زۆرێك لە وڵاتانی ڕۆژئاوای بە داگیرکراو دەزانی!

چائۆشسکو دەیوت: (وڵاتانی ئەوروپاش داگیرکراون. داگیرکراوی سەرمایەدارانی جولەکەکان و کۆمپانیا گەورەکانن!)

چائۆشسکو بەشێوەیەکی زۆر سەیر بەدبین بوو بەرامبەر بە ڕۆژئاواییەکان. ڕۆژئاوای بە خاڵی لە چاکەکاری ئەخلاقی و بەها مرۆڤایەتیەکان دەزانی.

تێگەیشتم کە بۆچوونەکانی محمد ڕەزا بەدبینانە نیە و ئەم پیاوە توشی نەخۆشی بەدبینی بووە[1]!

لە ڕۆمانیا گفتوگۆی توند لەنێوان محمد ڕەزا و چائۆشسکۆ، تەنانەت لە کاتی گەڕان و پیاسکە کردن لە شوێنی مانەوەشمان دروست دەبوو. بەڵام ئەم مەسەلانە نەبوونە هۆی ئەوەی کە خۆشیەکەمان لێ تێکبچێت.

میوانداری لە کۆشکی میوانیە بیانیەکان لە بخارست وەکو میوانداریکردنی کۆشکەکانی باکینگهامی لەندەن و کۆشکی ڤێرسای پاریس شکۆمەندانە و تەشریفاتی نەبوو. بەڵام جۆری خواردنەکانیان خۆشتر و بەچێژتر بوو.

مۆسیقا و ئاهەنگیشیان دڵنشینتر بوو لە مۆزیکی ڕۆژئاوایی.

هەڵبەتە لەنێوان ئەم هەموو بوارانەدا لە نێوان من و محمد ڕەزا و فەرەحیشدا جیاوازی هەبوو لەنێوان سەلیقە و حەزەکاندا، لەبەرئەوەی کە من زیاتر خەڵکی لادێ بووم و وەکو فەرەح و محمد ڕەزا لە ڕۆژئاوادا نەژیابووم و زۆر کاریگەر نەبووم بە فەرهەنگی ڕۆژئاوایی و زیاتر حەز و سەلیقەم لەگەڵ چائۆشسکۆ نزیکتر بوو!

هاوسەرەکەی ژنێکی ئاسایی و زۆریش جوان نەبوو.

لەو میوانیە ڕەسمیەی کە لە بخارست ئەنجامدرا چائۆشسکۆ تەنها لەگەڵ هاوسەرەکەی خۆی یەکجار سەمای کرد و داواشی نەکرد لە ژنەکانی دیکە سەمایان لەگەڵدا بکات! لەکاتێکدا لە ڕۆژئاوا عادەت وایە کە لەگەڵ ژنەکانی یەکتریدا سەما دەکەن! من وابیرم دەکردەوە ئەگەر ئێستا لە پاریس، لەندن یان واشنتۆن بوونایە فەرەحیش ناچار بوو لەگەڵ ڕێبەرەکانی ئەو وڵاتانەدا سەما بکات و تەنانەت ماچیشیان بداتێ[2]!

---

[1] —محمد ڕەزا هەرکەسێك پیاوی ڕۆژئاوا نەبوایە و وەکو ڕۆژئاوا بیری نەکردایەتەوە بە دواکەوتووی دەزانی، بە بۆچوونی محمد ڕەزا دەبوو وڵاتە بچوکەکان پشت بە وڵاتە زلهێزەکان ببەستن. بەڵام ڕۆمانیا تاوەکو ١٩٩٤ واتە تاوەکو ئەو کاتەی کە چائۆشسکۆ سەرۆکایەتی ئەو وڵاتەی دەکرد یەك دۆلار قەرزی دەرەکی بەلاوە نەبوو، بەڵام پاش ئەو ماوەیە کە ئەو حکومەتە ڕووخا، بە ماوەیەکی زۆر کورت دوای چەندساڵێك ئەو وڵاتە بوو بە گەورەترین وڵاتی قەرزداری ئەورووپا.

لەبەر ئەوەی کە من خەسوی شا بووم، ئەم خسوبوونە سنورداریکی زۆری بۆ دروستکردبووم، بەلآم باشی و ئیمتیازی زۆریشیم هەبوو بۆ نمونە یەکێك لەو ئیمتیازانە ئەم سەفەرانەی دەرەوە بوو.

هەڵبەتە سەفەرکردن لە سەدەی بیستەمدا بە شتێکی ئاسای دادەنرێت و هەموو ڕۆژێك ملیۆنەها کەس لەنێوان وڵاتە جیاوازەکاندا سەفەر دەکەن و فڕۆکە زەبەلاحەکان وەکو مراوی بە ئاسماندا دێن و دەڕۆن لەنێوان وڵاتە جیاوازەکانی جیهاندا و خەڵکێکی زۆر لە بازرگان و گەشتیار بۆ سەفەر و سیاحەت و ئیش و کار لە هاتوچۆدان.

بەلآم سەفەرکردن وەکو کەسایەتێکی بەرجەستە و دیار جیاوازە چونکە خاوەنی چەند ئیمتیازێکی تایبەتیت.

من لەهەموو ئەو ماوەیەی کە ئەندامی خێزانی سەڵتەنەتی بووم جەوازی سیاسیم بەکار دەهێنا. ئەم جەوازەش دبووە هۆی ئەوەی لە فڕۆکەخانەکاندا بەبێ لێکۆڵینەوە و پشکنینی جامتا و کەلوپەلەکان بێم و بڕۆم[1]

کاتێك دەڕۆیشتم بۆ هەر شار و وڵاتێك سەیارەی تەشریفاتی سەفارەتی ئێران یان وەزارەتی دەرەوەی ئەو وڵاتە بە وەرگێڕ و پاسەوانەوە چاوەڕوانم بوون.

لە باشترین و ڕازاوەترین شوێنەکاندا دەمامەوە و بەڕاستی لەو پەڕی ئارامی و خۆشگوزەرانی بێ سنوردابووم

---

[1] — ئەندامانی خێزانی شا و فەرەح لەبەر ئەوەی کە بە جەوازی تایبەتی سیاسی دەهاتن و دەچوون، لە هەموو پشکنینەکانی فڕۆکەخانەکانی جیهاندا ئازاد بوون، هەر لەبەر ئەوە کۆمەڵێك لە ئەندامەکانی ئەو خێزانە خەریکی قاچاغچییەتی مادەی بێهۆشکەر و کەلوپەلی گرانبەها و شتی قەدەغەکراو بوون.

بۆنمونە ئەشرەف پەهلەوی لە فڕۆکەخانەی جنێف لە ناو کەلوپەل و جامتاکانیدا ڕێژەیەکی زۆر هێرۆین و کۆکایین دۆزرایەوە ئەمەش ئابڕوچونێکی گەورەی بەدوای خۆیدا هێنا بۆبنەماڵەی پەهلەوی. (بۆ ئەم بابەتە سەیری بلآوکراوە جیهانیەکان بکە بەتایبەتی بلآوکراوە فەرەنسیەکانی ئۆکتۆبەری ١٩٧٤).

بەلام هەموو ئەم شتانە منیان خۆشحاڵ نەدەکرد. حەزم دەکرد پیاوەکەم، سوهراب، زیندوو بوایە و هەر لەو ماڵە بچوکەی ڕەشت یان لە ماڵی دایکی لە تەبریز ژیانێکی بچوك و سنوردار و ئاساییمان هەبوایە.

بە باوەڕی من، بۆ هەموو ژنێك باشترین خۆشبەختی و خۆشترین ژیان ئەو ژیانەیە کە لە پاڵ پیاوەکەی و منداڵەکانیدا دەیباتە سەر.

من هەرگیز خۆم بەخۆشحاڵتر و بەختەوەرتر نەدەزانی لە ژنێکی زۆر سادە و ئاسای کە خاوەنی ژیانێکی سادە بێت لە گەڵ پیاوەکەی و منداڵەکانی.

هەموو تەشریفاتێك بۆ من ئامادەبوو بەلام گرفتی گەورەم لەناو ئەم تەشریفاتانە بوو، چونکە کەم کەم پەیوەندی من لەگەڵ زاواکەم، کچەکەم و نەوەکانیشم خەریکبوو دەبووە لایەنێکی تەشریفاتی!

تەشریفات و ڕەسمیات بووە هۆی ئەوەی ئەو پەیوەندی ئینسانیەی کە لە ناو قوڵای گیانی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێت بێ ڕەنگ و بێ مانا بێت.

گرفتی ژیانی تەشریفاتی و ڕەسمیات ئەوەیە مرۆڤ دەبێت تەنانەت حساب بۆ پێکەنینیشی بکات و لە زۆرێك لە کات و شوێنەکاندا هەستی مرۆڤی خۆت سەرکوت بکەیت و یان هەموو شتێك سەربەرەوخوار و بە پێچەوانە پیشان بدەیت....... بەو شێوەیەی کە ئەوانی دیکە دەیانەوێت.



مندالّی فەرەح پەهلەوی



مندالّی فەرەح پەهلەوی



فەرەح و کوڕە خالّەکەی (ڕەزا قطبی)



لەسەرنەمی خوێندکاریدا ژمارەی (١٠) فەرەحە



تەمەنی گەنجی فەرەح



فەرەح لەیەکێك لەسەردانەکانیدا




"فەرەح" و "چوئێن لای "سەرۆك وەزیرانی پێشووی چین



سورەیا و محمد ڕەزا و نیکسۆن سەرۆکی ئەمریکا



محمد ڕەزا و فەرەح
لەگەڵ شاژنی بەریتانیا و
هاوسەرەکەی



محمد ڕەزا و فەرەح وێنەی خێزانی)

فەرەح لەیەکێك لەسەردانەکانیدا




شابانو فەرەح پەهلەوی لە ئاوارەیی دا

# کەسەکان و کەسایەتیەکان

بڵاوکەرەوە ئینگلیزەکان، کە مەبەستی بڵاوکردنەوەی (یاداشتەکانی) منیان هەیە، داوایان لێ کردم باسێکی ئەو کەسە ناسراو و شەخسیەتە سیاسی و سەربازیانەش بکەم کە دەمناسین و هەوڵبدەم یادەوەریەکانم لەبارەی ئەو کەسانەوە خەمە سەر کاغەز[1].

سەرەتا باوەڕم نەدەکرد ئەم کارە قورس بێت.

هەمووکەس لە ژیانیدا هاوڕێ و ناسراو و خزمی هەیە کە لەگەڵ ئەوانەدا لەدایك دەبێت و دەژی و ژیان بەسەر دەبات و لەم کەسانەش لە دوور و نزیکەوە بیرەوەری خۆش و ناخۆشی هەیە و کۆمەڵێك شتی بۆ بەجێدەمێنێت.

من چۆن دەتوانم لەبارەی ئەم کەسانەوە کۆمەڵێك بابەت بنوسم کە لەوانەیە وێنەی ئەوان لەلای خەڵکی گشتی هەڵبگەڕێتەوە و شتەکان پێچەوانە ببنەوە؟ یان باسی کۆمەڵە پرس و مەسەلەیەك بکەم کە لەوانەیە ببێتە هۆی ڕسوابوونی کۆمەڵێك لەو کەسانە؟

هەر بۆیە دەمەوێت بە ڕاستگۆی و بەوپەڕی ڕاشکاوانە بڵێم لەم بەشەی یاداشتەکەمدا کە باسی حەقیقەتی ڕاستی و ژیانی کۆمەڵێك کەس دەکات، خۆم بەدوور گرتووە لەبارەی وتنی حەقیقەتی ڕاستی هەندێك لە کەسایەتیەکان و زۆرێك لە

---

[1] -ئەم بڵاوکەرەوانە بەریتانی نین، بەڵکو ئێرانی نیشتەجێی بەریتانیان کە تاوەکو ئێستاش کتێبی زۆریان لەبارەی شۆڕش ئیسلامی ئێران و یاداشتەکانی پیاوەکانی ڕژێمی پێشوویان چاپ و بڵاوکردوەتەوە.

ئەندامانی خێزانی هاوڕێکانم و ناسراوەکانم، و بەشێك لە باس و خواست هەیە بەتەواوی پشتگوێم خستوە و هیچ ئامارژەیەکم بۆ نەکردون. ڕێگەم بدەن بۆ ئەوەی نهێنیەکانیان بە نەوتراوی بمێنێتەوە و بۆ هەمیشەش ئەو نهێنیانە بسپێردرێن بە تاریکخانەی مێژوو!

لەناو هاوڕێکان و ناسراوەکان و کەسانی ناو خێزانەکان هەمیشە کۆمەڵێکیان کاریگەرترن، مرۆڤ زیاتر گرنگی و خۆشەویستی و پەیوەندی لەگەڵ ئەواندا هەیە. ئەم گرنگیدان و پەیوەستبونەش پەیوەندی بە نزیکی و ڕادەی خزمایەتی ئەو کەسەوە نیە. هەندێکجار مرۆڤ لەگەڵ نزیکترین کەسی ئەندامی خێزانەکەی دنیایەك دووری و ماوە هەیە لەنێوانیاندا. هەندێکجاریش هاوڕێیەکی ئاسای کە زۆریش لە خزمایەتیەوە دوورە بەلاّم هەستێکی تەواو نزیکایەتی دەکەیت لەگەڵی.

ئەمە ئەزموونی شەخسی خۆمە و نازانم ڕاستە یان تەنها دەرئەنجامی بیرکردنەوەی شەخسی خۆمە.

وادەزانم مرۆڤ خاوەنی کۆمەڵە هەست و سۆزێکە کە زۆرجار هاوشێوەی ئەو هەست و سۆزەی لەناو بوونی مرۆڤێکی دیکەدا پەیدا دەبێت و نزیك دەبیتەوە لەگەڵ ئەوکەسدا. ئەگەر ئەوکەسەی بەرامبەرت خاوەنی هەست و سۆزێکی جیاوازتر بێت ئەو کەسە خۆی دوور دەکەوێتەوە و نزیکبوونی ڕاستەقینە دروست نابێت.

بەمانایەکی دیکە هەرچی خاڵی هاوبەشی ئەخلاقی و ڕۆحی لەنێوان دووکەسدا زیاتر بێت دەبێتە هۆی نزیکیان و هەرچی کەمتریش بێت دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەیان.

منیش لەم یاسایە بەدەر نەبووم. لەناو ئەندامانی خێزانی پەهلەویدا لەگەڵ هەندێکیاندا هەستم بە نزیکی و لەگەڵ هەندێکیشیان هەستم بە دووری دەکرد و زۆرجاریش ئازارم دەچێژا بەدەستیانەوە.

لەناو ئەو کەسایەتیە سیاسی و سەربازی و شەخسیەتانەی دیکەش کە لەبەر هەر هۆکارێك هەبوایە پەیوەندیان لەگەڵ ئێمەدا هەبوایە هەستم بەو لایەنانە دەکرد کە ئاماژەم پێکرد.

بۆ نمونە و بە ڕاستگۆیی بیڵێم هەرچەندە محمد ڕەزا زاوای من بوو و زۆریش ڕێزی لێ دەگرتم، بەڵام هیچ جۆرە هەستێکی تایبەتی و کەسایەتی و سۆزداریم لەگەڵیدا نەبوو.

هەڵبەتە لەبەرئەوەی کە زاوام بوو خۆشمدەویست. بەڵام ئەم خۆشویستنە شتێکی تایبەت نەبوو.

لەوانەیە کەسێك خواردنەوەی شیرینی پێ خۆش بێت. خواردنی پەنیریشی پێ خۆش بێت. مەلەکردنیشی خۆش بوێت. زاواکەشی خۆش بوێت.

ئەمە جیاوازە لەوەی کە کەسێك زاواکەی وەکو کوڕەکەی خۆش بووێت و هەروەکو کوڕی خۆیشی سەیری بکات.

من حسین صادقی، کە کوڕی سایقەکەی شا (ئەصغەر ئەمیر صادقی) بوو، زۆر لە محمد ڕەزای زاوام خۆشترم دەویست[1].

هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جۆرێك لە کەسایەتی ئەو کەسانەی کە بەدرێژای ئەو ماوەیەی کە نەش و نمای کردوە و جەستە و ڕۆحی پێکهێناوە لەناویدا.

مرۆڤەکان لە هەر ژینگەیەکدا گەورە ببن خلق و خۆی ئەو ژینگەیە دەگرن کە لەناویدا گەورەبوون. من بێ ڕادە بەداخم بۆ لەناوچوونی دەسەڵاتی سەڵتەنەتی پەهلەوی لە ئێران و چەندینجاریش بۆ ئەم کەوتنە گریاوم.

داخ و بێتاقەتی من بۆ ئەوە نیە کە ئیتمیازەکانی ژیانی شاهانەم لەدەستداوە. داخ و بێتاقەتیم بۆ ئەوەیە کە سەڵتەنەتی پەهلەوی خاڵی کۆتایی مێژووی ڕژێمی دێرین و کۆنی ئێران بوو. ئەو شتەی کە لە بیرەوەری مێژوودا ناسڕێتەوە.

من باوەڕم وایە ڕەزاشا بەو لێهاتوییەی کە هەیبوو لەوەی کە توانی خۆی لە پلەیەکی سەربازی سادەوە بگەیەنێتە ئەو پلە بەرزەی پاشایەتی، بەو ڕادەیە توانای

---

[1] —هۆکاری ئەو خۆشویستنە ئەوەیە کە پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی و بەجێمانی کۆمەڵێك لە ئەندامانی حکومەتی سەڵتەنەتی لە ئێران، حسین ئەمیر صادقی کە نیشتەجێی لەندەن بوو بەهۆی ئەو پەیوەندیەی کە لە ئێران هەیبوو سەکەوتووبوو بەوەی کۆمەڵێك لەو کەسانەی کە گیریان خواردبوو و بەجێمابوون لە ئێران کە هەندێکیشیان خزمی خێزانی دیبا بوون بە قاچاخی بیانباتە دەرەوەی ئێران و ڕزگاریان بکات لە دادگاییکردنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران!

ناسینی کۆمەڵگەکەی خۆی نەبوو. ڕەزاشا نەدەبوو منداڵەکەی خۆی بۆ خوێندن بنێرێت بۆ سویسرا و بەشێوەیە بە پەروەردەی ڕۆژئاوایی گەورەی بکات.

محمد ڕەزا بە منداڵی لەژێر دەستی (مادام ئەرفەع)دا پەروەردە بوو کە ژنێکی فەرەنسی بوو و سەردەمی هەرزەکاری و گەنجیشی لە ژێر پەروەردەی ڕاهێنەرە ڕۆژئاوایەکاندا گوزەراند.

ئەش و نماکردن لە ژینگەیەکی ڕۆژئاوای و خووگرتن بە فەرهەنگی ڕۆژئاواییەوە بووە هۆی ئەوەی نەتوانێت لەگەڵ خەڵکی ئێراندا تێکەڵی دروستبکات و لە کێشە و گرفتەکانیان تێ بگات.

کاتێك لە ساڵی ١٩٧٨ پاش دەرچوونمان لە ئێرانەوە ڕۆیشتین بۆ مەراکیش. محمد ڕەزا وتی: (من نازانم بۆچی خەڵکی مەراکیش کە زۆر مسوڵمانتر و پەیوەستن بە دینەوە لە ئێرانیەکان کەچی (سوڵتان حسن)یان دەوێت و لەدژی ڕاپەڕین و شۆڕش ناکەن؟

محمد ڕەزا ناوی هەریەکە لە پاشاکانی سعودیە و ئەردەن و مەراکیش و پاشا و فەرمانڕەواکانی دیکەی وڵاتانی ئیسلامی دەبرد و خۆی بەراورد دەکرد لەگەڵ ئەوانەدا و باسی ئەوەی دەکرد سەرەڕای ئەو ئازادی و خۆشیەی کە من فەراهەم هێنابوو بۆ خەڵکەکەم کەچی ئێرانیەکان لەدژم هەستان.

لەو هەلومەرجەدا کە محمد ڕەزا دەینالاند بەدەست نەخۆشی شێرەپەنجەوە و لە دەرەوەش لێدانێکی گەورەی ڕۆحی بەرکەوتبوو نەمدەتوانی بۆچوونی ڕاشکاوانەی خۆمی بۆ بخەمەڕوو و دەمویست بە قسەی هیوابەخشانە وەرەی پێ ببەخشم. بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە لایەنی خەتاباری سەرەکی بریتیی بوو لە پەروەدەکردنی هەڵەی محمد ڕەزا لەلایەن باوکیەوە.

ڕەزاشا بە ناردنی محمد ڕەزا بۆ کۆلێژی سویسری لوروژە ئاینەدەی محمد ڕەزا و سەڵتەنەتی پەهلەوی تێکدا. ڕەزاشا کوڕەکەی بەشێوەیەك ئاشنا کرد بە ژیان و بنەما ئازادیگەراییەکانی ڕۆژئاوای کە محمد ڕەزا لەژێر پەروەردەی ڕاهێنەرە ڕۆژئاواییەکان گۆڕا بۆ کەسایەتێك کە بەکەڵکی خەڵکی ڕۆژئاوا دەهات، نەك خەڵکی وڵاتێکی ڕۆژهەڵاتی بە بیروباوەڕێکی سونەتی و بنەمایەکی قوڵی ئاینی و مەزهەبی.

به باوەڕی من ئەگەر ڕەزاشا کوڕەکەی لە بری خوێندن لە سویسرا بناردایە بۆ حەوزەی زانستی لە قوم یان مەشهەد، ئەوکات محمد ڕەزا دەیتوانی ببێتە کەسێکی ڕۆحانی گەورە و هاوکات هەم سەڵتەنەت و هەمیش جڵەوی ئاینی و مەزهەبی خەڵکی ئێرانی دەگرتە دەست.

لە سعودیەش بارودۆخەکە بەم جۆرەیە و پاشای سعودیە کلیلدار و (خادم الحرمین شرفین)ە. لە مەراکیشیش سوڵتان حسنیش ئەم پێگەیەی هەبوو، کە نەک هەر پاشا بەڵکو بە خەلیفەی مسوڵمانانی مەراکیش حساب دەکرا! بەڵام لەبەر ئەوەی کە محمد خۆی حەزی لە شێواز و جۆری ژیانی ڕۆژئاوایی بوو، هەوڵیشدەدا خەڵکی ئێران ئاشنا و تێکەڵی شێوە و ڕووخساری ژیانی ئەوروپی بکات و واز لە بیروباوەڕی کۆن و دواکەوتوو بهێنن.

هەنگاوەکانی بۆ پێدانی ئازادی بە ژنان و دابەشکردنی زەویە وەقفیەکانی گوندەکان بەسەر جوتیارەکاندا بووە هۆی توڕەبوون و بێزاری زۆرێک لە مەلاکان و کاتێك لە ساڵی ١٩٦٣ خەڵکی ڕژانە سەر جادەکان و لە دژی محمد ڕەزا و سەڵتەنەتی پەهلەوی هۆتافی توندیان دەدا محمد ڕەزا لەبری ئەوەی چاکەسازی لەخۆیدا بکات و چاوێك بخشێنێتەوە بەو بڕیارانەی کە داویەتی کەچی ئەوەندەی دیکە سور بوو لەسەر ئەوەی ئێران بەرەو فراوانی و پێشکەوتنی ڕۆژئاوایی بەرێت، بەرەو ئەو شتەی کە خۆی بە (دەروازەی شارستانیەتی گەورە) ناوی دەبرد!

من لێرەدا دەمەوێت ڕاستێکی گەورە و ئازایانە باس بکەم. محمد ڕەزا زۆر گرنگی بە بۆچوونی گشتی و ڕای زۆرینە نەدەدا. ئەو دەیوت: (زۆرینەی خەڵکی یان خەڵکی گشتی وەکو کەرەسەیەکی خاو و سەرەتایین، حکومەت دەتوانێت بەهەر شێوەیەك کە بیەوێت بەکاریان بهێنێت).

کاتێك لە ڕێپێوانی بۆنەی شەشی فێبریوەری (ساڵیادی شۆڕشی سپی) خەڵکی لە سەرجادەکاندا بەڕیز دەڕۆیشتن و لە بەرژەوەندی محمد ڕەزادا هۆتافیان دەدا، محمد ڕەزا ئەم خۆپیشاندانەی بە نیشانەیەك لە پارێزگاری فراوانی خەڵکی دەزانی بۆ خۆی و وەکو شایەتێك دەیهێنایەوە بۆ بانگەشەکەی. ئەو بانگەشەیەی کە باوەڕی وابوو

حکومەت دەتوانێت خەڵکی گشتی و ئاپۆرەی خەڵکی پێکبهێنێت و بەکاری بهێنێت بۆ مەبەستی خۆی!

من و فەرەح هەمیشە ئەوەمان بیر دەخستەوە کە ئەو خەڵکانەی کە هاتوونەتە سەر جادە کەسانی سەربازی و خێزانەکانیان و ئەندامانی حزبی ئێران نوین و حزبی مردم و بەشێوەیەکی گشتی ئەو کەسانەن کە لایەنگری حکومەتن و دەوڵەت خۆی هێناونی بۆ سەر جادە.

تەنانەت جارێکیان کە فەرەح بێتاقەت بووبوو لەو سادە بیرکردنەوەی محمد ڕەزا، ئەوەی بیری محمد ڕەزا خستەوە کە ئەم خەڵکانە ئەو کەسانەن کە لە پانزەی مەی هێرشیان کردە سەر دەزگا حکومیەکان. بەڵام محمد ڕەزا خۆی هەڵدەخەڵەتاند و باوەڕی وابوو بیرکردنەوەی خەڵکی گۆڕاوە و دەیوت خەڵکی ئێستا دەزانێت حکومەت خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی بۆ فەراهەم هێناون!

من حەز ناکەم محمد ڕەزا بە هۆکاری هەرەسهێنانی سەڵتەنەتی پەهلەوی بناسێنم. بێ گومان لە هەرەسهێنانی سولالەی پەهلەویدا هۆکار و فاکتەری زۆر هەبوون کە بەدرێژای نزیکەی بیست ساڵی ڕابردوو سەدان جەڵد کتێب لەلایەن سیاسەتمەنداران، لێکۆڵەرەوەکان و مێژوونوسانەوە هۆکاری ئەم هەرەسهێنانە نوسراوە و بەتایبەتی ڕۆژنامەنوسان توانیویانە کۆمەڵێك لەو دەستانە ئاشکرا بکەن کە دەستیان خستبوویە ناو کاروباری دەوڵەتەوە چ لە ئێرانی سەردەمی پەهلەوی و چ لە ئەمریکا و ئەورووپا و هەرکەسێك کە لە دوورونزیکەوە دەستی لەو ئاگرەدا هەبووبێت.

یەکێك لە هۆکارە گرنگ و لەوانەشە گرنگترینیان بووبێت بوونی کەسانی ناشایستە و گەندەڵ بوو لە ناو دەزگا هەستیار و گرنگەکانی دەوڵەتدا.

محمد ڕەزا وەکو شای وڵات، بەپێی بنەمای یاسا بنەڕەتی وڵات، کەسێك بوو هیچ بەرپرسیارەتێکی نەبوو!

بەرپرسیاریەتی بەپێی یاسای بنەڕەتی دابەش بووبوو بەسەر سێ هێزی بنەڕەتیدا و بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتیش بەپێی یاسا لە ئەستۆی هێزی بەڕێوەبردندا بوو.

کاتێك کە کێشەکانی وڵات پەرەیانسەند و فراوان بوون، بەرپرسە ناشایستەکان بە زیرەکی و لێهاتویی محمد ڕەزایان بە بەرپرسی کاروبارەکان نیشاندا و ئەو بڕوایەیان لەلای خەڵکی دروستکرد کە هەموو کێشە و هەڵەکان لە گەردنی شادایە!

بەڵام ئەم کەسە ناشایستانە، ماستاوچی و سوك و بێ بایەخانە کە تاوەکو قوڵای ناو هێزی (شا)ش دەسەڵاتیان پەیدا کردبوو کێ بوون؟

پێشتر وتم، بەداخەوە محمد ڕەزا لەسەر بنەمای بیرکردنەوەیەکی هەڵە، زۆر گرنگی نەدەدا بە خەڵکی گشتی، ئەو خەڵکانەی بە نەزان و عەوام ناودەبرد و دەیوت: (ئەو خەڵکە وەکو قوڕی سەناعە وایە دەوڵەت بەهەرشێوەیەك بیەوێت دەتوانێت سودیان لێ وەرگرێت!)

لەبەرامبەر ئەم بیرکردنەوە سادە و ساویلکانە، کە گرنگی بە زۆرینەی خەڵکی گشتی نەدەدا، گرنگێکی تایبەتی بە (کەسانێکی دیاری کراو دەدا)، کە زۆرجار دەگەیشتە ڕادەیەك کە چاوپۆشی لێ دەکردن لە کۆمەڵێك هەڵەی گەورە و قبوڵ نەکراو.

من لە کاتی هاوسەرگیری فەرەحەوە لەگەڵ محمد ڕەزا شایەتی ئەوە بووم کە چۆن ڕۆژ بە ڕۆژ شا ژمارەی دەوروبەرەکانی زۆرتر دەبوون بەچەشنێك کە کەوتبوویە ناو گەمارۆی کۆشکیەکان، پیاوانی سیاسی و بازرگانانی پاشکۆ و کەسانی سەربازی ماستاوچیەوە.

لاوازێکی دیکەی محمد ڕەزا و گەورەترین خاڵی لاوازی، ئەوە بوو کە خۆی بە کامڵ و عاقڵێکی تەواو دەزانی و ڕێگەی نەدەدا هیچکەس ڕێگەیەکی بۆ دابنێت و یارمەتێکی بدات!

من یەك دووجار وەکو خەسویەك و دایکی خێزانەکەی لە ڕوانگەیەکی دڵسۆزانەوە هەوڵمدا ئاگاداری بکەمەوە لەو هەموو ماستاوچی و مامەحەمەچیانەی دەوروبەری. بەڵام بەپێچەوانەوە تێگەیشتم ئەگەر بمەوێت ڕێزم بمێنێت دەبێت بەهیچ شێوەیەك دەستوەرنەدەمە کاروبارەکانیەوە و بەوشێوەیە بێت کە خۆی بیری لێ دەکاتەوە.

محمد ڕەزا هیچکەسی قبوڵ نەبوو و ماستاوچیەکان و دەست و پێوەندە فێڵبازەکەی ئەوەندە ئەویان بە عاقڵێکی تەوا و پیاوێکی کامڵ و جیاواز دەزانی کە

خۆیشی کەم کەم گەیشتبوویە ئەو باوەڕەی کە خاوەنی (پەیامێکی) تایبەتی و جیاوازە لەلایەن دەسەلأتێکی نەناسراوەوە!

ئەم پێشەکیە کورتەم بە هۆشیاریەوە باس کرد تاوەکو ئەو کەسانەی کە بەدرێژای ساڵەکانی حکومەتی محمد ڕەزا، خەڵکی ناوی بیستوون یان وێنەیان لە چاپەمەنی و تەلەفزیۆنەکاندا بڵاوبووەتەوە. ڕۆڵیان لە هەرەسهێنانی سەڵتەنەتی پەهلەویدا ئاشکرا بکەم.

من زانیاریم لەبارەی وابەستەبوونی ئەو کەسانەوە نیە کە سەر بە دەزگا نهێنیەکانی ڕۆژئاوا بوون. وەکو (ژەنراڵ حسین فردوست) سەرۆکی لێکۆڵینەوەی شانهشاهی یان لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتیە هاوشێوەکانی دیکە تاوەکو دەستم بگاتە زانیاری نهێنی و بزانم کە فلأنە ژەنراڵ یان فلأنە وەزیر و وەکیل وەزیر وابەستەی سۆڤیەت، ئەمریکا، بەریتانیا یان فەرەنسا و هیتد بوون.

بەلأم بەدرێژای ئەو سالأنەی ژیانم لە کۆشکدا وەکو نزیکترین کەس لە کچەکەم، شابانوی ئێران و شای ئێران، کەسانێکی زۆر فراوانم بینی لەو کەسایەتیە جۆراوجۆرانەی کە دەهاتن بۆ کۆشك و هاتوچۆیان هەبوو، بۆیە حەز ئەکەم بەپێی ئەوەی کە لەبیرمە لەبارەی ئەو کەسایەتی و شەخسیەتانەوە بدوێم و بڕیار و دادوەری کۆتاییش بەجێبهێڵم بۆ خوێنەرانی ئەم یاداشتە.

ڕێگەم بدە سەرەتا لە خودی ئەندامانی خێزانی سەڵتەنەتیەوە دەستپێبکەم.

هەمووکەس دەزانێت کە لە حکومەتەکەی (دکتۆر محمد مصدق) هەندێك لە ئەندامانی خێزانی پەهلەوی و پێش هەمووشیان، جەنابی خاتو ئەشرەف پەهلەوی، تاوانبار بوون بە گەندڵی دارایی و سیاسی.

لەماوەی سەروبەندی شۆڕشی ١٩٧٨ لە حکمەتەکەی جەنابی (شەریف ئیمامی)ش ئەم پرسە دووبارە بوویەوە و سەرئەنجام محمد ڕەزا فەرمانێکی شاهانەی دەرکرد کە بەپێی ئەو فەرمانە بۆ هیچ ئەندامێکی خێزانی سەڵتەنەتی نەبوو کە دەستوەربداتە کاروباری ئابوریەوە.

ئێستا دەمەوێت ئازایانە بیڵێم کە هەندێك لە ئەندامانی خێزانەکەی محمد ڕەزا زۆرترین پشکیان لە هەرەسهێنانی سەڵتەنەتی پەهلەویدا هەبوو.

من سەرم سوڕدەما کاتێك کە دەمبینی چۆن هەندێك لە خوشك و براکانی محمد ڕەزا ڕەچاوی ناوی پەهلەوی و بنەماڵەکەیان نەدەپاراست و ئاگادار نەدەبوون کە ئەو هەڵسوکەوتە خراپانەیان دەبێتە هۆی بەدبینی خەڵکی لەمەڕ سەڵتەنەتی پەهلەوی.

لەبارەی جەنای خاتو ئەشرەف تاوەکو ئێستا بابەتی ناڕەوای زۆر بڵاوکراوەتەوە. من پشتگیری هەموو ئەم بابەتانە ناکەم بەڵام سەبارەت بە هەڵسوکەوتی بەشێوەیەکی گشتی ڕەخنەی زۆرم هەیە.

ئەشرەف ژنێکی شکستخواردو بوو لە ژیانی شەخسی و خاوەنی ناکامێکی زۆر بوو. بەڵام بەداخەوە زۆرجار مێژوونوسەکان و نوسەری کتێبەکانی پەهلەوی تەلاقە یەك لەدوای یەکەکان و هاوسەرگیریەکانی دەگەڕێننەوە بۆ مەسەلەی حەزە سێکسی و جنسیەکانی.

ئەمە ڕاست نیە کە لەو ڕوانگەیەوە ڕەخنە بگیرێت لە ئەشرەف لەبارەی ئەو تەڵاق وەرگرتن و دووبارە شوکردنانەیەوە. چونکە هاوسەرگیری و جیابوونەوە حەقی یاسای هەر ژن و پیاوێکە کە حەزی لێ دەکات.

هەروەها ناتوانرێت سەرکۆنە بکرێت بەوەی کە پیاوێکی خۆش بووێت و بە بەبێ بەندوبار بزانرێت.

ئەو کەسانەی کە لەم ڕوانگەیەوە سەرزەنشتی خوشکەکەی محمد ڕەزا دەکەن و سەرکۆنەی دەکەن لەبارەی پەیوەندیە تایبەتیەکانی لەگەڵ پیاوە جۆراوجۆرەکانەوە چیرۆك دروستدەکەن کەسانێکن کە بیرکردنەوەیەی سەدەکانی ناوەڕاست و دەروون نەخۆشانەیان هەیە!

ئەشرەف ژنێکی زبر و خاوەنی ئەخلاقی پیاوانە بوو بەڵام لەهەمان کاتیشدا نیاز و خواستی ژنانەی خۆیشی هەبوو.

دەڵێن ڕووداوێك ڕوویداوە کاریگەری کردوەتە سەری و بووەتە هۆی ئەوەی ڕۆحیەتێکی توندوتیژی و نەخۆشی جنسی لەناویدا سەرهەڵبدات.

پاش ئەوەی کە ڕەزاشا ئەشرەف دەگرێت لەگەڵ علیشای ڕاهێنەر و بەخێوکەری ئەسپەکانی سەڵتەنەتی لەناو تەویلەی ئەسپەکانی سعد ئابادا کە خەریکی کاری سێکسین فەرمان دەدات، علیشای گەنج بە توندترین شێوە شەلاقکاری بکرێت،

ئەشرەفیش پاش ئەو ڕووداوە توشی نەخۆشی دەروونی و تێکچوونێکی نائاسای بوو.

چەند هەفتە دواتر ڕەزاشا فەرمانی دەرکرد کە دەبێت ئەشرەف مارە بکرێت لە علی قەوام شیرازی (کوڕی قەوام الملك-کە لە دەرەبەگە گەورەکانی ئێران) بوون.

ئەو سەردەم هیچکەس جورئەتی ئەوەی نەدەکرد کە لەبەرامبەر فەرمانەکانی ڕەزاشادا سەرپێچی بکات، هەر بۆیە ئەشرەف و علی قەوامیش بە پێچەوانەی حەزی خۆیانەوە ئەم هاوسەرگیریەیان کرد. ئەشرەف لەم هاوسەرگیریە ناچاریەدا بوو بە خاوەنی منداڵێك بەناوی (شەهرام).

ئەشرەف ڕقی لە علی قەوام بوو و بە پیاوێکی بچوکی لادێی دەزانی. ئەم بابەتە (ئیحترام ملوك شیرازی) بۆی باس کردم.

ئیحترام ملوك دەیوت: (علی قەوام لەبەر ئەوەی کە ناچار کرابوو و بە فەرمانی ڕەزاشا لەگەڵ کچێکی حەیاچوودا هاوسەرگیری بکات زۆر ڕقی لە ئەشرەف بوو. ئەشرەفیش لە هەرزەکاریشدا لەکاتی فێربوونی ئەسپ سواریدا عاشقی علیشاه (ڕاهێنەری ئەسپ سوار بوو بوو)، هەر بۆیە لەبەر ئەوەی کە ئەشرەف بە زۆر مارە کرابوو لە علی قەوام بەردەوام بێزاری دەردەبڕی لەدژی پیاوەکەی و هەمیشە خۆی لێ دووردەخستەوە[1]. ئەم دوو کەسە، تاوەکو کاتی مانەوەی ڕەزاشا لە ئێران بە ناچاری بە ڕووکەش بەردەوامیاندا بە ژن و پیاوی خۆیان، بەڵام بە چوونە دەرەوەی ڕەزاشا لە ئێران ئەمانیش جیابوونەوە!)

پاش تەڵاق وەرگرتن لە علی قەوام، ئەشرەف ماوەیەك بەتەنها ژیا، تاوەکو لە سەفەرێکیدا بۆ میسر لە قاهرە لەگەڵ شۆفێرێکی سایق تەکسیدا ئاشنا دەبێت و دڵی پێ دەدۆڕێنێت.

---

[1] - باسی دەستدرێژی علیشا لە تەویلەخانەی بەخێوکردنی ئەسپەکانی ڕەزاشا لەگەڵ ئەشرەف، ژەنراڵ حسین فردوستیش لە کتێبی یاداشتەکانی خۆیدا باسی کردوە.

خودی ئەشرەفیش لە کتێبی یاداشتەکانیدا بەخێرایی ئاماژەیەك دەکات بۆ ئەم یادەوەریەی!

ئەشرەف دەستی سایق تەکسیەکەی گرت و هێنای بۆ ئێران لەگەڵ خۆیدا. محمد ڕەزا سەرەتا دژی هاوسەرگیری ئەم دووکەسە بوو و ئەو پیاوەی کە ئەشرەف هەڵیبژاردبوو شا بە شایەنی ئەوەی نەدەزانی کە بێتە ناو خێزانی پەهلەویەوە. بەڵام بە پێداگیری ئەشرەف سەرئەنجام محمد ڕەزا ڕەزامەندی پیشاندا و (ئەحمد شفیق) جنسیەی ئێرانی پێدرا و لەگەڵ ئەشرەفدا هاوسەرگیری کرد. بە پشتیوانی ئەشرەف پیاوە میسریەکەی گەیشتە سەرۆکایەتی دامەزراوەی فڕۆکەوانی ئێران و ئەشرەف لەم پیاوە میسریە بوو بە خاوەنی دوو منداڵ بە ناوەکانی (شەهریار و ئازادە (شفیق).

بەداخەوە لەبەر ئەوەی کە جەنابی ئەشرەف عادەتی کردبوو بەوەی کە بکەوێتە شوێن حەزەکانی خۆی و بەهیچ شێوەیەك لەبیری ئابڕو و شەرەفی خێزانی سەڵتەنەتی نەبوو و بۆ تێرکردنی خواست و حەزەکانی دڵی خۆی ئامادەبوو پێگە و ڕێزی خێزانی پەهلەوی توشی مەترسی بکات.

هاوسەری دووەمی ئەشرەف ئەحمد شەفیق ئەوەندەی نەبرد تەحەمولی ئەو خۆویستی و شێوە هەڵسوکەوتە پیاوانەی ئەشرەفی پێ قبوڵ نەبوو و ناچار بوو هەموو ئەو ئیمتیاز و دەستکەوتانەی خێزانی سەڵتەنەتی وەکو پیاوی خوشکی شا لە ئێراندا لەسەر خواستی ئارەزوومەندانەی خۆی وازلێبهێنێت و بەبێ تەڵاقدان وازی لە ئەشرەف هێناو و ڕۆیشت بۆ ئەورووپا.

من پاش دەرچوونم لە ئێران چاوم کەوت بە ئازادە شەفیق و ئەحمد شەفیق (پیاوی پێشوی ئەشرەف).

ئەم دیدارە بە بۆنەی تیرۆری شەهریار شەفیق بوو لە ساڵی ١٩٧٩ لە پاریس. تیرۆری شەهریار، کوڕە خۆشەویستەکەی ئەشرەف، لێدانێکی گەورەی رۆحی دا لە ئەشرەف.

ئەشرەف کە ئەو سەردەم دانیشتوی شاری نیۆیۆرك بوو وتم بە کچەکەم: (ئامادەبووم هەرچیم هەیە لەدەستی بدەم بەڵام ئەم ڕووداوەم نەبینایە.)

فەرەح باسی ئەوەی کرد کە بەڕاستی ئەشرەف تێکشکابوو. چەندین کاتژمێر بەبێ جوڵە و بەبێ دەنگی دەوەستا و سەیری خاڵێکی دەکرد.

چەند هەفتەیەك پاش كەوتنی حكومەتی پەهلەوی، شەهریار، كە ئەفسەرێكی هێزی دەریای ئێران و فەرماندەی هێزی ئاوی بوو لە بەندەر عباس، توانی بەسەركەوتوویی بەرەو دوبەی هەڵبێت و لەوێشەوە خۆی بگەیەنێتە پاریس.

مانەوەی لە پاریس زۆری نەخایاند. چونكە چەند ڕۆژێك پاش گەیشتنی بە پاریس دوو كەسی ماتۆڕ سوار لەبەرامبەر شوقەكەی فیشەكبارانی دەكەن.

ئازادە دەیوت: (شەهریار بۆ كڕینی هەندێك پێویستی خۆراكی لە شوقەكەی چووە دەرەوە و زۆر زوو گەڕایەوە. من لە پەنجەرەكەوە سەیری ئەوم دەكرد ئەوەندەم زانی ماتۆڕسوارێك كە دووكەس بوون نزیك بوونەوە لە براكەم و ئەوەی لە پشتەوە دانیشتبوو فیشەك بارانی كرد.)

كاتێك كە ڕۆیشتین بۆ بینینی ئازادە بۆ دڵدانەوەی، ئەحمەد شەفیقیشمان لەوێ بینی كە بە ماتەمبارێكەوە دانیشتبوو.

ئەحمەد شەفیق پاش دەرچوونی لە ئێران خەریكی كاری بازرگانی بوو. وابزانم سەرمایەی كارەكەی لەلایەن ئەشرەفەوە بۆ دابینكرابوو. ئەحمەد شەفیق كە زۆر نائومێد و بێتاقەت بوو لە لای ئازادەی كچەكەی دەستیكرد بە سەركۆنەكردنی ئەشرەف و باسی خۆویستەكانی كرد و ئەشرەفی بە هۆكاری كوژرانی سەرەكی كوڕەكەی زانی.

(ئەحمەد شەفیق) باسی ئەوەی كرد بۆم كە چۆن لەماوەی ساڵانی ڕابردوودا چەندینجار ئامۆژگاری ئەشرەفی كردوە كە واز لە شەهریار بێنێت بۆ ئەوەی بێت بۆ زوریخ و دووركەوێتەوە لە بنەماڵەی شاهنشاهی و خەریكی كاری بازرگانی و تجارەت بێت.

لە ئێستادا ئاگاداری ئەحمەد شەفیق نیم و نازانم لەكوێیە، كە ئایا ماوە یان مردووە. بەڵام هەمیشە قسەكانی ئەو ڕۆژەی دەهێنمەوە یادی خۆم كە لە تەعزیەی كوڕەكەیدا زۆر بەخراپی بێزاری خۆی دەربڕی لە ئەشرف و بەنەفرەتی دەكرد و دەیوت: (ئای خۆزگە هەرگیز ئەو ڕۆژە ئەشرەفم لە قاهرە سواری تەكسی نەكردایە، ئێستا لە میسر ژیانی هەژارانەی خۆم لە گەڵ كوڕە گەورەكەمدا دەگوزەراند!)

ئەشرەف، پاش جیابونەوەی لە هاوسەری دووەمی، لەگەڵ (مهدی بوشەهری) هاوسەرگیری کرد. مهدی بوشەهری لە پاریس کارمەندی نوسینگەی نوێنەری (ئێران-ئێر) بوو و ڕیستۆرانێکی ئێرانیشی وەکو کاری شەخسی دەبرد بەڕێوە.

کەسە نزیکەکانی ئەشرەف دەیانوت ژیانی هاوبەشی ئەم دوو کەسە تەنها حەوت مانگ زیاتر درێژەی نەکێشا و ئەشرەف کە زۆر زوو ماندوو دەبوو لە پیاوان، لەم دواییانەدا زۆر شەیدای داخوازی جۆراوجۆر بووبوو. پاش ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەیەك لەگەڵ پیاوی سێیەم فەرمانی دەرکرد کە ئیدی ڕێگە نەدەن بە بوشهری بێتە ناو کۆشکەوە!

من هەندێك لە هاوسەرگیریەکانی ئەشرەف بە دیاردەیەکی ناشیرین و ناپەسەند نازانم و سەرم سوڕدەمێنێت کە بۆچی نوسەرانی کتێبە مێژووییەکان تەنها گرنگی بەلایەن و پرسە تایبەتی و شەخسیەکانی دەدەن.

لە فەرهەنگ و کەلتوری ڕۆژهەڵاتی و لەوانەش ئێران، ئەو باوەڕە بە شێوەیەکی بنەڕەتی و بەتایبەتی لەلای ژنان هەیە کە دەبێت تاوەکو کۆتای تەمەن لەگەڵ هاوسەرەکەی بمێنیتەوە و تەڵاق شتێکی عەیب و ناپەسەندە.

لەو گوندەی من لەناویدا لەدایك بووم دەیانوت: ( ئەو ژنەی  بە جلی سپی بوکێنیەوە دەچێت بۆ ماڵی پیاوەکەی دەبێت بە کەفەنی سپییەوە لەو ماڵەش  بچێتە دەرەوە!)

هەر بۆیە کاتێك کە ئەشرەف سێ جار پیاوکانی گۆڕی کەوتە بەر ئامانجی تۆمەتی ناجوامێرانەیەکی فراوانەوە!

من و کچەکەم هەرچەندە هەرگیز لەگەڵ خاتو ئەشرەف لێکتێگەشتنێکی ئەخلاقیمان نەبوو بەڵام ئەو مافەمان پێ دەدا کە لەبارەی پەیوەندی تایبەتی و سۆزداریەوە بتوانێت بەو شێوەیەی کە حەز دەکات بڕیار بدات.

ئێستا کە نزیکەی بیست ساڵی تەواوە لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا دەژیم و تاوەکو ڕادەیەکی زۆر لەگەڵ فەرهەنگ و شارستانیەتی ڕۆژئاوا ئاشنابووم تێبینی دەکەم کە زۆرێك لەو پرسانەی کە بەبۆچونی ئێمەی ڕۆژهەڵاتی ناپەسەند و نائەخلاقین، بنەمایەکی هەڵەیان هەیە لەناو باوەڕە سونەتیەکانی ئێمەدا.

لە ئەورووپا و ئەمریکا ژنان و کچان بەتەواوی ئازادن بە ئارەزووی خۆیان دەتوانن حەزیان لەکێ بێت پەیوەندی لەگەڵدا ببەستن[1].

ژنێك کە پیاوی هەبێت و بیەوێت لەگەڵیدا جیاببێتەوە، لەدادگادا کاتێك داواکاری پێشکەش دەکات لە داواکەیدا ئەوە دەنوسێت کە حەزی لە پیاوێکی دیکە کردوە و دەیەوێت بەشێوەیەکی تەواو جیاببێتەوە لە پیاوە یاساییەکەی و ئەمەش بەو پەڕی شەهامەت و ڕاستگۆییەوە دەیخاتەڕوو!

لە فەرهەنگی ئێمەدا لەبەر هۆکاری دەمارگیری مەزهەبی، ژنان خاوەنی هیچ جۆرە ئازادیێك نین و تەنانەت قسەکردن و هاتوچۆیان لەگەڵ پیاوانی دیکەدا بە حەرام دەزانرێت.

محمد ڕەزا زۆر حەزی دەکرد ژنان ئازادی تەواویان هەبێت و لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا ژنان بەتەواوی هاتنە ناو هەموو کاروباری سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە.

ژنان گەیشتنە وەزارەت و هەندێکیش وەکو وەکیلی ئەنجومەن هەڵبژێردران.

لەسەردەمی محمد ڕەزا حەزکردن و گرنگی ژنان بۆ ئارایش و مۆدە گەشەکردنێکی زۆری بەخۆیەوە بینی و ژنانی ئێران دەستیان کرد بە فڕێدانی عەبا و سەرپۆشەکانیان و ڕوویانکردە شێوەی خۆگۆڕینی ڕۆژئاوایی و لە جادەکان و شۆستەکانی تاراندا هەر وەکو شارە گەورەکانی ئەورووپا بە تەنورەی کورت و جلی تەواو ڕۆژئاواییەوە دەهاتن و دەچوون!

ئەشرف خان کە خۆی بەرپرسی ڕێکخراوی ژنان بوو لە ئێراندا هەوڵیدەدا کە ئازادی ژنان بگەیەنێتە ئازادی پیاوان و ژن و پیاو یەکسان بکات. بەڵام دووژمنەکانی حکومەت ئەم کارەیان بە بڵاوکردنەوەی فەسادی ئەخلاقی دەزانی و پڕوپاگەندەی زۆریان بڵاو دەکردەوە لەبارەی خاتو ئەشرەفەوە و ئەم پڕوپاگەندانەش لێدانێکی گەورەیان دەدا لە خێزانی سەڵتەنەتی و پێش هەمووشیان لە محمد ڕەزا وەکو شای وڵات.

---

[1] — هەر ئەو ئازادیە فراوانەیە لە ئەمریکادا بووەتە هۆی سەرچاوەی نەخۆشی ئایدز و هەزاران نەخۆشی دیکەی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی، کە هیچ بنەمایەکی ئینسانی نەماوە.

من چەندینجار بە دەربڕینی زۆر حسابکراو و بە پارێزگارێکی تەواوە هێناومە بە گوێی محمد ڕەزادا کە دەبێت باوەڕە کۆمەڵایەتی و مەزهەبییەکانی خەڵکی بەکەم سەیر نەکات.

بەڵام محمد ڕەزا باوەڕی وابوو کە حکومەت ئەرکە لەسەر شانی کە دەبێت خەڵکی لەناو ئەوبیروباوەڕە کۆنانەی سەدەکانی ناوەڕاست دەربهێنێت و کۆمەڵگە ئاراستە بکات بەرەو (دەروازەی شارستانیەتی گەورە).

کێشەیەکی دیکەی گەورەی خێزانی پەهلەوی کە خەڵکی گشتی زۆر سەرنجیان لەسەر بوو مەسەلەی بازرگانی خێزانی سەڵتەنەتی بوو.

خێزانی محمد ڕەزا خێزانێکی زۆر بوو. بێگومان محمد ڕەزا نەیدەتوانی هەموو خێزانەکە بخاتە ژێر چاودێری خۆیەوە و یان داوایان لیَ بکات کە ئیش و کاری شەخسی نەکەن!

لە وڵاتێکدا کە هەمووکەس لەتوانایدا هەبوو بازرگانی و تیجارەت و کاروباری ئابوری بۆخۆی بخاتە گەڕ بۆچی شا دەبێت ئەو مافە سروشتیە ڕەوا نەبینێت بە خوشك و برا و کەسە نزیکەکانی؟

پاش ڕووداوەکانی سەردەمی حکومەتی (دکتۆر محمد مصدق) کە لەو سەردەمەدا ڕۆژنامە و بلاَوکراوەکان بابەتی زۆر ڕاشکاوانە و توندیان لەدژی خێزانی پەهلەوی بلاَوکردەوە، محمد ڕەزا، هەوڵیدا چالاکیە ئابوریەکانی خوشك و براکان و کەسانی نزیك لە بنەماڵەی پەهلەوی لە چوارچێوەیەکی ڕێکوپێك و لەژێر چاودێرێکی ورددا بەناوی (بنایدی پەهلەوی) ڕێکبخات.

بەڵام بەداخەوە کۆمەڵێك لە ئەندامانی خێزانەکەی لەدەرەوەی ئەم دامەزراوەیە چالاکیەکانی خۆیان پەرەپێدا.

من بە بەوپەڕی شەهامەتەوە دەریدەخەم کە خراپ هەڵسوکەوتی کۆمەڵێك لە کەسە نزیکەکانی دەوروبەری شا لە پێگەی خێزانی پەهلەوی بۆ کەڵەکەکردنی سەرمایە و پارە هۆکارێکی دیکەی کەمبوونەوەی ڕێزی محمد ڕەزا بوون لەناو بیری گشتی خەڵکیدا.

خەڵکی ئێمە بەداخەوە لەتوانایاندا نەبوو هەمووشتەکان جیابکاتەوە لەیەك و تاوانی هەموو ئەندامانی خێزانی پەهلەویان دەدا بەسەر محمد ڕەزادا.

من هەندێکجار دەموت بە کچەکەم: (ئەمە ڕاست نیە کە شاهپور غلامرەزا وەکو برای محمد ڕەزا خەریکی کاری بیناسازی بێت و یان لەدەرەوەی وڵات خەریکی هاوردەکردنی تەلفزیۆن و ئامێری کارەبای بێت!)

ئێمە دەمانزانی شەمسە لە کاروباری بازرگانی و تیجارەت لەگەڵ حەبیب ثابت و حەبیب ئیلقانیان (کە دوو سەرمایەداری گەورەی جولەکە بوون) بازرگانی دەکات و شەریکە لەگەڵیاندا.

هەروەها ئاگاداری چالاکیە فراوانە ئابوریەکانی ئەشرەف و کوڕەکەی شەهرام بووین کە هەر لە کارگەوە بیگرە تاوەکو بگاتە کشتوکاڵ و مەیخانە و دروستکردنی بیناسازی هەمووشتێکیان دەکرد.

بێگومان محمد ڕەزا باشتر لە ئێمە لەناو ڕووداوەکاندا بوو و ئاگاداری ئەو چالاکیانە بوو، بەڵام هیچ بەڵگە و هۆکارێکی نەدەبینی بۆ بەرگری کردن و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵیاندا.

محمد ڕەزا دەیوت: (ڕەونەقی ئابوری ئێران بووەتە هۆی ئەوەی کە زۆرینەی خەڵکی دەستبکات بە کاری بازرگانی و کاروکاسپی و بەمەش خەڵکی داهاتێکی باشیان دەستکەوتوە. باشە بۆچی برا و خوشکەکەی منیش لەم بارودۆخە تازە ئابورییە سودمەند نەبن؟

محمد ڕەزا ئاگاداری ئەوە نەبوو کە زۆرێك لە خاوەن کارگەکان و سەرمایەدارەکان تەنها لەبەر ئەوە پشکێکیان دەدەن بە برا و خوشکەکەی و دەیانکەن بە هاوبەش لە چالاکیە ئابوریەکاندا بۆ ئەوەی سود لە ناوی خێزانی پەهلەوی وەرگرن و باشتر بتوانن خەریکی کاروباری بازرگانی بن و زیاتر جێ پێی خۆیان بکەنەوە!

بوونی هەریەکە لە غلامرەزا، حمید ڕەزا، محمود ڕەزا، عبدالرەزا یان ئەحمەد ڕەزا پەهلەوی لە دەستەی بەڕێوەبردنی کۆمپانیایەکدا بەس بوو بۆ ئەوەی دەرگاکان بەرەو ڕووی ئەو کۆمپانیایە یان بانك و کارخانەیە بکرێتەوە.

یان کام له بانکه دەوڵەتیەکان جورئەتی ئەوەی هەبوو کە قەرزێکی زۆر گەورە نەدا بەو کۆمپانیایانەی کە کەسێکی وەکو خاتو ئەشرەف لەناویدا پشکی هەبوو یان کەسێکی وەکو شەمسە لەناویدا کاری بکردایە؟

لەڕاستیدا سەرمایەدارە ماستاوچی و خۆبەرەوپێشەکان هەموو ڕێگەیەکیان دەگرتەبەر بۆ ئەوەی خۆیان نزیك بکەنەوە لە بنەماڵەی پەهلەوی و بەهەر شێوەیەك بووە یەکێك لە ئەندامانی ئەو خێزانە بکەنە هاوبەشی خۆیان بۆ ئەوەی لەو ڕێگەیەوە بتوانن بگەنە مەبەستە گڵاوەکانیان و سودیان لێوەرگرن بۆ کارەکانی دیکەیان.

بەم کارەش قازانجە گەورەکە دەچووە گیرفانی سەرمایەدارەکانەوە و بەدناوی و پیاوخراپیەکەش دەمایەوە بۆ بنەماڵی خێزانی شاهانە.

دەبێت ئیعترام بکەم بەوەی کە نە من و نە کچەکەم و نە محمد ڕەزا و نە تەنانەت ئەندامانی خێزانی پەهلەوی لەو سەردەمدا ئەوەندە ئاگادارێکی تەواویان نەبوو لەبارەی ئەوەی کە خەڵکی ئێران بە وردێکی تەواوەوە هەموو کارەکانی بنەماڵەی پاشایەتیان خستوەتە ژێر لێکۆڵینەوەوە و خێزانی پەهلەویان بە بوونی رۆحیەتێکی پارەپەرستی و قۆرغکاری بازرگانی تۆمەتبار کردوە!

ژەنراڵ حسین فردوست، هاوڕێی نزیکی محمد ڕەزا، کە هەر لە منداڵیەوە لەگەڵیدا گەورە بووبوو بە پێچەوانەی کەسە سەربازیەکانی دیکە کە هەمیشە لەدەوروبەری محمد ڕەزادا دەسوڕانەوە، کەسێکی ئیماندار و دروستکاربوو. بە ڕاشکاوی دەیوت بە محمد ڕەزا و بیری دەخستەوە کە برا و خوشکەکانت بەتەواوی لێدانێکی گەورەیانداوە لە کەرامەتی بنەماڵەکەت و داوای کردبوو لە شا کە سنورێکی تەواو دابنێت بۆ ئەندامانی بنەماڵەکەی، بەلام محمد ڕەزا لەبەر ئەوەی پیاوێکی شەرمن و خەجاڵەتی بوو، تواناى ڕووبەڕووبوونەوەی نەبوو لەگەڵ برا و خوشکەکانی و داوای دەکرد لە فردوست خۆی قسەیان لەگەڵدا بکات!

من لەگەڵ فردوست زۆر نزیك و دۆست بووین. فردوست دەیوت: (کاتێك کە محمد ڕەزا جورئەتی ئەوەی نیە دەستی ئەشرەف بگرێت بۆچی من ئەو کارە بکەم و لەڕێگەی ئەو کارەشمەوە زەرپەیەکی گەورە بدەم لە پێگە و کەسایەتی و پلەکەم و ئەوەی کە بەدەستم هێناوە لەناوی بەرم؟)

بۆیە من لەو ڕووەوە ڕەخنە لە ئەشرەف ناگرم کە عاشقی بەخێوکەری ئەسپەکانیان بووە یان وازی لە هاوسەرگیریە یەك لەدوایەکەکانی دەهێنا بەهۆی ئەو پەیوەندیە سۆزداری و عشقیەی کە هەیبوو لەگەڵ کەسانی دیکەدا.

هەمووکەس ئازادە چۆن لەبارەی ژیانی شەخسی خۆیەوە بڕیار دەدات.

من لەو ڕوانگەیەوە ئەشرەف تاوانبار دەکەم کە لەلایەنەکانی دیکەوە توانی زەربەیەکی گەورە بدات لە کەرامەت و ئابوڕی بنەماڵەی پەهلەوی. هەڵبەتە ئەشرەف خاتونیش تەنها کەس نەبوو لەوەی کە ئەم زیانەی گەیاند بە خێزانی پەهلەوی.

خاتونە شەمسە لە چالاکیە بازرگانیەکانی لەگەڵ حەبیب ئیلقانیان و حەبیب ثابت و دەیان سەرمایەداری دیکە و لەسەروی هەمووشیانەوە قاسم لاجوردی، بەشداری هەبوو.

شاهپور غلامرەزا (کە لە خێزانی پەهلەویدا بە چاوچنۆکی فراوان ناسراو بوو)، شاهپور ئەحمەد ڕەزا، محمود ڕەزا و منداڵەکانی ئەشرەف و ئەوانی دیکەش هیچ کەمتر نەبوون لە خاتو ئەشرەف خان[1].

بۆ ئەم چالاکیانە پڕوپاگەندەی درۆزنانەشی بۆ زیاد دەکرا و دەرئەنجام هالەیەك لە ڕەمز و نهێنی بە دەوری ئەندامانی خێزانی سەڵتەنەتیدا کێشرا.

بۆ نمونە، خاتو ئەشرەف بەکاری قاچاغی مەوادی موخەدر تاوانبار دەکرا و لە هەمووشی خراپتر براکانی محمد ڕەزا تاوانبار دەکران بە چاندنی خشخاش (حەشیشە) لە ئێراندا!

گومانی تێدانیە کە گەشەکردن و فراوانبوونی ئەم پڕوپاگەندانە چ زیانێکی قەرەنەبووی دەدا لە حەریمی خێزانی پەهلەوی.

---

[1] – بەهەمان شێوە ئەشرەف پەهلەویش لە کتێبی یاداشتەکانی خۆی کە لە نیویۆرك بڵاوی کردوەتەوە بەتوندی هێرش دەکاتە سەر فەرەح دیبا و خێزان و هاوڕێکانی و دەنوسێت: (پاش هاوسەرگیری فەرەح لەگەڵ براکەم سەر و کەلەی سەدان کەس لە کۆشك و دەربار پەیدابوون). هەرکەس کە نازناوی قطبی یان دیبا بوایە لە دوورترین ناوچەی وڵاتەوە دەهێنرا بۆ تاران و لەژێر سەرپەرشتی فەرەحدا دەستی بە دزی و تاڵانی و...)

دەبێت ئەوە ڕوون بکەمەوە کە هەرگیز بە وردی ئاگاداری ئەم مەسەلە بازرگانیانە نەبووم تاوەکو بتوانم لێرە بە لێبڕاوانە ڕاستی یان ناڕاستی ئەو مەسەلانە پشت ڕاست بکەمەوە و هەروەها لەم کۆتایی تەمەنەشمدا هەرگیز بەوە ڕازی نیم کە بەهۆی هەندێك لە جیاوازیەوە لە ژیاندا کە هەمبووە لەگەڵ کەسەکانی محمد ڕەزا تاوانباریان بکەم یان بەهۆی ئەو دۆستایەتی و نزیکیەی کە هەمبووە لەگەڵ ژمارەیەکیاندا، پاکیان بکەمەوە و بێ بەریان بکەم لەو تۆمەتانەی کە دەدرایە پاڵیان.

تەنها، ئامانجم ئەوەیە کە لەبەرامبەر مێژوودا بە ڕاستگۆییانە شایەتی بدەم و ئومێدەوارم مێژوونوسان، نوسەرەکان و دانەری کتێبەکان لەوەو بەدوا بە خوێندنەوەی یاداشتەکانی من، هەندێك لەو هەڵە مێژووییانەی کە لە نوسینەکانی پێشوتری خۆیاندا توشی بوون ڕاستی بکەنەوە و ئاگاداری ئەو خاڵە گرنگە بن کە لەسەردەمی حکومەتی محمد ڕەزا کەسانێکی زۆر و جیاواز دەستیان هەبووە لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا یان لە پەراوێزی دەسەڵاتدا بوون هەربۆیە لەو شکستەی ڕژێمدا پشکیان هەیە.

بەداخەوە سەرکەوتن هەزاران بانگەشەکاری هەیە و شکست (هەتیوە)! پاش کەوتنی حکومەتی پەهلەوی هەمووکەس هەوڵیدەدا تەنها محمد ڕەزا لەو هەرەسەی سەڵتەنەتیدا تاوانبار بکات، لەکاتێکدا کە زۆرێك لە ڕەخنەگرەکانی ئەمڕۆ، خۆیان زۆرترین بەش و ڕۆڵیان هەبوو لە کەوتنی حکومەتی پەهلەویدا. من بە ئێوە دەڵێم کە هەریەکە لەو کەسانە چ پشکێکیان هەبوو لە کەوتنی ئەو دەسەڵاتە.

کاتێك کە بۆ یەکەمجار لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕادیۆی ٢٤ کاتژمێری لۆس ئەنجلس بە ئاشکرا برا و خوشکەکانی محمد ڕەزام تاوانبار کرد بەوەی کە پشکێکی سەرەکیان هەبوو لەوەی کە لێدانێکی کوشندەیان لە متمانەی پاشای ئێرانداوە. شاهپور غلامرەزا کە لە (بورلی هیلز) دەژیا هات بۆ بینینم و بە تووڕەی و زبری و توندیەوە محمد ڕەزای بە بێ توانا و بەبێ شایستە تاوانبار کرد و هەموو تاوانەکەی خستە ئەستۆی برا گەورەکەی و وتی: (محمد ڕەزا میراتی باوکمی (ڕەزاشا) بە بادا و هەموومانی ئاوارە کرد!)

هەڵبەتە هەموو ئەندامانی بنەماڵەی پەهلەوی بە باشی و تەنانەت باشتر لە من غلامرەزا دەناسن و باش دەزانن کە بە چ ڕادەیەك شەیدای پارەپەرستی و مادەگەرایی بوو. پشتیوانی ئەو لە ئەشرەف نەك لەو ڕوانگەیەوە بوو کە ئەو برای باوکیەتی، بەڵکو زیاتر بەهۆی ئەوەوە بوو کە شەریکە بازرگانی بوو.

غلامرەزا لە ٢٨ فێبریوەری ١٩٩٧ هات بۆ ماڵەکەم لە (بورلی هیلز) لەکاتێکدا کە چاوی بەهۆی زۆری تریاك کیشانەوە سور بووبوو و بۆنی دووکەڵ لەجلەکانیەوە دەهات، کۆمەڵە قسەیەکی کرد بە دەنگ و شێوە قسەکردنێك کە نەك لە ئاستی شازادەیەکی وەکو ئەودا نەبوون، بەڵکو هەرگیز ناتوانم ئەو بابەتەی دووبارە بکەمەوە لەبەرامبەر ئەو دەربڕینەی کە وەڵامدەرەوەی ئەو ئەدەبەی بێت.

بەڵام ئێستا دەمەوێت ئەو کەسانەی خێزانی محمد ڕەزا کە ڕۆڵیان هەبوو لە ڕووشاندنی کەرامەتی خێزانی پەهلەوی بێ پەردە و ڕاشکاوانە باسیان بکەم. ساڵی ١٩٦١ یان ١٩٦٢ بوو (بەتەواوی لەبیرم نیە) کە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان چاندنی حەشیشە و خشخاشی لە ئێراندا بەتەواوی قەدەغە کرد.

محمد ڕەزا فەرمانی دەرکرد بۆ پۆلیس و ئاسایش کە بەتەواوی چاندنی حەشیشە و خاشخاش لەناوبەرن و بەتوندترین شێوە ڕێگری بکەن لە چاندنی ئەو گیا لەناوبەرە لە ناوەندە سەرەکیەکان و ئەو گوند و شوێنانەی کە دەچێنرێت.

چاندنی ئەم گیایە لەو سەردەمدا لە ناوچەیەکی فراوانی پارێزگای خۆراسان، سیستان و بەلوجستان، پارێزگای ناوەندی، ئەسفەهان و کۆمەڵێك لەناوچەکانی دیکەی ئێران باو بوو.

نەتەوە یەکگرتوەکانیش لەلایەکەوە هەڕەشەی لە ئێران کرد کە ئەگەر ڕێگری لەو تریاك و حەشیشە نەکات ئەوا دەستدەکات بە پچڕاندی هەموو ئەو یارمەتیە ئابوری و جیهانیانەی کە دەیدات، و لەلایەکی دیکەشەوە بەڵێنیدا ئەگەر ئێران بتوانێت ڕووبەڕووی بنەبڕکردنی ئەو چاندنە ببێتەوە ئەوا قەرزێکی زۆری بێ بەرامبەر پێشکەش دەکات.

دەوڵەتی ئێران وەکو ئەندامێکی خێزانی جیهانی و یەکێك لە دامەزرێنەرە سەرەتاییەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان هیچ چارەسەرێکی دیکەی جگە

لەوەی کە خواستەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان جێبەجێ بکات نەبوو. بەڵام بازرگانیە پڕ سودەکەی تریاك لە ئێراندا پشتیوانی و لایەنگرانی زۆر بەهێزی هەبوو.

تاوەکو ئەو کاتەی کە چاندنی تریاك لە ئێرانُدا یاسای بوو برا و خوشکەکانی شا هەروەکو جوتیارە ئاساییەکانی دیکە خەریکی چاندنی ئەم کارە بوون و سودێکی باشیان دەکرد.

من زۆر ئاگاداری وردەکاری ئیشەکانیان نەبووم تاوەکو مەسەلەی لە سێدارەدانی (دایی قاسم هەمەدانی) هاتە پێشەوە.

کاتێك کە دایی قاسم گەورەترین قاچاغچی مەوادی مخەدەری ئێران لە قەڵاکەی خۆی لە شاری هەمەدان دەستگیرکرا و گوازرایەوە بۆ تاران وتم بە فەرەح چۆن تاوەکو ئێستا پۆلیس و هێزی ئاسایشی ئێران ئاگاداری بوونی ئەم قەڵایە نەبوون لە ناوەڕاستی شاری هەمەداندا.

(دایی قاسم) بۆ خۆی قەڵایەکی هەبوو لە شاری هەمەدان کە دەیتوانی لە هێرشی دەبابەش بیپارێزێت!

فەرەح سەرەڕای ئەوەی کە داوای لێکردم کە باشترە ئیدی ناوی دایی قاسم نەهێنم چونکە خۆی زانیارێکی وردی هەبوو لەسەری بەڵام پێی وتم: (دایی قاسم یەکێك بوو لە فرۆشیارە گەورەکان کە هەموو ئەو ساڵە دووروودرێژانە زیاتر کاری ئەوە بووە کە تریاکی ئەشرەف و غلامرەزای لە جیهاندا دابەش کردوە. چ پێش و چ پاش قەدەغەکردنی چاندنی تریاك و حەشیشیش لە ئێراندا ئەشرەف و غلامرەزا خاوەنی سەدان هیکتار زەوی بوون کە تەنها لەناویدا تریاك و حەشیشیان چاندوە..)

هەر بەپێی زانیاری فەرەح، هێزەکانی پۆلیس بە توندرین شێوە کێڵگە تریاکیەکانی جوتیارە ئاساییەکانیان وێران دەکرد و دەسوتاند و لەبەرامبەریشدا هەر ئەو هێزانە پارێزگاری و چاودێرێکی توندی کێڵگەکانی ئەشرەف و غلامرەزایان دەکرد.

هەرچەندە ئەشرەف و غلامرەزا بازرگانی تریاکیان لەژێر دەستدا بوو، بەڵام هەندێکی دیکە لە ئەندامانی نزیکی خێزانەکەیان و هاوڕێکانی محمد ڕەزاش بەشداریان لەگەڵدا دەکردن و بەشدار بوون لەو قازانج و سودەی کە بەدەستیان دەهێنا.

بەرهــەم و دەســتکەوتی غلامــرەزا و ئەشــرەف تــەنها لەڕێگــەی چــاندنی تریــاك و حەشیشەوە بەدەست نەدەهات لە کێڵگەکەیانیاندا. بەڵکو دەستیان دەگرت بەسەر ئەو تریــاك و حەشیــشەیەی قاچاغــچیانەشدا کەلەلایــەن پــۆلیس و ئاسایــشەوە دەســتگیر دەکران، و لەم ڕووەوە لەگەڵ فەرمانــدەی گشتی هێزەکانی پۆلیسدا هاوبەش بوون و ئەو مەوادەیان دووبارە بە قازانجی خۆیان بەکار دەهێنایەوە!

غلامرەزا لێکۆڵەرەوەی گشتی هێزی شاهنشاهی بوو و لەم دواییانەشدا پلەی سەر لەشکری هەبوو. ئەم لێکۆڵەرەوە گشتیە ڕۆژانە چەند کاتژمێرێك لە کاتی خۆی تەرخان دەکرد بۆ لێکۆڵینەوە لە بنکە سەربازیەکان و بەو شێوەیەی کە هاوڕێی کۆچکردووم (ژەنراڵ حسین فردوست) باسی دەکرد: (تەنها سەرداني بەشی دارایی سوپای دەکرد و بەهەر شێوەیەك هەبوایە هەوڵیدەدا پشکی خۆی لە گەندەڵی و بەکارهێنانی ئەو بوجەییەی کە دیاری کرابوو بۆ بەشەکانی سوپا ببات و بەکاری بهێنێت بۆ کاری شەخسی خۆی.)

بۆ نمونە سوپا هەموو ساڵێك ڕێژەیەکی زۆری لە برنج، ڕۆن، کەلوپەی خۆراکی و هەروەها جلوبەرگ بۆ سەدان هەزار سوپا و هێزەکان دەکڕی.

غلامرەزا کارێکی دەکرد تاوەکو ئەم شتانە لەلای بازرگانێك بکڕدرێن کە لەگەڵ غلامرەزادا بەجۆرێك لەجۆرەکان شەریك بووایە!

بۆیە گرنگی بە هیچ شتێکی دیکەی لایەنی سەربازی نەدەدا. لەم دواییانەشدا کوڕەکەشی کردبویە هاوکاری خۆی و لە خواردن و لوشە گەورەکاندا کردبوویە هاوبەشی خۆی.

دەستێوەردانی دیکەی غلامرەزا، وەکو لێکۆڵەری گشتی، دەستێوەردان بوو لە کاروباری پۆلیس (ژاندارمری)، بەشێوەیەك کە لە بەڕێوەبردن و دانانی فەرماندە باڵاکاندا ڕۆڵێکی سەرەکی هەبوو. دەسەڵاتی لە پۆلیسدا لە سەردەمی سەرۆك ئەرکانی سوپا قرەباغی گەیشتە ئەو پەڕی خۆی و لە سەردەمی ژەنراڵ ئویسی گەیشتە کۆتایی.

ژەنراڵ غلامعلی ئویسی هاوکاری بازرگانی تریاك حەشیشەی لەگەڵ غلامرەزا و ئەشرەف دەکرد و هەرچی تریاك لە سنورەکانی وڵاتدا دەستی بەسەردا بگیرایە

دەگوازرایەوە بۆ عەمباری تایبەتی ئویسی و لەم عەمبارەشدا کرێکاری ئەفغانی ئویسی تریاکەکەیان دەماڵی و ئامادەیان دەکرد!

ئویسی ئەم تریاکانەی تەسلیمی غلامرەزا و ئەشرەف دەکرد و هاوکێشی تریاکە دەستبەسەرکراوەکەش دۆشاوی خورما و چەند مادەیەکی دیکەیان تێکەڵ دەکرد و وەکو تریاك و حەشیشەکە دەیانکردە ناو کیسەوە و تەحویلی لێکۆڵەرەوانیان دەدا (ئەو لێکۆڵەرەوانەی کە لەلایەن خودی غلامرەزاوە دانرا بوون) بەحساب تاوەکو لەناوی بەرن!

تاوەکو ئەو کاتەی کە دای قاسم هەمەدانی زیندوو بوو ئەم تریاکانەیان تەسلیمی ئەو دەکرد و دای قاسمیش کە کەسێك بوو لە ئاستی مافیاکانی ئیتاڵیا لە پێشانگا گەورەکەی خۆی لە هەمەدان تریاکەکەی دەگۆڕی بۆ هیرۆیین و مادە لەناوبەرەکانی دیکە و لەوێشەوە ڕەوانەی دەرەوەی سنورەکانی ئێرانی دەکرد.

من باوەڕم بەم باسانە نەدەکرد و لەڕاستیدا هەوڵمدەدا باوەڕم بەم خەڵەتاندنانە نەکەم، تاوەکو چەند جارێك خۆم لە میوانیەکانی کۆشکەکەی ئەشرەف دای قاسم هەمەدانیم بینی کە پیاوێکی مامناوەندی  پیست ڕەش بوو.

دایی قاسم خاوەنی تۆڕێکی فراوانی قاچاغچی بوو لەسەرتاسەری وڵاتدا و دابەشکردن و ناردنی ئەم کاڵا مەرگهێنەرەی بەڕێوە دەبرد.

ئەشرەف تەنانەت سەیارەیەکی فیشەك نەبڕی پێشکەش  بە دای قاسم هەمەدانی کردبوو.

ئەشرەف ئەم قاچاغچییە گەورەیەی بە (دای) واتە (خاڵۆ) بانگ دەکرد. من کاتێك نزیکی و هاوڕێیەتی ئەم دووانەم بینی دڵنیابووم کە ئەو بابەتەی کە لە بارەی ئەو بازرگانیە مەرگهێنەرەوە باس دەکرێت لەبارەی غلامرەزا و ئەشرەفەوە حەیقیەتی هەیە. (و یان بەشێکی تەواوی ئەوەی کە لەسەر زمانە  حەقیقەتی هەیە)!.

لە دەوروبەری ساڵی ١٩٧٠ لە پڕێکدا هەواڵی دەستگیرکردنی دایی قاسم بڵاوبوویەوە و لەماوەیەکی کورتدا لە سێدارە درا!

لـەم کاتـەدا دوو هـەواڵی دژ و پێـچەوانە بـەر گـوێ دەکـەوتن. هەنـدێك دەیـان وت: (محمـد ڕەزا ئاگـاداری چـالاکیەکانی دای قاسـم بـووە و فـەرمانی دەسـتگیر کـردن و دادگایی کردنی بۆ دەرکردوە.)

و هەندێکی دیکە دەیانوت: (دای قاسم لـە معامـەلاتی تریاکدا غلامرەزا و ئەشرەفی هەڵخەڵەتاندووە و دەستگیرکردنیشی بە ئاماژەی غلامرەزا و ئەشرەف بووە)

من ئاگاداری ئەوە بووم کە فردوست وەکو سـەرۆکی لێکۆڵینـەوەی شاهنشاهی و جێگـری سـاواك زانیـاری وردی خستە بەردەسـت محمـد ڕەزا و محمـد ڕەزاش خـۆی ئاگاداری ئەو مەسەلەی قاچاغی و کارانەی خێزانەکەی بوو، بەڵام بەدووری دەزانم کە محمـد ڕەزا بـەم شـێوە و خێراییـە فـەرمانی دەسـتگیرکردنی دای قـاسمی دابێـت.

محمد ڕەزا لـە گـوێ ناسـکتری نـەدەوت بـە ئەشـرەف و تەنانـەت بەشێوەیەکی تـەواو گوێی لە ئەشرەفیش دەگرت.

هەڵبەتـە زۆر حسابی بـۆ غلامـرەزا نـەدەکرد و هەنـدێك کـاتیش لـە بـەردەم خەڵکدا گاڵتەی پێ دەکرد.

بـەو شـێوەیەی کـە کـچەکەم باسـی دەکـرد: (دای قاسم بووبـوو بـە کەسـایەتێکی ناسـراوی زۆر گـەورە و بازرگـانێکی نێودەوڵـەتی مەترسـیداری مـاددەی سـڕکەر و لـە چەند شـوێنێکی جیهانـدا جێگـە پێـی خـۆی کردبوویـەوە. هـەر لەبـەر ئەمـە پۆلیسی نێودەوڵەتی و ئیف بی ئای ئەمریکی داوایان لە ئێران کردبوو کە ئەو پیـاوە بگرێـت و سزای بدات.)

هەر لەبەرئەوەی کە محمد ڕەزا بەردەوام لـە کاردانـەوەی چاپەمەنیەکانی ڕۆژئاوا و سیاسەتمەندارەکانی ترسی هەبوو بە خێرای فەرمانی دەستگیرکردن و سزادانی دای قاسمی دەرکرد. پاش دەستگیرکردنی دای قاسم هەمەدانی چەند کەسێك لە هاوڕێکان و بەڕێوەبەرەکانی کارەکانی لە وڵاتانی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست و بەتایبـەتی لـە عێراقدا نامەیان نوسی بۆ محمد ڕەزا و خوازیاری ئازادی و بەخشینی دای قاسم بوون، بەڵام محمد ڕەزا لە وەڵامی ئەم کەسانە کە لە ڕۆژنامەکانی تاراندا چاپ کرا لـەم کەسـانە (و لەسەروی هەموویانەوە کەسایەتیە گەورەکانی عێراق) پرسیاری کرد: (کاتێك ئێمـە لە

ئێراندا خەڵکانێك لە سێدارە دەدەین تەنها لەبەر ئەوەی چەند گرامێك هێرۆینیان پێیە چۆن چاوەڕوانی ئەوە دەکەن کەسێك ئازاد بکەین کە چەندین تەن هێرۆینی هەیە؟)

لە سێدارەدانی دای قاسم کاردانەوەیەکی خراپی هەبوو بۆ خێزانی پەهلەوی، چونکە هاوکارەکانی لە هەموو جیهاندا دەستیان کرد بە تۆڵەکردنەوە و لە جەنگێکی ڕاگەیاندندا بە ئاشکرا لەدژی حکومەتی شاهنشاهی دەستیان کرد بە بلاوکردنەوەی کۆمەڵێك بەڵگە کە ئەوەیان خستەڕوو کە پەخشکردنی سەرەکی بازرگانی گەورەی ماددەی سڕکەر لە ئێراندا بنەماڵەی خێزانی پەهلەویین و دای قاسم تەنها هۆکارێکی جێبەجێکاری ئەو بنەماڵەیە بووە!

محمد ڕەزا فەرمانیدا کە هاتنە ناوەوەی ئەم جۆرە گۆڤار و ڕۆژنامانە بۆ ئێران قەدەغە بکرێت. بەڵام ئەم بلاوکراوانە بە نهێنی دەگەیشتنە ناو ئێران و دەست بەدەست دەکران و ئابڕووی ئەشرەف و غلامڕەزایان دەبرد!

من لە ئێوارە خوانێکدا شایەتی خۆهەڵخەڵەتاندنی محمد ڕەزا بووم کە هەمیشە بە شێوەیەکی ساویلکانە لە تەنیشت پرسەکاندا تێدەپەڕی و ئاگادار بووم کە محمد ڕەزا دەیوت بە دەوروبەرەکەی: (ئەم بانگەشە و پڕوپاگندە ژەهراویانە هەمووی کاری خوێندکارە مارکسی و ئیسلامیەکانی دەرەوەی ئێرانە!)

ئایا ئەمە قسەیەکی ڕاست بوو؟

ئێمە سەرەتا سەرنجەکانی محمد ڕەزامان پێ قبوڵ بوو، بەهەرحاڵ، ئەو پاشای وڵات بوو و باشتر لە ئێمە ئاگاداری پرسەکان بوو. بەڵام لە حەڤدەی نۆڤەمبەری ١٩٦٤ پۆلیسی سویسرا جەنابی خاتو ئەشرەفی لە فڕۆکەخانەی جنیف بە تۆمەتی چەندین جامتای پڕ لە مەوادی پوختی بە بەهای ٢٠ ملیۆن دۆلار دەستگیر کرد!

لەم سەفەری کارکردنەی(!) محمود ڕەزا پەهلەوی لەگەڵ خوشکە باوکیەکەی بوو. پۆلیسی جنیف هەردووکیانی تەسلیمی دادگا کرد و لێپرسینەوە لە خوشك و براکەی شا بە ئابڕووچوونێکی گەورە دانرا بۆ بنەماڵەی شای ئێران!

چەند جارێکی دیکە ئەم ئابڕووچوونە لەچەند شوێنێکی دیکەدا بەڵام بە حەجمێکی بچوکتر دووبارە بوویەوە. بەڵام دووبارە ئابڕوچونێکی دیکەی گەورە لە چاپەمەنیەکانی ڕۆژئاوادا دروستبوویەوە و لەو حەیاچوونەش بلاوکراوە

بەناوبانگەکانی ئەورووپا و ئەمریکا پەردەیان لەسەر چالاکیە فراوانەکانی قاچاغچیەکانی ئەشرەف هەڵماڵی لە ئەورووپادا.

لە ساڵی ١٩٧٦ کاتێك کە ئەشرەف پاش چاوپێکەوتنی لەگەڵ چەند کەسێك لە سەرانی گەورەی گرووپە قاچاغچیەکانی مەوادی مخەدەر لە ماڵە شکۆمەندەکەی لە ژوان لڤین (باشوری فەرەنسا) دەگەڕایەوە ئۆتۆمبیلەکەی دەدەنە بەر ڕێژنەی گولە.

بەداخەوە لەم ڕووداوەدا (فروغ خواجە نوری) هاوڕێی و هاودەمی کۆنی ئەشرەف (کە لەگەڵ منیشدا هاوڕێیەکی نزیك بوو) بە هۆی بەرکەوتنی فیشەکەوە دەم و دەست دەکوژرێت. شۆفێرەکەش بە سەختی برینـدار دەبێت. بەڵام پاش ئەنجامـدانی نەشتەرگەرێکی سەرکەوتوو ڕزگاری دەبێت.

هیچ زانێکی قورس نەگەیشتبوویە ئەشەرف، بەڵام ڕسواییەکی گەورە بوو بۆ هەموو ئەوانەی کە وابەستەی خێزانی پەهلەوی بوون.

ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی فەرەنسا لەوانە لیمۆند، فیگارو، ئەکسپریس، فرانس بەشێوەیەکی فراوان بڵاویان کردەوە کە تیرۆری شازادەی ئێرانی لەلایەن ڕێکخراوە تاوانکارەکانەوە بەهۆی دەستێوەردانی ئەشرەف پەهلەویەوە بووە لە بازاڕی ماددەی بێهۆشکەری فەرەنسا.

تاوەکو ماوەیەکی زۆر بڵاوکراوە بەناوبانگەکانی ئەورووپا و ئەمریکا ڕاپۆرتی سەیر و سەمەرەیان لەبارەی معامەلاتە نایاساییەکان و بەشداریکردنەکانی ئەشرەف لەگەڵ گرووپە مافیاکان و دابەشکەرەکانی مادە سڕکەرەکانەوە بڵاودەکردەوە.

کچەکەم (فەرەح) بەشێوەیکی خراپ لەم ڕووداوانە زیانی پێگەیشت.

فەرەح دەیوت: (فەرەنسیەکان سەبارەت بە خێزانی سەڵتەنەتی ئێران بۆچوونێکی باشیان هەبوو بەڵام ئێستا هەمووشتێك تێکچوو!)

محمد ڕەزا فەرمانیدا بە سەفارەتخانەکانی ئێران لە ئەورووپا هەرچیان کردوە و بەهەر ڕێگەیەك هەبووە هەوڵبدەن بێدەنگیان بکەن. لافاوێك لە فەرش و قاڵی، پستە و خاویار و خەڵاتی گرانبەها، تەنانەت ڕیکلامی چەند سەد هەزار دۆلاری بەرەو بڵاوکراوە ئەورووپیەکان لێژبوونەوە و پارەیەکی زۆر تەرخانکرا تاوەکو ئەم ڕووداوە ئابڕووچونە لەبیر بکرێت.

فەرەح فشاری زۆری دروست دەکرد بۆ محمد ڕەزا تاوەکو ڕێگە لە خوشك و براكانی بگرێت بۆ ئەو جۆرە کارانە و نەبنە هۆی لاوازی بنەماکانی سەڵتەنەتی. بەڵام بەداخەوە محمد ڕەزا کە لەناو وەهم و خەیاڵەکانی خۆیدا نوقم بووبوو زۆر گوێی لەم پرسانە نەبوو و پشتگوێی دەخستن و حەزی نەدەکرد ئەندامانی خێزانەکەی لەخۆی برەنجێنێت!

من بە داخەوە چەندین کتێبی فارسیشم بینیوە کە لە ئێران چاپکراون محمد ڕەزا تاوانبار دەکەن بەوەی کە دەستی هەبووە لەو چالاکیانەدا. ڕێگەم پێ بدەن کە زۆر بەتوندی ئەم بۆچوونە ڕەفز بکەمەوە. محمد ڕەزا بەهیچ شێوەیەك لەو چالاكیە نایاساییانەی خوشك و براکانی، بەتایبەتی بازرگانی تریاك و مەوادی مەخەدەردا دەستی نەبوو. بەهیچ شێوەیەکیش حەزی نەدەکرد باسێك لەمەڕ ئەو بوارانەشەوە ببیستێت!

تەنانەت چەندینجار داوای کردبوو لە ژەنراڵ فردوست کە لەم بارەیەوە لەگەڵ ئەشرەف و غلامرەزا و خزمەکانی دیکەی قسە بکات و ئاگادارکردنەوەی پێویستیان بداتێ و داوایان لێ بکات کە واز لەم کارانە بهێنن و ڕێگریان لێ بکات.

باسکردنی ئەم بابەتە و ڕوونکردنەوەی ئەم باسانە بۆ لێدانی ئەو کەسانە نیە کە دژی محمد ڕەزان و بەهیچ شێوەیەك بۆ تۆڵە سەندنەوەی شەخسی نیە.

من وادەزانم هەموو ئەو کەسانەی کە لە حکومەتی سەڵتەنەتیدا بەرپرسیاریەتیان هەبوو بە ڕێژەی بەرپرسیاریەتی خۆیان ڕۆڵیان هەبوو لە هەرەسهێنانی ئەم حکومەتە، بەڵام ئێستا بۆ پاككردنەوەی خۆیان کتێب دەنوسن و هەموو تاوانەکە دەخەنە گەردنی محمد ڕەزا!

بە ئەرکی مێژوویی خۆمی دەزانم تاوەکو ڕاستی (هەڵبەتە سوچێك لە ڕاستیەکان) بخەمەڕوو. من بەهیچ شێوەیەك حەزم نەدەکرد لەبارەی جەنابی خاتو ئەشرەف هیچ شتێك بڵاو بکەمەوە و بێدەنگی خۆم بشکێنم. سنگم داپۆشەری زۆرێك لە نهێنیەکانی حکومەتی پێشوی ئێران و نهێنی پیاوەکان و وابەستەکانی ئەو حکومەتەیە و ئەم نهێنیانەش بەردەوام دەمێنێتەوە، مەگەر تەنها لەحاڵەتێکدا ئەو شتانە بخەمەڕوو کە ببینم کەسێك خەریکی ئاوەژووکردنەوەی بارودۆخەکان و ڕووداوەکانی ئەو

ڕۆژگارەیە، ئەمەش ناچارم دەکات کە پەردەی بێدەنگی بدڕم و ڕاستیەکان بخەمەڕوو.

بەداخەوەم کە خوشکەکەی محمد ڕەزا، کە لە هەمووکەس زیاتر نزیکببوو لە محمد ڕەزاوە و خۆیشی پێش ڕووداوەکانی ١٩٥١ لە ڕووداوەکان و بارودۆخە سیاسیەکانی ئێراندا ڕۆڵێکی سەرەکی هەبوو، ئێستا خراپتر لە من پێی لە لێواری گۆڕدایە و بەردەوام ئەگەری ئەوەی هەیە کە دیداری بەرەو لای محمد ڕەزا بڕواتەوە کتێبێکی یاداشتی بڵاوکردوەتەوە کە لەو کتێبەدا براکەی بە بێ لێهاتوو، لاواز و سست، لەرزۆك لە بڕیاردان و مەزاجی لە کارکردندا تۆمەتبار دەکات و محمد ڕەزای بە بەرپرسی هەرەسهێنانی حکومەتی سەڵتەنەتی خستوەتەڕوو!

کاتێك کە ئەشرەف، خوشکە دووانەیەکەی محمد ڕەزا بەم شێوە بێ بەزەییانە هێرش دەکاتە سەر براکەی، دەبێت چ چاوەڕوانێکت هەبێت لە کەسێکی سوك و بچوك و زەبونی وەکو ژەنراڵ قرە باغی؟

ئێستا داوای یارمەتی دەکەم کە دەمەوێت کەمێك پەردەی حەیا هەڵماڵم و هەندێك وردە بابەت لەبارەی جەنابی خاتو ئەشرەفەوە لەناو سندوقی نهێنی سنگم هەڵڕێژم لەگەڵ چەند لایەنێکی دیکە تاوەکو خوێنەر خۆی بڕیار بدات کە ئایا هەموو تاوانەکان لە گەردنی محمد ڕەزادا بوون یان ئەگەر محمد ڕەزا موسی بدایە لە ڕیشی سەڵتەنەت، ئەوکات ئیدی ئەندامانی خانەدانانی پەهلەوی بۆ بەهێزکردنی بنەمای سەڵتەنەت و پاراستنی کەرامەتی هەوڵیاندەدا!

نامەوێت وەکو خاتو سورەیا ئەسفەندیاری بیرەوەریەکانم تەرخان بکەم بۆ باسی خراپەکاریەکانی جەنابی خاتو ئەشەرف پەهلەوی و دەستێوەردانە حەسودانەکانی لەبارەی ژن و مێرداریەتی محمد ڕەزاوە. نوسینی ئەم جۆرە بابەتانە نەك هەر دەبێتە هۆی ئابڕوچوونی ئەشرەف بەڵکو پێش هەمووشتێك لە ئاست و شەئنی من کەم دەبێتەوە.

من عارفی ڕێگەیەکم، ئەو ڕێگەیە داوا لەهەموو ئەو کەسانە دەکات کە لەسەر ئەو تەریقەتن، سنگ فراوان و لەخۆبووردووبن.

ئای خۆزگە جەنابی ئەشرەف کاتەکانی خۆی تەنها تەرخانی دەستێوەردانەکانی کاروباری ژن و مێردایەتی محمد ڕەزا و کچەکەم بکردایە. (کە زیانی ئەم کارەش تەنها

بۆ ژیانی تایبەتی محمد ڕەزا و فەرەح بوو و هیچ زیانێکی نەدەدا لە بەنەما و پایەکانی سەڵتەنەتی.)

بەوشێوەیەی کە پێشتر باسم کرد خوالێخۆش بوو فروغ خواجە نوری کە لە سەیارەکەی ئەشرەفدا بەهۆی هێرشی مافیاکانەوە کوژرا لە هاوڕێیانی زۆر نزیکی من بوو.

ئێمە هاوتەمەنیش بووین و پەیوەندی هاوبەشمان هەبوو. فروغ لە سەفەرەکان و دانیشتنەکاندا هەمیشە لەگەڵ ئەشرەفدا بوو و نزیکی ئەم دووکەسە بەڕادەیەك بوو کە ئێمە وابیرمان دەکردەوە کە ئەم دوو کەسە لەوانەیە شەوانەش بەیەکەوە بخەون.

فروغ هەندێکجار دەهات بۆلای من و بەبێ دواکەوتن سفرەی دڵی خۆی بۆ ڕادەخستم و دەستی دەکرد بە دەردە دڵ.

من ناوم نابوو (حسرەت الملوك) (!) هۆکاری ناونانەکەش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە هەمیشە حەسرەت و خەمی بۆ ئەم و ئەو دەخوارد (لەسەروی هەمووشیانەوە حەسرەتی بۆ ئەشرەف دەخوارد!).

فروغ کە لە ژیانی ژن و مێردایەتیدا شکستی خواردبوو، لەبەر ئەوەی کە نەدەبووە جێگەی سەرنجی پیاوان زۆر گلەی و گازندەی هەبوو و هەرچەندە بە قسە و باسی موئەدەبانە و حساب بۆ کراو(!) سەرسوڕمانی خۆی نیشان دەدا کە بۆچی ئەشرەف بەم سەر و شێوە قیافەوە کە هیچ جوانیش نیە چۆن بەم هەموو تەمەنەشەوە دەبێتە جێگەی سەرنجی پیاوان و یەك لەدوای یەك خۆشەویستەکانی دەگۆڕێت!

داماوە ئەم پەندە بەناوبانگەی نەبیستبوو کە دەڵێت:

*(ئەم هاوڕێ قەڵب و بێ کەڵکانە دەبینی*

*مێش و مەگەزن لە دەوری شیرینی!)*

نەیدەزانی کە جوانی ئەشرەف ڕۆڵی نیە لە کۆبوونەوەی پیاوە هەلپەرستەکانی دەورووبەری و ئەمانە دەیانەوێت سود لە دەسەڵاتی ئەشرەف وەرگرن و بۆ مەبەستێکی

دیکە بەکاری بهێنن بۆیە خۆیان لێی نزیك دەکەنەوە. من چەند کەسێك لەوانە باش دەناسم.

ئەم جۆرە کەسانە لەبەر ئەوە ڕوویان دەکردە ئەشرەف بۆ ئەوەی خۆیان دەربخەن و بڵێن ئێمە لەگەڵ خوشکی شای وڵاتدا دۆست و نزیکین.

یەکێك لەو کەسانە گۆرانیبێژێکی ناسراوی ئەرمەنی بوو بەناوی (ڤیگن) کە زۆر بووە جێگەی سەرنجی ئەشرەف.

هەندێکی دیکە دەهاتن بەشوێن ئەشرەفدا تاوەکو بتوانن لەو ڕێگەیەوە بەشێك لە بەرپرسیاریەتی وەرگرن لەناو دەوڵەتدا. بۆ نمونە لەو جۆرە کەسانە (ئەبو الحسن ئیبتهاج و لیئون پانچیان) بوون.

هەندێك گەنجی بێ پارە و تازە پێگەیشتوش هەبوون کە تازە پشتی لێویان ڕەش بووبوو و لەلایەن ئەشرەفەوە پارەی باش و خەڵاتی وەکو سەیارە و قەمەرەیان وەردەگرت، یەکێك لەوانە گەنجێکی تازە پێگەیشتووبوو کە لە بواری دۆبلاجی سینەمادا کاری دەکرد و دواتر بە پشتیوانی ئەشرەف بوو بە هونەرمەندێکی بەناوبانگ ئەویش (بەهرۆز وثوقی) بوو!

گەنجێکی دیکە هەبوو کە ڕۆژنامەنوس بوو لە ڕۆژنامەی ئیتلاعات ئیشی دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئێستا لە ئێرانە باشترە ناوی نەهێنم.

هیچکەس، تەنانەت محمد ڕەزاش مافی ئەوەی نەبوو دەست وەربداتە ناو ژیانی تایبەتی ئەشرەفەوە و نزیکی حەرەمی بکەوێت. بەڵام جەنابی خاتو ئەشرەف ئەو مافەی دەدا بە خۆی کە دەست وەربداتە ناو کاروبارەکانی هەموو ئەو کەسانەی کە لە دەوروبەریدا بوون.

پێش هەموو کەسیش ئەوانەی کە دەستی وەردا لە ژیانیان فەوزیە و سورەیا بوون و دەرئەنجامیش توانی دەریانپەڕێنێت لە دەرباری سەڵتەنەتیدا.

لە سەرەتای ژیانی هاوبەشی فەرەح و محمد ڕەزاش هەڵسوکەوتێکی تێکدەرانە و هاوشێوەی سورەیا و فەوزیە دەبینرا لە ئەشرەف کە هیچ ژنێك لەتوانایدا نەبوو تەحەمولی ئەو هەڵسوکەوتانەی بکات. بەڵام لەبەر ئەوەی من وەکو ڕاوێژکارێکی ڕاهاتوو و سارد و گەرم چەشتوو بەردەوام لەکەناری فەرەحدا بووم و پلانەکانی

ئەشرەفم هەڵدەوەشاندەوە کە زۆرێکیان بریتی بوو لە تورەکردن و بێتاقەتکردنی فەرەح و منیش بەردەوام بە پێدانی ئامۆژگاری و ڕێنوێنی رۆحی، بەرگری و ورەم لەناو فەرەحدا بەرز دەکردەوە.

پاش لەدایکبوونی ڕەزا، ئەشرەف وازی لەم نمایشانەی هێنا و پاشەکشێی کرد لەناو قەڵەمڕەوی ژیانی فەرەحدا.

بەدرێژای ژیانی هاوبەشی فەرەح و محمد ڕەزا، کچەکەم و ئەشرەف لەسەر بنەما و ڕێکەوتنێکی نەنوسراو، دەستوەردانیان نەکرد لە کاروبارەکانی یەکتری.

ئێستا هەر بەو بۆنەیەوە کە باسێکی خوالێخۆشبوو (فروغ خواجە نوری)یشم کرد، داوا دەکەم ڕێگەم پێ بدەی تاوەکو بەشێك لەو بابەتانەش باس بکەم کە خودی فروغ خواجە نوری گەڕاندویەتیەوە بۆم.

یەکێك لەو بابەتانە پەیوەندی بە خۆشەویستی نێوان ئەشرەف و سەرمایەداری ئەرمەنی (لیئۆن پالانچیان)ەوەیە. (لیئۆن پالانچیان) کۆمپانیایەکی بیناسازی و ڕێگەوبانی هەبوو. ئەم کابرایە لەلایەن گۆرانیبێژ (ڤیگن)ەوە ناسرابوو بوو ئەشرەف.

زووبەزوو کاری دڵداری و خۆشەویستی ئەشرەف و لیئۆن پالانچیان کە هەندێك سەروچاوی جوانی هەبوو، گەیشتە ڕادەیەك کە ئەشەرەف بەشێك لە زەوییە میراتیەکانی خۆی لە رامسەر بەخشی بە پالانچیان. ئەم زەویانە لە تەنیشت میوانسەرای بەناوبانگی رامسەردا بوون.

لەو سەردەمەدا ئەشرەف هێشتا لەگەڵ مهدی بوشەهری هاوسەرگیری نەکردبوو.

ئەشرەف هەموو کاتەکانی خۆی لەگەڵ لیئۆندا دەگوزەراند. وابزانم ساڵی ۱۹٦۳ بوو کە باسی ئەوە کرا کە ڕێگەیەکی تازە دروست دەکرێت کە تاران دەبەستێوە بە (ئامل)ەوە

فروغ کە ئاگاداری هەموو نهێنی و لایەنەکانی ژیانی ئەشرەف بوو، باسی ئەوەی کرد بۆم کە پالانچیان لەگەڵ محمود ڕەزا پەهلەوی بووە بە شەریك (و پشکێکیشی داوە بە مەجید بەختیار) و ئەشرەفیان خستوەتە پێشەوە تاوەکو لە دامەزراوەی بەرنامە و بوجە، کە سەرۆکەکەی ئەبوالحسن ئیبتهاجی هەڵبژێردراوی ئەشرەف بوو، بوجەیەکی گەورە بۆ دروستکردنی ئەم ڕێگە سێیەمەی مازندەران تەرخان بکات.

بە فشاری ئەشرەف، ئیبتهاج کە ئەشرەف لەلای هەمووکەس بە (ئەبول خان)! بانگی دەکرد، بوجەی دروستکردنی جادەی هەرازی دابین کرد و تەسلیمی پانچیانی کرد.

پالانچیان ئەرمەنی لە ماوەیەکی زۆر کورتدا جادەیەکی خراپ و ناستانداردی دروستکرد و تەسلیمی کرد.

هاوکاتیش بە پێشکەوتنی ئیشوکارەکانی جادەی هراز، دروستکردنی کۆشکێکی تازەش بۆ ئەشرەف دەستپێکرد تاوەکو لەکاتی کردنەوەی جادەی هراز، ئەشرەف لەم ڕێگە تازەیەوە بڕوات بۆ شهرستان نور بۆ کۆشکە تازەکەی.

پاش کردنەوەی جادەی هراز (هەراز) لەسەر دابەشکردنی قازانی پرۆژەکە، ناکۆکی و جەنگێکی گەرم کەوتە نێوان ئەشرەف، پالانچیان، محمود ڕەزا پەهلەوی و ئەبو الحسن ئیبتهاجەوە.

پالانچیان کە کۆشکێکی گەورەی چەند سەد مەترێکی بۆ ئەشرەف دروستکردبوو دەیوت پرۆژەکەی هەراز هیچ قازانجێکی بۆ ئەو نەبووە و بەڵکو زەرەریشی هەبووە.

ئەشرەف و محمود ڕەزاش نەدەچوونە ژێر بارەوە و داوای حەق و حقوقی خۆیان دەکرد.

ئەشرەف ماوەیەك لەگەڵ پالانچیان قسەی نەکرد و فەرمانیدا ڕێگەی نەدەن بێتە ناو کۆشکەوە. لەکۆتاییدا پاش چەند مانگێك لە سارد و سڕی پەیوەندی ئەو دووانە، مەجید بەختیار و ئەبوئەلحەسەن ئیبتهاج بوونە هۆی ئەوەی دووبارە ئەم دوو کەسە ئاشت ببنەوە و پەیوەندی دروستبکەنەوە.

ئەشرەف کە وایدەزانی پالانچیان لەسەر شەڕی شەیتان دابەزیوە و دەیەوێت حەق و حسابەکەی پێ بدات قبوڵی کرد کە لە (نور) چاوی بە پالانچیان بکەوێت.

لەلایەکی دیکەشەوە پالانچیان وابیری دەکردەوە بەم دیدارە و تازەبوونەوەی دیدارەکان ئاگری خۆشەویستی ئەشرەف دووبارە کڵپە دەسێنێتەوە بۆی و ئەشرەف بەشکەی خۆی پێ دەبەخشێت!

بەلاَم بەم شێوەیە دەرنەچوو و لەو دانیشتنەی کە فروغ خواجە نوریش ئامادەبوو ئەشـرەف لیئـۆنی بـە دز نـاوبرد و ئەوەشـی هێنـاوە بەگوێیـدا کـە ڕایدەکێـشێتە نـاو دادگاوە.

چەند کاتژمێرێك پاش ئەم چاوپێکەوتنە، هەواڵیاندا کە (لیئۆن پالانچیان) لـەکاتی ڕۆیشتنی لە (نور) بـەرەو رامسەر بە فڕۆکە بچوکە یـەك ماتۆڕیەکـەی (سنا) کە خۆی لێی دەخوڕی توشی گرفت بووە و کەوتوەتە ناو دەریای مازندەرانەوە.

هـەرگیز نـەتوانرا جەسـتەکەی بدۆزرێتـەوە و هـیچ پاشماوەیـەکیش لـە فڕۆکەکـەی نەدۆزرایەوە.

من هەرگیز لەو پلەیەدا نیم کە تۆمەت دروستبکەم بۆ جەنابی خاتو ئەشرەف. بەلاَم پێویستە بڵێم کە ئەشرەف بە زمانی خۆی چەندینجار لە بەردەم خەڵکی جۆراوجۆر و لەوانەش لەبەردەم مندا وتویەتی کە زەڕەیەك هەستی ژنانە و نـەرمی نیـە(!) چەندین جـار وتویـەتی: (دەبوایـە خوداوەنـد منـی بـە پیـاو دروسـتبکردایە چـونکە هـەموو تایبەتمەندیەکانی ڕەزاشام بە میرات بردوە)

دایکی (تاج الملوك)یش بەو شێوەیە بە زاری تورکی دەیوت: (جنسی محمد ڕەزا و ئەشرەف هەڵەی تێدا کراوە!)

بیـستم ئێـستا کۆشـکەکانی سـەڵتەنەتی ئێـران گـۆڕاون بـۆ مۆزەخانـە و خـەڵکی دەتوانن بە کڕینی بلیتی هەرزان سەردانی ئەم کۆشکانە بکەن.

هەرچەندە ئـەم کۆشـکانە کەلوپـەلی زۆریـان تێدایە بـۆ بینین بـەلاَم خـاڵین لـە رۆح و ناتوانرێـت باسـی هـەموو ئـەو شـتانە بکرێـت کـە لەناویانـدا ڕوویانـداوە و هـاتووە بەسەریاندا.

لەوانەیـە گەشـتیارەکان و ئـەو کەسـانەی کـە سـەردانی ئـەم کۆشـکە تـازە و جـوان و کەلوپەلە ڕازاوانە دەکەن لەوانەیە لە مێشکیاندا وابیر بکەنەوە کە خەڵکی ئەم کۆشکانە لە ڕەگەزی مرۆڤ نەبوون.

بەلاَم ئەشرەف، غلامرەزا، محمود ڕەزا، ئەحمەد ڕەزا و ئەندامەکانی دیکەی خێزانی پەهلەویش هـەموو تایبەتمەنـدی و ئەخلاقـەکانی مرۆڤـی ئاساییان تێدا بـوو و ژیـانی

نەجیبزادەی و خانەدانی نەیتوانی تەنانەت ناوەرۆکی و ماهیەتی سەرەتاییشان بگۆڕێت.

من سەرم سوڕدەما کاتێك دەمبیست کە خەڵکی گشتی و ئاسای بەهۆی گەشەکردنی خوێندەواری و ڕۆشنبیری کۆمەڵگەوە، وازیان لە خۆرافات و باوەڕە کۆنەکان هێناوە، کەچی ئەشرەف جنۆکەگیر و ساحری دەهێنا بۆ کۆشك و لەگەڵ برا و خوشکەکانی دادەنیشتن و کاری فاڵگریان ساز دەکرد!

فروغ خواجە باسی ئەوەی بۆ کردم کە چۆن فاڵگرێکی مفەوەزی سوپا لە دانیشتنێکدا بانگەشەی ئەوەی کردوە کە دەتوانێت ڕۆحەکان بانگ بکات، بۆیە بە ئامادەبوونی ئەشرەف و برا و خوشکەکانی دەست دەکات بە بانگ کردنی ڕۆحی ڕەزاشا!

یەکێکی دیکە لە کێشە ئەخلاقیەکانی ئەشرەف بریتی بوو لە قومارکردنی لە ڕادەبەدەر. من هەمیشە ڕقم لە قومار و مەشروب و جگەرە و هاوشێوەکانی و مادە سڕکەرەکان بوو. کچەکەشم بەهیچ شێوەیەك لێوی لە جگەرە و مەشروب نەدەدا و ئەهلی قومار و مادە سڕکەرەکانیش نەبوو. (هەرچەندە محمد ڕەزا هەندێك کات لیوانێك گێلاسی کنیاکی فەرەنسی دەخواردەوە و باوەڕی وابوو کە کنیاك بەتایبەتی جۆری (کوری ڤایزەر)ی بۆ چاو زۆر باشە!)

ئەشرەف زۆربەی شەوانی هاوینانی لە ڕستۆرانی دەربەند مەجلیسی قوماری دروستدەکرد و لە زستانانیشدا ئەم مەجلیس و بەزم و ڕەزمەی لە کۆشکە تایبەتیەکەیدا ساز دەکرد.

هەرکەسێك بانگهێشت بکرایە بۆ ئەم مەجلیسی قومارە وەکو ڕۆژی ڕووناك بۆی ڕوون بوو کە تەنانەت ئەگەر باشترین قومارچیش بوایە دەبوو بەجۆرێك یاریەکە بکات کە ڕێژەیەکی زۆری پارە بدۆڕێنێت بە ئەشرەف.

لەمە زیاتر نامەوێت لەبارەی ئەشرەفەوە قسە بکەم. ئەگەر لە کتێبی یادەوەریەکانی بێ بەزەییانە ڕەخنەی لە کچەکەم نەگرتایە و فەرەحی تاوانبار نەکردایە بەوەی کە کاریگەری هەبووە لەسەر محمد ڕەزا لەسەر دەرکردنی بڕیارەکان سەبارەت بە وڵات، ئەم چەند ڕستەشم باس نەدەکرد.

بۆ من جێگەی باوەڕکردن نەبوو کە کاتێك بینیم جەنابی خاتو ئەشرەف فەرەح تاوانبار دەکات بە دروستکردنی گروپێکی تایبەتی لە دەوروبەری شا لە (خێزانی دیبا) و کۆمەڵێك لە هاوپۆلە پێشینەکانی لە فەرەنسا و چەتاوەڕوانەش کچەکمە بە (گەدا زادە) و بنەچە هەژار و منیش بە......... ناوبەرێت)[1]

ئەم ژنە لەبیری چووەتەوە کە باوکی (ڕەزاشای ڕەحمەتی) پاسەوانی سەفارەتی بەریتانیا و پاشانیش جەندەرمەیەکی سادە بوو و بەهۆی یاری ڕۆژگارەوە گەیشتە سەڵتەنەتی.

من ئەمە بۆ ئەوە ناڵێم کە سوکایەتی بە خێزانی پەهلەوی بکەم. تەنها ئەوە وەبیر دەهێنمەوە کە ئەگەر کچەکەم منداڵی پاسەوانێکی سادەی سوپا بوو بێت ئەوا ئەشرەف و برا و خوشکەکانیشی منداڵی قەزاقستانێکی سادە بوون کە باوکیان لە پلەی سەربازیدا بەرپرسیاریەتی کەمتر بووە لە باوکی فەرەح.

پاش سەرکەوتنی شۆڕشگێڕەکان لە ئێران کە بووە هۆی هەڵهاتنی محمد ڕەزا و کچەکەم، هەموو کەس هەوڵیدەدا تاوانی کەوتنی دەسەڵاتی سەڵتەنەتی بخەنە ئەستۆی یەکتری.

محمد ڕەزا دەستی ئەمریکا و بەریتانیا، کۆمپانیا نەوتیەکان و چەك فرۆشەکان بە هۆکارێك دەزانێت بۆ کەوتنی حکومەتەکەی. ئەشرەف و برا و خوشکەکانی پشتگیری سەرۆك کارتەریان بۆ بەدەستهێنانی مافی مرۆڤ لە ئێراندا بە هۆکاری یاخیگەری خەڵك و ڕاپەڕینی ئێران دەزانی. هەندێك لە سیاسەتمەندارەکانیش وەکو بەڕێز جەمشید ئاموزگار، جەعفەر شەریف ئیمامی و هیتد هۆکاری ڕووخانی حکومەتەکەیان دەگەڕاندەوە بۆ لاوازی و سیستی دەسەلاتی هەویدا کە نزیکەی سیانزەساڵ سەرۆك وەزیران بوو، و بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکی لێ ڕاپەڕێت، بەکورتی هەمووکەس هەوڵیدەدا خۆی پاك و بێ بەری بکات و خاڵی هەڵە و تاوانەکان بخاتە ئەستۆی ئەوی دیکە! (چیرۆکی کێ بوو کێ بوو من نەبووم!...)

---

[1] – لەبەر ڕەچاوی گشتی ئەم وشە ناشیرینە پیسەم لابردوە.

بەهیچ جۆرێك بەم شێوەیە نیە. هەموو ئەو کەسانەی کە چ سەربازی بوون و چ مەدەنی بوون بەو ڕادەیەی کە بەرپرسیاریەتیان هەبووە لە حکومەت و بەڕێوەبردنی دەسەلاّتدا ڕۆلّیان هەبووە لە کاندانی ژێر پێی حکومەتی پەهلەوی.

بە تازەیش دەبینم هەندێك لە یاداشت نوسەکان (ژەنراڵ قرەباغی)یان بە خائین ناساندوە و وتویانە: (دەرکردنی بەیاننامەی فەرماندەیی گشتی لەسەر بنەمای بێ لایەنی سوپا لەلایەن ژەنراڵ عباس قرەباغیەوە بەرامبەر بەو ڕاپەڕینەی خەڵکی لەدژی دەسەلاّت، بووە هۆی لاوازی ڕۆحەیەتی سوپا و بێ هەلّوێستیان لەبەرامبەر کەوتنی ڕژێمی شانهشاهی!)

بە بۆچوونی من نوسەرانی ئەم جۆرە بابەتە بێ ئاگان لە پەیبردن و هەستی سیاسی و زانیارێکی ئەوتۆیان نیە لەبواری سیاسیدا. زۆر پێش ئەوەی کە ژەنراڵ قرەباغی ئەو بەیاننامەیە بلاّو بکاتەوە سوپا چووبوویە ڕیزی خەلّکەوە و ئێمە زانیاری ئەوەمان هەبوو کە سەربازەکان پاش تەواوبوونی ئەرکەکانیان بە جلی مەدەنیەوە دەهاتنەوە ناو خەلّکی گشتیەوە و ئەوانیش دەبوونە یەکێك لە ئەندامانی خۆپیشاندەرەکان.

تەنانەت زۆرێك لەو کەسانەی سوپا کە هەلّهاتبوون چەك و ڤەنگەکانیان تەسلیمی شۆڕشگێڕەکان دەکرد!

کەواتە تێبینی بکە بزانە عباس قرەباغی بۆچی ئەو بەیانەی دەرکرد بۆ ئەوەی سەربازەکان بگەڕێنێتەوە بۆ بنکەکانیان و لەو ڕێگەیەوە بتوانێت ڕێگە بگرێت لەوەی کە ئەو سەربازانە نەچنە ناو خەلّکی شۆڕشگێڕەوە و دەرکردنی ئەو بەیاننامەیەش ڕێگەیەکی نهێنی بوو بۆ دەرچوونی سوپا لەو تەنگەژە و قەیرانە.

ئێستا، پاش تێپەڕینی نزیکەی بیست ساڵ، ئەو پیاوە سیاسی و سەربازیانەی حکومەتی پەهلەوی کە لە ڕۆژئاوادا دەژین کەوتوونەتە گیانی یەکتر و هەریەکەیان ئەوی دیکە بە خائین دەزانێت و بە هۆکاری لەناوچوونی حکومەت و دەسەلاّتەکەی دەزانێت.

لەو سەرۆك وەزیران و وەزیرە نەزان و پیر و فەوتاو و بەرپرسە پیرە سەربازیانە لەوە زیاتر چاوەڕوان نەدەکرا (لەو قوڕە ئەوەندە تۆز هەلّدەستێت). بەلاّم لەکاتێکدا کە

خاتو ئەشرەف و جەنابی خاتو شەمسە یان شاهپور و غلامرەزا کە لەناو ڕووداوەکاندا بوون بۆچی دەبێت بەم شێوە بێ پەروایانە تۆمەت و درۆ بۆ خەڵکانی دیکە بتاشن؟

بەڕاستی زۆر بەداخم، بۆ ئەم شێوە بیرکردنەوەیە.

خراپتر لەوە کەسانی وەکو ئەمیر عباس هەویدا، ژەنراڵ حسین فردوست، ژەنراڵ نعمت الله نصیری و نموونەی ئەمانە کە دەستیان لە دنیا بڕاوە و لەتوانایاندا نیە پارێزگاری لەخۆیان بکەن، هێرشی ناجوامێرانە دەکەن.

واز لەهەموو ئەمانە بهێنە. من و کچەکەم (فەرەح) چ تاوانێکمان ئەنجامداوە؟

هەموو خێزانی دیبا بژمێریت دە کەس نابن.

خاتو ئەشرەف کە هێشتا، من ئێستاش بە جەنابی حەزرەتی خاتو ئەشەرف بانگی دەکەم و ڕێزی لێ دەگرم دەڵێت: (فەرەح و دایکی هەموو دیباکانیان لە هەموو شوێنێکی ئێراندا کۆ کردبویەوە و هێنابوونیان بۆ کۆشک و کۆمەڵەیەکیان لێ پێکهێنابوون!)

یان لە شوێنێکی دیکە لە کتێبی یاداشتەکەی خۆیدا دەنوسێت: (فەرەح کۆمەڵێک تودەیی کە هاوپۆلی پێشووی بوون لە پاریس هێنابوون بۆ دەربار و کردبوونیە بەڕێوەبەر و بەرپرس لە دەوروبەری خۆیدا).

یان لە بەشێکی دیکەی یاداشتەکانیدا دەنوسێت: (رەزا قطبی کوڕی خاڵۆی فەرەح شاهنشای هەڵخەڵەتاند تاوەکو ئەو نامەیەی هەڵەم کرد- بمبەخشن لە تەلەفزیۆن بخوێنێتەوە!)[1]

ئەگەر ئەم قسانە کەسێکی بێ ئاگا بیکردنایە من هیچ کاردانەوەیەکم نەدەبوو. هیچکەس ئەوەندەی خاتو ئەشەرف ئاگاداری بەڕێوەبردنی وڵات نەبوو. ئەم خۆی لە

---

[1] -خودی محمد ڕەزاشا لە کتێبی (وەڵام بۆ مێژوو) لە باسی ئەو وتارەی کە لە تەلەفزیۆن لە سەروبەندی خۆپیشاندانەکەدا پێشکەشی کرد لە بارەی ئەوەی کە داوای لێبوردنی کرد و لەو قسە بەناوبانگەی کە دەڵێت (پەیامی شۆڕشەکەی ئێوەم بیست) باسی ئەوە دەکات دەڵێت: (دەقی ئەم وتارە ڕەزا قطبی نوسیبووی و من تاوەکو پێش ئەم وتارە ئاگاداری ناوەرۆکی ئەم وتارە نەبووم. محمد ڕەزا لە کتێبەکەیدا ڕەزا قطبی و کۆمەڵێک لە دەوروبەرەکانی فەرەح بە بێ توانا و کەمتەرخەم دەزانێت کە ڕۆڵیان هەبوو لەوەی کە سەڵتەنەت بەرەو هەرەس بەرن.

هەمووکەس باشتر دەزانێت، هەڵەی کارەکە تەنها و تەنها برا تاجدارەکەیان بوو کە ڕێگـەی دەدا، خاتوونـەکان لەوانـە ئەشـرەف و منداڵـەکانی بـەبێ بـەرگری و ڕووبەڕووبوونەوە سەرپێچی یاسا و بڕیارەکان بکەن لە وڵات و تەنانەت لە دەرەوەی وڵاتیش.

ئەگەر هەویدا کەمتەرخەم بوو بێت، ئەگەر ژەنراڵ قرەباغی بێ توانا بوو بێت، ئەگەر ژەنـراڵ فردوسـت هۆکارێـك بـوو بـۆ ڕێگەخۆشـکردنی ئینگلیزەکـان، ئەگـەر جەعفـەر شـەریف ئیمـامی ماسـۆنی بـوو بێـت، ئەگـەر زۆربـەی پلـە دارە یەکەمینـەکان کەسـانی کەمتەرخـەم ، بـێ توانـا ، ماسـۆنی و جاسـوس و خـائین بـووبن و بەرپرسـیاریەتی کاروبـاری وڵات و سـوپا لـە ئەسـتۆیاندا بووبێـت. کەواتـە خـودی ئەشـرەف و بـرا و خوشکەکانیشی کەمتەرخـەم بـوون، چونکە هـەموویان ڕۆڵیـان هـەبوو لـە هاتنـە سـەر دەسـەڵاتی ئەو کەسـانەی کە نـاوم بـردن بە نهێنـی و ئاشکرا پشتیوانیان کـردوون بۆ ئەوەی ئەو پۆستانە بەدەست بهێنن.

جگە لـە سـەرۆك وەزیـران کە بە هەڵبـژاردن و دیـاریکردنی شەخسی محمـد ڕەزا و وڵاتـانی دەرەوە (زیـاتر ئـەمریکا و بـەریتانیا) هەڵدەبـژێردرا، ئیـدی وەزیرەکـان و تەنانــەت جێگــری وەزیــر و ســەفیرەکانی ئێــران لــە دەرەوە و ســـیناتۆرە هەڵبـژێردراوەکانیش بـە ئاگـاداری خـاتو ئەشـرەف و خانەدانـەکانی دیکـەی پەهلـەوی هەڵدەبژێردران.

بۆ نمونە، ئاماژە بە بەڕێز مین باشیان (مهرداد پهلبد) دەکەم کە سەنەدی وەزارەتـی ئیتلاعـات و گەشـتیاری بـەناوی ئـەوە لێـدرا بـوو و لەبەرئـەوەی کـە مهـرداد پهلبـد هاوسەری حەزرەتی شەمسە بوو لەناو هـەموو ئـەو دەسـتە و بەرپرسـانەی دەوڵـەت کە دەهاتن و دەچوون جێگەیەکی جێگیری خۆی هەبوو!

لەم جۆرە نمونانە زۆرن کە خودی خەڵکیش ئاگادارن. لەبەرئەوە زۆر نامەردی و بێ ماناییـە کـە هـەموو تاوانـەکان بخرێنـە ئەسـتۆ محمـد ڕەزا و یـان کـچەکەم. بەتایبـەتی لـەبارەی کـچەکەوە دەبێـت ئـەم خاڵـە بـەو پـەڕی ڕاسـتگۆییەوە بـاس بکـەم کـە (فـەرەح) تـەنها لـە نوسینگەکەی خـۆی و لـەم کۆتاییانـەش لە سـەنتەری ڕۆشنبیری نیاوەران و تـــاوەکو ڕادەیــەکیش لــە بــواری ســەنتەری پــەروەردە و پێگەیانــدنی منــداڵان و

نەوجەواناندا دەستوەردانی دەکرد، و ئیدی هیچ دەستێوەردانێکی لە کاروباری وڵات وەرنەدەدا.

بەشداریکردنی لە مەراسیمەکانی ئیفتیتاحیەکان و سەردانەکانی بۆ ناوەندە کۆمەڵایەتیەکانیش بە فەرمانی محمد ڕەزا بوو. خودی خۆی چەندین جار دەیوت: (من بوکەڵەیەکەم بە دەست محمد ڕەزاوە!)

باشە، بەسە، ئێستا ڕێگام دەن کەمێکیش لە بارەی جەنابی خاتو (شەمسە)شەوە قسە بکەم.

شەمسە پەهلەوی زۆر حەزی بە بەڕێوەبردن و دەستێوەردانی کاروباری سیاسی نەبوو، بەڵام بێ ڕادە پارە پەرست و حەزی لە مادە بوو. حەزی لە هەمووشتێك هەبوو و بێ کۆتاییش هەمووشتێکی دەویست!

بۆ نمونە لە کۆشکی مهر شهر چەند هەزار دەستە جلی هەبوو! لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر پێڵاو کە ژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی ٣ هەزار!

شەمسە ئەم حەزی کۆکردنەوەی گوێرەوی و جل و بەرگ و پێڵاوەی لەلایەن هاوسەری سەرۆك کۆماری فیلیپینەوە وەرگرتبوو.

تەنها هاوڕێیەتی کەسانێکی دەکرد کە قازانجی مادیان هەبووبێت بۆی!

لەناو هاوڕێکانیدا کەسانێك دەبینران کە تەنها خاڵی هاوبەشیان پارەداری بوو.

حەبیب ثابت (پاسال)، حەبیب ئیلقانیان، هژبر یزدانی، محمود خیامی، علی ڕەزایی، لاجوردی و چەند سەرمایەدارێکی بازاڕی تاران بەشێك بوون لە هاوڕێ گیانی بەگیانیەکانی.

ئەوەی کە ئێمە دەمانزانی و دڵنیابووین لێی، ئەوە بوو کە شەمسە لە بواری کاروباری ئابوریدا لەگەڵ ئەم کەسانەدا بەشدار بوو. هەڵبەتە هیچ سەرمایەیەکی بەوان نەدەدا. بەڵکو لە بواری پەیوەست بە هاوردەنی و ناردەنی هاوکاری دەکردن تاوەکو سەرپێچی بکەن لە یاسا یان دەسەڵاتی خۆی بەکاربهێنێت بۆیان تاوەکو قەرزی گەورەیان بۆ وەرگرێت لەلایەن دەوڵەتەوە!

بەمانایەکی دیکە کاری ڕێکخستنی دەکرد و لەو کارەش بڕێکی وەردەگرت!

شەمسەش، وەکو خوشکەکەی ئەشرەف، سێ جار هاوسەرگیری کردوە. پیاوی یەکەمی (جەم) بوو و دواتریان ئەمریکێك بوو بەناوی (وینسنت هیلەر) و جاری سێیەمیشیان لەگەڵ (مهرداد پهبلد) بوو. بەهەمان شێوە بۆ شەمسەش گەورەترین گەلەی و نارەحەتی من و فەرەح ئەوە بوو لەگەڵ خوشکەکەی ئەشەرەف بۆ نزیکبوونەوەی زیاتر لە محمد ڕەزا و کاریگەری خستنە سەری و سود لێ وەرگرتنی لە دەسەڵاتی برا تاجدارەکەیان هەوڵیاندەدا ژیانی ژن و مێردایەتی محمد ڕەزا بخەنە مەترسیەوە و هیچ سودێکیشیان لەم کارە وەرنەدەگرت.

ناچارم چەند لاپەڕەیەك- و تەنها چەند لاپەڕەیەك- لە دۆسیەی جەنابی خاتو شەمسە هەڵبدەمەوە تاوەکو خەڵکی بە ڕوونی ببینن کە کچەکەی من وەکو شاژنی ئێران و هاوسەری شا هەرگیز ژنێکی خۆشبەخت نەبووە.

بە باسی معامەلەکانی شەمسە نامەوێت سەرکۆنەی بکەم بەوەی حەزی بۆ کردنەوەی پارە و سەرمایە هەبووە. ئامانجم ئەوەیە کە خەڵکی ئاگادار بکەمەوە لە ترسنۆکی ڕۆحی و بچوکی خاتو شەمسە. چونکە کەسێك بۆ کۆ کردنەوەی پارە هەرچی نایاسای بێت ئەنجامی بدات، ئەوە گرنگ نیە بەلایەوە کە ژیانی ژن و مێردایەتی براکەی وێران بکات یان دەست بە تاوانیش بکات.

شەمسە دەستێوەردانەکانی لە کاروباری بازرگانی یان بێ پەردەتر بیڵێم: (کاری دەلاڵی و ڕێکخستن!) لە ئەشرەفی خوشکیەوە فێربووبوو.

هەر تاجرێك کە بۆ هاوردەنی کاڵا توشی کێشە ببوایە و بیویستایە بەبێ گومرگ کاڵایەکی زۆربهێنایە ناو وڵاتەوە و دینارێك نەدات بە دەوڵەت دەچوو بۆلای خاتو ئەشەرەف یان خاتو شەمسە!

هەر سەرمایەدار و خاوەن کارگەیەك توشی کێشەیەکی ئابوری ببوایە دەچوو بەشوێن یەکێك لەم دوو کەسەدا.

لەوانەیە بپرسیت بۆچی دەچوون بەدووی ئەشەرەف و شەمسەدا بەڵام نەدەچوون بەشوێن غلامرەزا یان ئەحمد ڕەزا و براکانی دیکەی محمد ڕەزادا؟

دەبێت ئەوە بڵێم لەبەر ئەوەی کە محمد ڕەزا کەسێك بوو کە یەکەم منداڵی ڕەزا شا و وەلیعەهدی بوو زۆر زوو بووە جێگەی سەرنجی. هەر ئەمەش وای کرد کە محمد ڕەزا هەندێك بە نازپەروەر گەورە بکرێت.

خوشکەکانیشی زۆر گرنگیان پێ دەدا. بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر دەبێت بڵێم هەرکاتێك کە ئەشەرف محمد ڕەزای ببینایە، تەنانەت لەناو بۆنە و لەبەردەم پیاوە سیاسیەکان و سەربازیەکانیشدا، ڕاستەوخۆ بە قوربان و بەساقە دەچوو بە پیریەوە. شەمسەش بەشێوەیەك باوەشی دەکرد بە محمد ڕەزادا و ماچی دەکرد کە زیاتر ماچەکانی لە شێوەی لێسینەوەدا بوون! (هەر چۆن سەگ و پشیلە مرۆڤ دەلێسنەوە بەوشێوەیە!)

لەبەرامبەر ئەم دەربڕینی خۆشەویستیانە، محمد ڕەزاش لە بەرامبەردا خوشکەکانی زیاتر لە براکانی خۆشدەویست.

هەمووکەس دەزانێت کە لەنێوان خوشك و براکانی محمد ڕەزا تەنها ئەشرەف و شەمسە بوون کە لەسەردەمی فەرمانڕەوای محمد ڕەزادا بۆ خۆیان کۆشکی ڕازاوە و جوانیان دروستکرد. (تێچوونی ئەم کۆشکانە کە پارەیەکی زۆر بوو محمد ڕەزا دابینی کرد.) بەڵام براکانی دیکەی محمد ڕەزا هەر لە کۆشکە کۆنەکانی سەردەمی ڕەزاشادا دەژیان. تەنانەت حەمید ڕەزا پەهلەوی لە دەرەوەی کۆشکەکانی سەڵتەنەتنی و لە ماڵێکی ئاسای لە تاران پارس لە (ڕۆژهەڵاتی تاران) دەژیا.

محمد ڕەزا بەهیچ شێوەیەك لەبەرامبەر سەرپێچی و یاسا شکێنەکانی خوشکەکانی دەمی نەدەکردەوە، بەڵام تەنانەت بە سمێڵەکانی شاهپیور غلامرەزاش هەستیار و بێتاقەت بوو.

(جارێکیان غلامرەزا سمێڵی هێشتبوویەوە و هەستی دەکرد کە زۆر ویقاری هەیە و زۆر جوانی لێ دێت! محمد ڕەزا لەناو کۆمەڵێکی زۆر سەرزەنشتی کرد و وتی: (یان برۆ سمێڵەکانت بتاشە یان ئیدی جارێکی دیکە نەت بینم لەم شوێنانەدا!)

بەگشتی محمد ڕەزا لەبەرامبەر ژناندا زۆر ملکەچ و لێبوردە و تەسلیم بوو. بەڵام بۆچی؟ من نازانم. چونکە دەروونناس نیم.

لێرەدا دەبێت بە ڕاشکاوانە و بەو پەڕی داخ و پەژارەوە بڵێم کە ئەشرەف و شەمسەش کاریان بۆ براکەیان دەکرد و ژن و کچی جوانیان پێ دەناساند. من و فەرەح دەمانزانی هەندێکجار شەمسە و ئەشرەف کچی جوان دەخەنە ناو داوەوە بانگهێشتیان دەکەن بۆ کۆشکەکانی خۆیان و سودیان لێ وەردەگرن بۆ مەرامەکانی محمد ڕەزا!

شەمسە چی دەکرد؟

نمونەیەکی لەبارەوە باس دەکەم.

بازرگانێکی ناسراو کارگەیەکی گەورەی دروستکردنی پسکیت و شیرنی و چکلیتی هەبوو ڕێژەیەکی زۆری شیری وشکی ئاژەڵداری هاوردە کردبوو و بەو شیرە پسکیت و شیرنی زۆری دروستکردبوو و دابووی بە خەڵکی بێ نەوا و داماو و هەژار!

دیارە شیری وشکی ئاژەڵداری کە بەتایبەتی بۆ پێگەیاندنی بێچوە گوێرەکە و بێچوە ئەسپ و یان ماین بەکار دێت بەهیچ شێوەیەك بۆ مرۆڤ ناشێت!

وەزارەتی تەندروستی، ماوەیەك دواتر، ئاگاداری ئەم بابەتە بوو و داوای یاسای لەسەر ئەم پیاوە سەرمایەدارە تۆمار کرد.

کاری ئەم ڕسواییە گەیشتە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکانی ئیتلاعات و کەیهان، وەزارەتی داد ناچار بوو محاکەمەیەکی ڕووکەشی ئەم تاوانبارە بکات!

لە دادگادا دەرکەوت کە ئەم سەرمایەدارە چەندین ساڵە خەریکی ئەم کارەیەوە و زۆرێك لە خەڵك چەندین ساڵە منداڵە پاك و بێ تاوانەکانیان بەم شیری بەخێوکردنی ئاژەڵە گەورە دەکەن!

ئاشکرایە کە بازرگانی بێ بەزەیی بەهۆی ئەم کارە نائینسانیەوە ڕێژەیەکی زۆری پارەی پەیدا کردبوو.

دادگا بە جەریمەیەکی نەقدی و پێنج ساڵ حوکمیدا. بەڵام بەو پەڕی سەرسامیەوە بینیمان چەند هەفتەیەك دواتر و بێ دەنگ ئەم کابراییان لە زینداندا هێنایە دەرەوە و ئازادیان کرد!

من لەبارەی شێوەی ئازادکردن و بەرەڵاکردنەکەیەوە پرسیارم کرد و زانیاریم دەستکەوت کە لەسەر پێشنیاری (شەمسە) وەزیری داد (غلامرەزا کیانپور) ئەم زیندانیەی ئازادکردوە.

کارێکی دیکەی ناشیرین کە شەمسە ئەنجامی دەدا وەرگرتنی بڕێکی زۆر پارە بوو لەو کەسانەی کە کەلوپەلی گرانبەهای وەکو ئاڵتون و خشڵ و زێریان هاوردە دەکرد.

سەرمایەدارەکان فێربووبوون باج و پارەیەکی باشیان دەدا بە شەمسە و لەبەرامبەریشدا ئەو کاڵایانە بەناوی کاڵای کۆشك و دەربار و شاهنشاهیەوە هاوردەی وڵات دەکرد و بەم شێوەیەش ئەو کەسانە دەبەخشران لە هەرجۆرە گومرگ و باج و ڕسوماتێکی تایبەتی.

فەرەح، کە زیاتر لە من ئاگاداری پرسە نهێنیەکان بوو دەیوت: (ئەم دوو خوشکە لەبەرامبەر وەرگرتنی پارەی زۆر ڕێگە دەدەن بە بازرگانەکان بەبێ هیچ چاودێری و لێپرسینەوەیەك تەنها بۆ بەدەستهێنانی مەرامی قازانجی شەخسی خۆیان گرانبەهاترین و بەنرخترین کەلوپەلی کۆنی ئەم وڵاتە هەناردەی دەرەوە بکرێت بەمەرجێك سودێکی بۆ ئەمان تێدا بێت!)

بەداخەوە هیچکەس، تەنانەتن کچەکەشم جورئەتی ئەوەی نەبوو کە دەرئەنجامی ئەم کارە خراپەی ئەم خوشکانەی محمد ڕەزا بگەیەنێتە شا و ئاگاداری بکاتەوە.

ژمارەیەکی دیکە لەو سەرمایەدارانەی کە سودمەند بوون لە پشتوانی خوشکەکانی محمد ڕەزا، و بە چەتاوەڕووی و بە ئاشکرا کاریان دەکرد. بۆ نمونە سەرمایەدارێکی بەهایی بوو بەناوی (هژبر یزدانی) کە ڕۆیشتبوو بۆ کڕینی بانکێکی دەوڵەتی بەڵام لەبەر ئەوەی کە بەڕێوەبەری بانکەکە ناڕازی بووبوو بە پێشنیاری نرخەکەی ئەویش بە شەق و زلە هاتبوو بەسەر بەڕێوەبەرەکەدا و بە سەختی بریندار کردبوو!

(هژبر یزدانی) لە ناو بازنەی هاوڕێیان و نزیکەکانی (شەمسە پەهلەوی) بوو. من چەندینجار (هژبر) کە کەسێکی قەڵەوی کورتە باڵای دەموچاو ئاوساو بوو لەناو میوانیەکانی کۆشکی مهر شهردا بینیومە.

بەباوەڕی من، زیاتر لە کێکێکی خڕ دەچوو! مستیلەی گرانبەهای دەکردە پەنجەکانیەوە یەکێك لەو مستیلانە مستیلەیەکی ئەڵماس بوو کە نرخەکەی نزیکەی ٥

ملیۆن دۆلار بوو! (ئەو ئەڵماسە یەکێك بوو لەو ئەڵماسە دەگمەنانەی جیهان کە یەکێك بوو لەو بیست دانە ئەڵماسەی کە لە کانە ئەڵماسەکانی ئەفریقای باشور دۆزرابوویەوە و هژبر لەلای هەڕاجی فرۆشێکی لەندن کڕیبووی).

هژبر لە بەهاییە ناسراوەکانی ئێران بوو. بەهاییەکان سەروەت و سامانی خۆیان تەسلیمی ئەو کردبوو و هژبریش بەم سەرمایە و پارانە کاری دەکرد. هەڵە و سەرپێچی و یاساشکێنەکانی بەچەشنێك بوون کاتێك ویستی ناوچەیەکی ئاژەڵدری بکاتەوە لە سنگسەر گوندنشینەکان و زەویدارە مسوڵمانەکانی ئەو ناوچەیە بە زۆر لەو ناوچەیە دەریانکرد و دەستیان گرت بەسەر زەویەکاندا.

هژبر سەرەڕای ئاژەڵداری، بانکداری و کاری کشتوکاڵی، قاچاغیَ خشڵ و ئاڵتونی ئێرانیشی لە کۆنترۆڵی ئەودا بوو.

لای هیچکەس شاراوە نەبوو کە هژبر نەیدەتوانی بەبێ بوونی پشتیوانێکی بەهێز، بەو ئاسانیە بارە گرانبەهاکانی خۆی لەخاڵەکانی پشکنین و گومرگەکانی سەر مەرزدا دەربکات. محمد ڕەزا بۆ ئەوەی تاوانبار نەبێت بە پشتیوانی کردن لە بەهاییەکان هەرگیز ڕێگەی نەدەدا بە (هژبر) ئامادەی دانیشتن و میوانداریەکانی بێت. فەرەحیش زۆر بێزار بوو لێی. تەنانەت جارێکیان بە بۆنەی ساڵیادی لەدایکبوونی فەرەح، دەستەیەك خشڵی گرانبەهای کۆن کە دەگەڕانەوە بۆ سەردەمی کاترینای دووەمی (ئیمپراتریس نامی روسیا) وەکو خەڵات پێشکەشی فەرەحی کرد، بەڵام فەرەح قبوڵی نەکرد و ناردیەوە بۆی.

چەند هەفتەیەك دواتر، ئەم خشڵانەمان لە سەر و ملی شەمسەدا بینی و تێگەیشتین کە هژبر وەکو سوکایەتیەك بە کچەکەم، ئەم خشڵانەی بەخشیوە بە شەمسە.

شەمسە کاتێك هاوسەرگیری دووەمی کرد لەگەڵ (وینسنت هیلەر)ی ئەمریکی ئاینەکەی خۆی گۆڕی و بوو بە مەسیحی.

ئەشرەف تەنانەت ئیمانیشی بە مەسیحی نەبوو بەڵام وا خۆی پیشاندەدات کە ئیماندارە.

له حەوشەی کۆشکی تایبەتی خۆی لە مهر شهر لە کەرەج کەنیسەیەکی تایبەتی دروستکرد و یەکشەمان بەو شێوەیەی کە مەسیحەیەکان دەچوون بۆ کەنیسە ئەویش دەچوو بۆ کەنیسەکەی!

(جەنابی خاتو ئەشرەف بە پێچەوانەی شەمسەوە ئیمانی بە دینە ئیلاهیەکان نەبوو و ڕووی کردبوویە جادووگەری و خورافیات و لەناو ژوورەکان و تەلارەکانی کۆشکەکەی هەموو جۆرە پەیکەرێك و داتاشراوێکی پەیوەست بە خوداکانی (هیندۆ) و (شینتۆ) و شێوە و پارچەکانی پەیوەست بە خێڵە ئەفریقیەکان هەبوو.

جیاوازی ئەشرەف و شەمسە لەوەدا بوو کە ئەشرەف سەرەڕای کۆکردنەوەی سەرمایەداران، سیاسەتمەدارانیشی لەدەوری خۆیدا کۆدەکردەوە. بەڵام خاتو شەمسە هیچ کارێکی بە سیاسەت و سیاسەتمەدارانەوە نەبوو و تەنها سەرمایەدارە گەورەکانی لەخۆ دەگرت.

ژمارەیەك لە سەرمایەدارەکانی ئەو کاتی ئێران بەهایی بوون. بەهاییەکان لەبەر ئەوەی کە بەپێی یاسای ئێران نەیاندەتوانی بەشداری سیاسی بکەن هەوڵیاندەدا خۆیان لە بواری ئابوریدا ببینەوە و بە دامەزراندنی دامەزراوە دارایی و بانکیەکان پەرە بە چالاکیە ئابوریەکانی خۆیان بدەن و لەو ڕێگەیەوە بتوانن بگەن بە پێگە گەورەکان لە ئێراندا.

هژبر، لەڕووی ڕێژەی سامانی شەخسیەوە، کەسێکی ئەوەندە گەورە و جێگەی متمانە نەبوو، بەڵام پارە و داراییەکانی بەهاییەکان لەلای ئەو بوو و ئەویش بەم پارانە کاری دەکرد. بۆ نمونە بانکی صادراتی ئێرانی بە پارەی بەهاییەکان کڕی بوو.

هژبر یزدانی، حبیب ثابت (پاسال)، ئەدوارد چتایات، موسی رستکار، شعاع الله علایی، مراد ئەریە، لتف اللە حی، عزت الله عزیزی، عتاالله قەیدمی، زکرالله خادم و زۆرێکی دیکە لە سەرمایەدارانی بەهایی، لەگەڵ شەمسەدا پەیوەندیان هەبوو.

لەگەڵ ئەم کەسانەشدا دەبێت باسی جولەکە دەوڵەمەندەکانیش بکەم کە لەسەروی هەموویانەوە (حبیب الله ئیلقانیان) بوو.

هاتوچۆی ئەندامانی خێزانی محمد ڕەزا لەگەڵ بەهاییەکان و یەهودیەکان کاردانەوەیەکی خراپ و ناخۆشی لە کۆمەڵگەی ئێرانیدا هەبوو.

زۆربەی ئێرانیە مسوڵمانەکان، بەهاییەکانیان بە نەجەس دەزانی و سەبارەت بە جولەکەکانیش هەمان بۆچوونیان هەبوو.

بازاریەکانیش کە بیروباوەڕێکی مەزهەبی ئیسلامیان هەبوو کاتێک دەیانبینی کاروباری وڵات بەدەست دوژمنانی ئیسلامەوەیە کاردانەوەی توندیان هەبوو.

ماوەیەکی زۆر شوشەی ساردی پیپسی کۆلا کە موڵکی ثابت پاسال بوو دەیانشکاندن و داواش لە خەڵکی دەکرا ئەو ساردیانە نەخۆن و وازی لێ بهێنن!

بەتەواوی ڕوون و ئاشکرا بوو کە شەمسە، ئەشرەف، غلامرەزا، ئەحمەد ڕەزا، محمود ڕەزا و تەنانەت منداڵەکانیشیان بەرژەوەندیە شەخسیەکانی خۆیان بەلاوە گرنگتر بوو لە بەرژوەندیەکانی حکومەت و دەوڵەت. ئەمانە هەرچەندە دەیانزانی کە بەشداریپێکردنی بەهاییەکان و یەهودیەکان ناتوانرێت لە دیدی تیژی خەڵکی بشاردرێتەوە کەچی هەر هاوکاری خۆیان لەگەڵ گروپە یەهودیەکان و بەهاییەکان بەردەوامی پێ دەدا و پشتگیریان لە سەرمایەدارانی یەهودی و بەهایی دەکرد.

دەزگای ساواکیشس کە لە ژێر فەرمانی ژەنراڵ نعمت الله نصیریدا بوو، بووبوویە هۆکارێک بۆ پاراستنی ئاسایشی سەرمایەدارانی ئێرانی. چەندینجار کاتێک کە کرێکارانی کارگەکانی ثابت پاسال و ئیلقانیان دەستیان بە مانگرتن و خۆپیشاندان کرد ساواک کارمەندانی خۆی دەنارد بۆ سەرکەوتکردنی کرێکارانی برسی و هەژار کە داواکاریان زیادبوونی چەند تمەنێك بوو بۆ ئەوەی پارویەك نان پەیدا بکەن!

لە بۆنە و دانیشتنە تایبەتیەکاندا نصیریان بە (نعمتە کەر مل) بانگ دەکرا. ئەم ناوە محمد ڕەزا لێی نابوو.

محمد ڕەزا عادەتی وابوو کە ناوی تایبەتی لە کەسەکان دەنا و ناوی خۆشی بۆ دەدۆزینەوە و لە میوانیە تایبەتیەکاندا بۆ گاڵتە و خۆشی ئەوانی بەو ناوانەوە بانگ دەکرد. بۆ نمونە بە ژەنراڵ (فردوستی دەوت (کەر دوست)!

ئەشرەفیش لەم گاڵتانەی دەکرد و دەبووە هۆی خۆشی و شادی میوانەکان و میوانداریەکان.

لەبارەی حەزی لە ڕادەبەدەری جەنابی خاتو ئەشرەف بۆ (پیاو) و (پارە) زۆر شت نوسراوە و زۆر وتراوە، بەلام خاتو شەمسە بە زیرەکی توانی بوو خۆی لەدیدی

خەڵکی پرسیارکەر بشارێتەوە و خۆی بەدوور بگرێت لە هێرشی توند و تیژی ڕەخنەگرانە.

هۆکارەکەی ئەوە بوو کە ئەشرەف بەهۆی ئەو خەلق و خووە توندەی کە هەیبوو خۆی بە تەواوی بە (پیاو) دەزانی و کاری شاردنەوەشی بە عەیب و عار و بە نیشانەی لاوازی دەزانی، بەڵام (شەمسە) بە پێچەوانەوە هەمیشە لە پەنهان و شاراوەییدا خەریکی چالاکی بوو.

من لە سەرتای هاوسەرگیری کچەکەم لەگەڵ محمد ڕەزا لەدانیشتنی زۆردا لەگەڵ ئەشرەف بەرامبەر بەیەك دانیشتوین و قسە و باسمان بووە، بەڵام پاش ئەوەی کە پەیم برد بە تایبەتمەندیە ئەخلاقیەکانی خۆم کێشایەوە و بە هەوڵێکی دووری خۆم پاراست لەگەڵ ئەشەرەفدا.

(ئەشەرف) دەیوت سروشت لەبەرامبەر مندا زوڵمی کردوە کە یەکەم منی بە (ژن) دروستکردوە و دووەمیش چەند خولەکێك پاش محمد ڕەزا لەدایك بووم!

ئەم قسانەی بە گاڵتەوە نەدەکرد، بەڵکو بەشێوەیەك دەیکرد کە ئیمانی هەبوو پێان. ئەشرەف باوەڕی وابوو کە سروشت و ئەخلاق و تایبەتمەندی باوکی (ڕەزاشا) بەو دراوە و نیشانەی پیاوییش دراوە بە برا دووانەییەکەی محمد ڕەزا!

ئەم چەتاوەڕوویەشی هەندێکجار لەبەردەم محمد ڕەزادا دەکرد. لەبیرمە جارێکیان لە دانیشتنێکدا کە محمد ڕەزاش لەوێ بوو بەوپەڕی بێ ئەدەبی وتی: (ئەگەر لە خێزانی پەهلەویدا تەنها پیاوێك هەبێت ئەویش منم!)

محمد ڕەزا زۆربێتاقەت بوو بەم قسەیە و بە بێتاقەتی و مۆنیەکەوە دانیشتنەکەی بەجێهێشت.

بەڵام شەمسە بە پێچەوانەی خوشکە بێ گوێدەرەکەی، خوشکێکی باش، بە ئەدەب، کراوە و گوێ گر بوو.

هەڵبەتە دیار بوو شەمسە ڕۆڵی دەبینی و ئامانجی ئەوەبوو لەو ڕێگەیەوە محمد ڕەزا بدۆشێت!

محمد ڕەزاش بۆ ئەوەی نیشانی بدات کە ڕێزی ئەدەب و ئیحترامی شەمسە دەزانێت، ئامادەیی خۆی پیشاندا بۆ ئەوەی بچێتە ژێر باری دروستکردنی کۆشکی

گەورەی شەمسە لە دەوروبەری کەرەج و بۆ ئەم مەبەستەش پارەیەکی زۆری بۆ تەرخان کرد.

شەمسە محمد ڕەزای بە جەنابی حەزرەت بانگ دەکرد و هەرگیز ئەوی بەناوی بچوکەوە بانگ نەدەکرد. بەڵام ئەشرەف بە پێچەوانەی شەمسەوە، محمد ڕەزای بە (ئاقا داداش) بانگ دەکرد واتە (کاکە برا) یان (گەورەم برا) و تەنانەت لە بەردەم خەڵك و پیاوانی سوپاش هەر ئەم دەربڕینەی بەکار دەهێنا.

دیارە دەی کاتێك کە ئەشرەف ئامادە نیە ڕێز لە برا تاجدارەکەی خۆی بگرێت دەبێت حسابی من و کچەکەم چی بێت!

ئەشرەف لەلایەکەوە لەگەڵ محمد ڕەزادا لە ئاستێکی باڵادا هەڵسوکەوتی دەکرد و لەلایەکی دیکەوە کاری لەسەر خاڵە لاوازەکانی دەکرد.

جاری واهەبوو بەبێ هیچ هۆکارێك باسی یادەوەرەکانی ڕابردووی خۆی دەکرد و باسەکانی پەیوەست بە ساڵی ١٩٥٣ و هەڵهاتنی محمد ڕەزای لە ئێراندا دەهێنایە ئاراوە تاوەکو باسی ڕۆڵی خۆی بکات لە گەڕاندنەوەی دووبارەی محمد ڕەزا بۆ سەر دەسەڵات!

ئەشەرف لە هەڵبژاردنی وەزیرەکان، ئەندامانی ئەنجومەن، سەفیرەکانی ئێران لە دەرەوە و تەنانەت لە معاون وەزیرەکان و بەڕێوەبەرەکانیشدا دەستێوەردانی دەکرد و بەوەرگرتنی پارەیەکی زۆر کاری نانەوایی و ئاوگێڕێشی دەفرۆشت.

یەکێك لە بەناوبانگترین سەفیرەکانی ئێران لە دەرەوەی وڵات بە پشتیوانی و لەسەر پێشنیاری ئەشەرەف گەشەی کرد و پێگەیشت. (پەرویز راجی) سەفیری ئێران بوو لە لەندن. کەسانی دیکەش هەبوون، کەسانی وەکو ئەنصاری کە بە پشتیوانی ڕاستەوخۆی ئەشرەف نەش و نمایان کرد و بوونە دەستکەلای بنەماڵەی پەهلەوی.

لەبەر ئەوەی کە ئەنصاری ناومان زۆر بوو، دەبێت ڕوونی بکەمەوە کە مەبەستم لە (هۆشەنگ ئەنصاری) یە کە دواهەمین پۆستی کە وەریگرت وەزیری دارای و کاروباری ئابوری بوو.

هۆشەنگ ئەنصاری لەناو پیاوە سیاسیەکانی ئێراندا تەنها کەسێك بوو کە زمانی یابانی دەزانی.

دەیانوت: کەسێکی هەژار و داماو بووە و لە کارگەیەکی قوماش دروستکردندا کاری کردوە و بەهۆی یاریەکانی ڕۆژگارەوە دەکەوێتە سەرەڕێی ئەشەرەف و دەبێتە جێگەی سەرەنجی[1].

ڕوون و ئاشکرایە کە هەرکەسێك ببوایە بە جێگەی سەرنجی خاتو ئەشەرەف هەموو دەرگاکانی بەناوبانگی و پێگە و سەرکەوتن بەرەو ڕووی دەکرانەوە.

هۆشەنگ ئەنصاری خوێندەواری و زانیاری نەبوو بەڵام یەکێك بوو لە سەیر و سەمەرەکانی ڕۆژگار. لەخۆ خۆشەویستکردن و کردنەوەی دڵی خەڵکیدا وەستا بوو. وەستای وەستاکان! لەوانەیە وا بزانیت کە (هۆشەنگ ئەنصاری) بۆ گەیشتن بە لوتکەی سەرکەوتنەکان کاتی زۆری تەرخان کردبێت. نەخێر!

لەنێوان سالآنی ١٩٦١-١٩٦٣ ڕۆژێك خاتو ئەشرەف دەچێت بۆ کارگەی (فەخر ئێران)، کە کارگەیەکی قوماش دروستکردنە، بۆ ئەوەی سەردانی بکات. لەم سەردانەدا بازی بەخت دەنیشت بەسەر سەری (هۆشەنگ ئەنصاری)یەوە و کرێکاری کارگەی ڕستن و چنین دەچێتە ناو کاری دەوڵەتیەوە.

چەند ساڵێك زیاتری نەبرد کە هۆشەنگ ئەنصاری لەسەر داواکاری ئەشەرەف پەهلەوی دەبێتە سەفیری ئێران لە یابان!

لەو سەردەمەدا، چەند کارێکی سیاسی گرنگێکی زۆریان هەبوو.

سەفارەتی ئێران لە واشنتۆن گرنگترین کار بوو. پاشان سەفارەتی ئێران لە مۆسکۆ، سەفارەتی ئێران لە لەندن، سەفارەتی ئێران لە پاریس و سەفارەتی ئێران لە تۆکیۆ!

---

[1] -ناوی ڕاستی هۆشەنگ ئەنصاری (عباس مستمند شیرازی) بوو.

ئەنصاری تاوەکو پێش ئەوەی بڕواتە ناو کاری دەوڵەتیەوە لە کارگەی (فخر ایران) ئیشی دەکرد و لەسەر دەزگا بوو. کرێکارێکی سادە بوو، بەڵام ئێستا یەکێکە لە دە بۆ پانزە سەرمایەدارەکانی جیهان و تەنها موڵکەکانی لە ئەمریکا و کەنەدا نزیکەی ٣ ملیارد دۆلارە.

گۆڤاری فۆرچون (خۆشبەختی) لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٩ هۆشەنگ ئەنصاری بە یەکێك لە خاوەن ١٠٣ کۆمپانیا دەوڵەمەندەکانی ئەمریکای ناو بردوە.

ئەشەرەف ئەم گەنجە باڵا كورتە سەرو زماندارەی نارد بۆ تۆكیۆ و ئەنصاریش لەماوەی مانەوەی لە یابان بەباشی فێری زمانی یابانی بوو. هەرچەندە ئەنصاری یەكێك بوو لەو كەسانەی كە ئەشەرف دۆزیبوویەوە بەڵام پاش ئەوەی دەرگای دەربار كرایەوە بەڕوویدات توانی قاپی بەردەم محمد ڕەزاش بدزێت و بە زووی بووە یەكێك لە ڕاوێژكارەكانی ئابوری محمد ڕەزا.

فەرەح دەیوت ناوی ئەسڵی ئەنصاری لە ناسنامەكەیدا هۆشەنگ شیرازی یە!

هەندێكجار محمد ڕەزا لە دانیشتنە خۆشەكاندا گاڵتەی لەگەڵدا دەكرد و لەلای خەڵكەكە دەیوت: (باشە چۆن بە تۆ دەڵێن ئەنصاری لەكاتێكدا شیرازیت، ئەی بۆچی پێت نالێێن شیرازی!)

ئەشرەفیش كاتێك مەزاجی هەبووایە دوابەدوای پرسیارەكەی محمد ڕەزا دەیوت: (من هەموو ساری گەڕام تاوەكو ئەمەم دۆزیەوە!)

(هۆشەنگ ئەنصاری) بوو بە بەرپرسی بەڕێوەبردنی كەلوپەل و داراییەكانی محمد ڕەزا لە ئەمریكا و پاشان خزمەتێكی زۆری بە بنەماڵەی پەهلەوی كرد. هۆشەنگ پیاوێكی ئەمانەتدار و بەڕێز و قەدرناسە و ئێستاش كە یەكێكە لە سەرمایەدارە گەورەكانی ئەمریكا خاوەنی پاڵاوگەی نەوت و كۆمپانیای فڕۆكەوانی و دەریایی و كارگەی گەورە و فراوانە تاوەكو ئێستاش زەڕەیەك لە بەندایەتی و ملكەچی بۆ خێزانی پەهلەوی كەم نەبوویەوە. یارمەتێكی زۆری فكری كچەكەمیشی كردوە.

لەبارەی سەركەوتنە سەیرە ئابوریەكانی هۆشەنگ ئەنصاریشەوە هەر ئەوە بەسە كە بڵێم ئێستا كەسانێكی وەكو (هێنری كیسنجەر) كارمەندی و ئیشكەری ئەون!

من لەمە زیاتر لە بارەی ئەنصاری و پەیوەندیەكانی لەگەڵ ئەشرەف و محمد ڕەزا نازانم. بەڵام تەنها پێویستە باسی ئەوە بكەم كە هۆشەنگ ئەنصاری یەكێك بوو لە هەڵكەوتە پلە یەكەكانی ئابوری جیهان و ئەگەر محمد ڕەزا چەند ساڵێك زوتر هەویدای لابردایە و هۆشەنگ ئەنصاری بكردایە بە سەرۆك وەزیران هەرگیز قەیرانی ئابوری دەیەی ١٩٦١ ڕووی نەدەدا و ئێران توشی ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینە نەدەبوو[١]!

---

[١] -خەڵكی تەنها كێشەی ئابوریان نەبوو بەڵكو كێشی بیروباوەڕ، ستەم و گەندەڵیان بوو كە حكومەتی نوقمی زۆرداری كردبوو.

ئەنصاری لەگەڵ ئەوەی کە کرێکارێکی سادەی ڕستن و چنین بوو و وەکو دەڵێن بە شەوێك نەك ڕێگەیەکی سەد ساڵە بەڵکو ڕێگەیەکی (هەزار ساڵەی) بڕی، هەرگیز خۆی ون نەکرد و لە حەد و سنوری خۆی زیاتر نەڕۆیشت. زۆر لەبەرامبەر خاتو ئەشرەف ملکەچ و گوێڕایەڵ بوو و لەلای هەمووکەسێکیشدا بە ئاشکرا ئەوەی باس دەکرد کە لەڕاستیدا فریشتەی بەختی ئەو ئەشرەف خان بووە. پاش ئەوەی کە ڕژێم هەرەسی هێنا کۆمەڵێك کەس هەبوون کە هۆشەنگ ئەنصاریان تۆمەتبار کرد بە ڕفاندنی و بردنی موڵکو ماڵی محمد ڕەزا بۆ نمونە لە هەندێك لە کتێبە مێژووییەکاندا کەوتوەتە بەرچاوم کە نوسیویانە: (هۆشەنگ ئەنصاری کە وەکیل و کارمەندی شا لە سەرمایەگوزاریەکانی خێزانی پەهلەوی بووە لە ئەمریکادا، پارەکانی محمد ڕەزا و خێزانی پەهلەوی کردە گیرفانی خۆیەوە!)

چەند مانگێك پاش سەرکەوتنی شۆڕش و دەرچوونی محمد ڕەزا لە ئێران هۆشەنگ ئەنصاری ڕاسپێردرا بەوەی کە بڕوات بۆ ئەمریکا و لەوێ چاوی بکەوێت بە بەرپرسە گەورەکان و لە دانیشتن و چاوپێکەوتنە تایبەتەکاندا لەبارەی مانەوەی شا و سەڵتەنەتەوە قسە و باس بکات.

لەڕاستیدا هۆشەنگ ئەنصاری سەفیری نهێنی محمد ڕەزا بوو لە ئەمریکا.

هۆشەنگ ئەنصاری لەگەڵ ژمارەیەك کەسی بەهێز وەکو (دیڤید راکفلەر)، (ریچارد هیلمز)، (هێنری کیسنجەر) و (ڕۆنالد ریگن) و هیتد دۆستایەتی و هاوڕێیەتێکی زۆر نزیکی هەبوو.

محمد ڕەزا هیوادار بوو کە هۆشەنگ بتوانێت سود لە پێگەی بەهێزی وەرگرێت و بتوانێت لەڕێگەی ئەو برادەرانەیەوە بنکەیەکی بەهێز بۆ چاودێری و پشتوانی محمد ڕەزا دابمەزرێنێت.

دەبێت ئەوە بڵێم کە هۆشەنگ هەوڵ و کۆششێکی زۆر فراوانی ئەنجامدا و لەم ڕێگەیەشدا بە ملیۆنەها دۆلاری بە شێوەی خەڵاتی گرانبەها و پێدانی ڕاستەوخۆ خەرج کرد و لەگەڵ کەسایەتیە بەهێز و خاوەن پێگەکاندا گفتوگۆ و دیداری سازدا- و هەڵبەتە تاوەکو ڕادەیەکیش سەرکەوتنی بەدەستهێنا- تاوەکو ئەم کەسانە فشار دروستبکەن بۆ (جیمی کارتەر) و دیموکراتەکان کە پشتی حکومەتی ئێران بەرنەدەن

و دەوڵەتی ئەمریکا پشتیوانی خۆی بۆ حکومەتی شا بەتەواوی دەربخات. (بەتایبەتی پارە خەرجکردنەکانی ئەنصاری بووە هۆی ئەوەی کە ئەمریکیەکان ئامادەبوون کە محمد ڕەزا قبوڵ بکەن بۆ چارەسەر و نەشتەرگەریەکەی لە نیویۆرك.)

بەداخەوە بۆ ئەم جۆرە کار و دروستکردنی فشارانە درەنگ بوو. ئاگری شۆڕش بەشێوەیەك کڵپەی دەسەند کە ئیدی هیچکەس لەتوانایدا نەبوو بیکوژێنێتەوە.

هۆشەنگ هەموو شەوێك چەندین کاتژمێر لەگەڵ محمد ڕەزا و فەرەح گفتوگۆی دەکرد.

سەرئەنجام کاتێك کە هەموومان لە ڕزگاربوونی سەڵتەنەت نائومێد بووین. محمد ڕەزا داوای کرد لە هۆشەنگ کە پاشماوەی هەوڵ و کۆششەکانی خۆی تەرخان بکات بۆ پەیداکردنی شوێنی مانەوە و سەرپەنایەك بۆ خێزانی پەهلەوی لە ئەمریکا.

هۆشەنگ لەو ماوەیەی کە لە ئەمریکادا بوو، کاروباری موڵك و داراییەکانی محمد ڕەزا و کچەکەم فەرەحی ڕێکخست لەبەر ئەوەی کە سەنتەری پەهلەوی چەند مانگێک پێشتر بە فەرمانی محمد ڕەزا هەڵوەشێنرابوویەوە ڕژێمێکی ئیداری بۆ سەرپەرشتی کردن و بەڕێوەبردنی سەرمایەگوزاریەکانی خێزانی پەهلەوی لە ئەمریکا دامەزرا کە هەموو ئیشکەرەکانی ئەمریکی بوون.

لە شوێنێکدا خوێندمەوە کە گوایە هۆشەنگ ئەنصاری بە بیانوی چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرپرسە ئەمریکیەکاندا، وڵاتی بەجێهێشتوە و ئیدی نەگەڕاوەتەوە!

ئەمە ڕاست نیە، ئەنصاری ئێستاش بەوەفایە لەگەڵ ئێمەدا. باسەکە هەر ئەوەیە کە وتم لەبارەی پارەکانیشەوە پاش مردنی محمد ڕەزا بەڵگەیەکی متمانەپێکراومان نیە کە بتوانین لەدژی ئەنصاری داوا تۆمار بکەین. ئەنصاری لەبەر ڕێزی محمد ڕەزا و ئەشرەف خزمەتێکی زۆری شەمسە و براکانی دیکەی محمد ڕەزای کردوە و بەتایبەتی شەمسە کە زۆربەی داراییەکانی لەناو حسابی خەڵکانی دیکەدا بوو و بە یارمەتی ئەنصاری توانی داراییە پەرتەوازەکانی کۆ بکاتەوە و پشکی خۆی لە شەریکە بەهێزەکانی بسەنێتێتەوە.

یەکێك لەو داراییانە کە نزیکەی سەد ملیۆن دۆلار بوو ئەنصاری و وەکیلەکانی توانیان لەناو گەروی وارسەکانی (ثابت پاسال) دەری بهێننەوە.

هەڵبەتە بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە کارانەی ئەنصاری بڕێکی لەو پارانەش بۆ خۆی وەردەگرت. قسە لەسەر شەمسە خان بوو کە گەیشتینە ئەم باسە.

دەبێت ئەوە بڵێم کە شەمسەش وەکو ئەشرەف حەزی لە پیاوانی بەهێز و جوان و بالاّ بەرز دەکرد. بەلاّم نەخۆشێکی سەیری هەبوو کە حەزی دەکرد لەگەڵ کەسایەتیە ناسراو و بەناوبانگەکاندا هاوڕێیەتی بکات.

بۆ نمونە بە خەرجکردنی پارەیەکی زۆر گۆرانیبێژێکی ئەمریکی یان فەرەنسی بانگهێشت دەکرد بۆ تاران هەتاوەکو بە تەنهای گۆرانی بۆ بڵێت! و لەگەڵیدا وێنەی دوو کەسی لەگەڵدا بگرێت!

هەرکاتێك کەسێکی ناسراو بهاتایە بۆ ئێران-گرنگ نەبوو ناوبانگی لە چ بوارێکدا هەبوایە- پێش هەمووکەس شەمسە بانگهێشتی دەکرد بۆ کۆشکە ڕازاوەکەی خۆی!

کۆمەڵێکی زۆر کە لەوانەیە نزیکەی سەد وێنەیەك هەبوون هەڵیواسیبوون بە دەرگا و دیوارەکانی تەلاری کۆشکە تایبەتەکەی کە هەموویان پێکهاتبوون لە وێنەی خۆی لەگەڵ کەسانی ناسراو و بەناوبانگی جیهان. من ژمارەیەك لەو وێنە دوو کەسیانەی یادگاری شەمسەم لەبیرە.

بۆ نمونە وێنەی لەگەڵ پرۆفیسۆر (بێرنارد)دا هەبوو کە زانایەکی ئەفریقای باشور بوو و یەکەمین کەس بوو کە زەرعی دڵی کرد لە جیهاندا. یان وێنەی لەگەڵ (فرانك سیناترا) گۆرانیبێژی بەناوبانگی ئەمریکیدا هەبوو، یان وێنەی لەگەڵ (شێرلی مەك لین) ژنە هونەرمەندی گەورەی ئەمریکی هەبوو، وێنەی لەگەڵ (گریگۆری پەك) هونەرمەندی ناوداری ئەمریکیدا هەبوو، وێنەی لەگەڵ (چارلی چاپلین)دا هەبوو، وێنەی لەگەڵ (لیئۆنید برژنیڤ) ڕێبەری کۆچکردووی سۆڤیەتی جاران هەبوو. وێنەی لەگەڵ (نیل ئارمسترانك)، (ئەویدن ئالدرین) و (مایکل کالینز) ئەو سێ کەسەی کە بۆ یەکەمجار بە ئەپۆلۆی یانزە ڕۆیشتنە سەر مانگ گرتبوو) و...

هەندێك لەم وێنانە لە دەرەوەی وڵاتیش هەڵیواسی بوون.

شەمس حەزێکی زۆر فراوان و شێوە نەخۆشانەی بۆ دیدار و بینینی کەسانی ناوداری جیهانی هەبوو و لەو پەڕی پارەپەرستی و ڕەزیلیشدا بوو بەلاّم بۆ دیدار لەگەڵ ئەم کەسانەدا خەلاّتی گرانبەها و پارەی زۆر فراوانی خەرج دەکرد.

ژمارەیەك لەوانە کەسانێك بوون بە بانگهێشتی ڕەسمی دەهاتن بۆ ئێران و لەو سەردانانەشدا لەسەر بانگهێشتی ڕەسمی شەمسە بۆ گرتنی وێنەی یادگاری میوانداری دەکران وەکو ڕێبەری یەکێتی سۆڤیەت، تەنانەت بۆ هەندێك لەچاوپێکەوتنەکان لەگەڵ شەمسەدا ئامادەکاریان بۆ دەکرا!

کاتێك کە پرۆفیسۆر بێرنارد هات بۆ ئێران و پشکنینی دڵی بۆ کردین.

چ محمد ڕەزا و چ کچەکەم فەرەح و چ نەوەکانم و چ هەموو ئەندامانی خێزانی پەهلەوی لەژێر چاودێری وردی پرۆفیسۆر بێنراردا بووین. کەچی شەمسە پرۆفیسۆری ئەفریقای باشوری برد بۆ کۆشکەکەی خۆی و چەند ڕۆژێکیش لەلای خۆی هێشتیەوە.

پرۆفیسۆر بێرنارد کەسێکی زۆر سوعبەتچی و پارە خۆشەویست بوو.

لەماوەی مانەوەی لە تاران سەرەڕای خێزانی پەهلەوی، ژمارەیەك لە پیاوان و سەرمایەدارە گەورەکانی بەشێوەی سەرپێی چارەسەر کرد و پارەیەکی زۆر فراوانی لێ وەرگرتن.

بەکورتی خێزانی محمد ڕەزا ڕەچاوی پێگە و بنەمای شای وڵات و ڕەچاوی ئابڕوی سەڵتەنەت و خێزانی سەڵتەنەتیان نەدەکرد و هەموو ئەمانەش لەسەر محمد ڕەزا دەکەوتن. خەڵکی کە ئاگاداری ئەم نهێنی و بنەماڵەیە نەبوون، تەنها و تەنها محمد ڕەزایان بە کەمتەرخەم و بەرپرسی یەکەم دەزانی و هەڵبەتە لەپاڵ ئەویشدا هێرشیان دەکردە سەر کچەکەم و بێ بەزەییانە ڕەخنەی توندیان لێ دەگرت.

من هیوادارم نوسەران و لێکۆڵەرەوان و مێژوونوسە بێ لایەنەکان، پرسەکانی سەردەمی سەڵتەنەتی محمد ڕەزا بەو شێوەیەی کە هەبوو بنوسنەوە بۆ خەڵکی تاوەکو هەمووکەس بزانێت کە کچەکەم (فەرەح) بچوکترین ڕۆڵی لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی وڵات و کەوتنی بنەماڵەی پەهلەویدا نەبووە، بەڵکو تەنانەت محمد ڕەزا لە زۆرێك لە کاتەکاندا داری نەزانی و بێ حسابی خێزانەکەی خۆی خواردوە.

ڕێگەم پێ بدە کە بێ پەردە ناکۆکێکی حەزی خۆم لەگەڵ کردار و هەڵسوکەوتی پێچەوانەی ناوخۆی خێزانی سەڵتەنەتی کە برا و خوشکەکانی محمد ڕەزا ئەنجامیان دەدا باس بکەم.

ئەحمـەد ڕەزا و محمـود ڕەزا حـەزێکی زۆر لـە ڕادەبـەدەریان هـەبوو بـۆ ڕاوکـردن و هەریەکەیان بۆ خۆی کۆمەڵێك زۆر لە پێست و سەر و کەلە و هەندێکجاریش جەستەی وشکەو بووی زۆرێك لە گیاندارە کێویەکانیان هەبوو.

محمـد ڕەزا بـۆ چاودێری و پاراستنی ژیـانی ئاژەڵـە کێویـەکان فەرمانیـدا بـوو لـەو ناوچـانەی کـە ئـاژەڵی کێویـان تێدایـە تـابلۆ هەڵبواسـرێت و ڕاوکردنـی هـەموجۆرە ئاژەڵێك قەدەغە بکرێت.

بۆ نمونـە یەکێك لـەو شوێنانە ناوچـەی خجیر بـوو لـە ڕۆژهـەڵاتی تـاران کـە هـەر لـە ناوچـەی خجـیرەوە تـاوەکو باشـوری دەشـتی ورامـین و ڕۆژهــەڵاتی سمنــان درێــژ دەبوویەوە.

ئەم ناوچە پارێزراوە، خاوەنی سروشتێکی سەیر و دیمەنێکی هەڵکەوتە و جوان بوو.

هـەمو جـۆر و شـێوەیەکی ئـاژەڵی کێـوی لـەم ناوچـەیەدا هـەبوون. هەرچـەندە ئـەم ناوچـەیە هـەر لەسـەردەمی سـەڵتەنەتی ناصـرالدین شـای قاجـاری گـەورە کرابوویـە باخێکی ملـی و ناوچـەیەکی پارێزراو و قەدەغـەکراو کەچـی ئەحمـەد ڕەزا و مـەحمود ڕەزا هەفتەی دوو سێ جار دەچوون بۆ ئەم ناوچەیە و تفەنگیان دەتەقانـد و تـەنها بـۆ کات بەسەر بـەردن دەیـان سـەر لـە بزن و ئاسکی کێوی و پڵنگ و گیانـەوەرانی تریـان دەکوشت.

سەرۆکی کاروباری ناوچە ڕاویەکانی سەڵتەنەتی، ئاغای ئەبوالفتح ئاتابـای بـوو کـە هەم لە ئەندامانی نزیك لە خێزانی ڕەزاشا بوو و هـەمیش بەهۆی ئـەوەی کـە ماوەیـەك هاوسەرگیری لەگەڵ کچی یەکەمی ڕەزاشا (هامدەم خانم) کردبوو بە زاوای شا حساب دەکرا!

ئاتابـای میری ڕاوچـی شـا بـوو و تـەمنێکی زۆریـشی کردبـوو و لەهیـچکەس قسەی نەدەخواردەوە. هەر لەبەر ئەوە هەمیشە شکات و گازندەی دەهێنا بۆ لای محمد ڕەزا و فـەرەح، هەمیـشە باسـی هەڵـسوکەوتە نائینـسانیەکانی ئەحمـەد ڕەزا و محمـودڕەزای دەکرد لە کوشتنی ئاژەڵە کێویەکاندا.

**من بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە لە دەربار‌دا بووم نەمبینی کە محمد ڕەزا بڕوات بۆ ڕاوکردنی ئاژەڵ و خۆیشی دەپاراست لە خواردنی گۆشت و زۆرجار گۆشتی باڵندە و ماسی دەخوارد. (بەتایبەتی تیهو) بەڵام براکانی لەژێر تابلۆی (ڕاوکردن قەدەغەیە) لەناوچە ڕاوییەکاندا، گیانەوەرە کوێیەکانیان ڕاو دەکرد.**

**تاوەکو ئێرە بابەتەکە زۆر گرنگ بەرچاو ناکەوێت. چونکە بەهەرحاڵ کۆمەڵێك زۆر گرنگی نادەن بە ژیانی کێوی و لە هەموو جیهانیشدا ئەم جۆرە کەسانە هەیە. بەڵام سەیر لەوەدایە لە بازاڕی چوار ڕێی ئەستەمبوڵ لە تاران گۆشتی ڕاو، ئەویش گۆشتی ڕاوی سەڵتەنەتی بە ئازادی دەفرۆشرا و فرۆشیارەکان بە ئاشکرا بانگیان دەکرد ئەم گۆشتە تازەیە هەر ئەمڕۆ لە ناوچەی ڕاوی سەلتەنەتیدا هێنراوە!**

**سەیرتر لەوەش ئەوە بوو کە ئەحمەد ڕەزا و مەحمود ڕەزا ڕۆژانە ئیجازەیان دەدا بە چەند فرۆشیارێکی چوار ڕێی ئەستەمبوڵ تاران بۆ ئەوەی ڕۆژانە ڕاو بکەن و ئەم کەسانە بە چەك و تفەنگی خۆیان بڕۆن بۆ ڕاو و پاش ڕاوکردنەکەش گۆشتەکەیان دەهێنا بۆ جادەی ئەستەمبوڵ بۆ فرۆشتن کە ئەو سەردەم ئەو جادە ناوەندی کڕین و فرۆشتنی گۆشتی ڕاوی خانەدان و نەجیبزادەکانی تاران بوو!**

**ئاتابای بە توڕەیی و بێزاریەوە دەیوت ئەم کارانە دەبنە هۆی حەیاچوونی خێزانی سەڵتەنەتی، بەڵام محمد ڕەزا هیچ کاردانەوەیەکی نەدەبوو و دەیوت من لێکۆڵینەوەی خۆم کردوە و بابەتەکە ئەوەیە کە ئەمانە ئەو ڕاوەی کە لەخۆیان زیادە بووە دەیدەن بە خەڵك تاوەکو دابەشی بکەن بەسەر خەڵکی هەژار و کەم دەرامەتدا!**

**لەلایەکی دیکەشەوە ئەم ڕاوکردنە زیاتر بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی ناو ئاژەڵە کێویەکانە!**

**کارێکی دیکەی ناشیرین بردنی میراتی فەرهەنگی و کەلوپەلی گرانبەهای کۆن بوو، وەکو دەڵێن میرات و پاشماوەی ژێر خاك.**

**هەرچەندە سەرۆکی قاچاغچییەکانی کەلوپەلی ژێر خاك (شەهرام) کوڕی (ئەشرەف) بوو، بەڵام ئەندامانی دیکەی خێزانی پەهلەوی بەتایبەتی (شەمسە)ش لەم کارەدا چالاکی بەرچاوی هەبوو.**

ئێمە هیچ شتێکمان لەم بابەتە نەدەزانی تاوەکو فەرەح نوسینگە تایبەتیەکەی کردە بەرپرسی پاراستنی پاشماوە مێژووییەکان.

کاتێك کە شارەزایانی نوسینگەی تایبەتی لە بواری کاروباری میراتی فەرهەنگیدا چالاك و دەستبەکار بوون باس و خواستی زۆر لەبارەی خێزانی محمد ڕەزا بۆ کەلوپەلە دێرین و دەگمەنەکان دەرکەوت[1].

(شەهرام)، کوڕە گەورەی ئەشرەف، کە ڕوون نەبوو چۆن ئاگاداری بوونی تەپۆڵکە و ناوچە مێژووییەکان دەبوو گروپێکی تیاری گەنجی بە هەموو پێویستێکەوە دەنارد بۆ ئەو ناوچانە و ئەوانیش هەرچی هەبوو دەریان دەهێنا. هەندێکجار ئەو ناوچانە لە باشوری تاران، هەندێك جار لە سیستان و بلوجستان و جارجاریکیش لە ئازەربایجان و شارەکانی دیکە بوون. هەمیشە گروپەکەی (شەهرام) زووتر لە ئیشکەرە شوێنەوارناسەکان دەستی دەگەیشتە ناوچە پاشماوەیەکان و ئەم بابەتە کەمێك بە سەیر دەکەوتە بەرچاو.

(فەرەح) دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە لەم بوارەدا و دواتر تێگەیشتین کە هەندێك لە بەرپرسە ئیداریەکانی شوێنەوارناسی بە ڕێنوێنی (ئەشرەف) و شەهرام بوونەتە سەرچاوەی کار، و ئەو زانیاریانەی کە پێویست بوون دەیانخستە بەردەستیان.

---

[1] -ژەنراڵ حسین فردوست لە کتێبی یادەوەریەکانی (کە یەکێکە لە سەرچاوە بەنرخەکانی مێژووی هاوچەرخ) فەرەح پەهلەوی و ئەندامانی نوسینگەکەی بە بەرپرسی یەکەم و سەردەستەی قاچاقچیەکانی کەلوپەلە شوێنەواریەکان و دەگمەنەکان دەزانێت.

فەریدە دیبا لەم کتێبەی خۆیدا هەوڵیداوە کچەکەی بە کەسێکی پاك و بێ تاوان پیشان بدات. بەلام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە بە شایەتی سەرۆکی لێکۆڵەرەوەی گشتی شاهنشاهی (فردوست) و ئەشرەف پەهلەوی و زۆرێك لە دەسەلاتدارەکانی دیکەی حکومەتی پەهلەوی کە پاش شۆڕشی ئیسلامی کتێبیان نوسیوە (فەرەح) یان بە کەمتر لە خوشکەکانی شا نەزانیوە و بەلایەنی کەمەوە لە کۆکردنەوەی پارە بەهەرشێوەیەك کە کراوە وەکو ئەشرەف دەستبەکار بووە!

تەنانەت هەندێك لە نوسەرە بیانیەکان کە لەبارەی ئەم خێزانەوە کتێبیان نوسیوە سامانی (فەرەح)یان بە زیاتر لە سامانی محمد ڕەزا زانیوە.

(فەرەح) لەبارەی ویرانکردنی ناوچە شوێنەواریەکان و تەپۆڵکە مێژووییەکانەوە قسەی لەگەڵ محمد ڕەزا کرد و داوای لێکرد ڕێگە بگرێت لەم دەستێوەردانە.

تەنانەت لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە جارێکیان بوو بە گفتوگۆیەکی توند لەنێوانیاندا. بابەتەکە ئەوە بوو کە ئەشرەف و شەهرام بۆ بەدەستهێنانی پاشماوە مێژووییەکان لەناو تەپۆڵکەیەکدا فەرمانیاندا بوو بە شۆفڵ تەپۆڵکەکە هەڵبدەنەوە. دەرئەنجام ئەم کارە نابەرپرسانە بووە هۆی ئەوەی کە هەزاران کەلوپەلی مێژوویی پارچە پارچە ببن وەکو ئەوەی کە لەناوچە شوێنەوارە هەڵدراوەکانی دیکەدا دەبینرێت کە هیچشتێك بەسەر هیچشتێکەوە نەماوە[1].

من و فەرەح کە ئاگاداری بابەتەکە بووین ڕۆیشتین بۆ سەردانی ناوچەکە می لە سیستان بوو و بینیمان مەسەلەکە ڕاستە و لە سەر تەپۆڵکەکە و دەوروبەری بە هەزاران هەزار پارچەی کەلوپەلی شکاوی گۆزە و شتی دیکە هەیە.

ئەو خەڵکانەی کە پەیوەندیان بەو کارەوە هەبوو و لایەنگری شوێنەوارناسی بوون لە سەرتاسەری تارانەوە هاتبوون بۆ ئەو ناوچەیە و پارچە وردبووە گۆزەکان و پەیکەر و کەلوپەلە مێژووییە کۆنەکانیان لە سەر تەپۆڵکە هەڵدراوەکە و لە بیابانەکەدا کۆ دەکردەوە.

تۆ بزانیت کاردانەوەی محمد ڕەزا لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە چی بووبێت؟

وتی بە کچەکەم: (ئەم وڵاتە زۆر فراوانە و ئەم جۆرە کەلوپەلە کۆن و بێ نرخانە لە ناو دڵی خاکدا زۆر زۆرە!)

لەلایەکی دیکەوە، شەمسە فەرمانیدا بوو لە کۆشکی چالوس، کە لەسەر تەپۆڵکەیەکی بەرز بوو و دەیڕوانی بەسەر شاری جوانی چالوسدا، بیرێکی تازە هەڵکەنن.

---

[1] ـئەم شوێنە بە (شاری سوتاو) بەناوبانگە لە سیستان و بەلوجستانە.

شۆفڵەکان بە ڕادەیەك کەلوپەلی مێژووییان لە ژێر زەویدا دەرهێنا بوو و وردیان کردبوو، تاوەکو ئێستاش ئەو کەسانەی کە سەردانی ئەو ناوچەیە دەکەن ڕێژەیەکی زۆر گۆزەی وردبوو و شتی کۆنی مێژوویی و بەردی گرانبەهای شکاو دەبینین لە سەرتاسەری بیابانەکەدا.

بیر هەڵکەنەکان لە کاتی هەڵکەندنی بیرەکەدا گەیشتنە سندوقێك پڕ بووبوو لە خشڵ و شمشێری بریسکەدار.

فەرەح زۆر هەوڵیدا. تاوەکو محمد ڕەزا ڕازی بکات بەوەی کە ئەم گەنجینە بەنرخانە بهێنێتەوە و تەسلیمی مۆزەخانەی ئێرانی بکات. بەڵام محمد ڕەزا وتی: (مۆزەخانەی ئێران ئەوەندە پڕ بووە لەم خت و پشانە کە ئیدی شوێنێك نەماوە جێگەی ئەم شتانەی لێ بێتەوە!)

پاش ئەو دۆزینەوە مێژووییەی کە لە چالوس بەدەست هات، ئەحمەد ڕەزا، محمود ڕەزا و ئەشەرەفیش بەرەو تەپۆڵکەکانی چالوس کەوتنە ڕێ. دەرکەوت کە شاری کۆنی چالوس لەسەر بەرزای بووە و چالوسی ئێستاش تەمەنێکی کورتی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ڕەزاشا.

بێ دواکەوتن گروپەکانی هەڵکەندنی ئەحمەد ڕەزا، محمود ڕەزا، ئەشرەف، شەهرام و شەمسە نێردران بۆ ناوچەکە و دەستیان بەهەڵکەندنی چاڵ و هەڵدانەوەی ناوچە کۆنەکان کرد!

ژمارەیەك لە پیاوە بەتەمەنەکانی ناوچەکە کە ئاگاداری ئەو بابەتی هەڵدانەوە و گەڕانانە بوون بۆ بەدەستهێنانی پارە یان خۆ نزیك کردنەوە لە خێزانی پەهلەوی یان بۆ خوڵك خۆشی و هەندێکیشیان بەهۆی سادە و ساکاریانەوە زانیاری و نەخشە و بەڵگەی کۆنی خێزانی خۆیان خستە بەردەست برا و خوشکەکانی محمد ڕەزاوە و لە ئەنجامدا ئەو کارەی کە لە تەپۆڵکەکانی چالوسەوە دەستیپێکرد گەیشتە ناوچەیەك لە (کلاردەشت) کە لادێنشینەکان لەکۆنەوە بەناوچەیەکی ئەو شوێنەیان دەوت (زر دە)!

ئەم ناوچەیە کە بۆ دۆزینەوەی کەلوپەلی کۆن هەڵکەنرا بوو چەندین کانی ئاڵتون دۆزرایەوە و دەستکرا بە دەرهێنانی بەشێوەیەکی نهێنی.

هەروەها لە لادێیەکی دەوروبەری رامسەریش بەردی مەعەدەنی گرانبەها دۆزرانەوە، بۆیە خەڵکی دەسەلاّتدار هێرشیان کردە سەری بۆئەوەی پشکێك بەدەستبهێنن!

شێوەی گەڕان و پشکنینی ئەو دەسەلاّتدارانە لەو ناوچەیەدا بەم شێوەیە بوو هەریەکەیان چەند هیکتارێك لە زەوی ئەو ناوچەیەی بە بیانوی دروستکردنی ڤیلا بە

دیوار دەورە دەدا و بێ دەنگ دەستی دەکرد بە دەرهێنانی ئاڵتون و خشڵ. (ناوی ئەم گوندە) ئەگەر لەبیرم نەچووبێتەوە (جواهر دە) بوو!

نیوەڕۆیەك لە ماڵی بەڕێز فرمانفرماییان میوان بووم. ڕەزا فلاح جێگری کۆمپانیای ملی نەوتی ئێران و غلامرەزا کیانپور وەزیری ئیتلاعاتیش لەوێ بوون. پەیکەرێکی زۆر جوانی نیو مەتریم بەرچاو کەوت. پەیکەری پیاوێکی سەیر و غەریب بوو کە لەچەند شوێنێکەوە درزی بردبوو کە دیاربوو پێشتر شکابوو و دووبارە لکاندبوویانەوە بەیەکەوە.

کاتێك کە فرمانفرماییان زانی سەرنجی ئەو پەیکەرە دەدەم، وتی ئەم پەیکەرە لە هەڵکەندنەکانی کلاردشت بەدەستهاتووە و یەکێکە لە ئالیهە کۆنەکان.

فرمانفرماییان باسی ئەوەی کرد کە پەیکەرەکەی بە بڕێك پارەی زۆر لەلای شەهرام کڕیوە. لەبارەی هۆکاری شکانیشیەوە وتی لەوانەیە لەناو پەیکەرەکەدا خشڵی گرانبەهای تێدا بووبێت و بۆ دەرهێنانی پەیکەرەکەیان شکاندوە. فرمانفرماییان دەیوت بۆ دیاریکردنی تەمەنی پەیکەرەکە ناردویەتی بۆ پاریس و لەوێ پاش پشکنین و لێکۆڵینەوە دەرکەوتوە بەلایەنی کەمەوە دەگەڕێتەوە بۆ چوار هەزار ساڵ پێش ئێستا!

یەکێك لە کاری خوشك و براکانی محمد ڕەزا لەسەروی هەموشیانەوە ئەشرەف و شەمسە ئەوە بوو کە هەندێك لەو کەلوپەلە گرانبەهایانەی کە بەدەستیان دەهێنا بە پارەیەکی زۆر دەیانفرۆشت بە دەوڵەمەند و بەرپرسەکانی وڵات.

حبیب ثابت (پاسال)یش، یەکێك بوو لە کڕیارەکانی کەلوپەلە گرانبەهاکانی ژێر خاك.

(هیوادارم تاوەکو ئێرە تێگەیشتبن کە خوشك و براکانی شا بەشێکی زۆر لەو سامان و پارەیان چۆن بەدەست دەهێنا.)

بڕێك لەو پارانە لە کاری ڕێکخستن و دەلاڵی و فرۆشتنی پلە و پۆستە دەوڵەتیەکان بەدەست دەهێنرا و بڕێکیشی لە ڕێگەی فرۆشتنی کەلوپەلی گرانبەهای ژێر خاك !

ئەوان پەیکەرێکی گڵێنەی چوار هەزار ساڵەیان دەفرۆشت بە دەوڵەمەندێك و پاشان ئەو پارەیان لە کارگە و پیشەسازێکی گرنگدا دەخستە گەڕ!

یان وەکو دەلاڵ پێشنیاریان دەکرد بۆ وەزارەتێك كە هاوكاری كارگەیەك یان كۆمپانیایەك بكات و پارەیەكی باشی بۆ دابین بكات لەبەرامبەر جێبەجێکردنی ئەم كارەشیان بڕێك پارەیان وەردەگرت!

هەموو ئەم كارانەش لێدانێكی گەورەیان دەدا لە ناوبانگی خێزانی پەهلەوی. بەلام بەداخەوە خوشك و براكانی شا و ئەو كەسانەی كە دەبوونە هۆی شكاندنی ئەم حەیا و ناوبانگیە ئاگاداری ئەم مەسەلەیە نەبوون و محمد ڕەزاش كە لە بنەڕەتدا كەسێكی شەرمن و حەیادار بوو ڕووی نەدەهات بە خوشك و براكانی شتێك بڵێت و ببێتە ڕێگر لەو كارانەیان!

بۆیە جەنابی ئەشرەف و شەمسە و شاهپور غلامرەزا (بەتایبەتی شاهپور غلامرەزا) ئەو مافەیان نیە كە كتێب بنوسن و چاوپێكەوتن ئەنجام بدەن و بڵێن: (فەرەح و ڕەزا قطبی و دەوروبەرەكانی فەرەح بە ڕێونوێنی و پێشنیارە هەڵەكانی خۆیان بوونە هۆكاری كەوتنی شا!)

دەڵێن نەعامە لەكاتی مەترسی و هەڕەشەدا سەری خۆی دەكات بە ژێر خاكەوە، چونكە وادەزانێت ئەگەر خۆی هیچ نەبینێت ئیدی هیچ شتێكیش ئەو نابینێت!

ئەندامەكانی خێزانی محمد ڕەزاش ڕێك وەكو نەعامە كاریان دەكرد. ئەوان سەریان كردبوویە ژێر خاكەوە و لەبەر ئەوەی كە خۆیان خەڵكیان نەدەبینی و سوكایەتیان بەخەڵكی دەكرد، وایاندەزانی خەڵكیش ئەوان نابینێت!)

لەكاتێكدا كە خەڵكی زۆر بە وردی كردار و هەڵسوكەوتی ئەوانی خستبویە ژێر چاودێریەوە و بەهەر ڕێگەیەك هەبوایە خەڵكی هەواڵ و باسەكانی بڵاو دەكردنەوە!

ناوەندی هەواڵی پارس ڕاپۆرت و بابەتێكی تایبەتی بڵاو دەكردەوە كە ناوەرۆكەكەی زیاتر ڕاپۆرتی ڕادیۆكانی دەرەوە بوو. ئەم بابەت و هەواڵانە بە مۆر و سەرداخراوی و بە نهێنی دەهات بۆ ئێمە و ئێمەش لەو ڕاپۆرت و بڵاوكراوانەدا دەمانبینی كە هەواڵ لەبارەی چالاكیە بازرگانیە ڕێگە پێدراو و ڕێگە پێنەدراوەكانی بنەماڵەی خێزانی محمد ڕەزاوە بڵاوكراوەتەوە، هەڵبەت زیاتر ئەو بابەتانە لە ڕادیۆكانی دەرەوە و بەتایبەتی ڕادیۆی بەغداد و ڕادیۆی حیزبی تودەوە وەردەگیران.

ڕادیۆی حیزبی توده له ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی بەرنامه فارسیەکانی خۆی پەخش دەکرد و دوابەدوای هەواڵەکان باسی بەرنامەیەکی هەبوو لەسەر خراپ بەکارهێنانەکانی خێزانی پەهلەوی (هیچ شتێك ئەوەندەی ڕادیۆی توده محمد ڕەزای توڕه و بێزار نەدەکرد!)

کاتێك محمد ڕەزا دەیبیست کە ڕادیۆی حیزبی توده تایبەتیترین و نهێنیترین هەواڵەکانی پەیوەست بە شا و خێزانەکەی دەزانێت و پەخشیان دەکات توڕه دەبوو و قسەی توندی پێ دەوت.

دەیوت: (ئەمانە کۆمەڵێك بێ عەقڵن کە قسه و باس لەسەر یەکسانی و ئەم شتانە دەکەن. مەگەر دەکرێت (شا)یەك لەگەڵ ڕەعیەتێکی ئاساییدا یەکسان بێت؟)

محمد ڕەزا هەمیشە بۆ پشتیوانی قسەکانی، قسەی کەسایەتێکی ناسراوی دەهێناوە کە پاش ٢٨ ئۆگۆستی ١٩٥٣ بۆ پشتگیری شا کردبووی، دەیوت: (تەنانەت مێرولەکانیش پاشایان هەیە!)

محمد ڕەزا هەموو ڕەخنەگرەکانی خۆی و خێزانەکەی بە تودەیی و مارکسی ناودەبرد. هەر لەبەر ئەم هۆکارە بوو کە من و کچەکەم کە زیاتر لە خەڵکی تر نزیك بووین لەو خێزانە بۆ ئەوەی تۆمەتبار نەکرێین بە لایەنگری لە تودەییەکان و مارکسیەکان بەرە بەرە چاوی خۆمان لەئاست ئەو کارە ناپەسەندانەی خوشك و براکانی داخست و هەوڵماندا هەمووشتێك فەرامۆش بکەین و گرنگی پێ نەدەین.

شەوێکیان لە ماڵی محمد علی (برام) لە کەنار ڕووباری کەرەج میوانێکی نیوە تایبەتی سازکردبوو. ئامادەبوەکان ئەگەر لەبیرم بێنەوە بریتی بوون لە: (قاسم لاجوردی، ژەنراڵ حسین فردوست و فەیروزە، ژەنراڵ قره بای، ژەنراڵ نعمت الله نصیری، محمد علی مسعودی، ڕەزا فلاح، منوچەهر ئیقبال و کچەکەی، ڕەزاخان قطبی (برازام) و هاوسەرەکەی، جهانگیر ئاموزگار، هوشەنگ ئەنصاری و...

من تێگەیشتم هەرچەندە ئەم میوانیە ناسیاسی و ناڕەسمی و وەکو دەڵێن نیوە ڕەسمی بوو، بەڵام میوانەکان لەلابەلای قسەکانیاندا جارجارێك ئاماژەیان بە لێهاتووی و شارەزای محمد ڕەزا دەکرد و لەلایەکی دیکەش قسەیان دەوت بە یەکێتی سۆڤیەت و حزبی توده!

لەبارەی بابەتەکەوە لەگەڵ براکەمدا دەستمان کرد بە گفتوگۆ.

ڕەزا وتی: (ئەم داماوانە دڵنیان کە بەیانی زوو هەواڵی ئەم شەو دەگاتەوە گوێی شا! هەر لەبەرئەوە هەریەکەیان پێشبڕکێی بوو لەسەر پیاهەڵدان و وەسفکردنی شا!

وتم: باشە ئەی بۆچی قسە بە حزبی تودە و یەکێتی سۆڤیەت دەڵێن؟

ڕەزا وتی: (چونکە ئەمانە دەزانن کە محمد ڕەزا زۆر ڕقی لە کۆمۆنیست و تودەییەکانە و دەیانەوێت خۆیان بە دوژمنی سەرسەختی کۆمۆنیست و تودەییەکان پیشان بدەن و بەم شێوەیە پێگەی خۆیان بەهێزتر بکەن!)

ڕاستیەکەی ئەوە بوو کە محمد ڕەزا هیچشتێکی بە قورسی نەدەگرت جگە لە تودەییەکان! ژەنراڵ فردوست سەرۆکی لێکۆڵینەوەی شاهنشاهی. هەندێکجار لەگەڵ گروپە لێکۆڵینەوەکەی خۆی چەندین مانگ جاری واش هەبوو ساڵێك ئەرك و ماندوبوونی دەکێشا و لێکۆڵینەوەی لە ئیدارەیەکی دەوڵەتی یان سوپای دەکرد و بەڵگەی پەیوەست بە دزی و گەندەڵی وەزارەتەکان و بەرپرسە یەکەمەکانی ئامادە دەکرد و دەیدا بە شا. بەڵام محمد ڕەزا تەنها فەرمانیدەدا کە ئەم ڕاپۆرتانە تۆمار بکرێن.

شا دەیوت وڵات پارەی زۆری هەیە و ئەم کۆمەڵە دزە کەمانە زەرەیەکی بەو شێوەیە نادەن لە داراییەکانی وڵات و کاتێك کە ئێمە یەك ملیارد دۆلار دەدەین بە میسر، و یەك ملیارد دۆلار ددەین بە ئیسرائیل، و نیو ملیارد دەدەین بە سەرچاوە ئاویەکانی لەندن و نیو ملیارد دەدەین بە هەندێك لە وڵاتان بە قەرز(!) ئیدی چ گرفتێکی تیدایە کە کۆمەڵێك لە بەڕێوەبەرانی وڵاتیش دەوڵەمەند بن و قەڵەو بن!

محمد ڕەزا نەك هەر چاوی دادەخست لەبەرامبەر کەسانێکدا کە لەسەر بوجەی دەوڵەت پێ دەگەیشتن و ناخونەکیان لێ دەدا، بەڵکو لەبەرامبەر ئەو کەسانەشی کە چالاکی نا کۆمۆنیستیان هەبوو لێبوردەی پیشان دەدا. بەڵام ئای بە حاڵی ئەو کەسەی کە بچوکترین مەیلی بۆ کۆمۆنیست هەبوایە!

کچەکەم دەیوت: (ئەمریکیەکان و ئینگلیزەکان لە دەوروبەرماندا چاو و گوێی تیژیان هەیە و بچوکترین جوڵە و هەڵسوکەوتمان دەگەیەننە واشنتۆن و لەندەن)

بۆیـە، وادیـار بـوو کـە توونـدبوونی محمـد ڕەزا لـەدژی کۆمۆنیـستەکان زیـاتر بـۆ بەدەستهێنانی دڵنیای واشنتۆن و لەندەن بوو، تاوەکو ئەوان دڵنیا ببن کە لە ئێراندا سەنگەرێکی بەهێز هەیە لەبەرامبەر هەژموونی کۆمۆنیستی.

ئێـستا کـە قـسە و بـاس هاتـە سـەر ئاشـنایان و نزیکـەکان و نـاوی حزبـی تـودە و کۆمۆنیزم و ئەمریکا و بەریتانیا و یەکێتی سۆڤیەت برا ڕێگەم پێ بدە هەنـدێکیش لەبارەی تودەییە یاخیەکانەوە قسە بکەم.

لـەناو کەسایەتیەکانی دەرباریـەکان و سـەرۆکی دەزگـا دەوڵـەتی و تەنانـەت لـەناو کەسـانی پلـە یـەکی وەزارەتـەکان و زانکۆکانیـشدا کەسـانی خـاوەن پێـشینەی کۆمۆنیست هەبوون.

پێش هەمووکـەس دەبێـت نـاوی (ئـەمیر عبـاس هەویـدا!) ببرێـت کـە لەسـەردەمی خوێندکارییـدا لـە پـاریس و لـە جنێـف و لـە برۆکسل و لـە بـەیروت چالاکی تـودەیی هەبووە.

من ئەم زانیاریەم بەبێ هیچ ئەملاو ئەولایەك لە خودی ئەمیر عباسەوە بیستوە.

یـەکێکی دیکـە (هۆشـەنگ نهاوەنـدی) وەزیـری کـار (دواتـر وەزیـری ئـاوەدانی و نیشتەجێبوون) بوو کە لە سەردەمی خوێندنیدا لەگەڵ فەرەح لە پاریس ناسیبیووی و لە هاوڕێیـانی سـەردەمی فـەرەح بوو لـە پـاریس. کەسێکی دیکە کە ئێستا لـە بیرمـە (محمـــود جعفـــەریان) (جێگـــری ڕادیـــۆ-تەلـــەفزیۆن) بـــوو. لـــە ڕۆژنامەنوســـە بەناوبانگـەکانیش دەتـوانم نـاوی (پـەرویز لوشـانی) و (ئیـسماعیل پـوروالی) ببـەم. لـە سـەرمایەدارە گـەورەکانیش دەتـوانم نـاوی غلامحـسین ئیبتهـاج و براکـانی ببـەم. لـە سەربازیەکانیشدا دەتوانرێت ئاماژە بە سەر لەشکر ئەحمەد مقربی بکرێت.

بەکورتی هەرچـەندە بـە سـەدان تودەییمـان هـەبوو و کـە زۆرترینیـان بـەهایی بـوون بـەڵام گیـانی خۆیـان دەکـردە قوربـانی بـۆ ممحـد ڕەزا. (بـەڵام مـن گومـانم هـەبوو لـەم دەربڕین و قوربانیەیان!)

محمـد ڕەزا دەیـوت: (ئـەم داماوانـە کـە لـە گەنجیـدا هەڵخەڵـەتێنرا بوون بـە هۆتـافی ئـازادی و دادپـەروەری کۆمەڵایـەتی و خۆشـگوزەرانی کۆمۆنیـستەکان، ئێـستا لـەم تەمەنەدا بەچاوی خۆیان دەبینن ئەو جیهانە باشەی کە کۆمۆنیستەکان باسیان دەکرد

له ئێراندا دەبینرێت و بەرچاو دەکەوێت! هەر لەبەر ئەوەیە ئێستا بونەتە لایەنگری یەکەمی ئێمە!)

به باوەڕی من، ئەم کەسانە ئەو درۆزنانە بوون لە گەنجیدا جیهانیان لەسەر ڕێی شۆڕشە کۆمۆنیستیەکانی دەبینی (و بۆخۆشیان ئایندەیەکی ڕوونیان وێنا کردبوو).

هەر بۆیە چوونە ناو چالاکی فیدراسیۆن و کۆمەڵەی خوێندکارانی تودەیی تاوەکو لە یارمەتیەکانی حزبی تودە سودمەند بن. بەڵام پاش خوێندن کاتێك گەڕانەوە بۆ ئێران و کاتێك بارودۆخەکەیان بە پێچەوانەی تودەییەکانەوە بینی (بەتایبەتی پاش ڕووداوی ٢٨ ئۆگۆستی ١٩٥٣ کە بڕیاری نایاسای حزبی تودە دەرکرا). بە ئاراستەی باوە سەریان شۆڕ کرد و بوونە هاوبیری حکومەت و دەسەڵات.

(هەویدا) بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە لە گەنجیدا کۆمۆنیست بووە بەڵام فەرەح کە دۆسیەکەی بینی بوو دەیوت هەویدا لەسەردەمی خوێندنیدا لە ڕیزی خوێندکارانی تودەیی و ئیرانیانی دژە حکومەت لەدەرەوە وەکو سیخوڕێك خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری بوو بۆ حکومەتی ئێران. (هەویدا) دواتر بوو بوو بە ئەندامی ساواك و یەکێك بوو لەسەرچاوەکانی هەواڵی ساواك لە دەرەوەی وڵات.

(مەنوچەهر ئازمون)یش کە گەیشتە وەزارەت لە تودەییەکانی پێشوو و لە کارمەندانی دواتری ساواك بوو!

(هەویدا) و (ئازمون) ئەوەندە لە کارەکەی خۆیاندا لێزان بوون کە تەنانەت بووبوون بە ئەندامی حزبی تودە لە نەمسا!

(محمود جەعفەریان) لە ئەفسەرانی تودەیی سوپای شاهنشاهی بوو کە پاش کەشفبوونی تۆڕی ئەفسرانی حزبی تودە لەناو سوپادا دەرکرا و ماوەیەکی زۆریش چاودێری کۆمپانیای یەکەی خەتی هاتوچۆ بوو. بەڵام دواتر توانی لەناو حزبی رستاخیز خۆی پێبگەیەنێت و ببێتە جێگری برازاکەشم لە ڕادیۆ-تەلەفزیۆنی نەتەوەی ئێران!

بەپێی ئەو بەدواداچوونەی کە کردم دەیانوت (ئەبو الحسن ئیبتهاج)یش لە سەردەمی خوێندکاربوونیدا تودەیی بووە.

چۆن دەکرێت کەسێك بەو بیر و مەرامە کۆمۆنیستیەوە کە دەبێت بۆ خۆشبەختی خەڵکی گشتی کار بکات تاوەکو ئەو ڕادەیە پارە پەرست بێت و ببێت بە یەکێك لە دەوڵەمەندترین پیاوانی وڵات؟

بۆیە، ئەو مافەم پێ بدەن ئەم کۆمەڵە کەسانە بە هەلپەرست و بەرژەوەندی خواز ناوبەرم چونکە لە هەر سەردەمێکدا بەپێی خواستی ئەو کاتە خۆیان دەگونجاند لەگەڵ ئەو بارودۆخانەدا وەکو ئەو پەندەی کە دەڵێت لە کوێ با هەبوو لەوێ شەن دەکات!

پاش کەوتنی حکومەتی شاهنشاهی ئێران بینیم لە هەندێك لە کتێبی یاداشتەکاندا و یان لەناو باسی ڕووداوەکانی دەستگیرکراوەکاندا وەکو پەروێز نیکخواه و محمود جەعفەر لە قسەکانی خۆیاندا وتویانە: (بە درۆوە خۆمان نزیك کردبوویەوە لە حکومەتی شا تاوەکو بتوانین لەناوەوە زەربەیەکی گەورەی لێ بدەین!)

جەعفەریان بە ئاشکرا لە دادگای شۆڕشدا وتبووی ئێمە گەیشتبوونە ئەو دەرئەنجامەی کە دەمانتوانی بە نزیك کردنەوەی خۆمان لە ڕژێم باشتر کرمۆڵی بکەین و کانی بدەین!

تێبینی بکەن بزانن چ کەسانێکی شەریف لە گەڵماندا بوون!

فەریدون هەویدا لە یاداشتەکەیدا سەرەڕای ئەو درۆ زۆرانەی کە کردویەتی بە پێی وتەی براکەی خۆی کە ١٣ ساڵی تەواو سەرۆك وەزیران و بەپێی یاسای بنەڕەتی وڵات بە کەسی یەکەمی وڵات حساب دەکرا بابەتێك باس دەکات لەو بابەتەدا ترۆپکی مەزڵومیەتی زاوا خۆشەویستەکەم دەخاتەڕوو!

(فەریدون هەویدا) کە خودی خۆیشی یەکێك بووە لە تودەییە هەڵگەڕاوەکان باسی ئەوە دەکات چۆن کەسانی تودەیی لەناو حکومەتدا دەسەلاتیان پەیداکردبوو و وەکو (مۆرانە) کەوتبوونە گیان و کرۆکی حکومەتەکە و بوونە هۆی کەوتنی!

محمد ڕەزا بە سادەیەکی زۆرەوە وابیری دەکردەوە کە ئەم کەسانە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری پێشکەوتنەکانی وڵات(!) و ئەو هەنگاوە چاکەسازیانەی حکومەتەوە و بیروباوەڕی توندڕەویانەی پێشوویان واز لێهێناوە و خۆیان بەستوە بە خزمەتکردنی حکومەت و دەوڵەتەوە!

هەر ئەم (فەریدون هەویدا) محمد ڕەزا تاوانبار دەکات بەوەی کە زۆر نامەردانە براکەی (ئەمیر عباس)ی واز لێهێنا و خستیە دەست ئایەت الله خلخالی (قازی دادگای شۆڕش).

محمد ڕەزا یەکێك لە گەورەترین و گرنگترین کارە سیاسیەکانی لە دەرەوەی وڵات دابوو بە (فەریدون هەویدا) تاوەکو ببێتە نوێنەری ئێران لە نەتەوە یەکگرتوەکان و دەرخەری سیاسیەتەکانی دەوڵەتی ئێران و پشتیوانی ڕژێم لە کۆمەڵەی نەتەوەیە یەکگرتوەکان. بەڵام لەکاتێکدا کە فەریدون هەویدا سودی لە باشترین توانای دەوڵەتی وەردەگرت بە هۆی ئەو پێگە باشەی کە لەبەردەستیدا بوو، کەچی لە پشتەوە خەنجەری دەدا لە پاشاکەی خۆی.

پاش ئەوەی لە ساڵی ١٩٧٨ لە ئێران چووینە دەرەوە هەندێك لە بەرپرسەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە ئەسوان لە (میسر) هاتن بۆ بینینی محمد ڕەزا. یەکێك لەو کەسانە (ئارمائۆ) بوو کە بەبێ هیچ ئەملاوئەولایەك و بێ پەردە زانیارێکی زۆری خستە بەردەست محمد ڕەزا.

ئارمائۆ کە زانیارێکی زۆری هەبوو لەسەر بەرپرسەکانی ئێران باسی ئەوەی کرد بۆ محمد ڕەزا چۆن (فەریدون هەویدا) وەکو ڕاوێژکارێکی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا ڕۆڵی بینیوە و زانیاری و بابەتی زۆری خستوەتە بەردەست وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا.

ئارمائۆ وتی: (فەریدون هەویدا شای بە کەسێکی نەخۆش و داماو ناساندوە کە بەهیچ شێوەیەك لەتوانایدا نیە بارودۆخی ئێران هەڵبسەنگێنێت و ئەگەر ئەمریکا بیرێك لە داهاتوی ئێران نەکاتەوە بێ گومان ئێران دەکەوێت دەست کەسانێکەوە کە لایەنگری یەکێتی سۆڤیەت دەبن!)

لێرەدا پێویستە باسی بەسەرهاتێکی سەرنجڕاکێش بکەم کە نیشاندەری پەیوەندی نێوان فەرەیدون هەویدایە لەگەڵ ئەمریکادا.

ئەگەر هەڵە نەبم، لەکۆتایی مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٨ بوو کە کچەکەم (فەرەح) بە نیگەرانیەکەو باسی ئەوەی کرد کە ڕۆحیەتی محمد ڕەزا زۆر خراپ تێکشکاوە.

هۆكارەكەیم پرسی. كچەكەم وتی: (ساواك دەقێكی تۆماركراوی گفتوگۆی فەرەیدون هەویدای لەگەڵ براكەی ئەمیر عەباسی هێناوە بۆ لای شا)

فەرەیدون بە تەلەفۆن لە نیۆیۆركەوە قسەی لەگەڵ براكەی كردوە و داوای لێ كردوە بەبێ هیچ دوودڵێك خاكی ئێران بەجێبهێڵێت.

فەریدون لەم پەیوەندیە تەلەفۆنیەدا بە ئاشكرا وتبووی بە براكەی كە لەگەڵ بەرپرسانی ئەمریكادا قسەم كردوە و ئەمریكیەكان پێیان ڕاگەیاندوم كە ئیشی شا تەواو بووە و باشترە تاوەكو درەنگی نەكردوە ئەمیر عباس خاكی ئێران بەجێبهێڵێت و مانەوەی لە ئێراندا ئیدی لە بەرژەوەندی ئەودا نیە.

من ئێستا ڕێك وەكو خودی ئەو دەقی قسانەم لەبیر نیە، بەڵام بابەتەكە بەكورتی ئەوە بوو كە فەریدون هەویدا لەگەڵ هاوڕێ دەسەڵاتدارە ئەمریكیەكانی خۆی قسەی كردوە و بەرپرسە باڵاكانی ئەمریكا پێیان وتبوو دەبێت شا بڕوات!

هەروەها ئەم شریتی گفتوگۆیە ئەوەی دەخستەڕوو كە فەریدون هەویدا لەگەڵ بەرپرسە ئەمریكیەكاندا پەیوەندی زۆر پێچەوانەی ئاراستەی بەرژەوەندیەكانی حكومەتی سەڵتەنەتی هەبووە. محمد ڕەزا پاش بیستنی ئەم قسانە فەرمانی دەستگیركردن و زیندانی كردنی ئەمیر عباسی دا و وابزانم لە حەڤدە یان هەژدەی مانگدا بوو كە حكومەتی سەربازی هەویدای دەستگیر كرد و خستیە ناو زیندانی جەمشیدیەوە!

من ئەو شەوەی كە هەویدایان دەستگیر كرد و خستیانە زینداوەوە نانی ئێوارەم لەگەڵ كچەكەم و محمد ڕەزادا خوارد.

لەسەر مێزی نان خواردنەكە وتم بە محمد ڕەزا: (جەنابی حەزرەت! باش نیە تۆ سەرۆك وەزیرانەكەی خۆت بكەیتە زیندانەوە. ئەم كارە بە زیانی خۆت تەواو دەبێت. هەویدا نزیكەی سیانزە ساڵ فەرمانەكانی تۆی جێبەجێ دەكات و خەڵكی دەڵێن شاهنشاه دانی ناوە بە خراپەكاری و سەرپێچیەكانی هەویدا و ئەوەندەی دیكە دڵنیا دەبن لەو باس و خواستانەی كە لەبارەیەوە دەكرێت!)

محمد ڕەزا لەكاتێكدا كە بەتوندی بێتاقەت و نیگەران بوو وتی: (ئەمە پیاوە بچوكە نێرەموكە و برا خراپترەكەی یەكێكن لە خیانەترین كەسەكان.)

زانیاری ساواك كه ماوەیەكی زۆر پێشتر ئەوەی دەخستەڕوو كه هەویدا و براكەی فەریدون لەو كاتەوەی كە جەمشید ئاموزگار هاتە سەر كار و دەستیكرد بە چاكەسازیە ئابوریەكان دڵی خۆشیان نەماو و دەستیانكرد بە پێدانی زانیاری هەڵە بە ئەمریكیەكان.

محمد ڕەزا دەیوت چەندین ساڵ پێشتر زانیویەتی كە ئەمیر عباس هەویدا لەگەڵ ڕێكخراوە نهێنیەكانی ئەمریكا و بەریتانیادا پەیوەندی زۆر نزیكی هەیە بەلاّم ئەم وابیری دەكردەوە كە ئەگەر كەسێكی وەكو ئەمیر عباس سەرۆك وەزیرانی ئێران بێت ئەوا ئەمریكیەكان و بەریتانیەكان پێیان خۆشە. بەلاّم هەرگیز تەصوری نەدەكرد كە ئەمیر عباس كە هەمیشە خۆی بە سوپاسگوزار و فیدای شا دەزانی زانیاری هەڵبە بدات بە ئەمریكی و ئینگلیزەكان و بۆ تۆڵە سەندنەوە لە محمد ڕەزا و جەمشید ئاموزگار زەربەیەك بدات لە بنەمای سەڵتەنەتی ئێران!

پاش كەوتنی دادوودخان لە ئەفغانستان (ساڵی ١٩٧٦) محمد ڕەزا توشی بێتاقەتی و نیگەرانێكی زۆر بوو.

من دووجار محمد ڕەزام زۆر بە بێتاقەت و غەمگین بینوە. جارێكیان پاش بیستنی هەواڵی سەركەوتنی جیمی كارتەر بۆ سەرۆكی ئەمریكا و جارێكیشیان پاش بیستنی هەواڵی كەوتنی دەوڵەتی ئەفغانستان.

كچەكەم دەیوت: (محمد ڕەزا) زۆر ڕقی لە كارتەر بوو و وەكو جۆن ئیف كەنەدی سەیری دەكرد.

محمد ڕەزا كارتەری بە پیاوێكی بچوكی لادێی ناو دەبرد. هۆكارەكەشی ئەوە بوو كە جیمی كارتەر كێڵگەیەكی گەورەی عەلی بابای بەڕێوە دەبرد و یەكێك بوو لە جوتیارە سەرەكیەكانی ئەمریكا.

دیموكراتەكانی ئەمریكا لەسەردەمی (جۆن ئێف كەنەدی) بۆچوونی هاوكاریان لەگەڵ محمد ڕەزادا نەبوو و ئێمەش دەمانزانی كە كەنەدی جارێكیان ویستبووی محمد ڕەزا لابەرێت و علی ئەمینی بهێنێتە جێگەكەی بەلاّم بەریتانیەكان ڕێگریان لەم كارە كردبوو.

محمد ڕەزا دەیوت: (ئەمریکیەکان گروپێکی دووژمنی بێدەنگیان لە ئێراندا هەیە کە هەرکاتێك بیانەوێت دەتوانن ئالآی دوژمنایەتی بەرز بکەنەوە).

ئەم گروپە دوژمنە دژە دەوڵەتیە پێکهاتبوون لە کۆمەڵێك لە پیاوانی نەتەوەیی-ئاینی و کەسانی سەردەمی خۆماڵیکردنی نەوت وەکو دکتۆر محد مصدق کە دەیان وت دەبێت شا وەکو شاژنی بەریتانیا تەنها سەڵتەنەتی بەدەستەوە بێت نەك حکومەت!

شاچەندجارێك لەم گروپە دووژمنانەی دەستگیر کردبوو و خستبویە ناو زیندانەوە.

پاش ئەوەی (جیمی کارتەر) لە ئەمریکا دەرچوو محمد ڕەزا توشی گەورەترین هەڵی سیاسی سەردەمی خۆی بوو بۆ دڵخۆشبوونی دیموکراتەکانی ئەمریکا و ئەو حکومەتە تازەیەی کە هاتبوویە سەر کار ئەویش بانگی فەزای کراوە و ئازادی دەرکرد.!

لەو هەلومەرجە ئابوریە خراپە کە ڕێژەی هەڵئاوسان لە زیادبووندا بوو، کردنەوەی فەزای سیاسی بۆ ئێران بووە هۆی زیاتربوونی ڕەخنە و ناڕەزایەتی دژی دەوڵەت و سەڵتەنەت.

هێرشی یەکێتی سۆڤیەتی جاران بۆ ئەفغانستان پێگەی جیهانی محمد ڕەزای خستە مەترسیەوە.

تاوەکو ئەو کاتە ئێران بەرپرسیاریەتێکی گەورەی هەبوو کە وەکو بەربەستێکی بەهێز ڕێگری لە هەژموونی کۆمۆنیستەکان دەکرد لە ناوچەی هەستیاری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. بەڵام سیاسەتە خاو و ئارامەکانی شا لە ئەفغانستان بووە هۆی کەوتنی دەوڵەتی ژەنراڵ محمد داوود خان و (پاشان لەشکرکێشی سۆڤیەت بۆ ئەفغانستان)

کەوتنی ئەفغانستان بڕبڕەی پشتی محمد ڕەزای توشی لەرزین و داخوران کرد.

ژەنراڵ محمد داوود خان پیاوێکی لایەنگری ڕوسەکان بوو بەڵام پاش ئەوەی گەیشتە سەرۆکایەتی کۆمار شوێنەکەی گۆڕی و ڕووی کردە ڕۆژئاواییەکان.

بە ڕووتێکردنی داوودخان بۆ ڕۆژئاوا محمد ڕەزا ڕۆڵی کەسی یەکەمی بینی.

من لەگەڵ ژەنراڵ دوود خانی کۆچکردوو چەندینجار دیداری دۆستانەم هەبووە. پیاوێکی زۆر خۆش مەشرەب، ئەدیب، ئەهلی شعر و عیرفان و قسە خۆش کە زمانی فارسی بە زاری دری زۆر بە شیرین قسەی پێ دەکرد.

باڵا بەرز، جسمێکی گەورە و کەچڵی هەبوو.

داوودخـان لـە ڕوسـیا خوێنـدبووی و لـە خانـەدانانی محمـد زاهرشـای پاشـای ئەفغانستان بوو، کە لەدژی ڕاپەڕی و زاهرشای دوورخستەوە.

ڕوسـەکان پـشتیوانی ئـەم هەڵگەڕانـەوەیان کـرد. بـەڵام پـاش ئـەوەی کـە داوودخـان توانی جێگە پێی خۆی بەهێز بکات. پشتی لـە ڕوسـەکان کـرد و لـەو چـەند سـەفەرەیدا کـە ڕووی کـردە ئێـران داوای کـرد کـە محمـد ڕەزا ببێتـە میانجیکـەری نێـوان ئـەو و ئەمریکا و ببێتە سەرچاوەیەك بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ڕۆژئاواییەکان.

محمـــد ڕەزاش فەرمانیـــدا هاوکـــارێکی زۆری دارایـــی فـــراوان بگـــات بـــە دەســـت ئەفغانستان.

سـەرەڕای دروسـتکردنی چـەند سـەدێکی هاوبـەش لـە خاڵـە سنوریەکان و هاوکاری ئابوری لەگەڵ یەکتری چەند ڕێکەوتننامەیەکیش مۆرکرا لە نێوانیاندا.

نزیکی داودخان لەگەڵ محمد ڕەزا و هاتوچۆ ئاشکرا و شاراوەکانی لەگەڵ ئێران لـە دیدی ڕووسـەکانەوە بەشاراوەی نـەما و ڕوسـەکان لـەم پـچڕانی پەیوەنـدە تەحـەمولیان نەکرد و توانیان کلکی داوودخان بپچڕێنن.

کودەتاچیەکانی حکومەمت پاش هێرشکردنە سـەر کۆشکی سـەرۆکایەتی کۆماری داوودخان هاوسەر و منداڵەکان و تەنانەت نەوەکانیشیان لە سێدارە دا و بـەم شێوەیە وەچەکانیشیان لەناوبرد.

سەرئەنجام، چەند کودەتایەکی یەك لەدوای یـەك، بووە هـۆی ئـەوەی کـە بـە ئاشکرا سـۆڤیەتەکان دەسـتوەربدەنە ئەفغانـستان و ڕوسـەکان ئـەو کەسـانەیان خـستە سـەر دەسـەڵات کـە دەستنیـشانکراوی خۆیـان بـوون و توانیـان بگەنـە نزیـك دەمـی تەنگـەی هورمز کە ڕەگی ژیانی جیهانی ڕۆژئاوا بوو!

مـن زۆر نەدەچـوومە نـاو پرسـی سیاسـی و وردەکاریەکانیـەوە. کـچەکم دەیـوت: ئەمریکیەکان محمد ڕەزا بە هۆکارێك دەزانن بۆ کەوتنی ئەفغانستان!

لەلایەکەوە ئەمریکیەکان دەترسان لەوەی کە پاش ئەوەی کە ئەفغانستان کەوتە دەست ڕوسەکان ببێتە هۆی ئەوەی هەژموونی خۆیان لە ئێراندا زیاد بکەن و لەلایەکی دیکەوە ببێتە هۆی ئەوەی کە تودەییەکان دووبارە سەرهەڵبدەنەوە.

ئەمە ئیدی نهێنی نیە و هەمووکەس دەزانێت کە جیمی کارتەر لە بیرەوەریەکانی خۆی وتویەتی ئەمریکا بۆیە پشتیوانی خۆی لە هاتنە سەر ئەو کەسە ئاینیانە کرد تاوەکو ببنە ڕێگر لەبەردەم هاتنە سەر حوکمی تودەییەکان[1].

کارتەر دەڵێت ڕاوێژکارەکانی پێیان وتوە بەردەوامی نائارامی لە ئێران و پشتیوانی ئەمریکا لە شا دەبێتە هۆی گەشەکردن و سەرهەڵدانەوەی تودەییەکان!

ئەم زانیارە هەڵانە چ کەسێك دەیدا بە ئێرانیەکان؟ کەسانی وەکو فەریدون هویدا! کۆمەڵێك لە عەقڵی کەم وکورت کە خۆیان ئەندامی حکومەت و بەشێك بوون لە دەسەڵاتدارانی دەوڵەت کاتێك بارودۆخەکەیان بەرەو گۆڕان برد، بۆ نزیك کردنەوەی خۆیان لە ئەمریکا و خزمەتکردنیان دەستیان کرد بە لێدانی شا. تەنانەت یەکێك لە کارمەندە پایە بەرزەکانی ئێران لە نەتەوە یەکگرتوەکان چووە ناو ڕیزی ئۆپۆزسیۆن و دوژمنەکانەوە!

من هەرچەندە خوالێخۆشبوو ئەمیر عباس هەویدام بەهۆی جوڵە و گاڵتە و گەپەکانیەوە خۆشدەویست، بەڵام هەمیشە باوەڕم وابوو دەبێت بۆ پیاوتی مەردایەتی لەناو پیاواندا بۆی بگەڕێیت. هەویدا بەداخەوە پیاو نەبوو کەسێك بوو لەنێوان

---

[1] – پاش دەستبەسەراگرتنی سەفارەتی ئەمریکا لە تاران کە لەلایەن خوێندکارانی هێڵی ئیمام خمینی کۆمەڵێك بەڵگە و دیکۆمێنت لەبارەی ئەو کەسانەوە بەدەستهات کە لەناو دەسەڵاتی کاتیدا هەژموونیان هەبوو سەر بە ئەمریکا بوون، خوێندکارەکانیش بە بڵاوکردنەوەی ئەم بەڵگانە بووە هۆی ئەوەی کە ئەو کەسانە لەناو حکومەتدا دووربخرێنەوە و کۆمەڵێکیشیان دادگایی بکرێن. دوابەدوای ئەم ڕووداوانە ئەو شۆڕشەی کە سەرانی ئیسلامی لە ئێران بە شۆڕشی دووەم ناویان برد دەوڵەتە کاتیەکەی مهندس بازرگان کە حەزی دەکرد هێڵی پەیوەندیەکانی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتوەکاندا بپارێزێت دەستی لەکار کێشایەوە و هەندێك لە کەسایەتیە ناسراوەکانیش وەکو ئەمر ئینتزام بە تاوانی سیخوڕی بۆ ئەمریکا دەستگیر کران و زیندانی کران.

حاڵەتی ژن و پیاویدا کە ئەمەش نابێت چاوەڕوانی پیاوەتی و مەردایەتی و وەفاداری لێ بکرێت.

براکەشی لەو خراپتر بوو. هەمووکەس دەزانێت کە فەریدون و براکەی ئەمیر عباس گیرۆدەی نەخۆشی نێربازی بوون.

من هەرچەندە هەوڵمدەدا خۆم تێکەڵی پرسی سیاسی نەکەم. بەڵام چەندینجار لە کچەکەم ئەپرسی ئایا لە وڵاتی ئێران وشکەساڵی پیاوە و پیاو پەیدا نابێت کە محمد ڕەزا ناپیاوێکی کردوە بە سەرۆك وەزیران؟

جگە لە منیش، مهندس ئەردەشیر زاهدی چەندینجار بە ئاشکرا باسی خراپەی ئەمیر عباس و بەتایبەتی فەریدونی لەلای محمد ڕەزا و کچەکەم کردوە و بە ڕونی وتویەتی کە ئەم دوو برایە هاوجنسبازن و ئەمەش بۆ ئابڕو و کەرامەتی ئەم وڵاتە باش نیە کە سەرۆك وەزیر و نوێنەری وڵات لە نەتەوە یەکگرتوەکان (هاوجنسباز) بن!

ئەردەشیر کە بەهیچ شێوەیەك قسەی نەدەخواردەوە هەندێکجار لەناو میوانیەکان و پیاوانی ناسراویشدا بە قسەی پیس ناوی هەویدا وبراکەی دەبرد و دڵنیاش بوو ئەم قسانە دەگەنەوە گوێی محمد ڕەزا.

فەریدون هەویدا لە کتێبەکەیدا، زاوا کۆچکردوەکەم بە بێ وەفا و تاوانبار ناو دەبات و زۆر بێ بەزەییانە ڕەخنە لە محمد ڕەزا دەگرێت بەهۆی بەجێهێشتنی ئەمیر عباس هەویدا لە تاران بۆ ئەوەی کە کەوتە دەست شۆڕشگێڕەکان و لەسێدارەیاندا. بەڵام لەبارەی ناپیاویەکانی خۆی و براکەیەوە هیچشتێك باس ناکات.

محمد ڕەزا، پاش دوورخستنەوەی ئەمیر ئەمیر عباس هەویدا، پێشنیاری بۆ کرد وەکو سەفیر بڕوات بۆ بەلجیکا.

هەویدا ساڵانی خوێندن و گەنجی خۆی لە برۆکسل گوزەراندبوو و محمد ڕەزا بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە هەویدا ماوەی سانزە ساڵ فەرمانڕەوای وڵات و بەرپرسی سەرهەڵدانی هەموو کێشە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان بوو، بەرپرسی سەفارەتی ئێرانیشی پێ بەخشی لە برۆکسل تاوەکو هەویدا ساڵانی کۆتای تەمەنی خۆی بە ئارامی و لەو ژینگەیەدا بەرێتە سەر کە خۆشی دەوێت. بەڵام هەویدا دەیویست لە

ئێران بمێنێتەوە و تۆڵە لە هاوڕێ دوژمنە سیاسیەکانی بکاتەوە. هەویدا محمد ڕەزای ناچار کرد وەزارەتی دەرباری شاهنشاهی بدات بەدەستیەوە.

هەویدا بە وەرگرتنی ئەم پۆستە مەبەستی ئەوە بوو بتوانێت لەلایەکەوە هەر لە ترۆپکی دەسەلاتدا بمێنێتەوە و لەلایەکی دیکەشەوە بۆ ئەوەی هەر جەمشید ئاموزگار و بەڕێوەبەرانی دەوڵەتیش لەژێر دەسەلاتی خۆیدا بن.

هەڵبەتە لەو کاتەدا هیچکەس بیری نەدەکردەوە کە ڕژێمی ئێران بەرەو لەناوچوون دەڕوات (ئەگەرنا هەویدا گیانی ڕزگار دەکرد و هەڵدەهات بۆ برۆکسل!)

من دڵنیام ئەگەر هەویدا نەڕۆیشتایە بۆ وەزارەتی دەربار و بەو نامەردەیەی کە لەناو فترەتیدا بوو، خەریکی ململانی جەمشید ئاموزگار و بەرپرسە دەوڵەتیەکانی دواتر نەبوایە هەرگیز ئەو حکومەتە هەرەسی نەدەهێنا.

بەڕێوەبەرانی بەڕێزی (چاپەمەنی نیما) لە لەندەن و (چاپەمەنی دەریا) لە نیۆیۆرك چەندینجار داوایان لێکردووم کە هەرچیم کردوە هێز بکەم لە خۆم و یادەوەری و ئەو پرسە مێژووییە تۆمارکراوانە لە تاریکخانە و قوڵای مێشکم بهێنمەوە بیر خۆم و بیانخەمە سەر کاغەز و باسیان بکەم.

دەبێت دان بەوە بنێم کە پیری و بەساڵاچوویی پێش ئەوەی هێزی جەستەی ئینسان لەناوبەرێت، توانای فکری و مێشکی لەناو دەبات و بیرچوونەوەش لەو لەدەستچوونانەیە کە پیری و بەساڵاچووی لێی دەسێنێتەوە و بێ بەشی دەکات.

بۆیە، زۆر زۆر بابەت و باس هەیە کە ئێستا لەبیرم نەماون و ڕاستر ئەوەیە کە کچەکەم (فەرەح) بێدەنگی خۆی بشکێنێت و یاداشتەکانی خۆی تۆمار بکات و مافی هەموو ئەو کەسانە بداتەوە کە بێ تاوان تاوانبار کراون و تۆمەتیان خراوەتە پاڵ.

زۆرتری ئەو بابەتانەی کە لەمێشکمدا ماونەتەوە پەیوەستە بە ساڵانی دەیەکانی ۱۹۷۰ و کاتەکانی شۆڕش و ڕووداوەکانی پەیوەست بە دوای هەڵهاتنمان لە ئێران.

ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت حەقیقەتی مێژووییان لەبارەی ئەمیر عباس هەویداوە بۆ دەرکەوێت داوایان لێ دەکەم ئەو دەقانە بخوێننەوە کە لەکاتی دادگاییکردنەکەیدا باسیان دەکات بۆ پارێزگاریکردنی خۆی لەگەڵ کتێبی یاداشتەکانی فەریدون هەویدا.

ئەمیر عباس هەویدا بە درێژای تەمەنی خۆی (تاوەکو پێش دەستگیرکردنی) محمد ڕەزای بە وەلی نعمەتی خۆی ناو دەبرد و خۆی بە سوپاسگوزار و نۆکەری شاهنشاهی دەزانی، کەچی لە دادگای شۆڕش خۆی بە بێ تاوان لە هەر هەڵەیەك دەزانێت و هەموو تاوانەکان دەخاتە ئەستۆی محمد ڕەزا!

فەریدون هەویدا لە کتێبی یاداشتەکانیدا خراپترین سوکایەتی بە محمد ڕەزا دەکات و شای بە هۆکاری هەموو نەگبەتیەکانی ئێران زانیوە!

هەر ئەم دەربڕینە بۆ تاوانبارکردن و مەحکومکردنی ئەم دوو کەسە بەسە. پیاوە سیاسی و سەربازیەکانی دیکەش کەمتر نەبوون لەم دووکەسە. کەسانی وەکو عباس قرەباغی کە بەرزترین پۆستی سەربازی هەبوو لە ئێراندا و دەستی محمد ڕەزای ماچ دەکرد و خۆی دەخست بەسەر پێ و قاچی محمد ڕەزا، پاش دەرچوونی محمد ڕەزا لە ئێران خۆی نزیك کردەوە لە شۆڕشگێڕەکان و سوپای لەکار خست!

ژەنراڵ (حسین فردوست) کە بە منداڵی لەگەڵ محمد ڕەزادا گەورە بووبوو و وەکو دەڵێن نۆکەر و خزمەتکاری ماڵی محمد ڕەزا بوو، دوو بەرگ کتێبی لەدژی محمد ڕەزا و خێزانی پەهلەوی و بەتایبەتی لەدژی کچەکەم فەرەح نوسیوە و خۆی تەسلیمی حکومەتی شۆڕش کرد. تەنانەت ئێمە بیستمان کە (حسین فردوست) لەکاتێکدا کە نزیکترین کەس بوو لە محمد ڕەزاوە و سەرۆکی نوسینگەی لێکۆڵینەوەی شاهنشاهیش بوو بە شاراوەی چەندین ساڵ پێشتر لەگەڵ شۆڕشگێڕەکاندا پەیوەندی هەبوو!

کاتێك لە پەنەما وتیان بە محمد ڕەزا، ژەنراڵ حسین فردوست پەیوەندی هەبووە لەگەڵ حکومەتی تازەی ئێران و تەنانەت هاوکاری لە سێدارەدانی سەرانی حکومەتی (شا)ش دەکات، محمد ڕەزا زۆر خراپ رۆحیەتی تێکچوو و چەندجارێکیش سەری بادا و وتی: باوەڕ ناکەم حسین! نەخێر باوەڕ ناکەم!)[1]

---

[1] – پڕوپاگەندەی هاوکاری ژەنراڵ حسین فردوست لەگەڵ دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی سەڵتەنەتخوازەکان دروستیان کردبوو، ئەوە ڕاست نەبوو. خودی ژەنراڵ حسین فردوست لە کتێبی یاداشتەکانیدا باسی شێوەی دەستگیرکردنەکەی دەکات و ئەم پڕوپاگەندەی هاوکاریەی لەگەڵ کۆماری ئیسلامی یە بە توندرین شێوە بەدرۆ دەخاتەوە.

ژەنراڵ فردوست تەنها کەسێك بوو کە محمد ڕەزا  بە ناوی بچوکیەوە بانگی دەکرد، بەڵام هەر ئەم کەسە سەبارەت بە محمد ڕەزا خائین و جاسوس بوو.

من ئێستا کە بیر دەکەمەوە و شاخێك زانیاری و بابەت بڵاوبوونەتەوە دوای شۆڕش وای بۆ دەچم کە زۆربەی ئەو کەسانەی کە لەدەوروبەری ئێمەدا بوون خائین بوون و ئێمەش لەناو گەمارۆی خائینەکاندا بووین.

فەریدون هەویدا، لە یاداشتەکانیدا، محمد ڕەزا تۆمەتبار دەکەت بەوەی کە لەبری ئەوەی خزمەتی وڵاتەکەی بکات، زیاتر کاتی خۆی تەرخان دەکرد بۆ سەیرکردنی فلیمە سینەماییەکانی (دوفوینس)!

خەڵکی ئاسای کاتێك کتێبەکەی دەخوێننەوە لەوانەیە وابیر بکەنەوە  محمد ڕەزا هەر لە بەیانی تاوەکو شەو کاتی خۆی بە سەیرکردنی فلیمەوە دەبردە سەر.

ئایا پاشای وڵات ئەو مافەی نیە کە لەماوەی هەفتەیەکدا دوو کاتژمێر سەیری فلیمێك بکات؟

ئایا ئەگەر محمد ڕەزا حەزی لە فلیمەکانی دوفونیس کردبێت ئەمە بە خاڵی لاوازی و کەمتەرخەمی دەزانرێت؟

هەمووکەس دەزانێت محمد ڕەزا پیاوێکی وەرزشەوان بوو و کاتە بەتاڵەکانی خۆی لە زستاناندا بە ئیسکی لە سن مۆریتس دەگوزەراند و کاتەکانی هاوینیشی لە نوشهر بە مەلەکردن و یاری سەر ئاو دەگوزەراند.

ئایا ئەم شێوەی گوزەراندنی کاتە بەتاڵانە خراپترە یان ئەو کارانەی کە ئەمیر عباس ئەنجامی دەدا؟

هەمووکەس دەزانێت کە بۆچی خاتو (لەیلا ئیمامی) پاش چەند مانگێک هاوسەرگیری لەگەڵ ئەمیر عباسی لە پرێکدا تەلاقی لێ وەرگرت!

خاتو ئیمامی ڕۆژێکیان لە پرێکدا خۆی دەکات بە ماڵەوەدا و دەبینێت ئەمیر عباس پیاوێکی زلی بردوەتەوە بۆ ماڵەوە و  خەریکی کاری بێ ئەخلاقیە.

ئەمیر عباس هەویدا کاتەکانی خۆی لەگەڵ کۆمەڵێك کەسی هاوجنسبازدا دەبردە سەر  و ڕۆژانەش دوو کاتژمێر سەرۆك وەزیران بوو.

---

حکومەتی سەڵتەنەتی ئێران ئەمیر عباس هەویدا لەناوی برد. محمد ڕەزا متمانەی بە ئەمیر عباس کرد و دەستی بەرەڵا کرد کە بەئارەزووی خۆی دەستبخاتە ناو کاروباری دەوڵەتەوە. ئەمیر عباسیش پیاوەکانی خۆی لە هەموو شوێنێك دانابوو و کۆنترۆڵی بارودۆخەکەی لەدەستی خۆی و هاوکارەکانیدا بوون. ئەمانە محمد ڕەزایان خستبوویە ناو چوارچێوەی چاودێری خۆیانەوە و حەقیقەتەکانیان پیشانی شا نەدەدا.

گرانبوونی نرخی نەوت لە ساڵانی دەیەکانی ۱۹۷۰ بووە هۆی ئەوەی کە داهاتی ئێران زۆر بێت. هەویدا تەنها پارەی خەرج دەکرد و حەقی بەهیچ شتێکەوە نەبوو. لەبری پەرەسەندنی کشتوکاڵ و پیشەسازی ڕووی کردە هاوردەنی و پارەیەکی زۆری نەوتی لەبری ئەوەی کە تەرخان بکات بۆ سەرمایەگوزاری ژێرخانی وڵات تەرخانی کرد بۆ هاوردەکردنی مۆز و پرتەقاڵ و بەرهەمی خۆراکی و کەلوپەلی بێ مانا.

هەویدا زوو زووو ڕاپۆرتی دەدا بە محمد ڕەزا کە خەڵکی ئێران هەموو خۆشبەخت و لە خۆشگوزەرانیدا دەژین و ئەوەندە پارەیان هەیە کە نازانن چی لێ بکەن.

محمد ڕەزا زۆربەی کاتەکانی خۆی تەرخان دەکرد بۆ بەڕێوەبردن و چارەسەرکردنی کێشە سەربازیەکان و سیاسیەتی دەرەوە. وابیری دەکردەوە هەویدا و کابینەکەی بەباشی زاڵن بەسەر بارودۆخەکەدا و ئێستا لەحاڵەتی گەیشتنن بە دەروازە گەورەکانی شارستانیەتی.

بە بۆچوونی من، هەڵەی گەورەی محمد ڕەزا ئەوە بوو کە متمانەی تەواوی هەبوو بەو ڕاپۆرت و هەواڵانەی کە هەویدا پێی دەدا.

هیچکەس، تەنانەت ئێمەش، باوەڕمان نەدەکرد کە هەویدا درۆ دەکات.

ڕادیۆ-تەلەفزیۆن و چاپەمەنیەکان لە ژێر دەستی خۆیدا بوون.

ئەگەر محمد ڕەزا بیویستایە لە ڕێگەی دیکەوە زانیاری پێ بگات ئەوا هەموو ئەو ڕێگایانەش لە ژێر دەسەڵاتە ئەمیر عباسەوە سەرچاوەیان دەگرت.

هەرکاتێك ویستبێتمان لە ڕێگەیەکەوە تێپەڕین بۆ دڵنیابوونی ئاسایشی هەواڵمان دەدا بە ساواك. تەنانەت هەویدا و پیاوەکانی ئاگاداری هاتوچۆی و مەبەستی شوێنی ئەو کەسانەش بوون کە سەردانی یەکتریان دەکرد.

ئێمە بڕۆیشتینایە بۆ هەر شوێنێك ئەو ڕێگایانەمان پاك و جوان و پوخت دەبینی و خەڵکانێکمان دەبینی کە جلی ڕازاوە و پاکیان لەبەرکردبوو و لەملاو لەولای ڕێگاکانەوە وەستابوون و دەستیان بەرزدەکردەوە بۆمان.

پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران تێگەیشتین کە پیاوانی دەوڵەت لەسەر ئەو ڕێگایانە دادەنران کە ئێمە دەڕۆیشتن بەناویاندا و کەسانی موچەخۆر و هێزەکانی پاسەوان و سوپا لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکانیان لەسەر ئەو ڕێگایانە دادەنیشتن تاوەکو بەخێرهاتنی ئێمە بکەن و فیکە و هاوارمان بۆ بکەن!

بە کورتی دەبێت لە ڕستەیەکدا ئەوە بڵێم کە هەویدا محمد ڕەزا و ئەندامانی خێزانەکەی لە خەڵکی جیا کردبوویەوە. ڕێگەم پێ بدەن باسی یادەوەرێکتان بۆ بکەم کە پەیوەستە بە فێڵ و تەڵەکەبازیەکانی هەویداوە.

ڕۆژێکیان، سەرۆکی گاردی کۆشکی نیاوەران، هات بۆ لای مێزی عەسرانەی ئێمە کە لە حەوشە سەوز و دارینەکەی کۆشکدا بووین و پاش دەربڕینی ڕێز و وسوپاسی سەربازی وتی بە محمد ڕەزا پیاوێکی پیری لادێی و کوڕێکی بە مەڕێکی قەڵە و خرپنەوە هاتونەتە بەر دەرگای کۆشك و پێداگیری دەکات و دەڵێت ئەم مەڕەم هێناوە پێشکەشی جەنابی حەزرەتی بکەم و تاوەکو خۆم پێشکەشی خاکی پێی شای نەکەم ئەم شوێنە بەجێ ناهێڵم!

محمد ڕەزاش نەیدەزانی چ وڵامێك بداتەوە. (فەرەح) بە بیستنی ئەم هەواڵە زەردەخەنەیەکی کرد و داوای کرد لە محمد ڕەزا ڕێگەی پێ بدات کە پیرە پیاوە لادێییەکە لەگەڵ منداڵەکەی بێنێە خزمەتی!

کاتێك سەرۆکی گاردی کۆشك پیرە پیاوی لادێی و کوڕەکەی هێنا بۆ ناو کۆشکەکە مەڕێکی قەڵەوی گۆشتنی سپی پاکیان پێ بوو.

پیرەمێرد و کوڕەکەی کە دیار بوو ڕاهێنرا بوون سەریان دانەواند و پاش ماچکردنی دەستی محمد ڕەزا و کچەکەم بابەتێکیان بە شێوەی پەخشان و شیعر لەبارەی پیاهەڵدانی شا و شاژن و پێشکەوتنەکانی وڵات وت.

محمد ڕەزا پرسیاری ئەوەی کرد کە بۆچی ئەم مەڕەتان هێناوە.

پیره پیاوی لادێی وتی: ( لەم ساڵانەی کۆتای بە ئەنجامدانی شۆڕشی سپی و دابەشکردنی زەویەکان بەسەرماندا بارودۆخی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری گەشەی کردوە و من کە لە ڕابردوودا تەنانەت دوو بزنیشم نەبوو ئێستا بوومەتە خاوەنی چەندین گەلە مەڕ کە ژمارەیان نازانم.

پاشان درێژەی پێدا و وتی بەمەبەستی سوپاسگوزاری و شوکرانەبێژی لەو ئەرك و ماندووبوونەوەی جەنابی حەزرەت ئەم مەڕەم کە ئەمساڵ پەروەردە کردوە وەکو خەلاتێك هێناوە بۆ خێزانی سەڵتەنەتی لە تاران!)

محمد ڕەزا بەم نمایشە (کە بۆی دروستکرا بوو!) زۆر خۆشحاڵ و گەشاوە بوو.

بێ دواکەوتن فەرمانیدا وێنەگر ئامادە بکەن و وێنەی ئەم باوك و کوڕە بگرن و لە ڕۆژنامەکاندا بە شێوەیەکی درێژ باسی بکەن و ڕوونکردنەوەی لەسەر بدەن!

شا خەلاتێکی پێشکەش بە کابرای لادێی و کوڕەکەی کرد و پاشان ئیجازەی پێدان بڕۆن.

کاتێك کە کابرا چووە دەرەوە لە کۆشك، سەرۆکی پاسەوانەکانی سەڵتەنەتی کە خۆی خەڵکی ئازەربایجان و لە ئەهلی (ئەهر) بوو، بانگی کرد و لێی پرسی: (باوکە گیان تۆ لەکوێوە هاتوی؟)

کابرای لادێیش لەخۆیەوە دەڵێت: لە (ئەهر)!

سەرۆکی پاسەوانەکانیش دەستدەکات بە قسە بە زمانی تورکی ئازەربایجانی و سەیر دەکات کابرای لادێی تەنانەت یەك وشە لە قسەکانی ئەو تێ ناگات.

ئینجا ئەوەندە دەزانێت تەنانەت لەهجەی ئازەریش نازانێت و زۆر بە ڕەوان و پاك بە فارسی قسە دەکات.

سەرۆکی پاسەوانەکان بە خەیاڵی خۆی کە دۆزینەوەیەکی گرنگی کردوە و گومان دەکات کە لەوانەیە پلانێك لە ئارادا بێت کابرای لادێی و کوڕەکەی دەبات بۆ بینای چاودێرەکانی کۆشك و دەستدەکات بە لێکۆڵینەوە و پرسیارکردن لێی.

دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەکە نیشانی دەدات کە ئەم کابرایە کە گوایە لادێییە و خۆی لە شێوە و ڕووخساردا کردوە بە لادێی یەکێکە لە هونەرمەندە پلە سێیکانی

تەماشاخانەکانی جادەی لالەزار لە تاران کە جەنابی ولیان (وەزیری کشتوکاڵی ئەو کات) پارەی پێداوە تاوەکو ئەم نمایشە ئەنجام بدات لەبەردەم محمد ڕەزادا[1]!

سەرۆکی پاسەوانەکان ناونیشان و تایبەتمەندی هونەرمەندە لادێیەکەی وەرگرت و پاشان بەسەرهاتی بابەتەکەی گەیاندە فەرەح.

کچەکەشم داوای لێ کرد کە لەم بارەیەوە لەگەڵ هیچکەسدا قسە نەکات.

بەیانی ئەم چاوپێکەوتنی پیاوە پیرە بەم مەڕ و منداڵەوە لەگەڵ محمد ڕەزا بە وێنە و باس و خواستێکی درێژەوە لەسەر لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامە سەرەکیەکانی تاران واتە ئیتلاعات و کەیهان بڵاو بوویەوە.

هەڵبەتە فەرەح بابەتەکەی وتبوو بە محمد ڕەزا و هەموومان دەمانزانی کە ئەمە نمایشێکی دروستکراوە. بەڵام محمد ڕەزا نەیویست مەسەلەکە بهێنێتەوە سەر خۆی و زۆر گرنگی بە مەسەلەکە نەدا.

دواتر کاتێك کە کچەکەم، ولیانی بانگ کرد و تاوانباری کرد بە کەسێکی درۆزن و فێڵباز ولیانیش بۆ ڕزگاربوونی خۆی ناچار بوو ئاماژە بە کەسی یەکەمی ئەنجامدەری پلانەکە بکات کە شەخسی جەنابی سەرۆك وەزیران (هەویدا) ئەم نەخشەیەی کێشابوو!

مەبەستم لە باسکردنی ئەم یادەوەریە کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٧٦ ئەوەیە کە نیشانی بدەم چۆن هەویدا بۆ ماوەی ١٣ ساڵ محمد ڕەزای هەڵدەخەڵەتاند. لە ڕاستیدا هەویدا ڕەگی حەیاتی محمد ڕەزای بەدەستهێنابوو و زۆر بەباشی خاڵی لاوازی محمد ڕەزای دەناسی و بەباشی دەیزانی چی بکات!

---

[1] – عبدالعظیم ولیان ئەفسەرێکی هێزی وشکانی بوو. پاش ماوەیەك لە هێزی وشکانیەوە گوازرایەوە بۆ خزمەتی مەدەنی و ماوەیەك وەکو کەسێکی سەر بە ڕژێمی ئێران ڕۆیشت بۆ کابوڵ. ولیان لەو ماوەیەی کە لە ئەفغانستان بوو کتێبێکی لەبارەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابوری ئەفغانستانەوە دانا کە بووە جێگەی سەرنجی زاهرپاشای ئەو کاتی ئەفغانستان.
عبدالعظیم ولیان لە کاری مەدەنیدا گەشەی کرد تاوەکو بووە وەزیری کشتوکاڵ و ئاوەدانکردنەوە. ولیان پیاوێکی خۆش بوو لەهجەیەکی تایبەتی هەبوو کە لەخۆیەوە لەکاتی قسەکردندا وشەکانی تێکەڵ دەکرد.

من نامەوێت بڵێم محمد ڕەزا کەسێکی بێ عەیب و بێ کەموکورتی بووە. نەخێر! بەو شێوەیە نیە. هەر کەسێك بێت با پاشاش بێت خاوەنی عەیب و کەموکورتیە.

لەبەرئەوەی کە محمد ڕەزا لە ڕۆژئاوا گەورە بووبوو و خوێندبووی، تەربیەت و خولق و خوی ڕۆژئاواییەکانی هەبوو.

ئەو سەردەم ڕۆژئاواییەکان بە چاوێکی کەمەوە سەیری نەتەوە ڕۆژهەڵاتیەکانیان دەکرد. بەداخەوە لەبەر ئەوەی کە محمد ڕەزاش هەر بە منداڵی لە سویسرا گەورە بووبوو و پەروەردەکەر و ڕاهێنەرەکانیشی ڕۆژئاوایی بوون، ئەم ئەخلاقەی لەوان بە میرات بردبوو و بە بچوك سەیری خەڵکی دەکرد، بەکورتی ئەو کەسەی کە لەبەرامبەریدا دانیشتایە بە بێ شەخسیەت و بچوك سەیری دەکرد!

ئەگەر کەسێك لەبەرامبەریدا خۆی نیشان بدایە بەبێ یەك و دوو وەلادەنرا.

تۆ دەزانیت بۆچی دکتۆر محمد مصدق وەلانرا و بۆچی ئەوەندە بێزار و بێتاقەت بوو بە ناوی مصدەق؟

لەو ماوەیەی کە لەگەڵ محمد ڕەزادا بووم تێگەیشتم کە محمد ڕەزا لە دڵەوە ئەخلاقی محمد مصدەقی خۆش دەویست و سەرسام بوو بەو خۆشەویستیەی کە هەیبوو بۆ نیشتیمان. تەنانەت چەندینجار بە پەژارە و ئەفسوسەوە دەیوت: (ئەگەر مصدەق حەد و حدودی خۆی بزانایە ئێمە دەمانتوانی چەندین ساڵ بەیەکەوە کار بکەین!)

ئەم حەد و حدودە چی بوو؟

محمد ڕەزا حەزی دەکرد لە وڵاتدا هەرچی بکرێت لەسەر ئەو حساب بکرایە. حەزی دەکرد هەموو کەس خۆشەویست و نۆکەر و خزمەتکاری بوایە. هەویدا زۆر بەباشی پەی بەم بابەتە بردبوو. بۆ نمونە ئەگەر پلان و نەخشەیەکی هەبوایە و تەنانەت ئەگەر جێبەجێشی بکردایە کاتێك محمد ڕەزا شتێکی لێ دەپرسی دەیوت:

(بە ئاراستەی جێبەجێکردنی حەزەکانی پاشایە و بەپێی فەرمانەکانی جەنابی حەزرەت ئەم کارەم کردوە!)

لەڕاستیدا، هەویدا محمد ڕەزای تەڵقین کردبوو بەچەشنێك لەتوانایدا هەبوو بیری شا بخوێنێتەوە و بەبێ ئەوەی محمد ڕەزا وشەیەکی لەدەم بێتە دەرەوە ئەو فەرمانەکان لە ڕێگەی هەستەکانەوە وەردەگرت و جێبەجێ دەکرد!

کچەکەم باسی دەکرد لەناو یەکێك لەو دانیشتنانەی کە شا ئامادە بوو یەکێك لە وەزیرەکان دەڵێت: (بە بۆچونی من باشترە فلاَن ئیش بکەین) محمد ڕەزا بەپەلە ئەو وەزیرە لە دانیشتنەکەدا دەکاتە دەرەوە!

مەبەستم ئەوە نەبوو کە محمد ڕەزا ئامادە نەبوو بۆچوونی هیچکەس ببیستێت، بەڵکو ئەو وەزیرە دەبوایە بیوتایە ئەگەر جەنابی حەزرەت ئەمە بۆچونیانە ئینجا ( بۆچوونی خۆی ڕاستەوخۆ باس بکردایە) شا خۆشحاڵ دەبو و ئەو بۆچوونەی قبوڵ دەکرد! بەمانایەکی دیکە دەبوو ئەگەر بۆچوونی خۆشت ببوایە بەجۆرێك لە جۆرەکان تێهەڵکێشت بکردایە لەگەڵ بۆچوونەکانی شادا بۆ ئەوەی قبوڵی بکات و وابزانێت کە ئەوە بۆچوونی ئەوە.

هەویدا کە زۆر بەباشی ئاگاداری ڕۆحیەت و شێوە و بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی محمد ڕەزا بوو، بێ ڕادە ماستاوچیەتی و پانکردنەوەی بەکار دەهێنا و شەخسیەتی خۆی ورد دەکرد هەر لەبەر ئەوە بوو محمد ڕەزا ڕازی لێی.

محمد ڕەزا بەهۆی ئەزموونی تاڵی ساڵی ١٩٥٣، هەوڵیدەدا کەسانی بێ ئیرادە و گوێڕایەڵ لە دەوری خۆیدا کۆ بکاتەوە.

حکومەتی کورتی (علی ئەمینی)ش ئەم شێوەی بیکردنەوەی لەودا پەرەپێدا. علی ئەمینیش دەیویست نەرم نەرم خۆی وەکو سەرۆك وەزیرێکی بەهێز جێگیر بکات، بەلاَم محمد ڕەزا پێش ئەوەی کە ئەمینی ببێتە مەترسێکی گەورە لەسەر ڕێگەکەی لای برد و بێدەنگی کرد[1].

---

[1] – علی ئەمینی لەسەردەمی سەرۆك کۆماری جۆن ئێف کەنەدی سەنگەری خۆی لەگەڵ دیموکراتەکاندا نزیك کردەوە و خوازیاری چاکسازی لیبراڵی بوو لە ئێراندا واتە خوازیاری کردنەوەی فەزای سیاسی بوو.

کاتێك محمد ڕەزا زانی بە کەین و بەینی علی ئەمینی و ئەمریکا لەترسی ئەوەی نەوەکو علی ئەمینی شا دوور بخاتەوە لە دەسەلاَت، شا دووری خستەوە لە دەسەلاَت.

من کاتێك کە دەمبینی کە کات لە دوای کات سەردەمی سەرۆك وەزیری ئەمیری عباس هەویدا درێژ دەبێتەوە یان سەرۆکی ئەنجومەنی شورای ملی بەردەوام لەدەستی شادروان مهندس عبدالله ریازییە، بێ ڕادە توشی سەرسوڕمان دەبووم.

جارێکیان وتم بە کچەکەم باشە مەگەر لەم وڵاتە بیست ملیۆن کەسیەی ئێراندا کەسێکی دیکە پەیدا نابێت ببێتە سەرۆکی ئەنجومەن سنا بۆچی دەبێت هەمیشە لەژێر دەسەڵاتی شەریف ئیمامی دا بێت؟

کچەکەم وتی: (ئەم کەسانە شقارتەی بێ مەترسین و خۆیان تاقیکردوەتەوە!)

محمد ڕەزا نەیدەویست مەترسی دروستبکات و کەسانێك بهێنێتە سەرکار کە دڵنیا نیە لە پێشینە و کاریان.

لە سوپاشدا هەمان سیاسەتی پەیڕەو دەکرد. فەرماندە و سەرکردەکانی کەسانێکی پیر و پاتاڵ و بەڕاستی بێ توانا بوون.

محمد ڕەزا، لە سوپادا بەتایبەتی هەوڵیدەدا هەمیشە کەسانی بێ توانا و خزمەتکار و ملکەچ و بچوك بکاتە بەرپرسی شوێنە گرنگ و هەستیارەکان.

من لە مەراسیمە ڕەسمی و میوانیەکاندا دەمبینی کە چۆن ئەفسەرانی پلە بەرزی سوپا دەست و تەنانەت پێی محمد ڕەزایان ماچ دەکرد.

محمد ڕەزا، کاتێك ئەو گروپە فەرماندە پلە بەرزانەی سوپای دەبینی کە بەو هەموو جلە زرق و برقانەوە ڕیزیان بەستوە و بە نۆرە دەست و پێی ماچ دەکەن، بەڕاستی چێژی وەردەگرت.

ئەم ئەفسەرە پلە بەرزانە هیچ جۆرە کەسایەتی و شەخسیەتێکیان نەبوو.

محمد ڕەزا وانەی زۆر فێر بووبوو لەو هەموو کودەتا سەربازیانەی کە لە کونج و کەلەبەری ئەم جیهانەدا ڕوویاندابوو و هەروەها ڕووداوەکانی پەیوەست بە ڕێکخراوی

---

کۆمەڵێك لە مێژوونوسەکان لە بەرهەمەکانی خۆیاندا هۆکاری لابردنی علی ئەمینیان بە دەرئەنجامی کێبەرکێی نێوان بەریتانیا و ئەمریکا زانیوە چونکە علی ئەمینی دەیویست هێزەکە بەلای ئەمریکیەکاندا بەرێت و ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی کە بەریتانیەکان بەرژەوەندیەکانیان بکەوێتە مەترسیەوە.

ئەفسەرانی حزبی تودە و هەژموونیان لە سوپای شاهنشاهی و هەروەها ڕووداوی گەمارۆی کۆشکی سەعد ئابادی لە ڕووداوی ١٩٥٣ هێشتا هەر لەبیر بوو، محمد ڕەزا سوپای کردبوویە سوپایەکی نمایشی. سوپا هەمووشتێکی هەبوو جگە لە کەسانی بەغیرەت و بەهێز.

ئەم فەرماندە سوپایانە ئەوەندە زەبون و داماو بوون پاش دەرچوونی محمد ڕەزا لە ئێران جلەکانیان داکەند و بە نهێنی هەڵهاتن!

لە هەمووی خائینتر عباس قرە باغی بوو کە بیاننامەی بێ لایەنی سوپای دەرکرد و سوپای تەسلیم کرد.

هەرچەندە سیاسەتی محمد ڕەزا لەبارەی سودوەرگرتن لە کەسانی وەفادار ڕاست بوو، بەڵام ئەم کەسانە ئەوەندە بێ توانا بوون کە نەیانتوانی خۆپیشاندانی خەڵکی سەرکوت بکەن.

ئێمە کاتێک لە ئێران چوینە دەرەوە، تاوەکو ڕادەیەک دڵنیا بووین لەوەی ئەو سوپایەی کە تاوەکو ڕادەیەکی زۆر ملکەچ و گوێڕایەڵ بوو بێباکانە دەتوانێت شا بگەڕێنێتەوە بۆ ئێران. بەڵام کاتێک کە بەیاننامەی بێ لایەنی قەرەباغی بڵاوبوویەوە، محمد ڕەزا بە سەرسوڕمان و ناباوەڕییێکەوە وتی: (ئەم پیاوە بچوکە بێ عەقڵە بە پێچەوانەی دەستورەوە هەڵسوکەوتی کردوە!)

بۆیە، تێبینی بکەن، هەرچەندە سودوەرگرتن لە کەسانی بێ شەخسیەت و زەبون و زەلیل لەلایەکەوە سودی هەیە، بەڵام ئەم کەسانە بەهۆی ئەم بێ شەخسیەتی و بێ توانابوونی فکری و بڕیاردانەشەوە نەیانتوانی لە کاتی پێویست، ئیشێک ئەنجام بدەن بە سودی سەڵتەنەت.

فەرەح دەیوت بەدرێژای سەڵتەنەت محمد ڕەزا بەرپرسەکانی دەوڵەت و فەرماندە سوپایەکانی وا ڕاهێنابوون کە شا لەبری ئەوان بیر بکاتەوە و بڕیاریش بدات. کاتێک لە ساڵی ١٩٧٨، شا ئێرانی بەجێهێشت، لەڕاستیدا مێشکی ئەوان لە ئیش کەوت هەموویان بەسەر یەکدا ڕژان و پەرتەوازە بوون.

گرفتێکی دیکەی محمد ڕەزا، کە ئەویش دەگەڕایەوە بۆ ئەو پەروەردە ڕۆژئاواییەی کە هەیبوو، ئەوە بوو کە هیچ پەیوەندێکی نەبوو بە ژیانی تایبەتی هیچکەسەوە و

هەندێکجار کە کەسانی دڵسۆز پێیان دەوت باش نیە کەسێکی بێ ئەخلاقی وەکو (هەویدا) سەرۆك وەزیرانی وڵاتی کۆرش و داریوش بن، محمد ڕەزا بە ساردیەکەوە دەیوت: (خەڵکی ئازادن چۆن جەستەیان بەکار دەهێنن!)

کچەکەم، لەم ئەخلاقی پیاوەی زۆر بێتاقەت بوو و بەردەوامیش خەفەتی دەخوارد. هەویداش هیچ باکی نەبوو لەوەی کە کەسانی هاوجنسباز بهێنێتە ناو ئیشەکەوە. لە دەوڵەتەکەیدا چەند هاوجنسبازێکی دیکە هەبوون. لە ڕێگەی ئەو زانیاری و هەواڵانەی پێمان دەگەیشت ئاگاداری کۆمەڵێك لەو دانیشتنانە دەبووین کە هەڵسوکەوتی زۆر ناپەسەندی هەویدا و هاوڕێکانیان دەگێڕایەوە[1]!

---

[1] – ئەمیر عباس هەویدا ئالودەی هەموو جۆرە کارێکی ناپەسەند بوو زۆر حەزی لە کاری سوك و بێ مانابوو. هەندێکجار جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگی پیرەژنانەی لەبەر دەکرد و لەناو دانیشتنی گشتیدا حەرەکاتی زۆر بێ مانای دەکرد!

ساواك ( (ڕێکخراوی نهێنی و ئاسایشی وڵات) لە ڕاپۆرتێکدا لە ساڵی ١٩٧١ دەنوسێت:

(لەم چەند ڕۆژەی دواییدا لە دادگاکان و لە جادەی فرصت پڕوپاگەندەی زۆر بڵاو بووەتەوە لەبارەی هەویداوە. لەوانە (گیل دشتی) داوەری دادگا (مشایخ) وەکیلی دادگا هەموویان باسی ئەوە دەکەن کە (سەرلەشکر حەمیدی) لەگەڵ هەویدادا پەیوەندی نامەشروعی هەیە! (ڕاپۆرت چوارشەمە: (کارمەندی ئاسایشی).)

ساواك لە ڕاپۆرتێکی دیکەدا هەر لە هەمان ساڵدا دەنوسێت:

(لە هەفتەی ڕابردوو حاجی کەریم بخش سعیدی (ئەندامی فراکسیۆنی پەرلەمانی حزبی مردم لە گفتوگۆیەکی تایبەتی لەبارەی هۆکاری جیابوونەوەی جەنابی سەرۆك وەزیران و هاوسەرەکەی دەڵێت:

(لەو سەفەرەی کە سەرۆك وەزیران لەگەڵ هاوسەرەکەی دەڕوات بۆ شاهرود، لەوێ چاوی بە ژنێکی دەسەڵاتدار بەناوی لقا الدوله (لە بەماییە دەوڵەمەندەکانی ناوچەی شاهرود-سمان و دامغانە) کە لە خێزانی هەویداشە دەکەوێت لەبارەی ئەنجامدانی کاروبارەکانی دەوڵەتەوە قسەباس دەکەن. پاش تەواوبوونی ڕێوڕەسم و تەشریفاتەکان دەڵێت بە خاتو لەیلا ئیمامی تۆ لە ماڵی لقا الدوله بمێنەرەوە چونکە من دەبێت سەردانی هەندێك بەرپرسی ناوچەیی بکەم و ئێوارە لەلای ئەوان بمێنمەوە. لەکاتی خەوتن دەگەڕێمەوە بۆلاتان.

خاتو هەویدا بە بیانوی گەڕان لە شاردا لە ماڵی لقا الدوله دەچێتە دەرەوە و دەڕوات بۆ ماڵی پارێزگاری شاهرود.

هەڵبەتە من تەنها لەسەر بنەمای ئەوەی کە تەنها شتەکانم بیستوە قسەکان ناگێڕمەوە. یەکێك لەو کەسانە غلامرەزا کیانپور وەیزری داد بوو کە لە دانیشتنە تایبەتیەکاندا جلی ژنانەی لەبەر دەکرد و سەمای دەکرد. (هەڵبەتە دەبێت دانیش بەوەدا بنێم زۆر جوان سەمای دەکرد!)

من خۆم لە میوانی ماڵی نعمت الله نصیری ئەم نمایشەم بەچاوی خۆم بینی.

بەگشتی لە سەردەمی سەرۆك وەزیر هەویدا دوو دیاردە لە وڵاتی ئێراندا زۆربەرچاو بوون: یەکێکیان نێربازی و ئەوی دیکەیان پەرەسەندنی بەهاییگەری بوو.

هەمووکەس لەبیریەتی کە پێشکەشکاری سەرەکی تەلفزیۆنی ئێران فەریدون فروخزاد بوو، کە لەبەردەم چاوی ملیۆنەها بینەری تەلەفزیۆن تەقلیدی دەنگ و شێوەی ژنانەی دەکرد و مەسەلەی نێربازیەکەی بووبوو بە پرسی سەرەکی ڕۆژنامەی تەوفیق. ئەم دیاردە دژە ئەخلاقیەی زیانێکی زۆر گەورەی دەدا لە پێگە و ناوبانگی حکومەت.

من خۆم هەویدا بە هۆکار و بەرپرسی کەوتنی ئەخلاقی و گەشەکردنی دیاردەی بێ ئەخلاقی لە سیانزە ساڵی کۆتایی سەردەمی حوکمڕانی شاهنشاهی دەزانم.

هەروەها، هەویدا بەرپرسی سەرەکیە لە هەڵخەڵەتاندنی محمد ڕەزا و دوورخستنەوەی لەو بارودۆخە ڕاستەقینەی کۆمەڵگەیەی ئێران.

لەو سەردەمەدا کە هەڵئاوسان و قەیرانی ئابوری پەرەیدەسەند هەویدا بەردەوام لەبارەی گەشەکردن و پەرەسەندنی ئابوریەوە قسەی دەکرد.

---

لەبەرئەوەی کە پاسەوانەکان خاتو لەیلایان دەناسی هیچ ڕێگرێکیان لێ نەکرد و خاتو لەیلاش لەناکاو خۆی دەکات بە ژووری پشوی پیاوەکەی بەو پەڕی سەرسامیەوە دەبینی هەویدا لەگەڵ کوڕێکی هەرزەکار کە لەڕێگەی پارێزگارەوە هێنراوە بۆی خەریکی..... دەبێت.

بەبینینی ئەم بارودۆخە لەیلا زۆر بێتاقەت دەبێت و بەبێ دواکەوتن ماڵەکە بەجێدەهێڵێت و دەگەڕێتەوە بۆ تاران و داوای تەڵاق لە هەویدا دەکات.

ڕاپۆرت بۆ ساواك ١٩٧١ (١٣٥٠/٨/٣٠ش)

لەبارەی زانیاری زیاتر لەبارەی کارە پیسەکانی هەویداوە سەیری کتێبی (جستارهای از تاریخ معاصر ایران–ج ٢ خاطرات ارتشبد حسین فردوست) بکە.

پرسیارم لێ دەکرا ئایا لەنێوان ئێمە (من و فەرەح) لەگەڵ هەویدا دوژمنایەتی و کێشە هەبووە یان بەپێچەوانەوە؟

ئەم پرسیارە زۆر کەس دەیکرد. هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە دەیانوت نوسینگەی تایبەتی فەرەح شوێنی کۆبوونەوەی کەسانی دژە هەویدا بووە و ئەندامانی نوسینگەکەی فەرەح لەگەڵ هەویدا و سیاسیەتەکانی ناکۆك بوون:

ئەم بابەتە تاوەکو ڕادەیەکی زۆر ڕاستی هەبوو، بەڵام هەمووی ڕاست نەبوو.

مەسەلەکە ئەوەبوو نوسینگەی تایبەتی فەرەح کە لە جادەی ئیران شهر لە تاران بوو، خاتو (فەریدە میربابایی) هاوڕێی و هاوپۆلی کچەکەم بەڕێوەی دەبرد. هەروەها، لەم نوسینگەیەدا کەسێکی زۆر باوەڕپێکراو و کاردروست بەناوی بەڕێز مصلح کاری دەکرد ئەم دوو کەسە لەسەر خواستی کچەکەم هەرچیان دەبیست و هەر زانیارێکیان بەردەست بکەوتایە ڕاستەوخۆ دەیانگەیاندە فەرەح.

ڕۆژانە سەدان نامە لە هەموو کونج و کەلەبەرێکی وڵاتەوە دەگەیشتە نوسینگەی تایبەتی کچەکەم کە لەو نامانەدا نوسەرەکانیان سەرەڕای باسی پرس و کێشە تایبەتیەکانی خۆیان باسیان لە خراپی و گەندەڵی بەرپرسەکان و جیاوازی و نادادپەروەری دەسەڵاتدارە دەوڵەتیەکانیشیان دەکرد و هەموو ئەم زانیاریانەش دەگەیشتنە لای کچەکەم.

خاتو فەریدە میربابایی و بەڕێز مصلح نامە و داواکاریەکانیان بەپێی گرنگی و تایبەتمەندی خۆیان ڕیزبەندی دەکرد و لەکاتی بینینی فەرەحدا هەموویان بۆ ڕوون دەکردەوە.

فەرەحیش بەپێی توانا و پێویستی، بابەتە سەرەکی و گرنگەکانی دەگەیاندە محمد ڕەزا.

هەویدا لەم ڕەوش و سیستەمە کە فەرەح دروستی کردبوو زۆر بێزار و بێتاقەت بوو، چونکە زۆربەی نامەکان گلەی و گازندە و شکات کردن بوو لە خراپ بەکارهێنان و نادادپەروەری دەسەڵاتدارەکان!

هەویدا چەندجارێکیش هەولیدا بوو کە هەژموونی خۆی لەناو نوسینگەی فەرەحدا پەرەپێبدات یەکێك لەو کەسانەشی کە دەیویست لەڕێگەیەوە دەستی بگات بەو نوسینگەیە کەسێکی ئێرانی ڕەگەز یۆنانی بوو بەناوی خاتو (ئالی ئانتونیادیس).

جارێکیان فەرەح لە شوێنێکدا کە هەویدا بانگهێشتکرا بوو بۆ پێشکەشکردنی ڕاپۆرتێك، گوێی هەویدای گرت و ڕایکێشا و تی: (ئاغای هەویدا ئاگاداری خۆت بە ئەوە بزانە کە من شاژنی بەهێزی ئێرانم. هەرچی زیاتر دەسەلاتت هەبێت لەلای جەنابی حەزرەتی شا هێشتا ناتوانی بەرامبەر من بوەستی! و بنەچەت هەلدەتەکێنم)

لەوەبەدوا هەویدا هەولیدەدا نزیکی نوسینگەی تایبەتی فەرەح نەبێتەوە و و نەچێتە سەر ڕێگەکەی.

ئەم ڕووداوە لە مانگی نۆڤەمبەری ١٩٧٥ ڕوویدا. بۆیە ئەو بەروارەشم بەتەواوی لەبەرە هۆکارەکەی ئەوەیە کە داوامکردبوو لە فەرەح تاوەکو فەرمان بدات بە هەویدا کە بەهۆی ئاهەنگەکانی نۆیەمی نۆڤەمبەر (سالیادی لەدایکبوونی محمد ڕەزا) ڕێژەیەك پارە لە حسابە تایبەتیەکانی سەرۆك وەزیران بخاتە بەردەستم تاوەکو هەندێك باوانی بکڕم بۆ کۆمەلێك لە بوکی هەژار و بێ کەس.

فەرەح وتی ئەم پارەیە خۆم دەیدەم. چونکە ئەمڕۆ گوێی هەویدام ڕاکێشاوە، ئەوەش ڕاست نیە ئێستا تەکلیفی لێ بکەم.

پاش هەرەسی ڕژێمی پاشایەتی زۆربەی سیاسەتمەدار و کەسایەتیە ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی و تەنانەت سەرکردە سەربازی و سەرلەشکرەکانیش بیرەوەری و یاداشتی خۆیان بلاوکردەوە. سیاسەتمەداران و نوسەرە بیانیەکانیش کتێبی زۆریان لەبارەی ئێران و پرسەکانی ئەو سەردەمەوە نوسی و بلاوکردەوە.

لە ڕۆژنامەکانی دەرەوە و ڕۆژنامە فارسیەکانی دەرەوە و ناوەوەش بابەت و وتاری زۆر فراوان لەوبارەیەوە نوسراوە و من زۆرێك لەو بابەتانەشم بینیوە و خوێندوەتەوە.

کچەکەشم لەبەر ئەوەی کە زۆر حەزی لەم بابەتانە بوو نوسینگەیەکی تایبەتی لە ئەمریکا دروستکردبوو کارمەندەکانی تەنانەت ئەو بابەتە ڕادیۆییانەشی کە لەبارەی ئێرانەوە باس دەکران تۆماریان دەکردن و ئەرشیفیان دەکردن.

من له هیچ کتێب و بڵاوکراوه و بابەتێکدا نەمبینیوه و بەرچاوم نەکەوتوه که لەبارەی هەویداوه به باشی نوسرابێت یان وەسفی کرابێت.

ئەم پیاوه بچوکه (توێکڵه مۆزی) خسته ژێر پێی محمد ڕەزا و حکومەتی سەڵتەنەتیەوه.

محمد ڕەزا متمانەی پێکرد، یان باشتر بڵێم قاپەکەی بەردەم محمد ڕەزای دزی و جڵەوی بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتی لەدەست خۆیدا بوو.

هەویدا لەماوەی سیانزه ساڵ فەرمانڕەواییکردنی هەرچی ویست کردی لەگەڵ ئەوەشدا بەزیرەکیەوه بەشێوەیەك قسەی دەکرد و خۆی دەردەخست که خەڵکی وابیربکەنەوه هەرچی ئەو دەیکات بەخواست و مەیلی فەرمانی شاهانەیە.

من ئیدی نامەوێت زۆرشتی خراپ لەبارەی کەسێکەوه بڵێم که مردوه و هیچ پەیوەندی بەم جیهانەوه نەماوه، بەڵام لەوانەیە ئەگەر هەویدا سەرۆك وەزیران نەبوایه ئێمه هەرگیز توشی ئەم ڕۆژگاره نەدەبووین و خودی خۆیشی لەسێداره نەدەدرا!

لەبارەی هەویداوه چەندین کتێب، بابەت و نوسینی زۆر له ڕۆژنامەکانی ناوخۆ و دەرەوه بڵاوبوونەتەوه. من بۆ خۆم چەندین بابەت و کتێبم لەوبارەیەوه بینیوه. بەداخەوه دەبێت ئەوه بڵێم که زۆربەی ئەو بابەت و قسه و باسانەی که لەبارەی هەویداوه دەکرێن ڕاستن. (ئای خۆزگه هەندێك لەم ڕاستیانه محمد ڕەزا لەسەردەمی دەسەڵاتیدا دەیزانی). بەتایبەتی ئەو کتێبانەی که زۆر بەشێوەیەکی ڕاست و دروست نوسراون، یەکێك لەو کتێبانه کتێبی بەڕێز ئەبو ئەلفەزل قاسمیه که لەسەرەتای شۆڕش به نهێنی له تاران بڵاوکرایەوه و هەمووشمان ، تەنانەت محمد ڕەزاش که هێشتا له ئێران بوو ئەم کتێبەمان بینی و خوێندمانەوه.

یەکێکی دیکه لەو کتێبانه (ژیان و یاداشتەکانی ئەمیر عباس هەویدا)یە که بەڕێز ئەسکەندەر دلدەم نوسیویەتی، من ئەم نوسەره بەهۆی ئەوەی که کتێبی زۆری لەدژی خێزانی سەڵتەنەتی نوسیوه بە کەسێکی قین لەدڵی حکومەتی پێشووی هەڵدەسەنگێنم که ئێستا هەلی تۆڵەسەندنەوەی پەیداکردوه. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت دان بەوەدا بنێم که کتێبەکەی لەبارەی هەویداوه (ژیان و یاداشتەکانی ئەمیر

عباس هەویدا) لە هەموو ڕوویەکەوە بێ کەموکورتی و بەپێزە و قسەکانی بەتەواوی بە بەڵگە و دیکۆمێنت دەخاتەڕوو[1].

یەکێکی دیکە لە بابەتەکان ئەو بابەتە یەك لەدوای یەکانە بوو کە خوالێخۆش بوو بەڕێز ئەمیرانی لە گۆڤاری بەناوبانگی (خواندنیهاست) دەینوسی لە ئێران، بەلأم ئێستا نازانم ئایا ئێستاش ئەو گۆڤارە دەردەچێت یان نا؟

ئەمیرانی ئەم بابەتانەی لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٨ لە کاتێکدا کە هێشتا هەویدا هەر وەزیری دەرباری شاهنشاهی بوو دەستپێکرد و هێرشە توندەکانی بە چەشنێك بوون کە هەمووکەس وایدەزانی ئەمیرانی ئەم بابەتانە بە ئاماژەی محمد ڕەزا دەنوسێت!

ژەنراڵ حسین فردوستیش لە بیرەوەریەکانی خۆیدا کە لە دوو بەرگدا بلأوی کردونەتەوە بابەتی زۆری لەبارەی هەویداوە نوسیوە کە زۆر بە بەڵگە و دیکۆمێنت شتەکانی خستوەتەڕوو.

دەبێت ئەوە بڵێم کە هیچ یەکێك لە ئێمە ئاگاداری ئەم جۆرە بابەتانە نەبووین لەبارەی هەویداوە.

هەڵبەتە لەبارەی پرسە ئەخلاقیەکانیەوە کۆمەڵێك بابەت باس دەکران و لەسەر زار دەماودەم دەکران، بەلأم زۆرکەس گرنگی بەو قسە و باسانە نەدەدا.

ئەو شتەی بۆ ئێمە ڕوون نیە ئەوەیە کە ئەگەر ژەنراڵ حسین فردوست وەکو سەرۆکی لێکۆڵینەوەی شاهنشاهی و جێگری دەزگای ئاسایشی ئیتلاعاتی وڵات و

---

[1] - ئەندامانی خێزانی پەهلەوی و پاشماوەکانی شا کە لە دەرەوەی وڵات دەژین بەدرێژایی ماوەی ساڵانی ڕابردوو بە بلأوکردنەوەی یاداشتەکان و بابەتەکانیان لەبارەی ساڵانی سەڵتەنەتی محمد ڕەزا پەهلەویەوە هەوڵیانداوە تاوەکو ئەو شوێنەی پێیان دەکرێت شا بە بێ تاوان و بێ کەموکوڕی پیشان بدەن و وایپیشانی بدەن کە خەڵکانی دیکە بەخراپ سودیان لێ وەرگرتوە و بەتایبەتی هەڵەکە بخەنە ئەستۆی ئەمیر عباس هەویدا.

ئەمیر عباس هەویدا لە دادگاییەکەی، کاتێك کە لەبەرامبەر کێوێك لە بەڵگە و دیکۆمێنتی ئینکاری نەکراو وەستابوو نەیتوانی خۆی پاك بکاتەوە، بۆیە تاوانەکانی خستە ئەستۆی محمد ڕەزا و سیستەمی حکومەتی بە کەمتەرخەم زانی و لەو ڕستە بەناوبانگەکەیدا وتی: (کەمتەرخەم سیستەمەکە بوو، خودی خۆشم قوربانی سیستەمەکە بووم).

هاوڕێی نزیکی محمد ڕەزا ئەم بابەتانەی دەزانی و ئەم جۆرە بەڵگانەی لەبەردەستدا بوون باشە بۆچی لەکاتی خۆیدا ئەم بەڵگە و دیکۆمێنتانەی نەدەدا بە شا و ڕێگەی داوە بە کەسێکی گەندەڵ و بێ ئەخلاق و خراپەکاری وەکو هەویدا جڵەوی فەرمانڕەوای وڵات بکات و ئەو وڵاتە بەرەو ئەو هەڵدێرە ببات و ببێتە هۆی کەوتنی ئەو ڕژێمە، کەچی پاش هەرەسهێنانی ئەو ڕژێمە ئەو بەڵگە و دیکۆمێنتانەی بڵاوکردەوە و خستیە بەردەست خەڵکی گشتی.

هەڵبەتە، حسین فردوست پاش شۆڕش نەچووە دەرەوە و هەر لە ئێران مایەوە و ئێمە ئەو هەلەمان بۆ هەڵنەکەوت تاوەکو هۆکاری سەرەکی ئەو مەسەلەیەی لێ بپرسین.

(لەبارەی فردوستەوە لە ئاییندەدا قسەی لەبارەوە دەکەم. بەڵام هەر ئەوەندە دەڵێم پەیوەندی محمد ڕەزا لەگەڵ فردوست بە ڕادەیەك بوو کە ئەوی بە ناوی بچوك بانگ دەکرد.

لە ڕاستیدا، حسین فردوست تەنها کەسێکی دەرەوەی نزیك لە پلە یەکەکان (خوشکەکان، براکان و هاوسەر و منداڵەکانی) محمد ڕەزا بوو کە شا به ناوی بچوکی بانگی دەکرد.

کاتێك محمد ڕەزا بڕیاریدا لە ئێران بچێتە دەرەوە، فشاری هێنا بۆ فردوست تاوەکو لەگەڵیدا وڵات بەجێبهێڵێت، بەڵام فردوست قبوڵی نەکرد و وتی هیچ هەڕەشەیەکم لەسەر نیە.)

مەبەستم ئەوەیە ئێستا خەڵکی لەبارەی هەویداوە زۆر زیاتر لە من شت دەزانن و هەرکەسێکیش حەز بکات دەتوانێت ئەو کتێبانە بخوێنێتەوە کە لە ئێران و دەرەوەی ئێران نوسراون لەبارەی هەویداوە.

کێشەی من و خێزانی سەڵتەنەتی ئەوەیە هەرچی دەڵێین و دەنوسین و وەکو تۆڵە سەندنەوە و تەصفیە حسابی شەخسی لێکدەدرێتەوە.

هەر لەبەر ئەوەیە ك کچەکەم بڵاوکردنەوەی بیرەوەریەکانی دواخست و وەسیەتی کرد کە دەبێت یاداشتەکانی پاش مردنی بەبێ گۆڕان و دەستکاری بڵاو بکرێنەوە.

بەڵام ئێوە یاداشتەکانی من بە پێشەکێکی کورت لە یاداشتەکانی کچەکەم بزانن.

براکەی خوالێخۆشبوو هەویدا (فریدون هەویدا) لە کتێبی یاداشتەکانی بە ناوی (پاش کەوتن) کە لە نیۆیۆرك بڵاوی کردەوە، براکەی وەکو کەسایەتێکی پیرۆز دەخاتەڕوو و تەنانەت هەویدای بەچەشنێك ناساندوە کە گوایە تەنانەت ڕەخنەشی لە ڕژێم گرتوە!

هەربۆیە بە پێچەوانەی حەزی ناخی خۆم ناچارم سوچێك لە زانیاریەکانم لەبارەی هەویداوە باس بکەم تاوەکو بزانن چۆن هەویدا بە گوفتار و کرداری (و تەنانەت بە گومانیش) ناڕاستی، بە پاچ بەربویە ڕەگی سەڵتەنەتی ئێران.

بۆ سەرنجی زیاتر، بەبیرتان دەهێنمەوە کە خەڵکی ئێران فەرهەنگی تایبەتی خۆی هەیە و لەم فەرهەنگەدا کردار و هەڵسوکەوتی کەسەکان بە بەتەواوی هەڵدەسەنگێنرێت.

بەڵام لە ڕۆژئاوادا بەم شێوەیە نیە. بۆ نمونە، ئەگەر سەرۆك وەزیرانێك یان وەزیرێك یان پاشایەك خاوەنی تایبەتمەندێکی نائەخلاقی بێت، خەڵکی حەقیان بەسەر پرسە شەخسی و تایبەتیەکانی ژیانیەوە نیە و تەنها لەچوارچێوەی کاری یاسایی خۆیدا سەیری ئیش و کارەکانی دەکەن و تەنها لە چوارچێوەی کارە یاساییەکانیدا هەڵسەنگاندنی بۆ دەکەن.

بەڵام لە ئێراندا تەواوی کاروکرداری بەرپرسێکی دەوڵەتی دەکەوێتە ژێر زەرەبینی خەڵکەوە و بەو شێوەیەی کە من تێگەیشتووم (و باوەڕم هەیە) خەڵکی ئێران کۆمەڵگەیەکن کە لە هەموو ڕوانگەیەکەوە سەیر دەکەن.

خەڵکی، هەر لە سەرەتاوە سەبارەت بە هەویدا بۆچوونێکی باشیان نەبوو.

هەمووکەس دەزانێت هەویدا کەسێکی نەناسراو نەبوو و پاش تیرۆرکردنی (حسنعلی منصور) بەشێوەیەکی کاتی بوو بە بەرپرس و سەرپەرشتیاری دانیشتنەکانی دەستە و بەڕێوەبەرەکان.

پاش ئەوەی کە هەویدا (لەماوەی چەند ڕۆژێکدا) بە نادیاری گەیشتە سەرۆك وەزیران پڕوپاگندەی زۆر خراپ لەسەرتاسەری وڵاتدا بڵاوبوویەوە کە لەو پڕوپاگەندانەدا هەویدایان بە بەکرێگیراوی بەریتانیا و ئەمریکا ناودەبرد و دەیانوت

بەریتانیەکان و ئەمریکیەکان هەویدایان لەناو قوڵی خۆیاندا دەرهێناوە و کردویانە بە سەرۆك وەزیران تاوەکو بەرژەوەندی کۆمپانیا نەوتیەکانیان بپارێزێت.

کەم کەم، پڕوپاگەندەی خراپتر کەوتە سەر زاری خەڵکی ئەویش بڵاوبوونەوەی بێ ئەخلاقی و نێربازی ئەمیر عباس هەویدا بوو.

بەوپەڕی داخ و ئەسەفەوە، دەبێت ئەوە بڵێم کە محمد ڕەزا نەك هەر هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو بۆ بڵاوبوونەوەی ئەو پڕوپاگەند و باسانەی کە لەبارەی هەویداوە دەکران و دەوتران، بەڵکو وەکو منداڵێکی ئینکار کەوتە بەرەی بەرگریکردنەوە لە ئەمیر عباس هەویدا و پشتیوانی تەواوی کرد.

محمد ڕەزا، خەڵکی ئێرانی لە ڕوانگەی ئاینی و مەزهەبیەوە بە دەمارگیر دەزانی و دەیوت ئاین بابەتێکی تایبەتیە و هەموو کەس مافی ئەوەی هەیە کە دین قبوڵ بکات یان ڕەفزی بکاتەوە.

محمد ڕەزا هەرچەندە خۆی باوەڕی بە مسوڵمان بوون هەبوو، بەڵام بە گرنگیدان بەوەی کە پێگەی بنەما و پێگەی ئاینی بەهاییگەری لە ئێران لە شاری (شیراز) بوو پێی خراپ نەبوو ئەگەر بەهاییگەری لە ئێراندا گەشە بکات و ببێتە هێزێك لە بەرامبەر ئیسلامدا بوەستێت.

شا بەرامبەر نێربازی هەویداشەوە زۆر ناڕەزایەتی دەرنەدەبڕی. ئێمە زانیاریمان هەبوو لەبارەی ئەوەی کە جگە لە هەویدا زۆرێك لە وەزیرەکانی دەوڵەت و بەرپرسە دەوڵەتیەکانیش بەتایبەتی بەرپرسە باڵا سەربازیەکان ئەم ئەخلاقە ناپەسەند و ڕەوشتە نزمەیان هەیە.

محمد ڕەزا خۆی کەسێکی وەرزشکار و تەندروست بوو و هیچ جۆرە ئالودەبوونێکی ئەخلاقی نەبوو، بەڵام خۆیشی نەدەخستە ناو ئەم پرس و کێشانەوە.

لەکاتی میوانیە تایبەتیەکاندا، (قلی صدری) کە پیاوێکی گاڵتەچی و خۆش بوو سەرشاخی پیاوە سیاسی و سەربازیەکانی دەگرت و بەتایبەتی ئەوانەی کە گومانی ئەوەیان لەسەر بوو نێربازبن، و بە لەحنی ژنانە تەقلیدی دەگرتن و هەموو ئامادەبووانی میوانیەکەی دەخستە پێکەنین. ئێمەش زۆر پێدەکەنین. (قلی) بەڕاستی کەسێکی خۆش بوو. یادی بەخێر!

خوالێخۆشبوو هەویدا هەرکاتێك دەهاتە ناو ئەو جۆرە میوانداریانەوە و چاوی بە قلی بکەوتایە بەتەواوی نیگەران دەبوو و کاتی لێ تاڵ دەبوو.

تەنها کەسێك کە بە ئاشکرا ڕووبەڕووی هەویدا دەبوویەوە لەبەرچاوی خەڵکیەوە قسە و دژوێنی ناموسی پێ دەدا و خاڵی لاوازی (نێربازی) بە وشە و دەربڕینی سەخیف بەئاشکرا پێ دەوت ئەردەشیر زاهدی بوو.

من جارێکیان وتم بە کچەکەم باش نیە ئەردەشیرخان بەم شێوەیە و بە ئاشکرا لەبەردەم ئەو پیاوە سیاسی و فەرماندانەی سوپا بەوشێوەیە سوکایەتی دەکات بە سەرۆك وەزیرانی وڵات.

کچەکەشم وتی: (محمد ڕەزا لەم کارەی ئەردەشیرخان زۆر خۆشی دێت. چونکە خۆی شەرم دەکات سوکایەتی پێ بکات، ئەردەشیر هاندەدات بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە)

بۆ نمونە کاتێك کە ئەردەشیرخان دەهاتە ناو دانیشتنە میوانیەکانەوە لەبەرچاوی هەموومانەوە کاتێك چاوی بە هەویدا دەکەوت بە پێکەنین و گاڵتەوە پێی دەوت: (ئای منداڵ... تۆش لێرەی و بەشوێن....گەورەیەکدا دەگەڕێیت.)

هەڵبەتە، دەبێت ئەوە بڵێم کە قسە وتن و قسە ڕەق کردن بەشێك بوو لە عادەتەکانی ئەردەشیرخان (زاهدی) و تەنانەت ڕەچاوی ژنەکانیشی نەدەکرد و جاروبارێش هەندێك ژنی بە قسەی پیس بانگ دەکرد.

ئەوە دەزانیت کە ئەدەشیرخان ماوەیەك پیاوی خاتو شاناز (کچی گەورەی محمد ڕەزا) بوو. هەرچەندە شاناز نەیتوانی ئەم پیاوە ژنانی و هەوسبازە تەحەمول بکات و جیابوویەوە لێی. چونکە باوکی ئەردەشیر، خوالێخۆشبوو سەرلەشکر فزاللە زاهدی، ڕۆڵی سەرەکی گێڕا بوو لە ڕووداوی ١٩ ئۆگۆستی ١٩٥٣، بۆیە جێگەی ڕێزی محمد ڕەزا بوو. محمد ڕەزا دەیوت: (زاهدی لەکاتی مردنیدا ئەردەشیری تەسلیمی من کردوە و دوای لێکردوم ئاگاداری بم)

یەکێك لە کێشە گەورەکانی هەویدا کوتلەکاریەکانی بوو. هەویدا بۆ خۆی دارودەستەیەی دروستکردبوو و پەیوەندی لەگەڵ ژێر دەستەکانی وەکو مورید و شێخ بوو!

وەزیرەکانی دەوڵەت و پیاوە سیاسیەکانی دەوروبەری، هەویدایان بە (ئاغا) بانگ ئەکرد کە ئەمەش بە بۆچوونی من ناوێکی لێنراو بوو!

ساواک لەبارەی کردار و هەڵسوکەوتەکانی هەویداوە بەردەوام و ڕۆژانە ڕاپۆرتی خۆیان ئامادە دەکرد بۆ محمد ڕەزا کە هەندێك لەو ڕاپۆرتانەش فەرەح دەیبینین و لەگەڵ مندا لەبارەی ناوەڕۆکی ئەو ڕاپۆرتانەوە قسە و باسی دەکرد.

ئەم ڕاپۆرتانە ئەوەیان نیشاندەدا کە هەویدا تاوەکو ئەو شوێنەی کە توانیویەتی نیش و کارە هەستیارەکانی تەسلیم بە بەهاییەکان کردوە.

ساواك هۆشداری دەدا بە محمد ڕەزا کە زۆربوونی بەهاییەکان لە ناو دەوڵەتدا ئەبێتە هۆی زیادبوونی نیگەرانی و بێتاقەتی خەڵکی گشتی. بەڵام بەداخەوە محمد ڕەزا ئەم هۆشداریانەی بە گرنگیەوە وەرنەدەگرت و گوێی پێ نەدەدان. لەو بەهاییە دیارانەی کە ناوەکانیم لەبیر بێت دەتوانم ئاماژە بە سەر لەشکر ئەسداللە صنیعی (وەزیری جەنگ)، منصور ڕۆحانی (وەزیری ئا و و کارەبا-کشتوکاڵ)، خاتو فەرەخ ڕو پارسا (وەزیری پەروەردە و فێرکردن) و هۆشەنگ نهاوەندی (وەزیری کار-ئاوەدانی و نیشتەجێبوون) بکەم.

لەسەردەمی سەرۆك وەزیرانی هەویدا، ژیان و چالاکیە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکانی بەهاییەکان بەتەواوەتی ئاشکرا بوو و ئیدی بەهاییەکان ناچار نەبوون ئاینەکەی خۆیان لەبەرچاوی خەڵکەوە بشارنەوە.

هەویدا کەسێکی سەیر وسەمەرە بوو. زۆر حەزی بەوە بوو کە کاری سەیر و سەمەرە ئەنجام بدات. وەکو (چەرچل) کڵاوی سەیر و سەمەرەی دەکردە سەری و هەندێکجاریش وەکو (مائۆ) جلی بەبێ یەخەی لەبەردەکرد! سەردەمێکیش وەکو (چەمبرلن) کە هەمیشە چەتری بەدەستەوە بوو بەبێ پێویستی و کاتی خۆی، (گاڵۆکێکی) دەگرت بەدەستیەوە.

جارێکیان پێم وت: (ئاغای هەویدا، لەکاتێکدا تۆ هیچ قاچ و قولت ئێش ناکات بۆچی هەمیشە ئەم گاڵۆکە دەگریت بەدەستەوە؟) ئەویش وەڵامی دایەوە: (چونکە لە کۆنەوە وتویانە دەبێت پیاوی عاقڵ هەمیشە بە گاڵۆك بڕوا بە ڕێگادا).

وەکو (مادام کامليا) حەزی لە گوڵ بوو و هەموو ڕۆژێك چڵێك گوڵی گرانبەهای دەکرد بە یەخەی کۆتەکەیدا.

نهێنی سەرکەوتنی هەویدا، بۆ ماوەی ١٣ ساڵی ڕەبەق دەگەڕێتەوە بۆ گوێڕایەڵی بێ چەندوچۆنی هەویدا لە محمد ڕەزا.

کچەکەم دەیوت: (هۆکاری سەرکەوتنی بەڕێز هەویدا لە بەڕێوەبردنی ولآتدا ئەوەیە کە تاوەکو ئێستا کەمترین کەس ئەو دەناسێت هەربۆیە کەمترین دوژمنی هەیە. لە ئێراندا هەرکەسێك زیاتر ناوبانگی و سەرکەوتنی هەبێت دوژمنی زۆرتری هەیە.)

ئاغای معینیان دەیوت: (نهێنی سەرکەوتنی هەویدا ئەوەیە لەکاری بەڕێوەبردنی ولآتدا بەرنامە و پلانێکی لەو شێوەیەی نیە کە بدات لە بەرژەوەندی کۆمەڵێك لە خەڵکی.)

هەویدا لە هیچ کارێکدا بۆچوونی شەخسی دەرنەدەبڕی و بۆ هەمووکەس ڕوونی دەکردەوە کە بەڕێوەبردنی ولآت بەتەواوی لەدەستی شادایە و بوون و نەبوونی ئەو هیچ گۆڕانێك لە بەرنامە و بەڕێوەبردنی ولآت ناکات.

هویدا خۆی بە سوپاسگوزاری شا دەزانی و بیرکردنەوەی محمد ڕەزاش ئەوە بوو کە (سەرۆك وەزیران هەرچی گوێڕایەڵتربێت باشترە!) بۆیە لەم ڕوانگەیەوە بوو کە هەویدا باشترین کەس بوو بۆ محمد ڕەزا.

سەردەمی فەرمانڕەوایی هەویدا تاوەکو ڕادەیەك ئارام و بێدەنگ تێپەڕی. لەماوەی فەرمانڕەواییکردنیدا جگە لە ڕووداوی گولەبارانکردنی کۆشکی مەرمەڕ (کە مەبەست لێی کوشتنی محمد ڕەزا بوو) ڕووداوێکی لەوشێوەیەی کە شایەنی باسکردن بێت ڕووی نەدا.

من چەندجارێك ڕۆیشتووم بۆ ماڵی هەویدا. هەویدا کۆمەڵێکی زۆر گرانبەهای سەبیلە و گاڵۆکی دەگمەنی کۆکردبوویەوە. یەکێك لەو گاڵۆك و عەصایانەی کە دەستەکەی لە زێڕی خالص بوو، لەیەکێك لە هەڵکەندنەکانی شوێنەوارەکانی میسردا دۆزرابوویەوە و بە قسەی هەویدا دەیوت ئەم گاڵۆکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی رامسیسی دووەم فرعەونەکانی میسر.

دواتر دکتۆر فەلاح پێی وتم کە هەویدای هەڵخەڵەتاندوە و ئەم گاڵۆکەیان بەو ناوەوە پێ داوە، چونکە لە میسردا کۆمەڵێك لە سەنعەتکار هەن کە ئیشیان دروستکردنی کەلوپەلی گرانبەهایە و بەناوی کۆنەوە دەیفرۆشن. ئەو وەستایانە بەجۆرێك شتەکان دروست دەکەن کە تەنانەت لێهاتووترین کەسانی شوێنەوارناسیش ناتوانن ئەو کەلوپەلانە جیابکەنەوە.

لە ڕووداوە سەیرەکانی ژیانی هەویدا، هاوسەرگیریەکەی بوو لەگەڵ هاوڕێی خۆشەویستم لەیلا ئیمامی و پاشان تەڵاقە چاوەڕوان نەکراوەکەی.

لەوانەیە بۆ یەکەمجار بێت ببیستیت کە هاوسەرگیری خاتو لەیلا ئیمامی بۆ هەویدا لەسەر پێشنیاری محمد ڕەزا بوو.

لەیلا ئیمامی کێڵگەیەکی پەروەردەکردنی گوڵ و گیای لە نزیك تاران هەبوو. خوشکەکەی، هاوسەری حسنعلی منصور، سەرۆك وەزیری کوژراو بوو. کە بەدەستی فیداییانی ئیسلام کوژرا.

ئەمیر عباس، بەتەنها دەژیا و هەموو ڕۆژێك پڕوپاگەندەی زۆر توند و خراپ لەبارەی ژیانی تایبەتیەوە بڵاودەبوویەوە. ساواك پێشنیاری کرد بۆ محمد ڕەزا کە باشتر ئەوەیە بەڕێز هەویدا بۆ ڕزگاربوونی لەو پڕوپاگەندانەی کە بۆی دەکرێت لەبارەی کاری نێربازی و هاوجنسبازیەوە، هاوسەرگیری بکات.

محمد ڕەزاش ئەم پێشنیارەی قبوڵ کرد و پێشنیاری کرد بۆ هەویدا کە ژن بهێنێت.

هەویدا سەرەتا حەزی دەکرد لەگەڵ خاتو (ئالی ئانتونیادیس) کە ژنێکی ئەمریکی بەڕەگەز یۆنانی بوو، هاوسەرگیری بکات. ئالی ئانتونیادیس دواتر هاتە ناو بازنەی هاوڕێ نزیکەکانی فەرەح و لە ماڵی هەویدا ئیشی دەکرد. بەڵام ڕاست نەبوو کە هاوسەری سەرۆك وەزیرانی ئێران ژنێکی بیانی بێت ئەویش ئەمریکی. (هەڵبەتە یاسا ڕێگر نەبوو لەوەی کە ژنی بیانی بهێنێت چونکە تەنانەت ئەفسەرانی پایە بەرزی سوپا و بەتایبەتی فرۆکەوانە ئێرانیەکانیش کە بۆ ڕاهێنان دەڕۆیشتن بۆ ئەمریکا لەوێ ژنی ئەمریکیان دەهێنا). بەڵام محمد ڕەزا پێشنیاری کرد بۆ هەویدا کە ژنێکی ئێرانی بهێنێت.

(لەیلا ئیمامی) هاوڕێی من بوو. کچی عارف بوو کە ئەهلی ئەدەب و شعر و زۆر پاك و سادە بوو. پێش ئەویش خوشکێکی ژنی یەکێك سەرۆك وەزیر (حسنعلی منصور) بوو، ئەم هاوسەرگیرە دەرئەنجامێکی خراپی هەبوو چونکە پاش ماوەیەك حسنعلی منصور لە بەردەم ئەنجومەنی شورای ملیدا کوژرا.

ئەو کاتەی کە حسنعلی منصور سەرۆك وەزیران بوو لە کێڵگەی گوڵ و گیای خوشکی ژنەکەی (لەیلای ئیمامی) بۆ سەرۆك وەزیر و وەزارەتخانەکان و بەڕێوەبەرایەتیەکان گوڵی دەکڕی. ئەم کارە پاش تیرۆرکردنی حسنعلیش هەر بەردەوام بوو. دەڵێن هەویدا حسنعلی منصور هێناویەتە ناو ساسەتەوە.

هەر بۆیە، هەویدا لەیلای هەر لە کۆنەوە دەناسی.

کاتێك کە دەگەڕان بۆ ژنێك بۆ ئەوەی بیهێنن بۆ هەویدا چەندین ژنی تەڵاقدراو و کچی گەنجیان پێشنیار کرد بۆ هەویدا. بەڵام دکتۆر شاهقلی کە پزیشکی تایبەتی ئەمیر عباس هەویدا و هاوڕێی نزیکی بوو و کێشەی سەرەکی هەویدای دەزانی، پێشنیاری لەیلای ئیمامی بۆ کرد و ئەمیر عەباس هەویداشی دڵنیا کردەوە لە پێشنیارەکەی کە ژن لە تەمەنێکی زۆردا لە شەوق و زەوق دەکەوێت و لەیلا ئیمامیش کە تاوەکو ماوەیەکی زۆر هاوسەرگیری نەکردبوو، لە ڕوانگەی هەلومەرجی تەمەنیەوە لە پێگەیەکدا نەبوو کە هەویدا بخاتە ناو کێشە و گرفتێکی نیگەرانیەوە و ببێتە هۆی حەیاچوون و شەرمی ئەمیر عباس هەویدا.

مەراسیمی خوازبێنیکردنەکە لەلایەن دکتۆر شاهقلیەوە ئەنجامدرا و داواکرا لە لەیلا ئیمامی تاوەکوە بۆ پاراستنی ناوخۆی وڵات و کۆتایی هێنان بەو پڕوپاگەندانەی کە لەبارەی ژیانی تەنهای هەویداوە هەیە فیداکاری بنوێنێت و لەگەڵ سەرۆك وەزیران هاوسەرگیری بکات.

(لەیلا ئیمامی) هاوڕێی نزیکی من بوو. کاتێك کە بیستم بڕیاریداوە ببێتە ژنی هەویدا زۆر هەوڵمدا پەشمانی بکەمەوە لەم بڕیارەی بەڵام هەستم کرد کە خێزانی ئیمامی کە جارێك زاوایەکی سەرۆك وەزیرانیان هەبووە حەز دەکەن دووبارە زاوایەکی دیکەی سەرۆك وەزیرانیان هەبێت.

هاوینان محمد ڕەزا دەچوو بۆ نوشهر بۆ مەلەکردن و خلیسکانەی سەر ئاو.

(پلانێکی گەورەشی دارشتبوو بۆ ئەوەی لە نوشهر شوێنێکی گونجاو دروست بکات و بیکاتە پایتەختی هاوینەی و لە هاویناندا پایتەختی ئێران بگوازێتەوە بۆ ئەوێ بەڵام یاری ڕۆژگار ئەو هەلەی بۆ نەڕەخساند ئەو کارە ئەنجام بدات.)

هەویداش لە نزیک نوشهر خانە باخێکی جوان و گەورەی هەبوو. مەراسیمی گرێبەست و بوکێنیەکە هەموو پێکەوە لەو خانە باخەدا ئەنجامدرا. لەبیرمە دوانیوەڕۆی یەکێك لە ڕۆژەکانی کۆتای مانگی جولای بوو کە لەگەڵ محمد ڕەزا، فەرەح، فاتمە و هاوسەرەکەی ژەنراڵ محمد خاتەمی ڕۆیشتین بۆ ماڵی هەویدا. (ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم ڕۆژی سێ شەمە یان چوار شەمەی مانگی جولای ١٩٦٦ بوو.)

هەویدا لە کاتی هاوسەرگیرەکەیدا تەمەنی ٤٧ساڵ و لەیلاش ٤٢ ساڵ بوو.

هەویدا و لەیلا سەرەتا هاتن بۆ پێشوازی ئێمە و دەستی جەنابی حەزرەتیان ماچ کرد.

دکتۆر شاهقلی، باوك و دایك و خوشکەکەی لەیلا، دایکی هەویدا، فەریدون هەویدا، پەروێز خوانساری و حەمید رەهنما و کچی پوری هەویداش لەوێ بوون.

هەویدا بەئاشکرا بێ زەوق و شەوق دیار بوو. بە پێچەوانەی ڕۆژانی دیکە کە هەمیشە گوڵی ئەرکیدەی گرانبەهای دەکرد بە یەخەی کۆتەکەیدا ئەمجارە گوڵێکی سوری ئاسای کردبوو بە یەخەکەیدا.

مەلای مزگەوتی جامعەی نوشهر گرێبەستەکەی کرد کاتێك جاری یەکەم مامۆستا وتاری یەکەمی خوێندەوە و پرسیاری کرد لە بوك کە ئایا ئامادەیت ببێتە هاوسەری بەڕێز هەویدا، بەبێ دواکەوتن وەڵامی دایەوە وتی: بەڵێ!

محمد ڕەزا پێکەنی و وتی: (بۆچی بە پەلە وتت بەڵێ؟)

لەیلا ئیمامی وەڵامی دایەوە: (ترسام بەڕێز سەرۆك وەزیران پەشیمان ببێتەوە!)

ئەڵقە و حەلقەی دەستگیرانی کە دکتۆر شاهقلی کڕی بووی، بوك و زاوا کردیانە دەستی یەکتر و پاش تەواوبوونی وتاری گرێبەست، فەرەح دەستبەندێکی گرانبەهای پێشکەش بە بوك و دوگمەیەکی سەردەستی ئەڵماسیشی پێشکەش بە هەویدا کرد.

دایکی هەویداش ملوانکەیەکی جوان و دەگمەنی مرواری کردە ملی لەیلا ئیمامی.

منیش سەرسنگێکی جوانم بۆ هێنا بوو.

محمد ڕەزاش کاتژمێرێکی خشڵی جوانی بەخشی بە هەویدا و نیوە تاجێکی برلیانیشی کردە سەر بوکەکە و سەری ماچی کرد.

لەکاتی گرێبەستەکەدا باسی ئەوە کرا کە لەیلا مارەییەکەی وەرگرتوە و تەنها باسی دەستەیەك ئاوێنە و شوێنی مۆمێك کرا.

ئەم ئاوێنە و شەمعدانە یان شوێنی مۆمە بە خشڵ دروستکرابوون و دەگەڕانەوە بۆ سەردمی هاوسەرگیری ناصرالدین شای قاجار. ئاوینە و شوێنی مۆمەکە هەویدا لەلای حبیب ثابت وەری گرتبوو. (ئیدی نازانم کڕیبیووی یان ثابت وەکو هەدیە پێشکەشی هەویدای کردبوو.)

خودی لەیلا بۆی باس کردم کە هەویدا هەر لە یەکەم ڕۆژی هاوسەرگیریەکەیەوە پێی وتووە نابێت چاوەڕێی ئەنجامدانی ئەرکی پیاویم لێ بکەیت و ئەم هاوسەرگیریە بۆ بەرژەوەندی سیاسی یە!

خێزانی ئیمامیش لەبەر ئەوەی کە کچی یەکەمیان هاوسەری حسنعلی منصور بوو بۆ فراوانبوونی دەسەڵاتیان خۆشحاڵ بوون بە پێدانی کچەکەیان بە هەویدا بەڵام لەیلا پاش هاوسەرگیری لەگەڵ هەویدا توشی دڵساردیەکی زۆر بوو و زۆربەی کاتەکانی لە کێڵگەی پەروەردە کردنی گوڵەکاندا دەبردە سەر.

لەبەر ئەوەی کە لەیلا هاوڕێیەتێکی نزیکی هەبوو لەگەڵ مندا هیچ شتێکی لێ نەدەشاردمەوە و من دەمزانی لە نێوان لەیلا و هەویدا هیچ جۆرە پەیوەندێکی ژن و پیاوی نیە.

هەویدا فەرمانیدا بوو بە وەزارەتەکان و فەرمانگەکانی دەوڵەت لەلای لەیلا گوڵ و گیا بکڕن و هەوڵیدەدا بە یارمەتیدانە مادیەکانی ناتەواوی و کێشە سەرەکیەکەی (لەڕاستیدا کێشە سەرەکیەکەی خۆی!!) قەرەبوو بکاتەوە!

ئەم هاوسەرگیریە بۆ لەیلا دەستکەوتێکی مادی زۆر باشی هەبوو. دەچوو بۆ سەفەرە ڕەسمیەکان و سودمەندبوو لە هەموو ئەو ئیمتیازانەی کە هاوسەری سەرۆك وەزیرانێك هەیبوو. بەڵام لافاوی پڕوپاگەندەکان زۆر کوشندە و تەحەمول نەکراو بوون. بەتایبەتی کاتێك کە پڕوپاگەندەکان گەیشتنە ترۆپکی خۆیان.

لەیلا خۆی باسی کرد بۆم لە سەفەرێکدا کە ڕۆیشتبوون بۆ چین لەگەڵ ئەشرەف، ئەشرەف لەبەر ئەوەی گاڵتەی زۆری دەکرد دەڵێت لەناو فڕۆکەکەدا زوو زوو پێی دەوتم چۆن دەتوانێت لەگەڵ نیرەموکێکدا بژیت!

بەڵام هیچ یەکێك لەم پڕوپاگەندە و بەزم و ڕەزمانە نەبووە هۆی ئەوەی کە لەیلا داوای تەڵاق بکات. ئەوەی کە بووە هۆی ئەوەی لەیلا سور بێت لەسەر ئەوەی کە جیاببێتەوە ڕووداوی ڕسوابوونەکەی بوو کە بە چاوی خۆی بینی.

بەوشێوەیەی من لە زمانی لەیلاوە بیستم. ڕۆژێك دەچێتەوە بۆ ماڵەوە دەچێت بەسەر هەویدادا کە خەریکی کاری بەدڕەوشتیە لەگەڵ ئەفسەرێکی سوپادا. لەیلا بە بینینی ئەم دیمەنە حاڵی تێکدەچێت و بەهەر شێوەیەك دەبێت خۆی دەگەیەنێتە دەرەوەی ماڵ. ئەو ماڵەی کە هەرگیز جارێکی دیکە بۆی نەگەڕایەوە.

سەر لەشکر حەمیدی دەیانوت یەکێك بوو لەو کەسکانەی کە لەگەڵ هەویدادا پەیوەندی نائەخلاقی هەبوو!

لەیلا پاش ئەم ڕووداوە لە هەویدا جیابوویەوە و توشی خەمۆکی و کێشەی ڕۆحی بوو. ئێستا لە پاریس دەژی و تاوەکو ئێستاش نامە نوسین و هەندێکجاریش بە تەلەفۆنی قسە دەکەین لەگەڵ یەکتریدا.

ئەمیر عباس بونەوەرێکی سەیر بوو. رۆحیەت لەژێر کاریگەری فەرەنسیەکاندا بوو و کردارەکانیشی لە عادەت و هەڵسوکەوتی بەریتانیاوە وەرگرتبوو.

بەشێوەیەکی زۆر سەیر بە شان و باڵی ئەمریکیەکاندا هەڵیدەدا و ڕوسەکانی بە خەڵکانی لادێی و دواکەوتوو دەزانی!

ئاین و مەزهەبی بە زادەی وەهمی مێشکی مرۆڤ دەزانی و دەیوت: (باشترین دین ئەوەیە کە پەیوەست نەبیت بە هیچ دین و مەزهەبێکەوە!)

هەویدا کە دەیزانی شا زۆر ڕقی لە عەرەبە، ئەویش خۆی بە دژە عەرەب دەزانی.

هەندێکجار لە قسە و باسە تایبەتیەکاندا دەیوت: (گەورەترین بەدبەختی و بێ چانسی ئێران ئەوەیە کە خوداوەند لە تەنیشت عەرەبەوە دروستی کردوە!)

ئاینی ئیسلامی بە ئاینی جەلاد و شەلاق ناو دەبرد و دەیوت دەبێت ئێرانیەکان بگەڕێنەوە بۆ ئەسڵی خۆیان و دەبێت دینی خۆیا زیندو بکەنەوە.

هەمووكەس دەیزانی كە نارەزایەتی ئاینی هۆكاری سەرەكی ناكۆكی خەڵك بوو لەگەڵ حكومەتی سەڵتەنەتیدا.

تاوەكو پێش هاتنە سەر حوكمی هەویدا بەشێوەیەكی هەستپێكراو رێز بۆ بیروباوەڕی خەڵكی دادەنرا. بەڵام هەویدا و دەوروبەرەكەی ئەو باوەڕیان لەلای محمد رەزا دروستكرد كە دەبێت ئاینی ئیسلام سنوردار بكرێت بۆ ناو مزگەوتەكان.

من زۆربەی ئەو كتێبە مێژووییانەی پاش كەوتنی حكومەتی سەڵتەنەتی چ ئەوانەی لە ئێران و چ لە ئەوانەی لە دەرەوەی ئێران بڵاوكراونەتەوە بینیومن و خوێندومنەتەوە بەداخەوە نەبینیوە هیچكەس باسی رۆڵی هەویدا بكات لە جوڵاندنی ئەو نارەزایەتیە مەزهەبییەی كە هەبوو لە دژی حكومەتی سەڵتەنەتی بەمانایەكی دیكە باسی ئەوە بكەن كە هەویدا بە هۆكاری سەرەكی دابینێت لە دژایەتی كردنی ئاینىدا.

(هەویدا) بیری ئەنجامدانی ئاهەنگە دوو هەزار و پێنج سەد ساڵەی دامەزراندنی سەڵتەنەتی ئێرانی خستە ناو مێشكی محمد رەزاوە.

ئەوە هەویدا بوو كە قەناعەتی كرد بە شا كە مێژووی شاهنشاهی بكاتە جێگرەوەی مێژووی هیجری شەمسی.

ئەم كارانە بەتەواوی و بەڕوونی بریتی بوو لە ڕووبەڕووبوونەوەی بیرباوەڕی ئاینی و دینی خەڵكی.

محمد رەزا ئاگاداری ئەو خاڵە نەبوو كە گەڕاندنەوەی مێژووی ئێران بۆ پێش مێژووی ئیسلام و تازەكردنەوەی رابردووی پێش ئیسلام و وەلانانی مێژووی هیجری شەمسی كە بیروباوەڕێكی پیرۆزی مێژوویی بوو دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی شەپۆلی نارەزایەتی لەناو سەرتاسەری ئێران كە خەڵكانێكی تەواو مسوڵمان و بیروباوڕێكی ئاینیان هەبوو.

مەلا ئاینیەكان زۆر سودیان لەم دوو هەڵەیە وەرگرت و كردیانە هۆكارێكی زۆر باش بۆ جوڵاندندنی شەقامی ئێرانی لە دژی حكومەتی سەڵتەنەتی.

ئەو وتارانەی كە مەلاكان لە مزگەوتەكاندا پێشكەشیان دەكرد بەتەواوی باسی محمد رەزابوون لەبەرامبەر ئەوەی كە هیچ گرنگی بە ئاینی ئیسلام نادات و باسی ئەوەیان دەكرد كە مێژووی كۆچی پێغمبەر (درودی خوای لێ بێت) بە پارەیەكی

زۆری دەوڵـەت گۆڕیویـەتی بـە بیروبـاوەڕی کـۆنی نـادینی و تـەرخانی کـردوە بـۆ زیندوکردنەوەی ئاهەنگە کۆنە دوو هەزار و پێنج سەد ساڵەیەکانی ئێران.

هەندێك کەس کە زانیاری ڕاستیان نیە دەڵێن بیری ئەنجامدانی ئاهەنگە دوو هـەزار و پێنج سەد ساڵەیەکانی شاهنشاهی بە پلانی کچەکەم فەرەح بووە. هەنـدێکیش لـە کتێبەکانیاندا نوسیویانە دکتۆر (شجاع الدین شفا) ئەم بیرۆکەیەی داوە بە فـەرەح و فەرەحیش قبوڵی کردوە و پاشان گواستویەتیەوە بۆ محمد ڕەزا.

بەڵام داستانەکە بەم جۆرەیە کە من یەکەمجارە باسی دەکەم.

هەمووکـەس دەزانێـت کـە دکتـۆر (شـجاع الـدین شـفا) زانایـەکی لێهـاتوو و بیرمەنـدێکی دەگمـەن بـوو و سەرپەرشـتی کاروبـاری فەرهـەنگی دەربـاری دەکـرد. (جێگری ئەمیر ئەسداللە علم بوو لە وەزارەتی دەرباری شاهنشاهی).

بەڕێز شفا لەو چاوپێکەوتنە هەفتانەیانەی کە لەگەڵ کچەکەمدا هـەیبوو لەیەکێك لـە دانیشتنەکاندا پێشنیاری بۆ دەکات لە تاران کۆنفراسێکی نێونەتەوەی ساز بکرێت بـۆ گفتوگۆ و ناسینی شارستانیەتەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.

پێش ئەوەش چەندین وتـار و دانیشتنی هاوشێوە لـە تـاران سـەبارەت بـە ناسینی کـەلتورەکان سـاز کرابـوو. کـچەکەشم ئـەم بیرۆکەیـەی قبـوڵ کـرد و بڕیـار دەدرێـت کـە بیرمەنـدان و کەسـایەتیە ڕوناکبیرەکـان لـە هـەموو کـونج و کەلەبـەرێکی ئـەم جیهانـە بانگهێشت بکرێن بۆ تاران.

لـەو سـاڵانەدا بـەهۆی دەرکـەتنی نوسـین و بیروبـاوەڕی تـازەی سیاسـی و ئاینیـەوە، فەرهەنگـە کـۆن و شارسـتانیەتە بنەڕەتیـەکانیان کەوتبوونـە نـاو چوارچـێوەی ململانێیەوە.

کچەکەم فـەرمان دەدات بـە دکتۆر شـفا تـاوەکو ڕێوشـوێنی پێویسـت بگرێتـە بـەر بـۆ ئەنجامدان و سازدانی ئەو کۆبوونەوەیە.

بـەپێی ئـەو نەرێتـەی کـە هەیـە، دەوڵـەت پێویسـتە لەسـەری بوجـەی ئـەو کۆنفراسـە دابین بکـات و کـاری پێویسـت بۆ ئەنجامـدان و بەڕێوەچـوونی ئـەو کۆنفراسـە جیهانیـە ئامادە بکات.

لە سەردەمی سەڵتەنەتی محمد ڕەزا دەیان دانیشتنی مێژوویی و مەراسیمی گەورە لـە تـاران ئەنجامـدرا کـە بـەناوبانگترینیان دانیـشتنی سـەرانی هاوپـەیمانی جـەنگی جیهانی دووەم (ڕۆزفێڵت، چرچیڵ و ئیستالین) بوون لە تاران لە سەرەتای سەڵتەنەتی محمـد ڕەزادا و پاشـان کۆنفراسـی دامـەزراوەی جیهـانی کـار و مـافی مـرۆڤ بـوو (بـە بەشداری سەرۆك کۆمار و پاشاکانی سەرانی وڵاتانی نەتەوە یەکگرتوەکان) ...

سەرەڕای ئەو تێچوونە زۆرەی کە خەرج دەکرا بۆ ئەنجامدانی ئەو کۆبوونەوانە بەڵام محمد ڕەزا هەر خۆشحاڵ بوو لە سازدانی ئەو جۆرە کۆبوونـەوە و دانیـشتانە لـە تـاران و مەبەستی شـا لـە ئەنجامـدانی ئـەو مەراسیم و کۆبوونەوانـەش ئـەوە بـوو کـە لـەکاتی ئەنجامـدانی ئـەو کـۆنفراس و دانیـشتن و کۆبوونەوانـە بیروبـاوەڕ و سـەرنجی جیهـان بـەرەو ئێـران ڕادەکێـشرێت و نـاوی ئێـران دەکەوێتـە سـەر زاری جیهـان و ئەمـەش باشترین ناوبانگی و ڕیکلام دەبێت بۆ وڵاتی ئێران.

کاتێـك دکتـۆر شـفا پـلان و نەخـشەکەی خـۆی دەخاتـەڕوو بـۆ سـەرۆك وەزیـران، هەویـداش لەگـەڵ ڕاوێـژکارەکانی خـۆی بابەتەکـە دەخاتـە بـەرباس و لێکۆڵینـەوەوە و هەرکەسێکیش بـە سـەلیقە و لێهـاتوویی خـۆی شـتێك و بۆچوونێکی تـازەی بـۆ زیـاد دەکـات و دەرئـەنجام ڕێـك دەکـەون لەسـەر ئـەوەی کـە کۆنفراسـێکی جیهـانی بکـەن و بانگهێشتەکە بەناوی ڕێزلێنـانی پێگـەی کۆرشـی گـەورە لـە بـەرپاکردنی ئاهـەنگی دوو هەزار و پێنج سەد ساڵەی شاهنشاهیەوە بێت.

هەڵبەتە سەرەتا بڕیار بوو تەنها سەرۆکی وڵاتانی یۆنان، ئیتالیا، میسر، حەبەشە و چەند وڵاتێکی کۆن بانگهێشت بکرێن.

پلانی کۆتایی ئامادە دەکرێت، هەویدا دەیزانی محمد ڕەزا حـەزێکی زۆری هەیـە بۆ گەورەکردن و ڕێزلێنـانی مێـژووی شاهنشاهی و زۆر خۆشحاڵە بەو کارانـە، بۆیـە ئـەو مەراسـیمە دەگـۆڕێـت بـۆ ئاهـەنگی ڕێزلێنـانی گـەورەی دامەزرانـدنی دەسـەڵاتی شاهنشاهی لە ئێران.

محمد ڕەزاش، ئەو پێشنیار و نەخشەیەی هەویـدا بـەو نـاوەوە واتـە سـازکردنی ئـەو ئاهەنگـە شـکۆمەندە بـۆ زیندوکردنـەوەی یەکـەمین ئاهـەنگی دامەزرانـدنی دەسـەڵاتی شاهنشاهی قبوڵ کرد و زۆر خۆشحاڵ و دڵخۆشیش بوو.

من خۆم شایەتی ئەوە بووم محمد ڕەزا چەندینجار بە دەربڕینێک کە دەرخەری خۆشحاڵیبوونی بوو، سوپاسی هەویدا دەکرد بۆ بەرپاکردن و سازدانی ئەم جۆرە کۆنفراس و ئاهەنگە بۆ زیندوکردنەوەی ئەو مێژووە، شجاع الدین شفاش وەکو خاوەنی یەکەمی بیرۆکەکە خەڵاتی پلەی یەکەمی هەمایۆنی پێ بەخشرا.

کچەکەم تەنها خەریکی ئەنجامدانی کاری فەرهەنگی بوو. بیرۆکەی دامەزراندنی سەنتەری پەروەردەی فکری منداڵان و نەوجەوانان کاری فەرەح بوو. بیرۆکەی دروستکردنی بینای سەیرکردنی شار لە شوێنی کۆنی ساحەی شهرداری لە چوار ڕێی پەهلەوی کاری فەرەح بوو. دروستکردنی بورج و مۆزەخانەی گەورەی (شهیاد ئاریامهر) بیرۆکەی کچەکەم بوو.

کچەکەم بینای شهیادی بۆ هاوسەرەکەی دروستکرد تاوەکو بۆ هەمیشە لە بیرەوەری شادا بمێنێتەوە و کاتێکیش خەڵکی ئەم مۆنیمێنتە دەبینن بکەونە بیری محمد ڕەزا و دڵیان تازە بێتەوە[1]!

تەنانەت نەخشەی سەرەتای بورجەکە کچەکەم کە خۆی دایڕشتبوو، ئامادەی کردبوو.

ئێستا مادامەکی بیر و یادەوەریەکانم بەرەو ئاهەنگەکای دوو هەزار و پێنج سەد ساڵەی دامەزراندنی پاشایەتی لە ئێراندا ڕۆیشت و لەوبارەیەوە قسە و باس دەکەم ڕێگەم پێ بدە تاوەکو چەند بیریەوەرێکی خۆشت لەبارەی ئەو ئاهەنگانەوە بۆ باس بکەم.

---

[1] – فەرەح لەبارەی هۆکاری دروستکردنی بورجی گەورەی (شهیاد ئاریا مهر) لە مەدخەلی چوونە ژوورەوەی تاران وتی ئەم بورجە گەورەیە بۆ ئەوە دروست دەکەم بۆ ئەوەی خەڵکی هەمیشە لەیادی شاهنشاکەیاندا بن! و بۆ هەمیشەیی بە نەمری بمێنێتەوە!

بەڵام لە یاریەکانی ڕۆژگار، ئەو ناوەندەی کە بڕیاربوو بۆ زیندوڕاگرتنی شاهنشا دروست بکرێت لە سەردەمی شۆڕشی ئیسلامی بوو بە ناوەندی کۆبوونەوەی دژە پەهلەویەکان و ئەمڕۆ خەڵکی ئەو بورجە بە بورجی ئازادی (مەیدان ئازادی) دەناسن و زۆر خەڵکێکی کەم هەیە لە نەوەکانی ئەمڕۆ کە ئەوە بزانن کە ئەو بورجە بۆ زیندوڕاگرتنی شا دروستکراوە.

فەرەح نەیدەزانی کە تەنها بورجی تێکەنشکاو و نەمر ئەو بورج و بینایانەیە کە لەناو دڵ و ڕۆحی خەڵکدا دروست دەکرێن نەك لەسەر جادە و مەیدانەکان.

محمد ڕەزا بێتاقەت بوو لە ڕیش و سمێڵ. لەبیرمە کاتێک کە غلامرزا سمێڵی هێشتبوویەوە، محمد ڕەزا فەرمانیدا بوو کە بەخێرای سمڵێی لە بنەوە بتاشێ! لە سوپادا هیچکەس بۆی نەبوو ڕیش و سمێڵ بهێڵێتەوە. ڕیشی بە نیشانەی پیسی و بێ نەزاکەتی دەزانی.

بۆ سازکردنی ئاهەنگە دوو هەزار و پێنج سەد ساڵەیە شاهنشاییەکان فەرمان درابوو بە ئەندامانی بنکەی باخی تەختی شیراز بۆ ماوەی ساڵێکی تەواو ڕیشیان نەتاشن!

ئەو پیاوانە بەو ڕیشە درێژەیانەوە بەشێوەی سەربازانی هەخامنشی تاوەکو سەربازانی قاجار نمایشیان ئەنجام دەدا. من لە دوای محمد ڕەزاوە دانیشتبووم. هێشتا مەراسیمی ڕۆیشتنی سوپاکە تەواو نەبووبوو کە سەر لەشکر بقراط جعفریانی بانگ کرد و پێی وت:

دوابەدوای تەواوبوونی نمایشەکە فەرمان بدە ڕاستەوخۆ هەموویان ڕیش و سمێڵیان بتاشن! من زۆر سەرم سوڕدەما لەو هەموو حەساسیەتەی محمد ڕەزا لەبەرامبەر ڕیش و سمێڵ. ئەو تەنانەت تاقەتی ئەوەشی نەبوو کە بۆ ماوەی کاتژمێرێکیش تەحەمول بکات سەیری ئەو ڕیشدار و سمێڵدارانە بکات.

بیرەوەرێکی دیکەم سەبارەت بە محمد ڕەزا لەبارەی عادەتی خواردنی بوو.

هەمووکەس دەزانێت (خاویار یان کاڤیار) کە لە دەریای خەزەردایە و لەناو سکی جۆرێك لە ماسیدا دەردەهێنرێت بەناوی (ئوزون برون) لە گرانترین جۆری خواردنی جیهانە کە تایبەتە بە پارەدار و سەرمایەدارەکانی جیهان.

(خاویار) یەکێك بوو لە سەرچاوە بەنرخەکانی هەناردەی ئێران پاش نەوت و فەرش و پستە.

کارگەی دروستکردنی خاویار لە نیوە دورگەی ئاشوراده لە بەندەری شا بوو لەو کارگەیەدا پسپۆڕانی بەستەبەندی باشترین جۆری خاویاری جیهانیان لە ژێر چاودێری عەقید ئەسفەندیاری ئامادە دەکرد و دەنێردرا بۆ بازاڕە جیهانیەکان.

گومانی تێدا نەبوو هەر میوانێکی بیانی بهاتایە بۆ ئێران پێی خۆش بوو بە خاویاری تایبەتی ئێرانی میوانداری بکرێت.

محمد ڕەزا زۆر ڕقی لە خاویار بوو و ئەگەر کەسێکیش لەبەرچاویەوە خاویاری بخواردایە وەکو ژنی دوو گیان تێکدەچوو و دەڕشایەوە.

لە میوانیە ڕسمیەکان و ئاهەنگی خواردنەوەی مەییەکاندا کاتێك خاویار دەهێنرا هیچکەس خاویاری نەدەخستە بەردەست محمد ڕەزا و بەهیچ شێوەیەك هیچ جۆرە قاپێکی خاویار لەبەرچاوی محمد ڕەزاوە دانەدەنرا بۆ هیچ میوانێك.

خزمەتکارانی کۆشك و بەپرسان بە باشی لەو خاڵە تێگەیشتبوون و ڕەچاوی ئەو کارەیان زۆر بە جوانی دەکرد.

لە ئاهەنگەکانی دوو هەزار و پێنج سەد ساڵە، کاری میواندارییکردنەکە درابوو بە دامەزراوەیەکی خۆراکی بەناوبانگی فەرەنسی و کارمەندان و ڕێکخەرانی ئێرانیش لەبیریان چووبوو ئەو مەسەلەیە باس بکەن بۆ کۆمپانیا فەرەنسیەکە.

لەسەر مێزی نانی نیوەڕۆ کە لەناو چادرە گەورەکاندا لە تەختی جەمشید ساز کرابوو، یەکێك لە خزمەتکارەکان بەبێ ئاگا قاپێك کە پڕ بوو لە خاویار پێشکەشی محمد ڕەزای کرد ئەویش لەو کاتەدا خەریکی گفتوگۆ بوو لەگەڵ ژۆرژ پمپیدو (سەرۆك کۆماری فەرەنسا).

محمد ڕەزا لەگەڵ ئەوەی کە چاوی بە خاویارەکە کەوت دڵی تێکچوو و دەستیکرد بە هێڵنجدان و ئەم کارە بووە هۆی جێگەی سەرنجی ئەو پاشا و سەرۆکانەی کە لەوێ دانیشتبوون.

ژۆرژ پمپید و هایلا سلاسی (ئیمپراتۆری ئەسیوپی) دەستی محمد ڕەزایان گرت و کاسیگین (سەرۆك وەزیرانی سۆڤیەتیش)[1] دەستی هێنا بە پشتیدا!

---

[1] – خاتو فەریدە دیبا لێرەدا توشی هەڵەیەك بووە و پادگورنی (سەرۆك کۆماری یەکێتی سۆڤیەتی جاران) بە کاساگیین سەرۆك وەزیرانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران تێکەیشتوە.

(کاسیگین) بە درێژای سەردەمی سەرۆکایەتیەکەی تەنها یەکجار هاتووە بۆ ئێران ئەویش لەکاتی ئیفتیاحی کارگەی گەورەی تواندنەوەی ئاسنی ئەسفەهان.

تاوەکو ئەو کاتەی کە جیهانی ڕۆژئاوا نەوت و سەرچاوە کانزاییەکانی بە تاڵان دەبرد ئامادە نەبوو هیچ جۆرە کەرەسەیەکی گرنگی ژێرخانی ئابوری بنێرێت بۆ ئێران.

سۆڤیەتەکان ئامادەبوون لەبەرامبەر وەرگرتنی گازی سروشتی کە پێشتر لە بیابانەکانی ئەهوازدا بە بەلاش دەسوتا کارگەیەکی تواندنەوەی ئاسن لە ئێراندا دروست بکات.

هەندێك كاتی برد تاوەکو محمد ڕەزا ئارام بویەوە، بەڵام تێکچوونی حاڵی محمد ڕەزا بووە هۆی ئەوەی خۆشی دانیشتنەکە نەمێنێت.

من زۆر پێم سەیر بوو محمد ڕەزا ناتوانێت تەحەمولی بۆنی ماسی و خاویار بکات ماسیشی نەدەخوارد. بەڵام بە بیستنی ناوی خاویار ڕاستەوخۆ حاڵی تێکدەچوو!

(ئەمیر عباس هەویداش) زۆر بێزار بوو لە خورمالو و ئێمەش لە میوانی و دانیشتنە تایبەت و جیاوازەکاندا بە هەر بیانویەك هەبوایە هەوڵمان دەدا ناوی خورمالو بهێنین لەبەردەم ئەمیر عباسدا تاوەکو بێزاری بکەین و سەر بخەینە سەری! ڕۆژنامەی فکاهی توفیق کە ئەم بابەتەی دەزانی هەموو هەفتەیەك وێنەی کاریکاتێریکی هەویدای دروست دەکرد و ناوی دەنا خورمالو یان بەشێوەی خورمالو!)

هایلا سلاسی (ئیمپراتۆری ئەسیوپی) کە هەوڵیدەدا شای ئێران بهێنێتەوە سەر خۆی، ئەویش نەخۆشێکی هەبوو نەیدەتوانی میزی ڕابگرێت.

لەکاتی سەیرکردنی نمایشەکاندا لەگەڵ سەرانی وڵاتانی جیهان کاتێك کە لەلای محمد ڕەزا دانیشتبوو نەیتوانی خۆی بگرێت و هەر لەو شوێنەدا کە دانیشتبوو میزی کرد بە خۆیدا.

من لەدوای محمد ڕەزاوە دانیشتبووم و بینیم کە چۆن خۆی تەڕ کرد. حبیب بورقیبە (سەرۆك کۆماری تونس)یش زۆر بەم کارە تێکچوو و بە چاوێکی سوکەوە سەیری ئیمپراتۆریەتی حەبەشەی دەکرد.

زۆربەی پاشا و سەرۆك کۆمارەکان ئاگاداری مەسەلەکە بوون.

لەڕاستیدا هیچ ڕێگەیەك نەبوو بۆ شاردنەوەی ئەو کارەساتە. هایلا سلاسی بەهۆی ئەو نەخۆشیەوە کە توشی بووبوو نەیدەتوانی کۆنترۆڵی میزی بکات. ئەو ڕۆژەش هەوا زۆر گەرم بوو و کاتێکیش میزەکەی کرد بە خۆیدا ئەوەندە بۆنەکەی پیس بوو ئەوانەی لەدەوروبەریدا بوون هیچکامیان تەحەمولیان نەکرد.

---

پاش دروستکردنی کارگەی تواندنەوەی ئاسنی ئەسفەهان، (کاسیگین) بۆ بەشداریکردن لە کردنەوەی ئەو کارگەیە هات بۆ ئێران، (پادگورنی) سەرۆك کۆماری سۆڤیەت بوو. ئەو پۆستەشی کە هەیبوو تەنها تەشریفاتی بوو.

یرەوەرێکی دیکەم سەبارەت بەو ئاهەنگانە لەبارەی وتاری مێژوویی محمد ڕەزایە لە ڕۆژی یەکەمی دەستپێکردنی ئاهەنگەکە، لە بەرامبەر گۆڕی کۆرشی گەورە، لە پاسارگادا.

محمد ڕەزا، ئەو ڕۆژە، وتارە مێژووییەکەی خۆی بە ڕووکردنە گۆڕی کۆرشی گەورە دەستپێکرد و لە وتارەکەیدا ئاماژەی بەوە کرد: (کۆرش ئارام بخەوە چونکە ئێمە بە خەبەرین!)

لەوە بەدوا ئەو ڕستەیەی محمد ڕەزا بووە خاڵێك بۆ فەرەح و منداڵەکانی و تەنانەت خوشك و برا و نزیکەکانی و بەردەوام بەو قسەیە گاڵتەیان پێ دەکرد.

بۆ نمونە ڕەزا دەیوت بە کچەکەم: (دایکە تۆ بڕۆ ئاسودە بخەوە چونکە باوکم بەپێی ئەو بەڵێنەی کە داویەتی بە کۆرش هێشتا هەر بە خەبەرە!)

یان کچەکەم هەندێکجار پێی دەوتم: (بڕۆ چەند خولەکێك پشو بدە و بخەوە! من یارمەتیم لە کۆرش وەرگرتوە!)

هەڵبەتە، محمد ڕەزا ئاگادار و بەخەبەر نەبوو کە دەوروبەرەکەی ئەویان خەواندوە. ئەو حەقیقەتی کۆمەڵگەی ئێرانی نەدەبینی. خەڵکی بەبچوك دەزانی و سوکایەتی پێ دەکردن.

محمد ڕەزا دەیوت ئەم خەڵکە لەتوانایاندا نیە هیچ شتێك ئەنجام بدەن. وەکو مەڕن.

سوکایەتی و بەبچوك سەیرکردنی محمد ڕەزا بەرامبەر بە خەڵکی پا ڕووداوی ۳۰ جولای ۱۹۵۳ زۆر بوو.

لە ۳۰ جۆلای ۱۹۵۳ خەڵکی تاوەکو نیوەڕۆ پشتیوانیان لە مصدق دەکرد و بۆ بەرژەوەندی ئەو هۆتافیان دەدا و لە دوا نیوەڕۆشەوە دەبوون بە پشتیوانی محمد ڕەزا و دەستیان دەکرد بە خۆپیشاندان بۆ پشتیوانی محمد ڕەزا.

کاتێك محمد ڕەزا ئەم دووڕوویی و مەزاجە سەیرو سەمەرەیەی خەڵکی بینی، ئیدی زۆر باوەڕی بە زۆرینەی خەڵکی نەبوو و خەڵکی بە (عەوام و نەزان) ناو دەبرد. کاتێك لە ساڵی ۱۹۷۷ گرنگترین و گەورەترین خۆپیشاندان لە تەبرێز ڕوویدا و هەواڵی کۆبوونەوە و خۆپیشاندانی خەڵکی تەبرێز (بە بۆنەی چلەی کوژراوانی قوم) گەیشت

به محمد ڕەزا بە نارەحەتیەوە وتبووی بە فەرەح: ( بەپێچەوانەی ئەو بەڵێنەی کە بە کۆرشم دا نەمتوانی خۆم بە ئاگا و بێدار ڕاگرم!)

خەڵکی تەبریز بۆ یادی کوژراوانی ڕووداوی قوم مەراسیمێکیان لە مزگەوتی تەبریز بەرپاکرد و لەو مەراسیمەدا لەگەڵ پۆلیسدا ڕووبەڕووبوونەوە.

خەڵکی تەبریز لەم ڕووداوەدا لە بەرژەوەندی خومەینی هۆتافیاندا و پەیکەرەکانی محمد ڕەزایان شکاند و چەند سینەما و کارگەیەکی دروستکردنی ساردی (بیبسی کۆلایان) سوتاند. لەم ڕووداوەشدا چەند کەسێك کوژران و بریندار بوون.

محمد ڕەزا نەیدەتوانی باوەڕ بەم ڕووداوە بکات و بەردەوام دەیوت: (خەڵکی تەبریز؟ نەخێر، نەخێر، باوەڕ ناکەم!)

بە نەفرەتی خوا بکەون دەوروبەرەکەی محمد ڕەزا بەتایبەتی ئەمیر عباس هەویدا کە هەمیشە محمد ڕەزایان با دەدا و بە عەقڵی گشتی ناویان دەبرد!

ماچکردنی دەست و پێی محمد ڕەزا و پێدانی نازناو و ناوی پڕ لە ماستاوچیانە لە ماوەی هاتنە سەر دەسەڵاتی لە ساڵی ١٩٤١ ەوە دەستیپێکرد. بەڵام لەسەردەمی حکومەتی دکتۆر ئیقبال بە دواوە گەیشتە تروپکە و لە سەردەمی سەرۆك وەزیرانی هەویدا گەیشتە کۆتایی.

ئەم پیاهەڵدان و وەسفانە بوونە هۆی ئەوەی محمد ڕەزایان لە ڕووی هێزی مێشك و عەقڵ و بیر و لێهاتووییەوە بە بەرزترین کەس دەناسی، ئەمەش کەم کەم کاری خۆی کرد و محمد ڕەزا ئەو باوەڕەی لەلا دروستبوو کە لە هەموو ڕوویەکەوە لەسەروی مرۆڤی ئاساییەوەیە!

بە بۆچوونی من، ئەم گەورەترین ستەمە کە کرا لە محمد ڕەزا. بەتایبەتی پاش سازکردنی ئەو ئاهەنگە دوو هەزار و پێنج سەد ساڵانەیانەی کە بە بۆنەی دامەزراندنی شاهنشاهی ئێرانەوە محمد ڕەزای توشی بیری خەیاڵپلاوی کردبوو.

لە ئاهەنگەکانی دوو هەزار و پێنج سەد ساڵە سەرۆك کۆمارەکان و پاشاکان و سەرۆك وەزیرەکان و کەسایەتیە جیهانیەکانی سەرتاسەری دنیا هاتن بۆ تەختی جەمشید و بوونە میوانی محمد ڕەزا.

کۆبوونەوەی پایە بڵندەکانی جیهان لە شیراز و لە ژێر چەتری ئەو خەییمەیەی کە محمد ڕەزا هەڵیدابوو ئەوەندەی دیکە بووە هۆی ئەوەی کە بیری خەیاڵپلاوی محمد ڕەزا فراوانتر بێت و بچێتە ناو جیهانی خەیاڵ و وەهمەوە.

من جارێکیان وتم بە کچەکەم، بەناوبانگی نەخۆشییە. فەرەح کە تێنەگەیشت لە مەبەستەکەم وتی: بەڵی. دەزانم نیگەران مەبە شا لەژێر چاودێری پزیشکە فەرەنسی و ئەمریکیەکاندایە و نەخۆشیەیەکەی جێگەی نیگەرانی نیە.

کچەکەم وی زانی مەبەستم لە سپڵ و هەناوی شایە لە کاتێکدا ئاماژەی من بۆ نەخۆشی مێشکی محمد ڕەزا بوو.

ڕادیۆ-تەلەفزیۆن و چاپەمەنیەکان پڕ بوون لە وتار و قسەی ماستاوچیانە و پیاهەڵدانی سەیر و سەمەرە بۆ شا.

سەرەڕای ماچکردنی دەستی محمد ڕەزا، خۆشیان دەخست بەسەر پێ و پێڵاوەکانیشدا و ماچیان دەکرد!

من زۆر بێزار دەبووم بە بینینی ئەم دیمەنانە.

تەنانەت کۆمەڵێك هەبوون هاوسەر و کچەکانی خۆیان بە بیانوی جۆراوجۆر دەهێنا بۆ لای محمد ڕەزا تاوەکو بەڵکو ببنە جێگەی سەرنجی شا!

لە ساڵانی کۆتای تەمەنی سەڵتەنەت، بەتایبەتی پاش ساڵانی ١٩٧١ و پاش ئاهەنگەکانی دوو هەزار و پێنج سەد ساڵە، ئیدی محمد ڕەزا خۆی بە کەسێکی ئاسای نەدەبینی. لە بۆنە جیاوازەکاندا، تەنانەت لەناو کۆبوونەوە و دانیشتن و چاوپێکەوتنە گشتیەکاندا، خۆی بە کەسێکی تایبەتی دەبینی و وایدەزانی لەلایەن هێزێکی میتافیزیقی و ئاسمانیەوە پشتیوانی دەکرێت و هەندێکجاریش لەبارەی خەون و خەیاڵەکانیەوە قسەی دەکرد و دەیوت دڵنیام هێزێکی ئاسمانی پەیامی شاهنشاهی پێ بەخشیوم.

لەم کۆتاییانەدا (دە ساڵی کۆتایی سەڵتەنەت) گوێی بۆ هیچ قسەیەکی خێر و بەرژەوەندیدار نەدەگرت و هەمووکەسی بە بێ عەقڵ و نەزان و بێ زانیاری دەزانی. برازا خۆشەویستە داماوەکەم ڕەزا (قطبی) کە کەسێکی دڵسۆز و شارەزا بوو بەردەوام سەبارەت بە دوورکەوتنەوەی محمد ڕەزا لە ڕاستی کۆمەڵگەی ئێران هۆشداری دەدا.

بەڵام محمد ڕەزا پاش ئەوەی کە یەکجار دووجار ئاگاداری قسە و باسەکانی ڕەزا (قطبی) بوو وتی بە فەرەح: (بڵێ بەم جوجکە تودەییە ئیدی دەستوەرنەداتە ناو کاروباری سیاسیەتەوە!)

ئەگەر محمد ڕەزا هەرکەسێکی قبوڵ نەبوایە یان بە تودەیی یان بە شێت ناوی دەبرد. نەیدەتوانی تەحەمولی هیچ جۆرە دەنگێکی جیاواز بکات.

زۆرێك لە سەرکردەکانی جیهانیشی بە بچوك دەزانی و بە شێت و نەزان و بێ عەقڵ سەیری دەکردن. لە (گەورەکردنی) محمد ڕەزا و تێکدانی مێشك و دەرونی ڕێبەرانی دەرەوەش پشکێکی سەرەکیان هەبوو.

ئەڵمانیا کە یەکێکە لە دەسەڵاتە گەورەکانی ئابوری و پێشکەوتوترین دەسەڵاتدارەکانی ئەوروپایە. لەبیرمە ڕاوێژکاری گەورەی ئەڵمانیا (هیلموت ئەشمیت) هات بۆ تاران و شەوێکیان لەگەڵ محمد ڕەزا و فەرەح و من و کۆمەڵێك لە میوانی دیکە نانی ئێوارەمان خوارد. (ئێوارە خوانێکی تایبەتی بوو)

هیلموت ئشمیت لە وەڵامی پرسیارێکی محمد ڕەزا کە ئێران چۆن دەبینێت وتی: (باوەڕ پێ نەکراوە ئەم هەموو پێشکەوتن و گەشەکردنە تەنانەت لە ئەوروپاشدا بوونی نیە!)

پاشان دەستیکرد بە پیاهەڵدان و هاندانی عەقڵ و گەورەبەری و ژیری محمد ڕەزا! من و ئامادەبوان بە بێدەنگی سەیرمان دەکرد. هەمووومان دەمانزانی هیلموت ئشمیت پیاهەڵدان دەکات. بەڵام بەداخەوە محمد ڕەزا نوقمی خۆشی و شادی بووبوو لەناو ئەو پیاهەڵدان و ماستاوکردنەدا، پێکەنین و خۆشی دەموچاوی پۆشی بوو.

ژیسکاردستن (سەرۆك کۆماری فەرەنسا) لە سەفەرەکەی خۆی بۆ تاران زیاد لە ڕادە وەسف و پیاهەڵدانی محمد ڕەزای کرد.

تەنانەت منداڵی بچوکیش دەیزانی ئەم قسە و باسانە بۆ ئەوە دەکران لە ڕێگەی محمد ڕەزاوە ئیمتیازی چەور و شیرین وەربگرێت. بەڵام بەداخەوە محمد ڕەزا باوەڕی بەم قسانە دەکرد!

(نیکسۆن سەرۆکی ئەمریکا) هاتبوو بۆ ئێران دەیوت ئامانجم لەم سەفەرەدا بۆ چاوپێکەوتنە لەگەڵ شای هەڵبژێردراو و ڕێنوێنی و ئامۆژگایەکانیەتی!

محمد ڕەزاش دەستیکرد بە پێدانی فەرمان و ڕێنوێنی بە نیکسۆن!

کـچەکەم زۆر بێتاقـەت بـوو بـەم خۆشـباوەڕیانەی پیاوەکـەی، بـەڵام چ کەسـێك جورئەتی ئەوەی هەبوو باسی ئەو سادەیی و زوو باوەڕیانەی بکات؟

بە باوەڕی من، محمد ڕەزا بە کەڵکی ئەم کۆمەڵگە تایبەتە و بە کەڵکی کاری سیاسی نەدەهات.

محمد ڕەزا بە منداڵی لە سویسرا گەورەبوو بوو و ئەخلاقێکی تایبەتی هەبوو.

محمد ڕەزا باوەڕی بەوە نەدەکرد کە دەوروبەری درۆی لەگەڵدا دەکەن!

لەبیرمە کاتێك کە چەندینجار نوێنەرانی مافی مرۆڤ و نەتەوە یەکگرتوەکان هاتن بۆ ئێران و پرسیاریان دەکرد لـە محمد ڕەزا لـەبارەی بـوونی ئازاردان و ئەشکەنجەدانی زیندانیـەکان و دەستەبەسـەرگیراوەکاندا لـە نـاو زیندانیـەکانی ئێرانـدا، محمـد ڕەزاش ژەنـراڵ نعمـەت اللە نـصیری سـەرۆکی دەزگـای ئیتلاعـات و ئاسایـشی وڵات و بەپرسەکانی دیکەی ئەو بوارەی بانگ کرد و پرسیاری لێ دەکردن لەو بارەیەوە.

نعمـت اللە نـصیری وتـی بـە شـا هیـچکەس ئـازار نادرێـت و دەسـتگیرکراوەکان بـە خواستی خۆیان دان بە توانەکانی خۆیاندا دەنێن و هاوڕێکانیان هەڵدەخەڵەتێنن!

محمـد ڕەزا پـاش بیستنی ئـەم ڕوونکردنەوانـە لـەبری ئـەوەی سـەرۆکی سـاواك سزا بدات بەهۆی ئەو درۆ و دەلەسە ئاشکرایانەی کە دەیکات، کەچی لەچاوپێکەوتنێکیدا باسـی ئـەوەی کـرد لـە زیندانـەکانی ئێرانـدا هـیچ کـەس ئـازار نادرێـت و خراپـەکارەکان پاش دەستگیرکردنیان بە ئارەزومەندانە دان بە تاوانەکانی خۆیاندا دەنێن!

لـەم کاتانـەدا، زینـدانێکی سـاواك توانیبـووی بـە هـەڵهاتن لـە زینـدان و بـە شـاراوەی خـۆی بگەیەنێتـە ئـەورووپا و شـوێنی سـزادانەکانی جەسـتەی پیـشانی ڕۆژنامەنوسـە ئەورووپیەکان بدات و بووە هۆی ڕسوابوون و درۆدەلەسەکانی ساواك.

محمد ڕەزا دووبارە نصیری بانگ کردەوە و لەم بارەیەوە پرسیاری لێ کرد.

نصیری دووبارە دەستیکردەوە بە درۆکردن و وتی: (ئەم کچە بۆ خراپکردنـی نـاوی ئێران خۆی بریندار کردوە و بە ئاگری جگەرە خۆی سوتاندوە!)

محمد ڕەزا باوەڕی بەم قسانە کرد و لە وەڵامی زۆرێك لەو ڕێکخراوانەی مافی مرۆڤی جیهان ئەوەی خستەڕوو کە تودەییەکان و خراپەکارەکان بۆ خراپکردنی ناوی حکومەت بەشێوەیەکی زۆر خراپ خۆیان بریندار دەکەن و ئازاری خۆیان دەدەن!

باوەڕی زیاد لەڕادەی محمد ڕەزا بە دەوروبەرە ماستاوچی و درۆزنەکانی زۆرترین زیانی گەیاندە سەڵتەنەتی ئێران و لە کۆتاییدا هەر ئەو درۆ دەلەسانە بوون بوونە هۆی کەوتنی ڕژێمی شاهنشاهی ئێران.

ئایا ئەمە تاوانە کە ڕێبەرێك متمانەی هەبێت بە دەوروبەرەکەی؟[1] محمد ڕەزا باوەڕی بە دەوروبەرەکەی هەبوو و ئەو متمانەباوەڕپێکردنەی بە دەوروبەری بۆ خۆی خاڵێکی بەهێزی بوو. بەڵام دەوروبەرەکەی تاوانبار و خراپەکاربوون کە ئیستغلالی ئەو خۆشباوەری و متمانەیەی شایان کرد.

هەستی باوەڕپێکردن بە کەسانی دیکە لەلایەن محمد ڕەزاوە بەچەشنێك بەهێز بوو لەم دواییانە تەنانەت ڕێگەی دەدا خەڵکانی دیکە لەبری ئەو بیر بکەنەوە!

من سیانزە ساڵ حکومەتی هەویدا بە ڕەشترین کاتەکانی مێژووی هاوچەرخی ئێران دەزانم و بە دڵنیاییەوە دەڵێم هەویدا بە هۆکاری ئەوە دەزانم کە محمد ڕەزا بکەوێتە ناو هەڵەوە و توشی ئەو بارودۆخە ببێت.

هەویدا لە ڕوانگەی ڕۆحی و دەروونییەوە نەخۆش بوو. هەویدا پیاوێکی ماستاوچی، دەم لوس و زۆر فێڵباز بوو.

هیوادارم لێکۆڵەرەوان و مێژوونوسان و شارەزایان، بێ لایەنانە ڕووداوەکانی ئێران هەڵبسەنگێنن و ڕۆڵی هەویدا ئاشکرا بکەن بەتایبەتی لەو ڕۆڵەی کە بینی لە ڕاکێشانی ئێران بۆ ناو ئەو بارودۆخە و ئەو زیانە زۆرەی کە دای لە بنەمای سەڵتەنەتی ئێران. ئەم کارە بۆ بەرژەوەندی ئیصلاحکردنی مێژوو زۆر گرنگ و پێویستە.

---

[1] – هەڵبەتە ئەمە تاوان نیە کە ڕێبەرێك متمانەی هەبێت بە دەوروبەرەکەی! بەڵکو تاوان و گوناهی گەورە ئەوەیە کە ڕێبەرێك کۆمەڵێك خەڵکی گەندەڵ، تاوانبار، دزوو بێ ئەخلاق لە دەوروبەری خۆی کۆ بکاتەوە و جڵەوی وڵات و چارەنوسی مەملەکەتێکیان بداتە دەست. ئەمە تاوانێکە هەرگیز مێژوو ئەو ڕێبەرە نابەخشێت و دەبێتە بچێتە ناو زبڵدانی مێژووەوە.

من بەداخەوە لەژێر فشاردام بۆ ئەوەی زانیاری و بابەتەکانی خۆم دەرنەخەم و ناچارم چاوپۆشی بکەم لە هەندێك لەو بابەتانەی کە هەیە. تەنانەت کچەکەم کە قوربانی سەرەکی کەوتنی سەڵتەنەتە لە ئێراندا داوام لیّ دەکات واز لە ڕابردوو بهێنم و واز لەو هۆکار و پرس و بابەتانە بێنم کە بوونە هۆی کەوتنی حکومەتی شاهنشاهی و ئاوارەبوونی ئێمە.

کچەکەم، تەنانەت ئێستاش لە دەرەوە موچەی بڕیوەتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە زیانیان لە محمد ڕەزادا و بوونە هۆی کەوتنی سەڵتەنەتی ئێران. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆحیەتی نەرم و دڵی مهرەبانی فەرەح.

بەلاّم من ناتوانم ببینم کەسانێکی وەکو ژەنراڵ حسین فردوست، ژەنراڵ عباس قرەباغی، ئەسدالله علم، فریدون هویدا، عبدالعزیز و فەرمانڕەوایانی دیکە دابنیشن و کتێب بنوسن و هەموو کەموکوڕی و تاوانەکان بخەنە گەردنی محمد ڕەزا و ڕاستیەکان هەموو ئاوەژوو بکەنەوە.

هەمووکەس دەزانێت حسین فردوست بە منداڵی لە ماڵی ڕەزاشا گەورە بوو و گۆشت و پێستی و ئێسقانەکانی لە نان و خوێی پەهلەویەکانە. محمد ڕەزا ئەوی بە ئەمینترین و نهێنی پارێزترین کەسی خۆی دەزانی، بەلاّم هەر ئەم کەسە خیانەتی کرد بە محمد ڕەزا و لەکاتێکدا کە بووە جێگری ساواکی ولاّت و بووە سەرۆکی لێکۆڵینەوەی شاهنشاهی بە شاراوەی چووە ناو ڕیزی دژە شاوە و لەناو کۆشکەوە خیانەتی دەکرد!

عباس قرەباغی، کۆتا سەرۆکی هێزی سوپا، بە دەرکردنی بەیاننامەی بێلایەنی و گەڕانەوەی سوپا بۆ بنکەکانیان بووە هۆی ئەوەی شۆڕشگێڕەکان زیاتر دەستیان بکرێتەوە و بە ئاسانی حکومەتی پەهلەوی بکەوێت. ئێستاش، ئەم خائینە، لە لەندەن کتێبێکی بیرەوەری نوسیوە و ڕەخنەی لە محمد ڕەزا گرتوە.

ئایا ڕاستە من بە بێدەنگ دابنیشم و ڕێگە بدەم هەرکەس هەرچی ویست بە ئارەزوی خۆی بیڵێت و بە خراپە باسی زاوای خوالێخۆشبووم بکات و بە ئارەزوی خۆی تۆمەتی بۆ دروست بکات؟

مـن تـەنها لەیـەك بـواردا لەگـەڵ کەسـانی خـائینی وەکـو قرەبـاغی و فردوسـتدا هاوباوەڕم و محمد ڕەزا بە کەمتەرخەم دەزانم ئەویش هەڵبـژاردن و دانـانی ئـەو کەسە زەبون و زەلیل و خائینانەی فەرماندەکانی سوپا بوو.

عبـاس قرەبـاغیش وەکـو هەویـدا حـەزی لـە نێربـازی بـوو، ڕاپـۆرتی زۆر لـەبارەی پەیوەندیە نامەشروعیەکانی لەگەڵ سەرباز و ئەفسەرانی ژێر دەستی دەگەیشت. خەتا و تـەنها خـەتای گـەورەی محمـد ڕەزاش ئـەوە بـوو کـە سـودی لـەم کەسـە ناپیـاو و نێرەموکانە وەردەگرت بۆ ئەو بەرپرسیاریەتە قورس و گرنگانەی کە تایبـەت بوون بە کەسانی لێهاتوو و پیاو!



امیر عباس هەویدا و لەیلای خێزانی، زۆر لەلای نەمایەوە بەهۆی بەدڕەوشتیەکانیەوە



امیر عباس هوەیدا لەکاتی داداگاییکردنیدا



حەبیب الله القانیان



تیمسار مهدی ڕەحیمی




هۆشەنگ ئەنصاری

ئەم وێنەیە لەیەکێك لەسەفەرەکانی بۆ ئەمریکا گرتویەتی



شابانو سورەیا،



محمد ڕەزا و ئەشرەف پەهلەوی کە (دووانە بوون)



ئەشرەف پەهلەوی و هاوسەرەکەی

(ئەحمەد شەفیق) هاوسەری دوەمی خەڵکی میسر بوو.



اشرەف پەهلەوی



بەهرۆز وثوقی یەکێك لە ئەکتەرەکانی ئێران(ئەشرەف پەهلەوی) ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە گەورەکردنی



یەکێك لە بەرپرسەکان

قاچی محمد ڕەزا ماچ دەکات



شمسە پەهلەوی لە تەمەنی پیریدا



محمد ڕەزا و فەرەح لەیەکێك لە سەردانەکانیان بۆ سەنتەری پێگەیاندنی منداڵ و نەوجەوانان



فەرەح  لە یەکێك لە سەردانەکانی بۆ فیستیڤاڵێکی کەلتوری

## جەژنەکان و میوانیەکان...

سێ ئاهەنگ هەیە لە مێژووی ژیانمدا، هەرگیز ساتە شیرینەکانی ئەو ئاهەنگانە لەبیر ناکەم.

یەکەمیان ئاهەنگی شوکردنی کچەکەم فەرەح بوو کە پێشتر لەبارەیەوە کورتەیەکم باسکرد.

دووەمیان ئاهەنگەکانی بیست و پێنجەمین ساڵیادی سەڵتەنەتی محمد ڕەزا و سێیەمیشیان ئاهەنگە شکۆمەند و مێژووییە دوو هەزار و پێنج سەدەمین ساڵیادی دامەزراندنی شاهنشاهی ئێران بوو.

لەبارەی ئەم ئاهەنگ و یادانەوە خەڵکی کەم تازۆرێك زانیاریان هەیە و لە کتێبە جۆراوجۆرەکاندا بابەتی زۆریان لەبارەوە نوسراوە.

دیارە بەهۆی ئەوەی کە تەمەنێکم هەبوو زیاتر پێم خۆشبوو بەشداری ئاهەنگە ڕەسمیەکان بکەم. هۆکارەکەشی ڕوونە. چونکە لە ئاهەنگە شەخسیەکاندا هەندێکجار حەریمی کەسایەتیەکان ڕەچاو ناکرێت. بۆ نمونە جارێکیان لەبیرمە لە میوانێکدا کە لە ماڵی بەڕێز ئیبتیهاج ساز کرابوو جەنابی خاتو ئەشرەف کە سەری گەرم کردبوو، دەستی کرد بە سەماکردن و لەکاتی سەما کردنەکەدا هات بۆ لای من و دەستی منی گرت و داوای لێ کردم تاوەکو سەمای لەگەڵدا بکەم!

من نامەوێت لۆمەی سەما کردن بکەم ناکۆکیش نیم لەگەڵ خۆشی و گۆرانی بەڵام هەر تەمەن و سەردەمێك هەر پێگە و پلەیەك بۆ خۆی پێگە و گرنگێکی تایبەتی هەیە و بۆ من لەو تەمەنە زۆرەدا سەماکردن کارێکی ڕاست نەبوو. بەڵام خاتو ئەشرەف بەهیچ شێوەیەك گوێی بەم مەسەلەیە نەدەدا!

ئامـادەبوون لـە میـوانی و جەژنـە نارەسمیەکانـدا مەترسـی دیکـەی هەیـە، کـە مـن ئەزموونی ڕووبەڕبوونەوەم هەیە لەگەڵیاندا.

لە ئاهەنگێکی لەدایکبوون کە لە ماڵی (ئازادە شفیق) ڕێکخرابوو، بەداخەوە پاش زیـادەڕەوی زۆر لـە خواردنـەوەی مەشـروبات و شـەراب و سـەرگەرمبوونی زۆرێـك لـە ئامادەبوان، ئاهەنگەکە ئاراستەی بەرەو بەکارهێنانی مەوادی بێهۆشکەر چوو و بۆ منیش ڕاست نەبوو کە وەکو دایکی شابانوی ئێران لە دانیشتنێکدا بم کە لەناویدا یاسا شکێنی بکرێت و تریاك و حەشیش لەناویدا بکێشرێت!

کێشەی دیکە لـەناو ئـەم میوانیانـەدا ڕوویـان دەدا بۆیـە لەبەرژەوەنـدی منـدا نـەبوو بەشداربم لەو جۆرە دانیشتنانەدا.

بۆ نمونە جاری واهەبوو ئەکتەرێکی کۆمیدی پلە دووی تارانیان بانگ دەکرد کە لێهاتوورییەکی زۆری هەبوو لە تەقلید و لاساییکردنەوەدا لەناو میوانیەکەدا تەقلیدی هەموو کەسیان دەکردەوە تەنانەت تەقلیدی خودی پاشاش.

بـە سـەرنجدان بـەم کێـشە و گرفتانـە، زیـاتر هەوڵـمدەدا بەشـداری لـەو میوانیـە تایبەتیانە بکەم کە کۆمەڵێکی کەم بەشداریان دەکرد ئەوانیش زیاتر ئەو کەسانە بوون کـە نزیـك بـوون لـە تەمـەنی خۆمـەوە. بۆیـە زیـاتر بەشـداریم لـە میـوانی ئاهـەنگی لەدایکبوونی نەوەکانم یـان ساڵیادی هاوسـەرگیری شـا و فەرەح یـان ئاهـەنگی ساڵی تازە و هەندێکجاریش دەچوون بۆ ئاهەنگی بوك گواستنەوەی کۆمەڵێك لەو خێزانانەی کە نزیك بوون لێمانەوە.

لەو ئاهەنگ و میوانیەی کە خاتو ئەشـەرف بەشـداری بکردایە هەوڵمدەدا زۆر خـۆم دوور بخەمەوە. من هیچ دوژمنایەتیێکم لەگـەڵ خـاتو ئەشـەرفدا نـەبوو، بـەڵام زۆر ترسم لە چەتاوەڕووی و بیێ شەرمیەکەی هەبوو. خاتو ئەشرەف خان ڕەچاوی هـیچ شـتێکی نەدەکرد. بۆ نمونە، هەندێکجار لە بەردەم خەڵکیدا ژنێك کە پیاویشی بوایە هـانی دەدا بۆ ئەوەی حەز لە پیاوێکی ژندار بکات و دڵی لیێ بچێت!

جارێکیان لەبەردەم کۆمەڵێك خەڵکدا ڕەخنەی ئەوەی لیێ گرتم کە بۆچی شو ناکەم و پاشان پێشنیاری کرد بۆ ئەبوئەلحسن ئیبتهاج کە مارەم بکات! لەم کاتەشدا ئازەرخان هاوسەری ئەبوئەلحسنیش وەستا بوو.

منیش ئیشارەتێکم کرد بۆ ئازەر خان و بە گاڵتەوە وتم بە ئەشرەف بەڵام (ئەبول خان) ژنی هەیە.

ئەشەرفیش پاڵێکی نا بە ئازەرەوە و وتی: (خەمی ئازەر مەخۆ بە پێی پێویست مەشغوڵە و دەوروبەری پڕن لە جوجکە کەڵەشێر!)

هەر بەم سادەییە کەسایەتی و شەخسیەتی مرۆڤی دەشکاند و وێرانی دەکرد. هەڵبەتە مەبەستێکی تایبەتی نەبوو. بەڵام من هەمیشە ترسی ئەوەم هەبوو کە متمانە و پێگە و ناوبانگی خۆم لەدەست بدەم!

ئەم جۆرە میوانیانە لەبەر ئەوەی کە مۆزیک و گۆرانی و سەماکردنی تێدا بوو هەمیشە جێگەی سەرنجی گەنجەکان بوو. هەروەها لەبەر ئەوەی کە کچ و ژنی زۆر گوێنەدەری تێدا بوو زیاتر شوێنی کەسانی خۆشگوزەران و پیاوانی هەوەسباز بوو.

تایبەتمەندی ئەم جۆرە میوانیانە هەرچەندە بۆ کۆمەڵێك زۆر جێگەی سەرنج بوو، بەڵام بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ڕۆحیەتی مندا نەدەگونجان.

لەبەر ئەوەی کە کچەکەم عاشقی سەما کردن بوو حەزی لەم جۆرە میوانیانە هەبوو و بەهیچ شێوەیەك خۆی لانەدەدا لە بەشداریکردنی ئەم میوانداریانەدا. بەڵام من سەرەڕای پێداگیری فەرەح و هاوڕێکانی بۆ بەشداریکردنی ئەم جۆرە ئاهەنگانە بەڵام هەر خۆم بەدوور دەگرت.

هەر لەو سەرەتاوە کە پێم نایە دەربار و کۆشکی شاهنشاهی وێنایەکی خێزانەکانی سەڵتەنەتی سەدەکانی هەژدە و نۆزدە لەناو مێشکمدا بوو و وابیرم دەکردەوە کە ئەندامانی ناو خێزانی سەڵتەنەتی تەنانەت لەکاتی پێڵاو لە پێکردن و گوێرەوی لەپێکردنیشدا ناچەمێنەوە و لەکاتی ڕۆیشتنیشیاندا هەموو کەس لەبەرامبەریان دەچەمێتەوە و دار و دیوار کڕنوشیان بۆ دەبات! بەڵام دواتر ئەم گومان و وێنایە لەلام هەرەسی هێنا و بینیم لە کۆتایی کاتژمێرەکانی شەودا کە کاتێك میوانیەکان بەرەو کۆتایی دەچن لە پڕێکدا گڵۆپەکان دەکوژێننەوە و دەڵێن هەموو کەس باوەش بکات بە کەسەکەی پاڵ خۆیدا و ماچی بکات!

پێم سەیر بوو چۆن خوشکی پاشا ڕێگەی دەدا کەسێکی وەکو میر ئاخور شا یان کەسێکی هەڵسوکەوت خراپی وەکو ڕەحیمعلی خورەم ماچی بکات![1]

---

[1] – ڕەحیمعلی خورەم پیاوێکی گەورەی بەهەیکەل زلە بوو. سەرەتا کاتێك هاتبوو بۆ تاران کرێکاری دەکرد و پاشان کاتێك کە خشتەکاری شۆستەکان پەیدا بوون دەستیکرد بەکاری خشتەکاری و بووە کرێکاری خشتەکاری.

ڕۆژێکیان سەرەتای هاوین دەبێت لە تاران ڕەحیمعلی خرم لەگەڵ کۆمەڵێك لە کرێکاری زۆری خشتکاری دەبرێن بۆ ئیشکردن بۆ شۆستەی کۆشکەکانی سەعد ئاباد.

ڕۆژێکیان ڕەحیمعلی پاش ئەوەی کە نانی نیوەڕۆ دەخوات پاشان لە ژێر سێبەری درەختە بەرزەکان هەندێك ڕادەکشێ و سەرخەوێك دەشکێنێ و لەو گەرمایەدا دەچێتە ناو قولآی خەوەوە... بەڕێکەوت دایکی شا (تاج الملوك) لەگەڵ ئیحترام شیرازی (ئیحترام الملوك) لەو شوێنەوە تێدەپەڕن، کاتێك چاوی بەو گامێشە مل ئەستورە دەکەوێت درێژ درێژ ڕاکشاوە حەزی لێ دەکات و پێی خۆشە ئەم کرێکارە ببات بۆ کۆشکە تایبەتەکەی خۆی!

ئیحترام الملوك (هاوسەری زول قەدر نوێنەری شیرزا لە ئەنجومەنی شورای نەتەوەی بوو) ڕەحیمعلی دەنێرێت بۆ حەمام و پاشان جلوبەرگێکی تازەی لەبەر دەکات و دەینێرێت بۆ خزمەتی شاژنی دایك!

لەو ڕۆژە بە دواوە ئەستێرەی بەختی ڕەحیمعلی دەرکەوت و کرێکاری خشتەکار بوو بە یەکێك لە خاوەن کارگە خشتەکانی دەوڵەت و کارگەیەکی دروستکردنی خشتی لە شوێنی ئێستای پارکی ئیرەمدا دروستکرد.

ڕەحیمعلی ماوەیەك کە سەرگەرمی خزمەتکردنی شاژنی دایك بوو و بەهۆی ئەو پەیوەندیەی کە لەبەر ئەو هەیکەلە زلەی لە کۆشکدا هەیبوو توانی تۆپی خۆی بتەقێنێت و تاوەکو توانی (نانی هەیکەل زل!) خوارد و هەر لەو ڕێگەیەشەوە توانی ببێتە خاوەنی ناوچەیەکی زۆری چەند هیکتاری پارکی ئیرەمی ئێستا و لەوێش دەریاچەیەکی دەستکردی دروستکرد لەگەڵ باخێکی کێوی و باڕێك و شوێنێکی گەشتیاری.

خورەم بونەوەرێکی زۆر سەیر بوو. ئەو ژن و کچانەی کە تەنانەت لەگەڵ پیاوەکانیشیاندا یان لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکانیشیاندا بڕۆشتنایە بۆ پارکی خورەم لەلایەن پیاوەکانی خورەمەوە دەڕفێنران و لە شوێنێکی پارکەکەدا زیندانی دەکران و پاشان دەستدرێژیان دەکرایە سەر.

چەندینجار لە ساڵی ١٩٧٦ و ١٩٧٧ هەواڵی ونبوونی ژن و کچ لە پارکی خورەم (ئیرەمی ئێستا) لە چاپەمەنیەکاندا بڵاوبووەتەوە. بەڵام هیچکەس نەیزانی ئەم داماوانە ون نەبوون. (بەڵکو پیاوەکانی خورەم ڕفاندویانن) تەنانەت لە ڕۆژنامەکانشیدا نوسیان ئەو کەسە ونبووانە کەوتبونە ناو شوێنێکی پارکەکەوە، تاوەکو لە ساڵی ١٩٧٧ پیاوەکانی خورەم چەندینجا ژن و کچی خەڵکیان ڕفاندوە بەبێ

من که تاوەکو ئەو کات ئەو جۆرە دیمەنانەم نەبینی بوو و لەگەڵ خێزانە نەجیبزادە و پیاوە ناسراوەکانی وڵاتدا هاتوچۆم نەبوو هەمیشە وێنایەکی سونەتی لە ناموس و شەرەف و باوەڕیی دینی لە مێشکمدا بوو. بەڵام کاتێك ئێستا دەبینم پیاوەکان لەگەڵ

---

ئەوە دەستگیر بکرێن و سزاش بدرێن، تەنانەت جارێکیان کچێکی داماو بەزۆر لەدەستی دەستگیرانەکەی دەبەن و هەڕەشە لە گەنجە داماوەکەش دەکەن ئەگەر قسە بکات دەیخەنە ناو قەفەزی شێرەکانەوە.

گەنجی ناموس دۆڕاویش! خۆی دەگەیەنێتە بنکەی پۆلیس و شکات دەکات بەڵام پیاوەکانی خورەم کە لە بنکەکەشدا دەبن هیچ گوێ بە شکاتەکەی نادەن. ئەم دایك مردوەش بیر لە هەر شوێنێکی دیکە دەکاتەوە خۆی پیادەکات بەڵکو بە فریای بکەون بەڵام هیچکەس گوێی پێ نادات بەکورتی کچەی گەنج چەند ڕۆژێك لە دیلیەتیدا لەلای خورەم و پیاوەکانی دەمێنێتەوە و ئەو کارەی کە نەدەبوو پێی بکرێت ئەنجامی دەدەن... یەکێك لەو ئەخلاق حەیوانیانەی کە ئەم کابرایە کردی بریتی بوو لە پەلاماردانی ژنێکی گۆرانیبێژ لەسەر شانۆی بارەکەی و ئەنجامدانی کاری بەدڕەوشتی لەگەڵیدا لەبەردەم سەیرکەرەکاندا.

ڕەحیمعلی گرەو دەکات کە ئامادەیە لەبەرامبەر هەموو سەیرکەراندا بڕواتە سەر شانۆکە و لەبەرچاو هەموو ئەو خەڵکەوە دەستدرێژی بکاتە سەر ئەو ژنە!

ئەو کەسانەی کە ئامادەی گرەوکردن دەبن یەکی دە هەزار تمەن دەخەنە سەر مێزەکە ، ئەم پارەیە بۆ ئەو کاتە سەیارەیەکی سفری دەکرد برێکی زۆر زۆر بوو. ڕەحیمعلیش پارەکان کۆ دەکاتەوە و دەیدات بەیەکێك لە پیاوەکانی و لەبەرامبەر چاوی دەیان سەیرکەرەوە خۆی هەڵدەداتە سەر شانۆکە و یەخەی گۆرانیبێژە ژنەکە دەگرێت و دەستدرێژی دەکاتە سەری.

(ئەم گۆرانیبێژە ژنە یەکێك بوو لە قوربانیەکانی ئەو ڕژێمە. ئەم ژنە بۆ یەکەمجار ساڵی ١٩٥٤ لەلایەن پیاوەکەی کە ژەنیاری ڕادیۆ بوو بانگهێشت دەکرێت بۆ بەرنامەی مۆسیقای گوڵەکان و زۆر زوو بوو بە گۆرانیبێژێکی بەناوبانگ.)

پاش شۆڕشی ئیسلامی ڕەحیمعلی لە دادگای ئیسلامی دادگای کرا و دانی نا بە هەموو ئەو تاوان و ڕسوایانەی کە ئەنجامیدا بوون. لە سەروبەندی دادگاییکردنەکەی ڕەحیمعلیشدا دەرکەوت کە ئەم پیاوە بێ بەزەییە لە شوێنی پارکی ئێرەم چەند شێرێکی دڕندەی هەبووە و ئەو کەسانەی کە دەرفێندران ئەگەر بەرگریان بکردایە فڕێ دەدرانە بەردەم شێرەکان!

ژنانی یەکتر سەما دەکەن و هاوسەرەکانی یەکتر دەگرن بە باوەشەوە و دەیانگوشن و ماچیان دەکەن!

ئەم دیمەنانە لەسەرەتادا زۆر جێگەی سەرسوڕمان بوون بۆم. بەڵام کەم کەم تێگەیشتم کە ئەم کار و کردەوانە بەهۆی کاریگەری فەرهەنگی ئەمریکیەوە بوو و ئەم خاتون و پیاوانەش لەبەر ئەوەی کە زۆربەیان لە ئەمریکا خوێندبوویان و لە ڕۆژئاوا گەورەبووبوون خویان گرتبوو بەم مەسەلانەوە و ئاسایی بوو بەلایانەوە.

داڕێژەرەوانی بەڕێزی ئەم کتێبە ناوی کۆمەڵێك کەسیان پێدام و داوایان لێ کردم ئەوەی کە لەبارەیانەوە دەزانم و ئەوەی کە لەبارەوەیان بینیومە و بیستومە (لەسەر شریتەکە) باسی بکەم تاوەکو لەناو کتێبەکەدا بینوسن.

بۆ نمونە یەکێك لەو کەسانە خاتو ئازەر صنیع هاوسەری ئەبوالحسن ئیبتیهاج بوو.

ئەبوالحسن ئیبتیهاج یەکێك بوو لە قوماربازە لێهاتووەکان و هاوڕێی قوماری سەر مێزی محمد ڕەزا و ئەشەرف بوو.

ئیبتیهاج ماوەیەکیش بووە سەفیری گەورەی ئێران لە فەرەنسا و پەیوەندێکی فراوانی لەگەڵ کۆمپانیا بەناوبانگەکانی جیهان هەبوو. ئیبتیهاج گەشەکردن و پێگەیشتنی ئەو ماوەیە بوو کە بەڕێوەبەری دامەزراوەی بەرنامە و بوجە بوو.

ئەبوئەلحەسەن ئیبتیهاج خاوەنی بانك بوو و لەڕووی سەرمایە و پارەشەوە یەکێك بوو لە دە دەوڵەمەندە گەورەکانی وڵات.

ئێستا ئەگەر بمەوێت ئەو دە کەسە دەوڵەمەندە بژمێرم دەبێت بڵێم بریتی بوون لە: حبیب ثابت (ثابت پاسال)، حبیب ئیلقانیان، هژبر یزدانی، علی ڕەزای، لاجوردی، خەسروشاهی، برادەرانی ئەریە، ئەبوالحسن ئیبتیهاج، خیامی و هوشەنگ ئەنصاری. هەڵبەتە بەلایەنی کەمەوە نزیکەی هەزار سەرمایەداری گەورە هەبوون لە ئێراندا کە کاریان پارە پەیداکردن و بەدەستهێنانی سەرمایە بوو لە ئێراندا، بەڵام لە ئەمریکا و ئەورووپا سەرمایەگوزاریان دەکرد و ماڵ و موڵکیان هەبوو. (کەسانی وەکو (نمازی) لە ئەمریکا گەورەترین کۆمپانیای کەشتیوانی جیهانی هەبوو.)

ئەمانە ملیاردلێر بوون و پاش ئەمانەش بەلایەنی کەمەوە نزیکەی دە هەزار کەسێکیش ملیۆنێر بوون.

لەباسەکەم دوور کەوتمەوە باسەکە لەسەر ئەبوالحسن ئیبتیهاج بوو کە محمد ڕەزا لەکاتی گاڵتەپێ کردن و دانیشتنەکاندا بە (ئەبول) بانگی دەکرد.

ئەبوالحسن دوو برای هەبوو کە یەکێکیان (غلامحسین) بوو کە ماوەیەك سەرۆکی فرۆکەوانی ملی ئێران (هما) بوو. پاشا دەیزانی ئەم سێ برایە لەسەر بوجەی دەوڵەت دەستمایە دەبەن. بەڵام گرنگی پێ نەدەدان. هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە ئەشرەف بەشێوەیەکی زۆر سەیر پشتیوانی لە ئەبوالحسن ئیبتیهاج دەکرد.

ئەبوالحسن، هاوڕێی قوماری شەوانەی ئەشرەف بوو، هەمووشەوێکیش خۆی بەدۆڕان دەدا و زیانی دۆڕانەکانی ئەشرەفیشی دەدا.

ئەو ژنەش (ئازەر صنیع) ئەشرەف خان هێنای بۆ ئەبوئەلحسن.

ئەبوئەلحسن ئیبتیهاج ژنی هەبوو و ژنەکەشی لە خزمەکانی بوو ( کچی معز الدولەی نبوی) بوو.

(ئازەر صنیع) خۆشەویستی دکتۆر سعید حیکمت (سەرۆکی پزیشکی قانونی) بوو کاتێك ئەبوئەلحسنی ناسی، خۆی بەست بە ڕیشیەوە!

لەبەر ئەوەی بەسەرهاتی ئەم ژنە سەرنجڕاکێشە هەندێك یارمەتیم بدەن کەمێك زیاتر لەبارەیەوە قسە بکەم.

ئازەر خوشکێکی هەبوو بەناوی مەهین، ئەمانە خەڵکی بابل بوون، هەربۆیە ئەمانە نەك بەناوی خێزانیانەوە بەڵکو بەناوی زادگایانەوە بانگ دەکران. ئازەر بابلی، مەهین بابلی.

ئازەر پیاوی هەبوو و پیاوەکەشی کارمەندی دامەزراوەی بەرنامە و بوجە بوو.

شێوەی ناسینی ئازەر لەگەڵ دکتۆر حکمەت لە زانکۆی تاران دەستیپێکرد. ئازەر لە کۆلێژی ددان بوو و دکتۆر حیکمەتیش مامۆستا بوو. ئەم دکتۆر حکمەتە مرۆڤێکی تایبەت بوو. باوەڕی بە هیچ ئاین و بیروباوەڕێك نەبوو و هاوسەرگیری و گرێبەستی کۆمەڵایەتی و ئاینی بە خورافات دەزانی و ئەو شتانەی بە سەرچاوەی خورافاتی مرۆڤ دەزانی!

هاوسەرگیری بەکارێکی خۆویستانەی پیاوان دەزانی و دەیوت پیاوەکان دەیانەوێت (ژن) وەکو کاڵا و موڵك بکەن بە موڵکی خۆیان!

بیروباوەڕەکانی لە کۆشك و لەناو کەسایەتیە گەورە و نەجیبزادەکاندا لایەنگری هەبوو و کەسانی خۆشگوزەران و هەوەسبازیش لەدەوری کۆدەبوونەوە.

ئەو کارانەی کە دکتۆر دەیکرد بریتی بوو لە ڕاوکردنی ئەو ژن و کچانەی کە بەهۆکاری جۆراوجۆر سەردانیان دەکرد. هەوڵیدەدا ئاشنایەتی لەگەڵ ئەو کچ و ژنانە پەیدا بکات و پاشان دەیناساندن بە هاوڕێکانی دیکەی. هەرچەندە لەڕووی پێگەی کۆمەلایەتی و پۆستی دەوڵەتی و دارایی و مەکانەتەوە لە ئاستێکی بەرزدا نەبوو، بەلام لە زۆربەی میوانی و ئاهەنگەکاندا بانگهێشت دەکرا. هۆکاری بانگهێشتەکەشی دیار بوو، چونکە دەیانزانی کە بەتەنها نایێت و دوو یان سێ و تەنانەت هەندێکجاریش چوار و پێنج خاتونی پلەیەکی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا!

من چەندینجار وتومە بە کچەکەم هەرچۆنێکت کردوە ڕێگە بگرە لەم دکتۆرە با کەم بێت بۆ دەربار.

(بەلام کچەکەم گرنگی پێ نەدەدا و دەیوت ئەگەر محمد ڕەزا بیەوێت ئەو کارانە بکات پێویستی بە دکتۆر حکمت نیە و هەمیشە و هەموو کاتێك و لە هەموو شوێنێك ئەو هەلە بۆی ڕەخساوە و ئەو توانایەی هەیە ئەو کارانە ئەنجام بدات.)

ئازەر ژنێکی زۆر خۆشەویست بوو هەرچەندە خەڵکی ناوەڕۆکی ئەم ژنەیان دەناسی و دەیانزانی ژنێکە چۆن بووە بە ژنی ئیبتیهاج بەلام لەخۆوە هەستی خراپت بۆی نەبوو، بەمانایەکی دیکە لە شێوەدا لەخراپ نەدەچوو.

پیاوەکەی ئازەر صنیع، کارمەندی ژێر دەستی ئیبتیهاج بوو لە دامەزراوەی بەرنامە و بوجە.

ئازەر بابلی صنیع ماوەیەکی زۆر پەیوەندی لەگەڵ ئەبوئەلحسن هەبوو تاوەکو ڕۆژێکیان پیاوەکەی لە ژوری خەوتنی ماڵەوەیاندا لەگەڵ ئەبوالحسن دەیگرێت، و پاشان تەلاقی دەدات.

بەو شێوەیەی کە من لەسەر زمانی (ئەسداللە علم) بیستم ئازەر ڕۆژێکیان ئازەر ئەبوالحسن دەباتەوە بۆ ماڵی خۆیان و لە هەلێکی گونجاودا تەلەفۆن دەکات بۆ پیاوەکەی کە ئەو کات بەیانی دەبێت و لەسەر کارەکەی دەبێت لە دامەزراوەی بەرنامە و بوجە پێی دەڵێت کارێکی زۆرپێویستم پێتە دەمەوێت بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە.

ئازەر زۆر بە ئاگادارانە پیاوەکەی ڕادەکێشێتەوە بۆ ماڵەوە تاوەکو ئەبوئەلحسن لەو بارودۆخە نالەبارەدا ببینێت.

پیاوەکەی ئازەر کە ئەندازیارێکی گەنج بوو (من ئێستا ناوەکەی نازانم) بەبێ دواکەوتن دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و ڕێك دەچێت بەسەر ئازەر و ئەبوئەلحسندا کە خەریکی ڕابواردن و خۆشی بوون.

ئیبتیهاج لەوکاتەدا تووڕە دەبێت لە پیاوەکەی ئازەر و هاوار دەکات بەسەریدا کە بۆچی لەکاتی دەوامدا ئیشەکەت بەجێهێشتوە؟

پیاوەکەی ئازەریش داوای لێ بوردن دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئیشەکەی. بەڵام چەند ڕۆژێك دواتر ئازەر تەڵاق دەدات.

ئازەریش بە هەڕەشە و گوڕەشە و هەر هۆکارێك هەبوو پاش تەواوبوونی ماوەی جیابوونەوەی، خۆی مارە دەبڕێت لە ئەبوئەلحسن.

(علم) دەیوت ئەم پلانە ئازەر و پیاوەکەی پێکەوە دایانڕشتبوو تاوەکو ئیبتیهاج پێوە بکەن و بیخەنە ناو داوەوە.

پاش ئەم ڕسواییە، ئیبتیهاج نادێکی گەورە کە پێکهاتبوو لە سالۆنێکی ئسکیت و مەلەوانگە و بۆلینگ و ساونا لەگەڵ هەموو ئیمکانەتێکدا لە جادەی پەهلەوی (لەسەروی بولینگ عبدە)وە کڕی بۆ ئازەر و کردی بەناویەوە و ئەو شوێنەش جێگەی دەوڵەمەندەکانی تاران و خەڵکانی بیانی دەرەوەی ئێران بوو. پارەیەکی زۆریشی دا بە پیاوە بە غیرەتەکەی ئازەر! تاوەکو دەمی خۆی دابخات و جاڕی نەدات و ئەو ڕسوابوونەی داپۆشێت.

ئازەر و خوشکەکەی مەهین ڕاوچی پیاوە دەوڵەمەندەکان بوون. ئەوان هەرچەندە پیاویان هەبوو بەڵام بەهیچ شێوەیەك دەستیان لەهیچ شتێك نەدەپاراست. جەنابی خاتو ئەشرەف زۆر خۆشی دەهات لەگەڵ ئەم دوو خوشکە و دەیویت بە هەموو ژنەکانی خێزانەکان: (دەبێت لەم دوو خوشکەوە فێربن!)

خاتو ئەشرەف دەیوت چۆن پیاوان جارجار چەند ژنێك دەهێنن و هەندێکیشیان سەرەڕای ئەوەی کە چەند ژنێکیان هەیە کەچی خۆشەویستیش دەکەن، دەبێت

ژنەکانیش ئەو مافەیان هەبێت کە سەرەڕای پیاوەکانیان خۆشەویست و هاوڕێی درۆزنانەیان هەبێت!

بەوشێوەیەی کە پێشتر باسم کرد ئەم ئەبونەلحسنە پێش ئەوەی کە ئازەر صنیع بهێنێت کەسێکی ناردبوو تاوەکو لەگەڵ مندا هاوسەرگیری بکات، بەڵام من ڕەفزم کردەوە.

برای دووەمی ئیبتیهاج بەناوی غلامحسین ماوەیەکی زۆر سەرۆکی شارەوانی تاران و ماوەیەکیش بەڕێوەبەری کرێکارانی فڕۆکەوانی ملی ئێران (هما) بوو.

ئەحمەد علی برای سێەمیشیان ئەویش شەریکە ئیش بوو.

ئەو برایەی کە سەرۆکی فڕۆکەوانی بوو تەندەرێکی دەردەکرد ئەوەی دەخستەڕوو کە دەیەوێت فڕۆکەخانەیەك دروست بکات یان فڕۆکەیەك بکڕێت یان بەشێك دروست بکات بۆ فڕۆکەکان.

برا گەورەکەی کە سەرۆکی بەرنامە و بوجە بوو بوجەی پێویستی دابین دەکرد و برا سێیەمینەکەش ئەحمەد علی کە مقاول بوو وەکو براوەی بەشداربووەکان دەردەچوو و تەندەرەکەی وەردەگرت!

بەم شێوەیە ئەم سێ برایە دەستیان خستبوویە ناو ئیشوکاری حکومەتەوە و پارە و سامانێکی باشان پێکەوەنا. ئەبونەلحسن جنسیەی ئەمریکی هەبوو. ئەبونەلحسن و غلامحسین و ئەحمدعلی لە دانیشتنە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکاندا بە سێ چەکدارەکە بەناوبانگ بوون.

غملاحسین ئیبتیهاج کاتێك سەرۆکی شارەوانی بوو تاوانبار بوو بە گەندەڵی و دزی و ڕاوەڕووت و دادگایش کرا. بەڵام لە دادگادا بە سەلامەتی دەرچوو. لە فڕۆکەوانیەکەشدا دەستیکرد بە دزی کردن و گەندەڵی بەڵام لە هەردووکیاندا بەسەلامەتی دەرچوو. (هەڵبەتە لە پشتیەوە ئەشەرەف هەبوو.)

کچەکەم دەیوت پشتیوانی محمد ڕەزا و ئەشرەف لە برادەرانی ئیبتیهاج پشتیوانێکی سۆزداریە. چونکە ئەم سێ برایە لەکاتی ڕوودانی کودەتای ١٩ ئۆگۆست کە بووە هۆی گەڕانەوەی شا ڕۆڵێکی سەرەکیان بینیوە. ( ڕۆڵێکی شاراوە کە تاوەکو ئێستا هیچکەس لە شێوە و جۆری ئەو یارمەتیە زانیارێکی لەو شێوەیەی نیە)

سالّی ۱۹۷۵ غلامحسین ئیبتیهاج لەکاتی گەڕانەوەی لە نور (لە باکوری ولاّت) کەوتە ناو ڕووباری خروشان هەزار و جەنازەکەشی نەدۆزرایەوە. محمد ڕەزا غەواصەی دەریاییشی نارد بەلاّم بەهیچ شێوەیەك نەیانتوانی مەیتەکەی بدۆزنەوە.

پاش ئەم ڕووداوە، پەیوەندی ئیبتیهاجیەکان لەگەڵ ئەشرەف و دەربار خراپ بوو و دوو براکەی دیکە، کەم کەم خۆیان کۆکردەوە و پێش شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران چوونە دەرەوە. بەداخەوە، ئەبوئەلحسن پێش مردنی کتێبێکی سەرتاپا درۆ و تۆمەتی و زیادەڕەوی بلاّوکردەوە و لە کتێبەکەدا لەگەڵ ئەوەی کە خۆی بە پاك و چاکەکار دەزانێت، محمد ڕەزا تۆمەتبار دەکات بە کوشتنی براکەی و دەڵێت غلامحسین بووە قوربانی ئەو ناکۆکیە داراییانەی کە لەگەڵ خاتو ئەشرەف هەیبوو، بۆیە کوشتیان بۆ ئەوەی دەستبگرن بەسەر سامانەکەیدا.

ئەبوئەلحسین لە کۆتایی تەمەنیدا لە ڕۆیشتن کەوتبوو و هەر دوو پێی فەلەج بووبوو و لە ئەمریکاش لە نزیك ئێمەوە دەژیا. ئەو هەموو سامانە گەورە و پارەیەش کە هەیبوو، پاش مردنی لە سالّی ۱۹۹۸ کەوتە دەست ئازەر بابلی!

پرسیاری کەسانی دیکەت کرد وەکو علی ئەمینی.

لەبارەی علی ئەمینیشەوە دەبێت بڵێم کە پیاوێکی ئەهلی ئیمان و نوێژکەر و بەدین بوو. ڕۆیشتبوو بۆ مەکە و حەجیشی کردبوو.

علی ئەمینی کوڕی خاتو فخرالدولەی قاجار بوو. من لەبارەی پەیوەندی علی ئەمینی لەگەڵ شا شتێکی زۆر نازانم. بەلاّم تەنها لە سەرەتای هاوسەرگیری فەرەح لەگەڵ شادا جاروبار دەهات بۆ سەردانی محمد ڕەزا. کاتێکیش کە بووە سەرۆك وەزیران دەستیکرد بە کۆمەڵێك چاکەسازی. لەسەر شێوەی بەڕێوەبردنی ولاّتیش کێشە هەبوو لەنێوان شا و ئەودا. بەو شێوەیەی کە کچەکەم فەرەح دەیوت: (علی ئەمینی زیاتر لایەنگری دیموکراتەکانی ئەمریکا بوو و بەلاّم لەبەر ئەوەی کە محمد ڕەزا دیموکراتەکانی قبوڵ نەبوو لەسەر ئەو مەسەلەیە ناکۆکیان هەبوو..)

بەکورتی محمد ڕەزا نەیتوانی لەگەڵ علی ئەمینیدا دانیان پێکەوە بکرێت و بگونجێت. بەهەرحاڵ ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە جیابوونەوە ڕوویدات لەنێوان علی ئەمینی و محمد ڕەزا و هەموو کار و چالاکێکی سیاسی لێ قەدەغەکرا.

علی ئەمینی خاوەنی موڵك و ماڵ بوو، لە تارانیش خاوەنی موڵك و ماڵێکی زۆر بوو.

شێوەی جۆری ژیانی سونەتی بوو، بەڵام کورەکەی (ئیرەج)ی نارد بۆ ئەوروپا و ئەمریکا بۆ خوێندن.

لە ماڵێکی کۆنی ئەژدادی لە دەوروبەری مەیدانی بەهارستان دەژیا. برایەکیشی هەبوو کە ئەفسەرێکی پلەبەرزی سوپا بوو. (سەرلەشکر حسن ئەمینی)

کچەکەم (فەرەح) کە زیاتر لە من ئاگاداری پرسە سیاسی و کاروبارەکانی بەڕێوەبردنی وڵات بوو دەیوت: (علی ئەمینی کەسێکە زۆر جێگەی متمانەی ئەمریکیەکانە و ئەمریکیەکان هەمیشە داواکاریەکانی خۆیان لە ڕێگەی علی ئەمینیەوە دەگەیەنن بە محمد ڕەزا!)

ئەمریکیەکان چۆن داواکاریان دەکرد؟

بۆ نمونە کاتێك کە محمد ڕەزا و فەرەح لەسەر بانگهێشتی ڕەسمی جۆن ئێف کەنەدی و ژاکلین ڕۆیشتن بۆ واشنتۆن. هەر لەیەکەم ساتی بینینیان، کەنەدی پرسیبووی لە شا: (بارودۆخی ئەو دۆست و هاوڕێیەمان بەڕێز ئەمینی چۆنە؟)

ئەهلی هونەر و سیاسەت دەزانن کاتێك کە سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە یەکەمین ساتی داخڵبوونی شا بۆ کۆشکی سپی پێش هەموو شتێك هەواڵی علی ئەمینی دەپرسێت. چ مانایەکی هەیە؟

کچەکەم (فەرەح) دەیوت: (کەنەدی هەر بەهاتنە سەر حوکمی پەنجەی خستە سەر ئێران و دەیویست لە ئێران و لەم وڵاتەوە گۆڕانی سیاسی دەستپێبکات. عەلی ئەمینیش یەکێك بوو لە جێگرەکانی شا کە دیاری کرابوو.)

ئامانجی ئەمریکیەکان دروستکردنی حکومەتێکی کۆماری بوو لە ئێران و گۆڕانی جۆری حکومەتەکە بوو لە ئێران و دانانی علی ئەمینی بوو وەکو سەرۆك کۆمار. بەڵام محمد ڕەزا کە پەیوەندێکی زۆر نزیکی لەگەڵ کۆماریخوازەکان هەبوو ئەم خەونەی کەنەدی کرد بە جوتی ناو ئاو و ناکۆکی هەر دوو بەرەی حکومەتی ئەمریکا لەسەر ئێران بووە هۆی ئەوەی کە پلانەکەی جۆن ئێف کەنەدی لە قسە زیاتر هیچ نەبێت.

هەڵبەتە دواتر محمد ڕەزا ناچار بوو بە فشاری ئەمریکا ملکەچ بکات و کۆمەڵێك بەرنامەی چاکەسازی دەستپێبکات وەکو مەسەلەی گۆڕانی زەویداری لە ئێران و چاکەسازی سیاسی و کۆمەڵایەتی.

لە ٢٦ جنێوەری ١٩٦٢ محمد ڕەزا بنەمای شەشگانەی شۆڕشی سپی شا و خەڵکی دەرکرد.

ئەم بنەمایە ئەو بەرنامانە بوو کە لەلایەن لێکۆڵەرەوان و کۆمەڵناسان و سیاسەتمەدارانی ئەمریکی ئاگادار لە بارودۆخی کاروباری ئێران فەراهەم کرابوو.

محمد ڕەزا، هەمیشە ناڕازی بوو لە دیموکراتەکانی ئەمریکا و دەیوت: (فشاری ئەوانە بۆ ئەنجامدانی چاکەسازی زەوی بووە هۆی ئەوەی من هەزاران هیکتار زەوی گرنگ و سەدان گوند و شوێنی بەنرخ کە باوکم (خوالێخۆش بوو ڕەزاشا) بە سەختی و نارەحەتی بەدەستیهێنا بوو لەدەستیان بدەم و تەسلیمی کۆمەڵێك ژێر دەستەی نەزانیان بکەم!)[1]

محمد ڕەزا زۆر ڕقی لە دوو کەس بوو. یەکەمیان دکتۆر محمد مصدق و دووەمیان علی ئەمینی.

لە دکتۆر محمد مصدق بەچەشنێك بێزار بوو کە هیچکەس جورئەتی ئەوەی نەبوو لەلای محمد ڕەزادا ناوی بهێنێت. تەنانەت کەسێك هەبوو کە ئەندامی دەوڵەتەکەی بوو بەناوی مصدق هەر لەبەر ناوەکەی هیچکاتێك جورئەتی ئەوەی نەکرد لە مەراسیمی سڵاوی دەربارداا ئامادەبێت!

---

[1] – ڕەزا شا تاوەکو پێش ئەوەی بگاتە دەسەڵات هیچشتێکی نەبوو. بەڵام کاتێك گەیشتە دەسەڵات و بەرەبەرە جێگە پێی خۆی قایم کرد حەزی لەوەبوو زەوی و زارێکی زۆری هەبوو بۆیە حەزی لە هەرشوێنێك بکردایە دەیکردە موڵکی شەخسی خۆی. لەبارەی ئەم بابەتەوە دەتوانیت سەیری یاداشتەکانی (ڕەحیم هیرداد) سەرۆکی نوسینگەی ڕەزاشا بکەیت. کە چۆن بووە بە خاوەنی ئەو هەموو ئاو و زەویانە. پاش مردنی ڕەزاشا هەموو زەویە گرنگانە بەجێمان بۆ کوڕەکەی و لەسەردەمی محمد ڕەزاشدا بەشێك هەبوو لە کۆشك بەناوی (موڵکەکانی سەڵتەنەتی) کە ئەو بەشە گەورەتربوو لە وەزارەتێك تەنها بۆ سەرپەرشتی موڵکوماڵەکانی بنەماڵەی شا.

من چەندینجار بینیومە کە محمد ڕەزا قسەی زۆر ڕەق و ناشیرینی بە علی ئەمینی وتوە.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٧ کە کاتێك بارودۆخی سیاسی وڵات بەرەو قەیران قوڵ بوویەوە.

دووبارە سەروچاوی علی ئەمینی لە دەربار پەیدابوویەوە.

علی ئەمینی کە برۆیەکی پڕ و لوتێکی هەڵۆیی و چاوێکی گەورەی هەبوو لەسەر مێزی نان خواردن لەبەردەم محمد ڕەزا، فەرەح، ئەشەرەف (و هەندێك کاتیش من) دادەنیشت و وڕ دەبوو بە محمد ڕەزا دا.

شا داوای ڕاوێژی لێ دەکرد و دەیویست ڕێگە چارەیەکی بۆ بدۆزێتەوە بۆ دەربازبوون لەو قەیرانەی کە کەوتوەتە ناویەوە.

علی ئەمینی بێدەنگ دادەنیشت و گوێی لە قسەکانی شا دەگرت و لە کۆتاییدا دەیوت دەبێت (بیر بکەمەوە!)

پاش ئەوەی کە ئەمینی دەڕۆیشت محمد ڕەزا دەیوت: (ئەم دایك... خزمەتکاری ئەمریکیەکانە و ئێستا دەڕوات بەدرێژی ئەم دانیشتن و قسە و باسانەی ئێمە دەگەیەنێتە بەرپرسە ئەمریکیەکان!

من جارێکیان جورئەتم کرد و وتم بە زاواکەم: (جەنابی حەزرەت کاتێك کە دەزانن ئەمینی ئەم پرسانە دەگەیەنێتە ئەمریکیەکان بۆچی ڕاوێژی پێ دەکەن!)

محمد ڕەزا دەیوت: (هەرشتێك کە دەمەوێت ئەمریکیەکان بیزانن دەیڵێم بەم پیاوە بچوکە دایك... ئەویش دەیگەیەنێتە گوێی ئەمریکیەکان!)

محمد ڕەزا لەسەر بنەمای زانیاری ساواك دەیوت: (علی ئەمینی لەکاتی خوێندنیدا لە ئەمریکا بووەتە کارمەندی سی-ئای-ئەی و تەنانەت ماوەیەکیش لە تورکیا، بۆ سی ئای ئەی کاری کردوە!)

هەڵبەتە علی ئەمینی جنسیەی ئەمریکی هەبوو.

لە ناو ئێرانیەکاندا ژمارەیەکی زۆر هەبوون کە چەند ڕەگەزنامەیەکیان هەبوو ئینگلیزی یان ئەمریکی یان هەندێك لە وڵاتەکانی دیکە.

محمد ڕەزا کە لە هەموومان زیاتر زانیاری هەبوو دەیوت: (ئەمریکا و بەریتانیا لەگەڵ ئەوەی کە دۆستی منن و پشتیوانی لە دەوڵەتەکەی من دەکەن بەڵام لەدوامەوە کەسێکی دیکەش پەروەردە دەکەن!

ئەو خوێندکارە ئێرانیانەی کە دەڕۆن بۆ ئەمریکا و ئەورووپا سەرنجیان ڕادەکێشن و سەرمایەگوزاریان لەسەر دەکەن و بۆ ڕۆژی پێویست وەریان دەگرن و هەرکاتێك پێویستیان بوون لە کەلانەکەیاندا دەریان دەهێنن!)

محمد ڕەزا بەڕادەیەکی تەواو توشی نەخۆشی بەدبینی و گومان بووبوو لە هەموو کەس. لە یەکەمین ڕۆژەکانی دەستپێکردنی شۆڕشەوە کە هەموو ڕۆژێك ناوی ژمارەیەك لە ڕۆحانی و سیاسەتمەدار دەکەوتە سەر زمان و ڕۆژنامەکان و ناو و وێنەی کەسانێکیان بلاودەکردەوە کە ئێمە ئەو کەسانەمان نەدەناسی محمد ڕەزا یەك بەیەکی ئەوانەی تۆمەتبار دەکرد بەوەی کە سیخوڕن و دەیوت هەموو ئەمانە خزمەتکاری ئەمریکان. پێشتر بەڕادەیەکی کەم بەدبینی و خراپ تێگەیشتن لەلای محمد ڕەزا هەبوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٦ بە دواوە هەموو کەسی بە سیخوڕی ئەمریکا و بەریتانیا و بەکرێگیراوی کۆمپیانیا نەوتیەکانی بێگانە دەزانی.

لە ساڵی ١٩٧٦، محمد ڕەزا بۆ زیادکردنی نرخی نەوت و بەدەستهێنانی مافی ئێران لە کۆمپانیا نەوتیەکان دەستیکرد بە فشار دروستکردن لەسەر کۆمپانیا نەوتیەکان. دواتر کاتێك کە تێکچوون دەستیپێکرد محمد ڕەزا دەیوت ئەم تاوانە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کۆمپانیا تالانکارانە!

محمد ڕەزا، علی ئەمینیشی بە (علی نەوتی) بانگ دەکرد و دەیوت علی نەوتیش بەکرێگیراوی کۆمپانیاکانە!

مەلا و ئاخوندەکانی بە (کۆنپارێزی ڕەش)، ناو دەبرد. خەڵکی نەیدەزانی مەبەست لە (کۆنپارێزی ڕەش) چیە کە محمد ڕەزا لە مەلا و ئاخوندەکانی نابوو.

من تەنانەت لەناو کتێبی لێکۆڵەرەوە پلە بەرزەکانیشدا نەمبینوە هیچکەس تێگەیشتبێت لە مەبەستی محمد ڕەزا. مەسەلەی کۆنپارێز دیارە. بەڵام لکانی ئەم وشەیە بە ڕەشەوە چ مانایەکی هەیە؟

محمد ڕەزا لەسەرەتاوە دەیوت: (کۆنپارێزی نەوتی ڕەش!)

دەیوت ئەمانە هەموو خزمەتکاری بەریتانیا و کۆمپانیا نەوتیەکانیان و کۆمپانیا ئەمریکیەکانن!

پاشان کاتێك کە تودەییەکان وەکو هۆکارێکی ناوخۆی سۆڤیەتیەکان داوایان کرد کە ئیمتیازی نەوتی باکور بدرێت بە سۆڤیەتەکان محمد ڕەزا ئەوانی لەگەڵ مەلاکان کردە ناو قاپێکەوە و ناوی ئەوانیشی نا (کۆنپارێزە سور و ڕەشەکان!) و مەبەستی لەم قەسەیە ئەوەبوو کە ئەم کۆنپارێزانە دەیانەوێت ئێران بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی ئیستعمار!

علی ئەمینی مەلایەکی خاوەن ڕێچکەبوو و جارێکیان گفتوگۆیەکی جدی و توند لە نێوان ئەو و محمد ڕەزادا لەسەر مەسەلەی رۆحانیەت دروستبوو.

دەبێت بڵێم، پاش شۆڕشی خەڵکی تەبریز، محمد ڕەزا توشی لەبیرچوونەوە بوو و لەخۆیەوە قسەی دژ بەیەکی دەکرد و دەیوت: (ئەمانە هەموو لەلای سنوری (سۆڤیەتەوە) هاتوون و هەموویان تودەیین!)

لەو ماوەیە هەموو ڕۆژێك محمد ڕەزا فەرمانی دەدا کە ئەمینی بانگ بکەن.

ئەمینی لەلایەن محمد ڕەزاوە دانرابوو وەکو بەرپرسی یەکەم بۆ ئەوەی گفتوگۆ بکات لەگەڵ مەلاکانی قومدا. ئەویش بەردەوام دەڕۆیشت بۆ قوم و ڕاپۆرتی سەردانەکانی پێشکەش بە محمد ڕەزا دەکرد. زۆربەی پەیوەندیەکانیشی لەگەڵ سەید کازم شریعتمداری بوو.

من خۆم لە بواری شەرعیەوە پەیوەستبووم بە یەکێك لە ئایتوڵڵەکانی دانیشتوی تاران بەناوی (ئایت الله خوانساری) بەڵام محمد ڕەزا خۆی پەیوەندێکی نزیکی لەگەڵ سید کازم شریعتمداری هەبوو و یارمەتی دارای باشی دەکرد. هەرچەندە هیچ زانیارێکی لەو شێوەیەم نەبوو لەبارەی پەیوەندی نێوان شریعتمداری و شا، بەڵام جارێکیان لەپاڵ کچەکەم وتم بە محمد ڕەزا: (جەنابی حەزرەت باشتر ئەوەیە فشاری خۆت بخەیتە سەر بێدەنگ کردنی ئەو کەسایەتیانەی کە ناسراون و کەسی یەکەمن. شریعتمداری دوعاکەری جەنابتە!)

ئەمینی لەگەڵ هەندێك لە مەلاکان وەکو شریعتمداری پەیوەندێکی کۆنی هەبوو. شریعتمداری لەکاتی لەدایکبوونی (ڕەزا گیان) پەیامێکی پیرۆزبای ناردبوو.

هەندێکجاریش لە قومەوە پەیوەندی تەلەفۆنی دەگرت و دوعای بۆ جەنابی حەزرەت و نەوەکانم دەکرد.

ئەو بەهیچ شێوەیەك دژە سەڵتەنەتی نەبوو. شەریعەتمداری نمونەی ڕۆحانێکی تازەگەر بوو. توانیبووی لەناو پێستی کۆنپارێزی ڕۆحانیە سونەتگەرا دەمارگیرەکاندا بێتە دەرەوە و ڕووبکاتە شێوەی دنیای پێشکەوتوو.

منداڵەکانی ناردبوو بۆ دەرەوەی وڵات بۆ خوێندن و زۆر خۆشحاڵ بوو بەو هەموو پێشکەوتنانەی کە لەسەرتاسەری وڵاتدا ئەنجام دەدران بەتایبەتی ئەو کارە باشانەی کە دەکران.

ئەم کارە تەنها تایبەت نەبوو بە شەریعەتمداریەوە. کۆمەڵێك ڕۆحانی ناوداری دیکەش هەبوون لە قومدا کە لایەنگری محمد ڕەزا بوون[1].

کاتێك کە (ڕەزا گیان) لەدایکبوو ژمارەیەك لەو مەلایانە لە ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی ئێراندا پەیامی پیرۆزباییان نارد.

محمد ڕەزاش لەبەرامبەر ئەو سوپاسکردنەیاندا هاوکاری ماددی کردن. بە فەرمانی محمد ڕەزا بەڕێوەبەرایەتی ئەوقاف بۆ هەریەکە لەو مەلایانە مەعاشێکی مانگانەی بۆ بڕیبوونەوە.

کۆمەڵێکیشیان لە سوپادا دامەزرابوون و وەکو (قازی سوپا)، خزمەتیان دەکرد.

لەم کۆتاییانەدا (سوپای دین)یش دامەزرابوو و زۆرێك لە ڕۆحانیەکان بووبوون بە ئەندامی ئەو سوپایەش.

علی ئەمینی زۆر هەوڵیدا تاوەکو ڕۆحانیە جێگیرەکانی ئێران لە ئیمام خومینی جیا بکاتەوە و بۆ ئەوەی ئیمام خومینی لە دەرەوەی وڵات بەتەنها بمێنێتەوە لە دژایەتیکردنەکانی بەرامبەر محمد ڕەزا.

---

[1] – ئەم جۆرە مەلا و ئاخوندانەی کە بووبوونە جێگەی گرنگی کۆشك و محمد ڕەزا، ئیمام خومینی پێی دەوتن مەلاکانی سوڵتان، یان دوعاکار و ئامۆژگاریکەرەکانی کۆشك. دەیوت ئەمانە لەسەردەمی شا لەلایەن ساواکەوە پارە و موچەی باشیان وەردەگرت و پاش شۆڕشیش دەستیانکرد بە نانەوەی دووبەرەکی و ئاژاوە. بەم جۆرە مەلایانەی دەوت ئیسلامی ئەمریکی

کۆمەڵێك لە ڕۆحانیە بەناوبانگەکانی وەکو شریعتمداری هەرچەندە بە نهێنی وتبووی بە علی ئەمینی کە ئیمام خومینی کەسێکی سەرکەشە و پشتیوانی لێ ناکەن! بەلاّم بۆ پاراستنی متمانی خەڵك خۆی پشتیوانی لە ئیمام خمینی دەکرد! و ئێمەش مانای ئەم دوو ڕوویيە تێنەدەگەیشتین لە کرداری ئەمانەدا!

ئێستا بۆ یەکەمجار باسی دەکەم کە سید کازم شریعتمداری کە مەرجعی بەرزی بەهێزی شیعەکان بوو لە ترۆپکی قەیران و کێشەدا لەگەڵ علی ئەمینی و بە شاراوەی لە قومەوە هات بۆ تاران و لە کۆشکی نیاوەران چاوی کەوت بە محمد ڕەزا.

محمد ڕەزا لەم چاوپێکەوتنەدا داوای کردبوو لە شریعتمداری تاوەکو بەهەرشێوەیەك بووە بتوانێت ئیمام خومینی بێدەنگ بکات یان بەهەرشێوەیەك بووە ببێتە دژە تەوەری و بەرامبەری بوەستێت!

شریعتمداریش بەبێ شەرم هەردوو خواستەکەی محمد ڕەزای ڕەفز کردبوويەوە و وتبووی ناتوانێت ئەم کارە ئەنجام بدات، چونکە یەکەم ئیمام خومینی تەنها بەگوێی من ناکات و دووەمیش ئەگەر بمەوێت دژایەتی لەگەڵ خومینیدا بکەم ئەوا وەکو خۆکوژێکی سیاسی وایە!

پاش ئەم چاوپێکەوتنە، محمد ڕەزا بە نزیکەکانی خۆی و بەتایبەتی بە فەرەحی وتبوو هیچ مەلایەکی بەهێز شك نابەم کە بتوانێت بەرامبەر ئیمام خومینی بوەستێت. هاتوچۆکانی شریعتمداری بۆ کۆشك هەرچەندە بەوپەڕی شاراوەی ئەنجامدەدران بەلاّم دەرئەنجام دەرکەوتن و ڕادیۆی لەندەن (بی.بی.سی) زانیاری لەبارەی ڕێکەوتنی محمد ڕەزا و شریعتمداریەوە بلاّوکردەوە.

چەند ڕۆژێك دواتر زانیاری گەیشت کە بەرپرسانی دەوڵەتی سەربازی هێرشیان کردوەتە سەر ماڵی شریعتمداری لە قوم و کۆمەڵێك کەسیان لە حەوشەکەیدا گرتوە و ئازاریان داوە.

محمد ڕەزا زۆر بێتاقەت بوو لە بیستنی ئەم هەواڵە و داوای ڕوونکردنەوەی لە ژەنراڵ ناصر مقدم (سەرۆکی ساواك) کرد.

مقدمیش ڕوونی کردەوە کە ئەم هێرشە لەسەر داواکاری مهندس حسن شریعتمداری کوڕی گەورەی ئایت الله ئەنجامدراوە!

گوایه پاش بڵاوبوونەوەی هەواڵی چاوپێکەوتنی محمد ڕەزا لەگەڵ شریعتمداری لە ڕادیـۆی لەنـدەن، پڕوپاگەنـدە لـە دژی شـریعتمداری بڵاوبووەتـەوە و هـەموو کـەس پرسیاری ئەوەیان کردوە کە ئەم پەیوەندیە دروستبووە؟

بڵابوونەوەی ئەم پڕوپاگەندانە بەردەوام، شریعتمداریان خستبویە ناو چوارچێوەی هاوکاریەوە لەگەڵ محمد ڕەزا و حکومەتەکەی.

مهندس حسن شریعتمداری، کوڕی گەورەی ئایت الله، کە ڕاوێـژکاری سەرەکیشی بوو داوا لە ساواك دەکات کە لـە هـەنگاوێکی نمایشیدا هێرش بکەنـە سـەر حەوشـەی ماڵی ئایت الله و ژمارەیەك لە دەستوپەیوەندەکەی دارکاری بکەن!

دواتر شریعتمداری وتبووی بە فەرمانـدەی هێزەکانی حکومـەتی سـەربازی لـە قوم: (من وتم دارکاری بکەن نەك بەو شێوەیە!)

ڕوونکردنەوەی بابەتەکە بەشێوەیەکی فراوان ژەنراڵ ناصر مقدم گەیاندی بە محمد ڕەزا و دەبێـت ئـەوە بڵـێم لـەو ڕۆژە تـاڵ و ناخۆشـانەدا بـۆ یەکـەمینجار دوای چـەند مانگێك لە بێتاقەتی و بێزاری، پێکەنین بەتەواوی هـەموو دەمووچاوی شـای داپۆشـی. محمـد ڕەزا لـە ڕۆژەکـانی دواتـریش چەندجارێك ئـەم قسـەیەی ئایـت الله شـریعتمداری دەهێنایەوە بیر و لەناخی دڵیەوە پێدەکەنی!

ڕۆحانیـەتی شیعە هـەر لەسـەردەمی هاتنـە سـەر حـوکمی سـەفەویەکانەوە بەردەوام تـاوەکو ئـەو کاتـە پشتیوان و هاوکـاری سـەڵتەنەت بوون. دەرگیری و کێشە لـەنێوان حکومەت و ڕۆحانیەت بۆ یەکەمیجار لە ساڵی ١٩٦٣ ڕوویدا.

هەمووکـەس دەزانێت کـە جـەنابی حـەزرەت لـە ٢٦ جنێـوەری سـاڵی ١٩٦٢ بنـەمای شەشگانەی شۆڕی سپی ئێرانی دەرکرد. خاڵی سـەرەکی ئەم بەیاننامـە و بنـەمای ئەم چاکەسـازیە شۆڕشـییە! بـریتی بـوو لـە چاکەسـازی زەوی و زار و دامـاڵینی بـوو لـە دەستی خاوەن دەسەڵات و موڵکدارە گەورەکان.

محمـد ڕەزا، پـێش ئـەوەش هـەموو زەویـە میراتیـەکانی خـۆی دابەشـکرد بەسـەر جوتیارەکاندا.

خاوەن زەویدارە گەورەکانیش کە نەیاندەتوانی زەویەکانی خۆیان دابەشبکەن بەسەر جوتیار و ستەملێکراوەکاندا دەستیانکرد بە هاندانی مەلا ۆ ڕۆحانیەکان لە دژی محمد ڕەزا و توانیان ئەو چینە بکەنە دوژمنی محمد ڕەزا.

زۆرێك لە رۆحانیەکان خۆیان لەناو چوارچێوەی موڵکدارە گەورەکان بوون کۆمەڵێکیشیان کە زەوی و زاریان نەبوو لەلایەن موڵکدارەکانەوە پشتیوانیان لێ دەکرا و زەویدارە گەورەکان پارەیەکی باشیان پێ دەدان و پشتیوانێکی باشیان دەکردن!

رۆحانیەکانیش لەبەرامبەر دەرکردنی ئەو بەیاننامە و بنەما چاکەسازیە هەستان و بەشێوەیەکی توند ڕووبەڕووی بوونەوە و دەستیان کرد بەهاندانی خەڵکی بۆ دژی ڕژێمەکە و دەستیان کرد بە یاخیگەری!

ئەوان مافی دەنگدانی ژنانیان بە پێچەوانەی یاسای ئیسلام ناوبرد و بەشداری کردن و پشکدارکردنی کرێکارانیان لە قازانجی کارگەکان بە ناڕەوا دەزانی و دژی بڵاوکردنەوەی زانست بوون بۆ گوندەکان و بەتوندترین شێوە بەرامبەری وەستان! ئەم جیاوازییانە درێژەیان کێشا و هەندێك لە ڕۆحانیە توندڕەوەکانی وەکو ئیمام خومینی بەئاشکرا لەسەر میمبەر و لەبەرچاوی خەڵکی گشتیەوە بانگەشەی شۆڕشی لەدژی حکومەتی محمد ڕەزا دەکرد!

شاهنشا بەهۆی ئەو پەیوەندی و بیروباوەڕەی کە بەرامبەر بە مەزهەبی شیعە هەیبوو هەوڵیدەدا زۆر توند لەگەڵ مەلاکاندا نەجوڵێتەوە و هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەوەندەی دیکە گەشە بکەن و فراوان ببن، هەر لەبەر ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٦٣ لە کاتی ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی ویلایەتەکان، ویلایەتی ئیمام خومینی خەڵکی هاندا بۆ شۆڕش و سەرئەنجام توانی ئاژاوەی ٥ جنێوەر دروست بکات!

لەو سەردەمەدا، کۆمەڵێك وەکو (قازی سەربان) لە سوپادا خزمەتیان دەکرد و دوعاکەری گیانی جەنابی حەزرەتی هەمایۆن بوون!

تەنانەت کاتێك کە شا هەستا بە پێکهێنانی (سوپای دینی) کۆمەڵێك لەو رۆحانیانە هاتنە ناو ڕیزی ئەو سوپایەوە.

تەنانەت شا هاوکاریێکی زۆری پیاوە دینیەکانی نەجەف و کەسایەتیە ناسراوە ڕۆحانیەکانی کرد.

ئێمە لە هەر سەفەرێکدا کە دەچووین بۆ قوم، مەشهەد و یان تەنانەت کەربەلا و نەجەف لەلایەن پیاوە ئاینیە پلە بەرزەکانەوە پێشوازی گەرممان لیٚ دەکرا.

لە ترۆپکی شۆڕشی ساڵی ۱۹۷۸ وابلاوبوو کە پیاوە ڕۆحانیەکان و پیاوە دینیەکان دژی خێزانی پەهلەوی و حکومەتی سەڵتەنەتین، کچەکەم فەرەح، کە لەبواری کاروباری شەرعیەوە پەیوەست بوو بە ئایت الله العظمی خویی، ڕۆیشت بۆ بینینی لە نەجەف. ئایت الله زۆر بەگەرمی پێشوازی لیٚ کرد و بۆ مانەوەی سەڵتەنەتی ئێران و سەلامەتی خێزانی پەهلەویش دوعای کرد!

کۆمەڵێك لە ڕۆحانیە بەناوبانگەکانی وەکو ئایت الله ڕۆحانی تاوەکو کۆتایی ڕۆژی ژیانی خۆی لە پاریس پشتیوانی لە حکومەتی پاشایەتی بە تایبەتی محمد ڕەزا کرد و هەوڵیدا سەڵتەنەت بگەڕێنێتەوە بۆ ئێران.


ژەنراڵ ئاریانا


غلام علی ئویسی


عبدالله ریازی و ژەنراڵ قەرەباغی


نعمت الله نصیری



ڕۆستەم خان بەختیار

سەرۆکی نوسینگەی تایبەتی شاژنە سورەیا



فزل الله زاهیدی



عبدالعزیم ولیان



پەروێز ثباتی

# ژیانی پاش دەرچوون لە ئێران....

ترۆپکی ڕوداوەکان کە لە کۆتاییدا بووە هۆی دەرچوونمان لە زێدی باوباپیرمان، لە دیسەمبەری ( ۱۹۷۷) وە دەرچوون دەستیپێکرد.

لە حەوتی جنێوری ۱۹۷۷ بابەتێك لە ڕۆژنامەی ئیتلاعات بلاوکرایەوە کە پڕ بوو لە ڕەخنە و قسەی ناشیرین بە ئایت الله خومینی.

هەمووکەس دەزانێت بلاوکردنەوەی ئەم بابەتە وەکو پریسکێك لە ئاگر بوو کە کەوتە ناو عەمبارێك باروتەوە و ولاتی ئاگر تێبەردا.

داوای یارمەتی دەکەم وەکو ئاگادارترین کەس و بۆ یەکەمینجار، ڕاستێك لەبارەی ئەم بابەت و نامەوە بلێم.

ئەم (شوم نامە) هەویدا (سەرۆك وەزیرانی لابراو) و داروودەستەکەی ئامادەیان کردبوو و هەموو ئەو داستانانەی کە تاوەکو ئێستا لەبارەی فەرمانی محمد ڕەزا لەبارەی ئامادەکردنی ئەو بابەتەوە دەوترێت درۆ و هەلبەستراوە.

چ محمد ڕەزا کە لە ساڵی ۱۹٦۳ ڕووبەڕووی ڕۆحانیەکان و پیاوە ئاینیەکان بوویەوە و چ ڕۆحانیەکانیش، کە لە هێرشی ساواك و گاردی شاهنشاهی زیانیان پێگەیشتبوو، هەولیاندەدا نەچنە ناو حەریمی یەکترەوە.

ئایت الله خومینی لە نەجەف خەریکی کاری ئاینی و مەزهەبی خۆی بوو بەتایبەتی پاش باشتربوونی بارودۆخی سیاسی نێوان عێراق و ئێران، بەتایبەتی پاش ڕێکەوتننامەی ئاشتی نێوان شا و سەدام لە جەزائیر بێدەنگی هەلبژارد و یان باشترە بلێم دەولەتی عێراق ڕێگەی پێ نەدەدا چالاکی سیاسی ئەنجام بدات.

لە زستانی ساڵی ١٩٧٧، کوڕە گەورەکەی ئایت الله خومینی لە نەجەف کۆچی دوایی کرد.

بەو شێوەیەی عادەتە لەلای مسوڵمانەکان شوێنکەوتوەکانی ئیمام پرسەیان دانا بۆ کوڕەکەی لە نەجەف و قوم و مەشهەد.

هەندێك لە قسەکەرەکانی ئەم پرسانە سەرەڕای دەربڕینی سەرەخۆشی و هاودەردی خۆیان باسێکی مێژووی هەڵهاتن و دوورکەوتنەوەی ئایت الله خومینیان کرد و خوازیاری گەڕانەوەی بوون بۆ ئێران.

بێ توانای کارمەندانی ئاسایشی (ساواك) و پۆلیس لە قوم بووە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵێك لە بەکرێگیراوانی ساواك و چەکدار هێرش بکەنە سەر پرسەی کوڕەکەی ئایت الله خومینی و پرسەکەی دابخەن.

ئەم ڕووداوە، بووە هۆی سەرهەڵدانی تێکچوونێکی بچوك لە قوم کە ئەگەر حکومەت ئەو ئاژاوەیەی زۆر گەورە نەگرتایە بە زووی لەبیر دەکرا و هیچ کاردانەوەیەکی لە ناوچەکانی دیکەی وڵاتدا لێ نەدەکەوتەوە. بەڵا نەزانی و بێ توانایی کارمەندانی ئاسایش و قۆزتنەوەی ئەو هەلە لەلایەن گروپەکەی هەویداوە بۆ ئەوەی بارودۆخەکە بەرەو ئاڵۆز بوون بەرن سەرئەنجام پاراستنی بارودۆخەکە لەدەستچوو. هەویدا لەکاتێکدا کە پێش ئەم ڕووداوە پاش ١٣ ساڵ سەرۆك وەزیری بەهۆی بێ توانای و دروستکردنی قەیرانی ئابوریەوە لە سەرۆك وەزیرانی لاچو بوو و لەبری ئەو جمشید ئاموزگار چووبوویە شوێنەکەی، ئەم مەسەلەیەی بە هەل زانی بۆ لێدانی دەوڵەتەکەی ئاموزگار و هەوڵیدا ئاڵۆزی و پەشێوی بنێتەوە بۆ ئەوەی ئەوە نیشانبدات کە بەلاچونی ئەو وڵات بەرەو ئاڵۆزی و پەشێوی دەڕوات.

محمد ڕەزا تاوەکو دواهەمین ساتەکانی ژیانی هەرگیز هەویدای نەبەخشی و هەمیشە بە نەفرەتی دەکرد و بە ئاشکراك هەویدای بە هۆکاری لەناوچوونی وڵات و کەوتنی پەهلەوی دەزانی.

هەویدا گروپێك لە ڕۆژنامەنوسی گەندەڵ و بێ ئەخلاقی لەدەوری خۆی کۆکردبوویەوە و وەکو کوروش لاشای، پەروێز لوشانی، پەروێز نیکوخوا، سیبروس ئاموزگار، حسین سرفراز، جعفەریان و هتد..

ئەو بابەت و نامەیە، لە بەرژەوەندی هەویدا، لە نوسینگەی چاپەمەنی وەزارەتی دەربار، ئامادە دەکرێت و بۆ بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەکان لەلایەن داریوش هەمایۆنەوە دەدرێت بە ڕۆژنامەی ئیتلاعات[1].

پێشەکی بابەتەکە خودی هەویدا دەینوسێت و پەروێز نیکوخواهش کۆمەڵێک بابەتی بۆ زیاد دەکات و دەیدات بە ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی وەکو کەیهان و ئیتلاعات.

لە ڕۆژنامەی کەیهان چەند ڕۆژنامەنوسێکی بەئاگا هەبوون بە بینینی بابەتەکە، مەترسی بڵاوبوونەوەی بابەتەکە ڕادەگەیەنن بە دکتۆر مصباح زادە و مصباح زادەش ئامادە نیە بڵاوی بکاتەوە.

داریوش هەمایۆن هەرچەندە وەزیری ئیتلاعات و گەشتیاری بوو بەڵام دەسەڵاتی نەبوو بەسەر کەسانی وەکو مصباح زادە. چونکە یەکەم لەبەر ئەوەی کە زۆربەی پشکی ڕۆژنامەی کەیهان پەیوەست بوو بە محمد ڕەزاوە و دووەمیش مصباح زادە بۆچونێکی باشی نەبوو لەبارەی هەویدا و دەوروبەرەکەیەوە و بەهیچ شێوەیەک نەدەچووە ژێر باری فەرمانیانەوە. بەڵام ڕۆژنامەی ئیتلاعات پاش مردنی (عباس مسعودی) کەوتە دەست کوڕەکەی فەرهاد، کە کەسێکی بەرژەوەندی پەرەست و پێگەخواز و تاڕادەیەک خۆبەرە پێش بوو، فەرهاد هەوڵیدەدا بەهەرشێوەیەک بووە

---

[1] – بەو شێوەیەی کە لە ناوەڕۆکی ئەم کتێبەی یاداشتەکانی خاتو فەریدە دیبادا دیارە زۆر زیرەکانە هەوڵیداوە هەموو تاوان و ئاژاوە و کێشەکان بخاتە ئەستۆی کەسانی دیکەی وەکو هەویدا و محمد ڕەزا بێ بەری بکات لەو هەموو گرفت و کێشانەی کە دروستبوون، لەبارەی ئەو نامەیەوە دەبێت ئەوە بوترێت کە ئەو نامەیە بە فەرمانی ڕاستەوخۆی شا بڵاوکرایەوە.

(شجاع الدین شفا) لە بیرەوەریەکانی خۆیدا دەنوسێت: (پاش کۆچی دوایی کوڕە گەورەکەی ئیمام لە نەجەف و دانانی تەعزیە لە ناوچەکانی ئێران، کاتێک محمد ڕەزا بەمە دەزانێت تووڕە دەبێت و داوا لە هەویدا دەکات کە بابەتێک یان نامەیەک ئامادە بکات لەدژی ئیمام بۆ ئەوەی لە ڕاگەیاندنەکاندا بڵاوبکرێتەوە، بۆ ئەوە ڕێگە بگرێت لە ڕووداوی هاوشێوەی ساڵی ١٩٦٣.

سەرەتا بڕیار نەبوو ئیشەکە بە بڵاوکردنەوەی ئەم بابەتە تەواو ببێت.

بەڵام کاتێک کە کاردانەوەی توندی خەڵکیان بینی ئیدی بڕیاردرا بابەتەکانی دیکە ڕاگرن و بڵاویان نەکەنەوە.

خۆی نزیك بكاتەوە لە سەرانی بەرپرس و دەسەلاتدار. هەر لەبەرئەوە بوو، سەرەڕای ئەوەی كە ڕاوێژكارەكانی لە ڕۆژنامەی ئیتلاعات هۆشداریان پێدابوو سەبارەت بە بلاوكردنەوەی ئەو بابەتە، بەلام فەرهاد مسعودی نامەكەی لەدژی ئایت الله خومینی بلاوكردەوە.

بلاوبوونەوەی ئەم نامەیە بووە هۆی سەرهەلدانی خۆپیشاندانی ڕۆحانیەكان و شوێنكەوتوەكانی ئیمام خومینی لە قوم و مەشهەد و تەبریز، و كەم كەمیش لە ناوچەكانی دیكەی ئێران ئاگری نا بە گیانی مەملەكەت و حكومەتی سەلتەنەتیەوە.

من ئێستا ناوەرۆكی نامەكەم لەبیر نیە، بەلام ئەوە دەزانم كە لەو نامەیەدا سوكایەتی زۆر كرابوو بە پێگەی ڕۆحانیەت و خودی شەخسی ئایت الله خومینی.

هەویدا بە بلاوكردنەوەی ئەم نامەیە كە مەبەستی لەوە بوو نیشانی بدات كە جمشید ئاموزگار ناتوانێت بارودۆخی ئێران باش بكات و بەلكو لەسەردەمی ئەویشدا پەشێوی هەیە گەیشت بە ئامانجەكەی. بەلام شەڕانگێزیەكەی هەویدا دژی ئاموزگار لە كۆتاییدا بە زیانی خۆی شكایەوە و بە كەمتر لە سالێك هەویدا لە ئێران لە سێدارە درا، لەكاتێكدا كە جمشید ئاموزگار تاوەكو ئێستاش لە ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا ژیانێكی خۆشی هەیە و یەكێكە لە بەڕێوەبەرە دیارەكانی سندوقی نێودەولەتی!

پاش ڕووداوەكانی قوم و تەبریز و پەرەسەندنی خۆپیشاندانەكان كە كەم كەم گۆڕان بۆ هێرشكردنە دەزگا ئەمینیەكان و پاشان ئیدارە و بانك و فرۆشگا گەورەكان و یەك لە دوای یەك هەموو دەسوتێنران، ڕۆژێكیان بەڕێز صاحب ئەختیار (سەپەرشتیاری خزمەتكارەكانی كۆشكی سەلتەنەتی) كە ئێستا لە لەندەن دەژی هات بۆلام.

بەڕێز صاحب ئەختیار پیاوێكی زۆر عاقل و بە ئەدەب و شیرین گوفتار و ڕاشكاو بوو.

(بۆ ئەوكەسانەی كە ئەم پیاوە ناناسن دەبێت بلێم ناوە ئەسلیەكەی عباسعلی یعقوبی بوو و خەلكی مازندەران بوو)

بەڕێز صاحب ئەختیار بە ئاشکرا وتی ئەو ئاگرەی کە هەویدا دایگیرساندوە ئیدی دانامرکێتەوە و خراپ نیە ئەگەر بڵێی بە جەنابی حەزرەت، هەویدا وەکو خەتاباری سەرەکی بڵاوبوونەوەی ئەو بابەتە دەستگیر بکات، پاشان دادگایی بکات و تۆڵەی لێ بسێنێتەوە!

صاحب ئەختیار کە خۆی جورئەتی نەدەکرد پێی بڵێ پاش ئەوەی کە بە پێداگیری من توانی ڕووبەڕووی ترس و شەرمی خۆی بێتەوە، چووە لای جەنابی حەزرەت و وتی ئەگەر من لە شوێنی تۆ بومایە هەر ئێستا هەویدام بە تاوانی ئاژاوە نانەوە لە سێدارە دەدا!

هەندێکجار پیاوە سیاسیەکانی پێشوو، ئەفسەرانی پلە بەرزی سوپای شا و ئێرانیانی نیشتەجێی دەرەوەی وڵات کە دێن بۆلام و دەستدەکەین بە قسە و باس لەسەر ڕابردوو، زۆربەیان کۆی قسەکانیان ئەوەیە کە ڕەخنە دەگرن لە محمد ڕەزا کە نەیتوانی لەکاتی خۆیدا سزایەکی توندی هەویدا بدات.

ئەردەشیر زاهیدی باسی کرد بۆم کە پاش بڵاوکردنەوەی ئەم بابەتە و سەرهەڵدانی یەکەمین ئاژاوە لە قوم لەگەڵ شاهنشا بە تەلەفۆن قسەی کردوە و زۆر پێداگیرانە داوای لێکردوە تاوەکو هەویدا بە تاوانی نانەوەی ئاژاوەگێڕی دەستگیر بکات و پاشان دادگای بکات و سزای بدات و شۆڕشەکە دابمرکێنێتەوە! بەلام جەنابی محمد ڕەزا لەبەرامبەر ئەم پێشنیارە بە تەواوی ئەردەشیر زاهیدی تاوانبار دەکات بەوەی کە دوژمنایەتی شەخسی هەیە لەگەڵ هەویدادا.

دواتر، کاتێک لە پەنەما بووین محمد ڕەزا لەکاتی قسەوباسەکانی لەسەر شێوەی سەرهەڵدانی شۆڕشەکە، دانی بەوەدانا کە کەمتەرخەمی نواندوە لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئاژاوەکەوە و نەیتوانیوە بەپێی پێویست هەڵسوکەوت بکات و نەیتوانیوە پەی بە فێڵەکانی هەویدا بەریت و بەتەواوی هەویدا هەڵیخەڵەتاندوە.

محمد ڕەزا دەیوت کاتێک داوام لە سەرۆکی ساواک (ژەنراڵ نصیری) کرد کە ڕوونکردنەوە بدات. هەویدا لەو دیدارەدا ئامادەبووە لەگەڵ ژەنراڵ نصیری بەخێرای لەکاتی قسەکانیدا دەستیکردوە بە یارمەتیدانی نصیری و بۆ ئەوەی محمد ڕەزا دوور

بخاتــەوە لــە ســەرنجدانی بــە بــێ توانــای ســاواك وتوپــەتی شۆڕشــگێڕەكان كۆمــەڵێك تودەیین و لە سەر سنورەكانەوە هاتوون!

ئەم دوو كەسە بۆ ماوەیەك ئەو بیركردنەوەیان خستە ناو مێشكی محمد ڕەزاوە كە كۆمۆنیستەكان (تودەییەكان) لە پشتی ئەم ڕواوەوەن! و محمد ڕەزاش كە هەمیشە بە گومانی پوچی پلانگێڕیەوە دەژیا و بەردەوام گومانی لە هەمووشتێك و هەموو كەسێك هــەبوو لــە دەربڕینــە ڕەســمیــەكان و چــاوپێكەوتنەكان و وتارەكانیــدا هەمیــشە قــسەی لەســـەر یـــەكێتی ئیـــستیعماری ســـور و ڕەش دەكـــرد كـــە مەبەســـتی لـــە یـــەكگرتنی تودەییەكان بوو لەگەڵ مەزهەبیەكاندا!

تەنانەت جارێكیان پاش ڕووداوی تەبرێز لە چاوپێكەوتنێكدا ئەوەی خستەڕوو كە شۆڕشگێڕەكانی تەبرێز لە خەڵكی ئایزربایجان نەبوون و لەو بەری سنورەوە هاتبوون تاوەكو ئاسایشی ئایزربایجان بخەنە مەترسیەوە!

تەنانـەت جارێكیـان لەبیرمە لـەبارەی ئەم شێوە قسەكردەوە لە نێوان محمد ڕەزا و كـچەكەم فـەرەح، لەبـەردەم مـن و ڕەزاگیانـدا گفتوگـۆ و وتووێـژێكی تونـد دروسـتبوو لەنێوانیاندا.

فـەرەح وتـی بـە محمـد ڕەزا توركیـا پـەیمانی ئاسایـشی هەیـە لەگـەڵ ئێمـەدا و لـە هاوپەیمانـەكانی ئێمەیـە لـەناو پەیمانی ناوچەیی (سـنتو)، چۆن دەتوانێـت لـە ئێـران ئاژاوە دروستبكات و دەستی تێبخات؟

هەروەها كچەكەم باسی ئەوەشی كرد لە سنوری ئێران و سۆڤیەت ئەگەر مێشێكیش بفڕێت پاسـەوانەكانی هـەردوو سـنور دەتـوانن بیگـرن، چۆن دەكرێـت سـۆڤیەتەكان بە ڕۆژی ڕووناك هزاران كەسـی خراپـەكار لـە سـنورەكانیانەوە تێپـەڕێنن و داخڵـی خـاكی ئێرانیان بكەن؟

محمـد ڕەزا هەنـدێك بڕوبیـانو و بەڵگـەی هێنایـەوە و هەوڵیـدا كـە بـە هەنـدێك بەڵگـە بیسەلمێنێت كە خەڵكی دەرەوە و بیانیەكان چاویان بەم پێشكەوتنەی ئێران هـەڵنایێت و نایانــەوێت ئێــران ببێتــە نمونەیــەكی ســەركەوتووی جیهــانی ســێیەم و لــە دنیــادا بناسرێت!

لەو ڕۆژانەدا ساواك ڕاپۆرتێكی درێژ و فراوانی تایبەتی لەبارەی هاتنە سەر دەسەڵاتی كەسێكی نەتەوەپەرستی لە ئایزربایجانی سۆڤیەتی ئامادەكردبوو و پێشكەشی محمد ڕەزای كردبوو. ئەو ڕاپۆرتە ئەوەی دەخستەڕوو كە حیدەر علی ئێیف ئایزربایجانێكی بەڕەگەز ئێرانی (لەدایكبووی دەوروبەری زنجانە) و ئەندامی پولیت بوروی سۆڤیەتی بووە كە (بەرزترین مەرجەعی حكومەتی یەكێتی سۆڤیەت بوو) ئەم كەسە بوو بوو بە سەرۆك كۆماری ئایزربایجانی سۆڤیەتی و لە یەكەمین وتاری خۆیشیدا پاش بەدەستهێنانی ئەو پۆستە، باسی ئەوەی كردبوو كە ئامانجی ئەوەیە دەبێت هەردوو ئایزربایجانەكە بكاتەوە بەیەك، مەبەستی ئەوە بوو دەبێت ئایزربایجانی ئێرانیش بگەڕێنێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی.

محمد ڕەزا بوجەیەكی گەورەی دەخستە بەردەست ساواك و ساواكیش ڕاستەوخۆ دەستوەردانی لە ئابوری وڵاتدا هەبوو. سەرۆكەكانی ساواك وەكو نصیری و ثابتی لە بواری ئابوریدا چالاك بوون و بە ئازادای موڵكومالێكی بێ حەد و حدودیان كۆ كردبوویەوە.

ئەوان بۆ ئەوەی محمد ڕەزا قەناعەت پێ بكەن كە ساواك خاوەنی ڕێكخستنێكی چالاك و كارایە و لە ئاستی ڕێكخراوە گرنگە سیخوڕیەكانی جیهانە داستانی سەیر و سەمەرەیان دروست دەكرد و لە چوارچێوەی ڕاپۆرت و شیكاری زانیاریدا دەیانخستە بەردەست محمد ڕەزا، تاوەكو نیشانی بدەن كە ساواك چەندە دەسەڵات و هەژموونی پەیداكردوە و پێشكەوتنی بەدەستهێناوە. محمد ڕەزاش هەرچەندە بەتەواوی متمانەی بە هەموو ئەم ڕاپۆرت ونوسراوانە نەبوو، بەڵام بەهۆی ئەوەی كە پەیوەندێكی زاتی هەبوو لەگەڵ ئەم جۆرە چیرۆكە پۆلیسیە سەیرانە پێشێوازێكی گەرمی لەم جۆرە ڕاپۆرت و باسانە دەكرد!

بەهۆی بەردەوامی خوێندنەوەی ئەو ڕاپۆرت و شیكارانەی ساواكەوە محمد ڕەزا وای لێهاتبوو ئەو سەربازەی كە خەریكی پاسەوانی بوو لەبەرامبەر كۆشكی نیاوەران یان ئەو باخەوانە پیرەی كە خەریكی بڕاركردنی گوڵەكانی باخچەكان بوو بە چاوی سیخوڕێكی گەورە و سی ئای ئەی ئەمریكی یان كارمەندێكی كەی جی بی سەیری دەكرد و واگومانی دەكرد كە هەموو دنیا خەریكی پلانگێڕی و نەخشەدانانە لەدژی!

کەم کەم ئەو بەدەبینی و گومانە بەچەشنێك لەناو محمد ڕەزادا پەرەیسەند تەنانەت گومانیشی لە کەسانی نزیك دەوروبەری و برازا خۆشەویستەکەم (ڕەزا قطبی)یش کردبوو و بە سیخوڕی سۆڤیەتەکان و بەکرێگیراوی تودەییەکان سەیری دەکرد!

لە ڕۆژانی کۆتایی مانەوەی لە تاران تەنانەت گومانی لە دەرگا و دیواریش کردبوو و وایدەزانی هەموو کەسێك دەگەڕێت بۆ کوشتنی ئەو.

بەداخەوە تەنانەت گومانیشی لە فەرەحی کچم کردبوو. جارێکیان وتبووی بە کچەکەم ئایا ئەگەر ئەمریکیەکان یان بەریتانیەکان داوات لێ بکەن پیاوەکەت تیرۆر بکەیت و بیکوژیت ئایا ئەم داواکاریەیان قبوڵ دەکەیت؟

محمد ڕەزا بەهیچ شێوەیەك دانی بەوەدا نەدەنا کە ئەو نائارامی و شۆڕشەی دروستبووە خەتای ئەوی تێدا بێت و هەمیشە خۆی بەبێ تاوان نیشان دەدا.

هەمیشە بە سەرسوڕمانەوە ئەو پرسیارەی دەکرد ئایا ئەم خەڵکە چی دەوێت؟

دەیوت: (خەڵکی ئێران یەکێکبوون لە دواکەوتووترین خەڵکی جیهان ئەوە باوکم ڕەزا خان بوو ئەوانی لە نەزانی و هەژاری و نەخوێندەواری ڕزگار کرد[1]!

محمد ڕەزا دەیوت: (خەڵکی ئێران یەکێکبوون لە دواکەوتووترین ملەتەکانی جیهان کە تەنانەت عادەتیان نەکردبوو دەست و پلیان بشۆن، ئەوە باوکم (ڕەزا خان) بوو کە خەڵکی فێری پاك وتەمیزی و دەستشۆردنیش کرد.

---

[1] - شا لەبەرامبەر خەڵکی ئێران بە خۆ گەورەزانینێکەوە دەیوت دەبێت ئەو خەڵکە سوپاسی شاکەیان بکەن.

شا خۆی بە شای شاکان و میراتگری کۆرشی گەورە دەزانی و لەسەر تەلەفزیۆن بە لەخۆباییبوونێکەوە و جۆرێك لە هەڕەشە و گوڕەشەوە دەیوت هەرکەسێك ئەو بەرنامەیەی منی قبوڵ نیە دەتوانێت جەوازەکەی بخاتە گیرفانی و ئێران بەجێبهێڵێت!

شا خەڵکی بە کۆیلەی خۆی دەزانی و ئەگەر هەرکەس ملکەچ و وابەستەی ئەو نەبوایە، بە کەسێکی سەر بە دەزگای ڕەش و سوری دەزانی.

هەر لەبەر ئەو بیرکردنەوە بێ مانایانە بوو کە هەرگیز باوەڕی نەدەکرد خەڵکی لە ڕاپەڕینێکی گەورەدا تەخت و تاجی تێکبدەن و شار بەدەری بکەن و بیخەنە ناو زبڵدانی مێژووەوە!

محمد ڕەزا دەیوت: (بیستساڵ حکومەتی ڕەزاخان و سی و حەوت ساڵ حکومەتی من بوو، بووە هۆی گۆڕانی سیاسی لە ژیانی ئێرانیەکاندا و نەتەوەیەکی داوکەوتوو هەنگاوی بەرەو دەروازەکانی شارستانی گەورە هەڵنا!)

دەبێت ئەوە بڵێم کە تەنها محمد ڕەزا تاوانباری یەکەم نەبوو لەم بیرکردنەوە سادانەیەدا، چونکە ساواك و دەزگا بەرپرسەکانی دیکەی وڵات بەردەوام ڕاپۆرتیان پێ دەدا کە باسیان لە پێشکەوتن و پەرەسەندنی وڵات دەکرد لە هەموو ڕوویەکەوە و تەنانەت ڕاپۆرتەکان بەردەوام باسی ڕەزامەندی هەموو چینەکانی ئێرانی دەکرد لەو بارودۆخەی کە هەبوو. ئەو هەراوهوریا کورتەی کە لە ئەنجامی پرسەکەی کوڕی ئیمام خومینی لە قوم دروست بوو بەهۆی ڕووبەڕووبوونەوەی ناعاقڵانەی ساواك و شارەوانی قومەوە بوو کە ئەمە بووە هۆی ئەوەی کۆمەڵێك ئاژاوە و تێکچوونی دیکەی بەشوێندا بێت و ئەو ئاژاوەیە بەرەبەرە تەشەنەی کرد بۆ سەرتاسەری وڵات و کارەکە گەیشتە ڕادەیەك کە لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانی ساڵی ١٩٧٨ ئاپۆڕەیەکی چەند سەد هەزار کەسی لە تاران بەڕێ کەوتن و لە دژی شەخسی شا هۆتافیان دەدا!

محمد ڕەزا، ئەو ڕۆژە بە سواری هەلیکۆپتەر ڕۆیشت بۆ سەیری خۆپیشاندەرەکان و بینی خەڵکی زۆر بەتوندی دژی شا هۆتافی مردن دەڵێن! پاش گەڕانەوەی ئەم سەردانە محمد ڕەزا ئیدی بڕیاریدا ئێران بەجێبهێڵێت.

محمد ڕەزا زۆر بێتاقەت و شکاو بەرچاو دەکەوت.

دواتر فەرەح بۆی باسکردم کە فەرماندەکانی سوپا و بەتایبەتی ژەنراڵ ئویسی و سەرلەشکر نشاط داوایان لە شا کردبوو کە فەرمانی سەرکوتکردنی خەڵکی دەربکات، بەڵام محمد ڕەزا وتبووی: (ئێمە ناتوانین هەموو ئەم وڵاتە بکوژین!)

محمد ڕەزا فەرمانی دەرکرد بۆ ئەندامانی خێزانەکەی هەرچی پێیان دەکرێت بە زووترین کات ئێران بەجێبهێڵن. پێش ئەوەش کۆمەڵێك لە دەستوپەیوەندەکەی باروبنەی خۆیان کۆکردبوویەوە و ئێرانیان بەجێهێشتبوو.

من دەبینم لەناو هەندێك لە کتێبە مێژوویيە بێ بنەماکاندا، کۆمەڵێك ئەفسانەیان لەبارەی جەنابی خاتو ئەشرەفەوە دروستکردوە و نوسیویانە ئەشرەف ژنێکی ئاسنین بوو و دەیویست هانی شا بدات لە ئێراندا بمێنێتەوە و خۆیشی لەگەڵیدا بمێنێتەوە و

دەستبکەن بە سەرکوتکردنی خۆپیشاندەران! ئەم بابەتە هیچ ڕاستی تێدا نیە، چونکە ئەشرەف یەکەمین کەسی بنەماڵەی خێزانی پەهلەوی بوو کە ماوەیەکی زۆر پێش شا لە ئێران دەرچووبوو و لەناو شوقەیە ڕازاوە گرانبەهاکەی خۆی لە نیویۆرك دەژیا.

پیاوانی دەوڵەت و کەسایەتیە سیاسیەکانیش، تەنانەت ئەفسەرە پلە بەرزەکانی سوپاش یەك لەدوای یەك وڵاتیان بەجێهێشتبوو.

هەموو ڕۆژێك هەواڵ لەبارەی دەرچوونی ژمارەیەکی بەرچاو لە بەڕێوەبەرانی دەوڵەت و بەرپرسەکانی سوپا لە ڕۆژنامەکاندا بلاّو دەبوویەوە و محمد ڕەزاش سەیری دەکرد خەریکە بەتنها دەبێتەوە.

تەنانەت ژەنراڵ ئەزهاری کە سەرۆك وەزیری حکومەتی سەربازی بوو وەلاّتی بەجێهێشتبوو!

ژەنراڵ ئەزهاری توشی جەڵدەی مێشك بووبوو و بە ئیجازی محمد ڕەزا و بۆ چارەسەر ولاّتی بەجێهێشتبوو. کۆمەڵێك نوسیبوویان ئەزهاری بە بیانوی نەخۆشی هەڵهاتووە ڕۆیشتوە بۆ ئەمریکا، هیچ یەکێك لەم نوسینانە ڕاست نەبوون.

ئەزهاری زیاتر لە شا وەفای بۆ ئەمریکیەکان هەبوو. وەکو محمد ڕەزا دەیوت ئەزهاری لە کاتی خوێندنی سەربازی لە ئەمریکا شەیدای ئەمریکیەکان بوو بوو و بە پێشنیاری ئەوان پلە سەربازیەکانی بڕی و گەیشتە سەرۆکایەتی بنکەی سەربازی.

ئەزهاری ماوەیەك لە (سنتو) دەستی ڕاستی ئەمریکیەکان بوو و ئەو کاتەشی کە لە ئێران چووە دەرەوە محمد ڕەزا تێگەیشت کە ئەمریکییەکان هیچ بەرنامەیەکیان بۆ مانەوەی سەڵتەنەتی پەهلەوی نیە و ئەویش دەبێت بڕوات.

ئەزهاری خێزانەکەی بەبێ زانیاری شا بە فڕۆکەیەکی سەر بە هێزە ئاسمانیەکانی ئەمریکا و بەبێ جێبەجێکردنی یاساکانی سەفەرکردن و تەشریفاتی خروجی، ولاّتیان لە بنکەی سەربازی (دوشان تپە)، کە لە ژێر دەستی ڕاوێژکارە ئەمریکیەکان بوو بەجێهێشت.

ئەزهاری هەر بە گەیشتنی بۆ ئەمریکا بە تەلەفۆن پەیوەندی کرد بە محمد ڕەزاوە و داوای لێ کرد گەردنی ئازاد بکات.

سەرۆك وەزیرانی حكومەتی سەربازی بەبێ زانیاری سەرەوەی خۆی ولاتی بەجێهێشت و كاتێكیش گەیشتە شوێنی خۆی تەلەفۆنی بۆ پاشاكەی كرد و ئاگاداری كردەوە لە دەرچوونی!

ئەزهاری لەو پەیوەندیە تەلەفۆنیەدا وتبووی بە محمد ڕەزا بیر لە دەرچون بكاتەوە. ئەویش هەرچی زووتر و خێراتر!

لە ڕووداوی شۆڕشی ئێران، ئەفسەرە پلە بەرزەكان كە بە هەموو شێوەیەك خۆیان بە قەرزارباری محمد ڕەزا دەزانی، لە پێش هەموو كەسێك و زیاتر لە هەمووكەس خیانەتیان لە محمد ڕەزا كرد!

پێویست ناكات دووبارە باسی خیانەتی ژەنرالْ قرە باغی بكەمەوە. هەمووكەس دەزانێت ژەنرالْ قرەباغی بە فەرمانی ئەمریكیەكان پەیوەندی كرد بە مهندس مهدی بازرگانەوە و سوپاشی لە ڕووداوە سیاسیەكە نەزۆك كرد و بەیاننامەی بێ لایەنی سوپای ڕاگەیاند كە ئەمەش بووە هۆی هەرەسهێنانی ولات.

ئەمانە كەسكانێك بوون بۆ گەشەكردن و پێگەیاندنی خۆیان هاوسەر و كچە جوانەكانیان پێشكەش بە محمد ڕەزا دەكرد.

ناكۆكی بەردەوامی فەرەح لەگەلْ محمد ڕەزا لەسەر بێ غیرەتی ئەم ژەنرالانە بوو كە بۆ وەرگرتنی پلە و پۆست و پێگە هاوسەر و كچەكانیان بەكاردەهێنا.

كاتێك لە پەنەما بووین محمد ڕەزا زووزوو قسەی پیسی دەوت بەو ئەفسەرە پلە بەرزانە بۆ نمونە دەیوت: (من چەندە نەزان بووم كە بۆ چەندین سالْ كەسێكی خائین و نەفس نزمی وەكو ئەزهاریم لە سەرۆكایەتی بنكەی گشتی سوپادا هێشتەوە!)

پێش دەرچوونمان لە ئێران، زۆربەی كەسانی سەر بە خێزانی پەلهەوی و دیبا و تەنانەت كەسانی پلە چوار و پێنجی خێزانەكانمان و هەموو ئەوانەشی كە بەجۆرێك لە جۆرەكان پەیوەندیان هەبوو لەگەلْماندا ولاتیان لە ترسی گیانی خۆیان بەجێهێشت و بەرەو دەرەوەی ولات هەلْهاتن.

محمد ڕەزا بەجۆرێك خۆی دەردەخست كە ئێمە تێبگەیەنێت كە هیچ چارەسەرێك نیە جگە لە هەلْهاتن. فەرەح دەیوت: (ئەمریكیەكان و بەریتانیەكان ویستیان محمد ڕەزا حكومەت تەسلیمی بەختیار بكات و بڕوات.)

شاهپور بەختیار کەسێکی ئۆپۆزسیۆنی سەر بە بەرەی ملی بوو کە هاوکاری نزیکی هەبوو لەگەڵ ساواکدا.

شاهپور بەختیار لە فەرەنسا خوێندبووی و لە گەنجیدا یەکێك بوو لە ئەندامی گونیدیەکانی فەرەنسا. تەنانەت لەجەنگی دووەمی جیهانشیدا بەهۆی ئەو ئازایەتیەی کە هەیبوو (لە بەرەی بەرگری ملی فەرەنسا) لەگەڵ ژەنراڵ دیگۆل مەدالیای وەرگرتبوو. شاهپور بەختیار جنسیەی فەرەنسی و تەنانەت ژنی فەرەنسیشی هەبوو. منداڵەکانیشی لە فەرەنسا دەژیان.

خودی خۆیشی لە ئێراندا چەند کۆمپانیا و کارگەیەکی هەبوو.

محمد ڕەزا ئەوی بە کرێگیراوی سی ئای ئەی دەزانی و کاتێك ئەمریکیەکان ئامۆژگاری محمد ڕەزایان کرد کە شاهپور بختیار بکاتە سەرۆك وەزیران ئەو گومانەی کە محمد ڕەزا هەیبوو بۆ شاهپور بەتەواوی بووە ڕاستی بەلایەوە.

لەسەردەمی حکومەتی محمد ڕەزا، بەرەی ملی و نەهزەتی ئازادی وەکو ئۆپۆزسیۆنێکی ناوخۆیی چالاکێکی نیوە ئاشکرایان هەبوو لە ئێراندا، بەڵام محمد ڕەزا و ساواك هەرگیز لەگەڵیاندا بەجدی ڕووبەڕوو نەبوونەوە.

تەنانەت لەبیرمە لەکاتی سەفەری سەرۆك کۆمارەکانی ئەمریکا بۆ ئێران وەکو جۆن ئێف کەنەدی و نیکسۆن و کارتەر نەهزەتی ئازادی نامەی کراوەیان بۆ ئەو سەرۆکانە دەنوسی و بە ئاشکرا ڕەخنەیان لە حکومەتی محمد ڕەزا دەگرت.

محمد ڕەزا دەیوت: (ئەم ئازادیخوازە ئاینیانە، ئەلتەرناتیڤی لە ئاو و خوێنی خەوێنراوی حکومەتەکەی منن و دروستکراو و پێکهێنەری دەستی ئەمریکیەکانن، بەتایبەتی سەر بە بەرەی کۆترەکان و حیزبی دیموکراتەکانن!)

لەناوخۆدا کۆمەڵێك نەیاری وەکو شاهپور بەختیار-ئەلهیار صالح- مهندس حسیبی... و هیتد هەبورن کە جێگەی متمانەی هەردوولای حکومەت و ئەمریکیەکانیش بوون.

تەنانەت مهندس مهدی بازرگان پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێرانیش بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی شۆڕش هەڵبژێردرا و خاوەنی چەندین کۆمپانیا و کارگەی

گەورەی پیشەسازی بوو و لەگەڵ دەزگا دەوڵەتیەکانیشدا پەیوەندیێکی زۆر نزیکی هەبوو.

مهندس بازرگان بەهیچ شێوەیەك خوازیاری ئەوە نەبوو کە دەسەڵاتی سەڵتەنەتی نەمێنێت بەڵکو زیاتر حەزی لەوە بوو ئێران وەکو وڵاتی بەریتانیای لێ بکات و دەسەڵاتی سەڵتەنەتی وەکو بنەماڵە بهێڵێتەوە و لەو نێوەندەشدا دەوڵەت هەڵبژێردراوی خەڵك بێت!

بەو شێوەیەی کە کچەکەم لە محمد ڕەزاوە بیستبوی مهدی بازرگان لە سەروبەندی ڕووداوەکانی حکومەتی دکتۆر محمد مصدق و لە سەروبەندی خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران ڕۆڵی ناوەندی و هاوسەنگی گێڕابوو و ڕۆڵێکی سەرەکیشی بینی لە کۆتایی پێهێنانی مانگرتنی کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی ئێران.

من لە لاپەڕەکانی دواتردا، دووبارە لەبارەی بازرگان و هەندێك لە کەسایەتیە ئاینیی و شۆڕشگێڕیەکان قسە دەکەم و کۆمەڵێك حەقیقەت هەیە ڕوونیان دەکەمەوە.

ئێمە لە بەرواری ١٦ جێنیوەری ١٩٧٨ خاکی ئێرانمان بەجێهێشت.

ئەو کات ڕەزاگیان لە ئەمریکا خەریك بوو خولی فێربوونی فڕۆکەوانی تەواو دەکرد. بۆیە لە فڕۆکەکەدا تەنها من، فەرەح، محمد ڕەزا، و هەندێك لە خزمەتکارەکان و میوانەکان بووین.

ئەو دیمەنەی کە هەرگیز ناتوانم لەبیری بکەم شین و گریانی ژەنراڵ ئەمیر حسین رەبیعی فەرماندەی هێزە ئاسمانیەکان بوو.

ئەمیر حسین ربیعی، لە کاتێکدا کە هاوسەرە ئەڵمانیەکەی شایەتی گریان و شیوەنی پیاوەکەی بوو، خۆی دەدا بەسەر پێیەکانی محمد ڕەزا و بێتاقەتانە داوای لێ دەکرد وڵات بەجێنەهێڵێت و چەند کاتژمێرێك بمێنێتەوە تاوەکو سوپا شۆڕشگێڕەکان دابمرکێنێتەوە.

محمد ڕەزا لەم کاتەدا دەستیکرد بە گریان. چاوی ئێمەش پڕ بووبوو لە فرمێسك.

لە تارانەوە ئێمە ڕۆیشتین بۆ میسر، محمد ڕەزا بەدرێژای ئەو سەفەرە تاوەکو گەیشتینە میسر یەك وشە لەدەمی نەهاتە دەرەوە و بێدەنگ و مات لە پەنجەرەی فڕۆکەکەوە سەیری خوارەوەی دەکرد.

لـە میسر ڕۆیشتین بۆ ئیسوان لەوێ دەریاچەیەکی دروستکراو هەبوو لە پشت سەدێکی گەورەوە. دەوڵەتی میسر لەو شوێنەدا میوانخانەیەکی زۆر خۆشی لێ دروستکردبوو.

ئەم میوانخانە خوالێخۆش بوو ئەنوەر سادات و هاوسەرە بە ڕەگەز ئێرانیەکەی (خاتو جیهان سادات) خستیانە بەردەست ئێمە تاوەکو لەوێ بمێنینەوە.

ئەم سەدە گەورەیە ڕوسەکان لەسەردەمی حکومەتی جەمال عبدالناصر دروستیان کردبوو و پێشکەشی خەڵکی میسریان کردبوو.

خوالێخۆش بوو ئەنوەر سادات لەبارەی دروستکردنی سەدەکەوە باسی زۆری کرد و محمد ڕەزاش بە وردی گوێی لەم ڕوونکردنەوە سەرنجانە گرتبوو.

ئەو سەدە گەورەیە لەسەر ڕووباری نیل دروستکراوە و ئابوری میسر بەستراوە بەو سەدەوە. ئەم بەنداوە یەکێك بوو لە دروستکراوە تایبەتەکان و شاکارێکی ئەندازیاری جیهانی بوو.

محمد ڕەزا کاتێك کە ڕوونکردنەوەکانی ئەنوەرساداتی بیست وتی بەداخەوە درەنگ تێگەیشتم لە بەنرخی ڕووسەکان!

ئێمە سەیرمان لەو قسەیەی محمد ڕەزا هات و ئەو هەمیشە ڕقی لە تودەییەکان بوو و بەردەوام خۆی لێ بەدوور دەگرتن.

دواتر فەرەح پێی وتم ئەنوەر سادات پیاوی ئەمریکیەکانە و دواتر ئەنوەر سادات هەموو قسەکانی شا دەگوازێتەوە. محمد ڕەزا بە وتنی ئەم قسەیە ویستویەتی بێتاقەتی خۆی پیشان بدات بەرامبەر بە بێ وەفای ئەمریکیەکان. باسی مانەوەی کورتمان لە میسر و مەراکیش و دواتر لە پەنەما و ئەمریکا لە زۆربەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بلاوبووەتەوە و کتێبی زۆریش لەم بارەیەوە بلاوکراوەتەوە.

بۆیە، من ئێستا نامەوێت دووبارە دەست بکەمەوە بەم باسە بەلام تەنها هەندێك لایەن ڕوون دەکەمەوە.

لە هەفتەکانی یەکەمی دەرچوونمان لە ئێران، ئەو کەسانەی کە لەگەڵماندا بوون لەبەر ئەوەی تاڕادەیەك هەندێك ئومێدیان هەبوو بگەڕێینەوە بۆ ئێران هێشتا هەر لە

هەڵسوکەوتیاندا ماستاوچیەتی و مامەحەمەییان دەنواند، بەڵام پاش نزیکەی مانگێك ڕووی ڕاستەقینەی خۆیان دەرخست!

هەندێك لەو کەسانەی کە لە میسر، مەراکیش و پەنەما و ئەمریکا لەگەڵماندا بوون لە خزم و کەسە نزیکەکانی خێزان و هاوڕێ نزیکەکانمان بوون کە حسابیان لەگەڵ کەسانی دیکەدا جیاواز بوو، یان بەلایەنی کەمەوە ئێمە بەهۆی سادەییەوە بەوشێوەیە حسابمان بۆ دەکردن!

کەسانی وەکوە (فریدون جوادی) هاوڕێی و هاوپۆلی کۆنی کچەکەم، یان (ئەحمەد علي مسعود ئەنصاری) کە دواتر کلاّوی کردە سەر ڕەزا گیان و دەیان ملیۆن دۆلاری لە موڵکوماڵی ڕەزاگیان و کچەکەم برد.

لەیلا ئەمیر ئەرجومەند هاوڕێی و هاوپۆلی کۆنی فەرەح، خوالێخۆش بوو محمود دیبا (ئامۆزای فەرەح) محمد جعفەر بهبهانیان (سەرۆکی پێشوی موڵکەکانی سەڵتەنەتی و بەڕێوەبەری گشتی حسابداری کۆشکی شاهنشاهی)، سەرهەنگ کیومیرس جهانبینی (سەرۆکی پاسەوانەکانی محمد ڕەزا)، سەرهەنگ یزدان نویسی (پارێزەری تایبەتی کچەکەم فەرەح)، علی شهبازی (پارێزەری فەرەح)، ئەمیر پور شجاع و محمود ئەلیاسی (خزمەتکارە تایبەتەکانی محمد ڕەزا)، دکتۆر لوسی پیرنیا (دکتۆری تایبەتی ڕەزا گیان و نەوە خۆشەویستەکانی دیکەم)، مەنوچهر قوربانی فر (ڕێکخەری کرینی چەك و تەقەمەنی) علی کبیری (سەرۆکی چێشتخانەی تایبەتی شا) و کۆمەڵێکی دیکە لە ئەندامانی خێزانی پەهلەوی وەکو منداڵەکانی شەمسە، ئەشەرەف و غلامرەزا.

لە هەندێك لە کتێبە مێژووییەکاندا بەرچاوم کەوتووە نوسیویانە فەریدە دیبا پێش دەرچوونی شا و فەرەح لە ئێران چووەتە دەرەوە. ئەمە هیچ ڕاست نیە.

من لەگەڵ ئەو فڕۆکەیەدا بووم کە محمد ڕەزای پێ بوو بردی بۆ ئەسوان لە میسر و تاوەکو ڕۆژی مردنی محمد ڕەزاش لەگەڵیدا بووم.

چیرۆکی دەرچوونمان لە ئێران و سەرگەردانبوون و ئاوارەبوونمان لە میسر، مەراکیش، پەنەما، مەکزیك و ئەمریکا پڕبوو لە عیبرەت و ئامۆژگاری.

ڕستەیەکی محمد ڕەزا هەیە هەمیشە ئازارم دەدات. کاتێک کە ئەمریکیەکان هەوڵیاندەدا بە بیانوی جیاواز ڕێگەی پێ نەدەن لە ئەمریکا بمێنێتەوە و نەبنە سەرە ئێشە بۆ حکومەتی شۆڕشی ئێران، شا لە پەیوەندێکی تەلەفۆنیدا وتی بە راکفلەر: (ئایا لەم جیهانە گەورەیەدا شوێنێك پەیدا نابێت بۆ ئەوەی کۆتاییەکانی تەمەنم لە ئارامیدا بەسەربەرم ؟)

من بەروارەکانی ڕۆژ و هەفتە و ساڵ و مانگم بە باشی لەبیر نیە. بەتایبەتی ئەم ساڵانەی پیری و کۆتایی تەمەن.

بەڵام ڕۆژی دەرچونمان لە ئێران هەرگیز لەبیر ناچێتەوە کە ١٦ جێنیوەری ١٩٧٨ بوو.

هەوایەکی سارد لە فڕۆکەخانە هەڵیکردبوو بە شێوەیەك کە ئازاری دەداین. من و زۆرێك لە هاوڕێکانم چەند کاتژمێرێك زووتر لە محمد ڕەزا و فەرەح چووبووین بۆ فڕۆکەخانەی مهرئاباد و ڕۆیشتبووینە ناو فڕۆکەی سەڵتەنەتیەوە کە فڕۆکەیەکی بوئینگی ٧٠٧ بوو، چاوەڕێی گەیشتنی شا و فەرەحمان دەکرد.

سەیری بەردەم شوێنی سەڵتەنەتیم دەکرد کە بینایەکی یەك قات بوو ئاڵای ئێران و ئاڵای سپی سەڵتەنەتی لەسەر دەشەکایەوە.

کەوتمە بیری ئەو ڕۆژە شکۆدارانەی کە لەبەردەم ئەم شوێنەدا فەرشی سور دادەخرا و سەرۆك و پاشای وڵاتە جۆراوجۆرەکانی جیهان دەهاتن بۆ دیداری محمد ڕەزا و سەردانی ئێرانیان دەکرد.

لەماوەی ڕۆژانی ئاژاوە و شۆڕشدا هیچ چالاکیەکی لەو شێوەیە کە شایەنی باس بێت لە فڕۆکەخانەی مهرئاباد بەرچاو نەدەکەوت. لە زستانی ساڵی ١٩٧٨ بە مانگرتنی کارمەندانی فڕۆکەخانەکە چالاکیەکانی مهرئاباد پەکیان کەوتبوو.

ئێمە پێشتر ئەو کەلوپەل و پێویستیانەی کە هەر ماڵێکی ئێرانی پێویستیەتی، بە فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی شاهنشاهی ناردبوومان بۆ دەرەوە.

گروپێك لە ئەندامانی دەوڵەت و پیاوانی سیاسی و کەسە کۆمەڵایەتیەکان و بەرپرسانی سوپا لە ڕیزێکی ڕێکدا وەستابوون چاوەڕوانی تەشریفی جەنابی محمد ڕەزا بوون.

شا لە ئێران جێگری هەبوو و چاوەڕوانی ئەوەش بوو ئەنجومەنی دەوڵەت متمانە ببەخشێت بە شاهپور بەختیار بۆ ئەوەی ئەویش بە خەیاڵی ئاسودە وڵات بەجێبهێڵێت.

پاش چەند خولەکێك شاهپور بەختیار بە هەلیکۆپتەرێك کە فرۆکەوانەکەی خوالێخۆش بوو خەسرەوداد بوو هات بۆ فرۆکەخانە و هەواڵی پێدانی متمانەی ئەنجومەنی گەیاند بە محمد ڕەزا و ئەویش خۆشحاڵ بوو بەوەی کە جێگیرەوەیەکی هەیە و پاشان بەرەو فرۆکەکەی هات.

کاتێك محمد ڕەزا لەبەردەم ڕیزی خەڵکەکەدا تێدەپەڕی کۆمەڵێك لە بەرپرسەکانی سوپا وەکو خوالێخۆشبوو خەسرەوداد (فەرماندەی هێزی ئاسمانی نیروز) و ژەنراڵ ئەمیر حسین ڕەبیعی (فەرماندەی هێزی ئاسمانی شاهنشاهی) خۆیان خست بەسەر پێی محمد ڕەزا و داوایان لێ کرد تاوەکو چەند کاتژمێرێکی دیکە لە بینای سەڵتەنەتی یان لەناو فرۆکەکەیدا بمێنێتەوە تاوەکو بە هەر شێوەیەك هەبووە لێدانێکی کوشندە بدەن لە یاخیەکان و شۆڕشگێڕەکان.

بەڵام محمد ڕەزا هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو بۆ ئەم پێشنیارە و تەنانەت وەڵامیشی نەدانەوە.

محمد ڕەزا وتی بە کۆمەڵێك ڕۆژنامەنوس کە لە فرۆکەخانە بوون بەهۆی ماندووبوونیەوە بۆ ماوەیەکی کورت دەچێت بۆ پشوو بۆ میسر و پاشان دەگەڕێتەوە.

بەڵام، هەموومان دەمانزانی بەوشێوەیە نیە و ئێمە ئیدی ناگەڕێینەوە بۆ ئێران. شەوێك پێش دەرچوونمان لە ئێران محمد ڕەزا هەمووانی کۆ کردەوە و وتی: (ئەمە دواهەمین نانی ئێوارەیە کە لە ئێران دەیخۆین. واشنتۆن و لەندەن داوایان لێکردووم بەخێراترین شێوە ئێران بەجێبهێڵم و بیری گەڕانەوەش لە مێشکمدا دەربێنم!)

هەڵبەتە ئێمە پێشتر ئاگاداری ئەوە بووین کە بەردەوام سەفیرەکانی ئەمریکا و بەریتانیا سەردانی کۆشکیان دەکرد و چاوپێکەوتنی تایبەتیان ئەنجام دەدا لەگەڵ محمد ڕەزا، بەڵام هیچ ئاگاداری ناوەرۆکی ئەو دانیشتنانە نەدەبووین.

دواتر، محمد ڕەزا لە ئیسوان لەبەردەم ئێمەدا وتی بە ئەنوەر سادات: (مێژووی من تەواوبووبوو بۆیە ئەمریکییەکان و ئینگلیزەکان وەکو دەستەسڕێکی بەکارهاتوو فڕێیاندام...!)

بۆ ئاگاداربوونی زیاتری خوێنەرانی ئەم یاداشتە، دەبێت ئەوە بڵێم کە پێشینەی ناکۆکی محمد ڕەزا لەگەڵ ئەمریکییەکان و بەریتانییەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئابڵوقەی نەوتی عەرەبی!

کاتێك لە ڕووداوەکانی جەنگی شەش ڕۆژەی نێوان عەرەبەکان و ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٦٧ عەرەبەکان ناردنی نەوتیان بۆ ڕۆژئاوا وەستاند نرخی نەوت بەشێوەیەکی سەیر بەرزبوویەوە، ئێرانیش لەم ئابڵوقە نەوتییەدا بەشداری نەکرد بەڵام سەرکەوتووبوو بەوەی نەوتی خۆی بە نرخێکی گران بفرۆشێت و داهاتێکی زۆر باشی دەستکەوێت.

پاش کۆتایی گەمارۆکەی عەرەب، محمد ڕەزا هەوڵیدا ئێران (ڕێبەرایەتی ئۆپیك ڕێکخراوی هەناردەکارانی نەوت) بگرێتە دەست. ڕێبەرایەتی ئێران بووە هۆی ئەوەی نرخی نەوت بەرز ببێتەوە و ئەم کارەش جێگەی ڕەزامەندی کۆمپانیا گەورە بەرهەمهێنەرەکان و مشتەریەکانی نەوت نەبوو.

ئەمریکییەکان و بەریتانییەکان کە کڕیاری سەرەکی نەوتی ئێران بوون فشارێکی زۆریان دروستکرد بۆ ئێران تاوەکو نرخی نەوت بهێنێتە خوارەوە.

محمد ڕەزا بە ئاشکرا کەوتبوویە کێشەوە لەگەڵ کۆمپانیا نەوتیەکانەوە و ڕێبەرایەتی ئێرانیش لە ئۆپێك ئەم ڕێکخراوەی کردبوویە کۆمپانیایەکی زەبەلاح و کاریگەرێکی گەورەی کردبویە سەر ئابوری جیهان.

پەرەسەندنی نرخی نەوت بووە هۆی سەرهەڵدانی قەیرانێکی ئابوری لە ئەوروپا، بەڵام داهاتی ئێرانی زیاد کرد و نرخی پارەکەشی بەرزبوویەوە و محمد ڕەزاش بۆ پەرەسەندن و گەشەکردنی ئابوری هەمەلایەنەی ئێران زۆر پێویستی بەو بەهایە بوو.

ئەمریکییەکان و بەریتانیەکانیش هیواداربوون بەو فشارەی کە دروستی دەکەن بتوانن محمد ڕەزا پەشیمان بکەنەوە، بەڵام محمد ڕەزا نەك هەر لەسەر کۆڵی شەیتان

دانەبەزی بەڵکو لە چاوپێکەوتنە بەناوبانگەکەی خۆی لە ساڵی ١٩٧٦ بە تورەی و پێداگیریەوە وتی ئیدی ئێران باج و خەراج نادات بە چاو شینەکان!

تێکچوونی لە ئێران، یان باشتر بڵێم ئەو پلانەی کە بووە هۆی کەوتنی ڕژێم لەم ڕێگەیەوە دەستیپێکرد!

ئێمە دواتر ئەم بابەتەمان لەگەڵ (دیڤید راکلفەر)دا باس کرد، راکفلەر سەرەڕای پشتیوانی خۆی بۆ قسەکان وتی: (کۆمپانیا نەوتیەکان نەیاندەویست هۆکاری کەوتنی حکومەتی شا فەراهەم بکەن، بەڵکو ئامانجیان ئەوەبوو کە لێدانێکی کوشندە بدەن لە شا و عاقڵی بکەن! بەڵام پاراستنی بارودۆخەکە لە دەستی هەمووکەس دەرچوو!)

کاتێك لە میسر میوانی سەرۆك ئەنوەر سادات بووین، خاتو جیهان سادات کە بە ڕەگەز ئێرانێکی ئەسفەهانی بوو پرسی لە محمد ڕەزا بۆچی لەگەڵ خۆپیشاندەر و لادەرەکان بەتوندی نەجولایەوە و هیچ کاردانەوەیەکت نەنواند؟

محمد ڕەزا هیچ وەڵامی ئەو پرسیارەی نەدایەوە، بەڵام من و فەرەح و هەندێك لە کەسە نزیکەکانی خێزانەکەی هۆکاری ئەو کاردانەوەیەی محمد ڕەزامان دەزانی.

محمد ڕەز بەهۆی توشبوونی بە شێرەپەنجەوە توشی خەمۆکێکی زۆر بووبوو.

(چ کەسێك دەزانێت لەم جیهانەدا توشی شێرەپەنجە بووبووبێت و خەمۆکی و نیگەرنی و بێتاقەتی داینەگرتبێت؟)

محمد ڕەزا لە دوو ساڵی کۆتایی حکومەتەکەیدا گرنگی بەهیچ شتێك نەدەدا و حەزی لەهیچ شتێك نەدەکرد. دیاریکردنی کچەکەم وەکو جێگری شاهانە و دواتر دیاریکردنی ئەنجومەنی شاهانە تەنها لەبەر ئەم هۆکارە بوو کە پزیشکە فەرەنسیەکان و ئیسرائیلیەکان وتبوویان بە محمد ڕەزا کە ماوەیەکی زۆر ناژیت.

دواتریش لەگەڵ ئەو نەخۆشیە قورسەدا، کێشەی پرۆستاتی هاتە بان و جگەریشی دەستیکرد بە ئاوسان.

دەبێت دەروونناسەکان لەم بارەیەوە بۆچوونی خۆیان دەربڕن کە ئەگەر کەسێك گیرۆدەی نەخۆشیێك ببێت و چاوەڕوانی مەرگ ببێت دەبێت چ گۆڕانێك لە حاڵەتی دەروونیدا ڕوودات. دەبێت دەروونناسەکان بڵێن ئەگەر ئەو کەسە هەموو ڕۆژێك زیاتر

نزیك ببێتەوە لە مەرگ و بە ڕوونی ئەوە ببینێت کە چۆن دەبێت دنیا و هەموو ئەو شتانەی کە خۆشی دەوێن و هەموو ئەو شتانەی کە لەدەوروبەریدا بەجێیان بهێڵێت، چۆن بڕیار بدات و چۆن توشی ڕاڕای و ناجێگیری دەبێت؟

محمد ڕەزا لە کۆتایی دەسەلاتی سەڵتەنەتی خۆیدا، تەنها شایەتی بە باداچوونی کورسی و سەڵتەنەتی پەهلەوی نەبوو بەڵکو چاوەڕوانی کوژانەوەی مۆمی تەمەنی خۆیشی بوو.

لەم دواییانەدا لە کۆشکی نیاوەران هەمووشێك دانیشتنی بانگ کردنی ڕۆحی ئەنجام دەدرا و محمد ڕەزا بە ئامادەبوونی چەند کەسێکی ڕۆحی هەوڵیدەدا بانگی ڕۆحی باوکی بکات و داوای ڕێنوێنی لێ بکات.

یەکێك لەو کەسە ڕۆحیانە کە ئەزموونێکی زۆری لەم کارەدا هەبوو خانەنشینێکی سوپای شا و یەکێکی دیکەیان نوسەرێکی کۆنی ڕۆژنامەی ئیتلاعات بوو، دووەمیان بەهۆی پیریەوە زۆر توانای بانگ کردنی ڕۆحەکانی نەبوو و تەنها بۆ ئەوە بەشداری دەکرد تاوەکو ڕاستی کرداری بانگکردنی کرداری ڕۆحیەتی یەکەم ببینێت و هەڵیبسەنگێنێت و پشتیوانی بکات.

فەرەح کە جارێکیان لەو دانیشتنەدا بەشداری کردبوو دەیوت محمد ڕەزا توانی لەگەڵ ڕۆحی چەند کەسێك لە سەرۆك وەزیرەکانی پێشوو پەیوەندی دروست بکات.

محمد ڕەزا بەهۆی بەشداری کردن لە دانیشتنەکانی بانگکردنی ئەم ڕۆحانە توشی خەیاڵپلاوی بووبوو. دەیوت من پرسیارم بۆ چارەنوس و ئایندەی ئێران کردوە لە کۆچکردوەکان، ئەوانیش وتویانە ئێران توشی دەرگیری و ئاژاوەیەکی گەورە و خوێنرێژێکی فراوان دەبێت!

ئێمە بە تەواوی شایەتی وردبوون و تێکچوونی جەستە و مێشك و دەروونی شا بووبووین. کەواتە چۆن دەتوانرێت چاوەڕوانی کەسێکی لەم شێوەیە تاوەکو ئەم ڕادەیە نەخۆش بکریت کە بۆچوونی خۆی دەربڕێت لەبارەی ئەو بارودۆخە ئاڵۆزەی کە دروستبووبوو و چۆن دەیتوانی ڕووبەڕووی شۆڕشگێڕەکان ببێتەوە و ئەو ڕاپەڕینە دابمرکێنێتەوە؟

لە هەمووشی خراپتر ڕاوێژکارە نزیکەکانی شا وەکو بەڕێز مهندس ئەردەشیر زاهدی بەردەوام ئامۆژگاری شایان دەکرد هەرچی زووتر ئێران بەجێبهێڵێت چونکە بۆ ئەمریکیەکان و بەریتانیەکان گیانی محمد ڕەزا و خێزانەکەی بچوکترین گرنگی نیە و تەنانەت ئەوان ئەوەیان بەلاوە باشترە کە خێزانی پەهلەوی لە ئێراندا کوشت و بڕ بکرێن تاوەکو ئەمە ببێت بە وانەیەك بۆ ئەو کەسانەی کە وابەستەی ڕۆژئاوان و عاقڵ بن بەوەی کە هەرگیز بیر لەوە نەکەنەوە پشت لەوان بکەن و هەوڵی ئەوە نەدەن کە بەرژەوەندی کۆمپانیا ڕۆژئاواییەکان بخەنە مەترسیەوە!

کچەکەم دەیوت: (ئەمانە هەموو خەون و خەیاڵ و تۆمەتن چونکە کارتەر لە دیدارێکدا پشتیوانی خۆی بۆ محمد ڕەزا و سەڵتەنەتی پەهلەوی دەربڕی.)

پلانەکەی کارتەر ئەوە بوو کە محمد ڕەزا بۆ ماوەیەك لە وڵات بچێتە دەرەوە تاوەکو بەختیار زاڵبێت بەسەر بارودۆخەکەدا و پاش دامرکردنەوەی شەپۆلی ناڕەزاییەکە، شا بگەڕێتەوە بۆ ئێران و یان لە بەرژەوەندی کوڕە گەورەکەی واز لە سەڵتەنەت بهێنێت و دەسەلآت بەجێبهێڵێت بۆ ڕەزا محمد.

بەلآم محمد ڕەزا ئەم بۆچوونانەی کارتەری بە درۆی پوچ ناودەبرد و دەیوت ئەمریکیەکان دەیانەوێت من لە ئێران بکەنە دەرەوە بۆ ئەوەی بنەمای سەڵتەنەت پاش من هەرەس بهێنێت!

محمد ڕەزا بەردەوام باسی سەفەرە یەك لەدوای یەکە نهێنیەکانی (رۆبیرت هایزر)ی فەرماندەی هێزەکانی ناتۆی لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا دەکرد بۆ تاران و دەیوت: (ئەم پیاوە بچوکە ئەو ئەرکەی پێ سپێردراوە کە پشتیوانیکردنی سوپا بۆ من هەڵوەشێنێتەوە!)

دواتر کە لە ئەمریکا بووین دیڤید راکفلەر بە ئاشکرا پێی وتین ئەمریکا بەلادانی شا بەرژەوەندی درێژخایەنی هەیە. تاوەکو ئێستا لە بەرژەوەندیماندا بووە پشتیوانی شا بکەین بەلآم لەمەودوا بەرژەوەندی ستراتیژمان لەوەدایە کە شا لابەرین!

دیڤید راکفلەر باوەڕی وابوو هاتنە سەر دەسەلآتی حکومەتێکی ئیسلامی ڕادیکاڵ لە ئێراندا دەتوانێت بۆ یەکێتی سۆڤیەت کە لە سنورەکانی باشوری خۆی لەگەڵ ئێراندا زیاتر لە پەنجا ملیۆن مسوڵمانی هەیە کێشەساز بێت.

ئەو كات ئەفغانستان هێشتا سۆڤیەت دەستی بەسەردا نەگرتبوو دیڤید راكفلەر پێی وتین ئەمریكا دەیەوێت سۆڤیەت توشی شەڕێكی پڕوكێنەر بكات لەگەڵ مسوڵمانەكاندا تاوەكو هێزی ئەو وڵاتە بتوێنێتەوە. ئامانجی كۆتایی واشنتۆن هەرەسپێهێنانی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتیە و ئێمەش بۆ گەیشتن بەم ئامانجە ناچارین لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا گۆڕانێك ئەنجام بدەین!

دواتر كاتێك كە مەسەلەی داگیركردنی ئەفغانستان هاتە پێشەوە ئێمە قسەكانی ڕاكفلەرمان بیر هاتەوە.

شۆڕش لە ئێران و دوابەدوای ئەو سەرهەڵدانی جەنگی نێوان ئێران و عێراق بووە هۆی ڕەونەقی بازاڕی چەك لە ناوچەكەدا كە لەو ڕووداوانەدا تەنها ئەمریكیەكان نزیكەی سەد ملیارد دۆلار چەك و تەقەمەنیان بە وڵاتە دەوڵەمەندەكانی ناوچەكە فرۆشت.

راكفلەر كە لە هاوڕێ كۆنەكانی جەنابی محمد ڕەزا شا و خێزانی ئێمە بوو وتی پاش كۆتایی هاتنی جەنگی ڤێتنام كۆمپانیا چەكسازەكانی ئەمریكا هەرگیز ئەم جۆرە بازاڕە گەرم و گوڕەیان بەخۆیانەوە نەبینیوە و ئەمە یەكێكبوو لە گەورەترین ئەو ئامانجە ئابوریەی كە بۆ ئەمریكا هاتە پێشەوە لەو گۆڕانەی ئێراندا.

ئەو هەلومەرجە قەیرانارویەی كە بەهۆی شۆڕشی ئێرانەوە هاتە ئاراوە لەگەڵ ئەو جەنگەی كە لەنێوان ئێران و عێراقدا دروست بوو، بووە هۆی دابەزینی نرخی نەوت.

ئەو نەوتەی كە لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٨ بەرمیلێكی گەیشتبویە نزیكەی ٤٠ دۆلار بەڵام لە ماوەیەكی كورتدا بەتەواوی دابەزی و تەنانەت لەهەندێك شوێندا بەرمیلی بە حەوت دۆلار دەفرۆشرا!

ویلایەتە یەككگرتوەكانی ئەمریكا و بەریتانیا هۆكارەكانی كەوتنی حكومەتی ئێرانیان فەراهەم هێنا و خۆشیان سەركەوتووبوون بە بەدەستهێنانی گەورەترین دەستكەوتی سیاسی و ئابوری.

هەرەسهێنانی یەكێتی سۆڤیەت بەهۆی دەرئەنجامی شۆڕشی ئێرانەوە بوو. ئابوری سۆڤیەت پشت ئەستور بوو بە داهاتی نەوت. یەكێتی سۆڤیەت گەورەترین بەرهەمهێنەر و فرۆشیاری نەوت بوو لە جیهاندا. دەوترێت كەوتنی نرخی نەوت لە

بەرمیلی ٤٠ دۆلارەوە بۆ ٧ دۆلار بەچەشنێك زیانیدا لە سۆڤیەت کە نەك هەر لەتوانایدا نەبوو هاوکاری هاوپەیمانەکانی خۆی بکات بەڵکو تەنانەت نەیتوانی تێچوونی جەنگی ئەفغانستانیش بکێشێت و تەنانەت لە توانایدا نەما بەتەواوی گەنم بکرێت بۆ هاولاتیەکانی خۆیشی! کاتێك کە ڕاستیەکانمان لە زمانی بەرپرسە گەورەکانی حکومەتی ئەمریکا وەکو دیڤید راکفلەر یان هێنری کیسنجەرەوە دەبیست، ئێدی تێدەگەیشتین کە محمد ڕەزا زۆر توشی پەرێشانی و تێکچوون نەبووە!

سەفەرەکەمان لە ئێرانەوە بۆ میسر نزیکەی ٣ کاتژمێری خایاند، محمد ڕەزا کورسی لای فڕۆکەوانەکەی بەجێهێشت و بەرەولای شوێنی نانخواردنی فڕۆکەکە هات و لەگەڵ من و کچەکەم دەستیکرد بە خواردن، خواردنەکەش علی کبیری، چێشتلێنەرە تایبەتەکەی ئامادەی کردبوو.

لەسەر مێزی نانخواردنەکە ئەمیر ئەصلان ئەفشار سەرۆکی گشتی تەشریفاتی کۆشکی شاهنشاهیش ئامادەبوو.

لەلای منیشەوە سەرهەنگ کیومرس جهانبین دانیشتبوو.

نازانم لە مێشکی محمد ڕەزا چی دەگوزەرا و لە بیری چیدا بوو کە بەبێ پێشەکی وتی:

(باوکم هەڵەیەکی گەورەی کرد، ئەو کاتی پێویستی لەبەردەستدابوو تاوەکو وەکەو کەمال ئەتاتورك هەموو مەلا و ئاخوندەکان بپێکێتەوە!)

دوای نیوەڕۆ گەیشتینە فڕۆکەخانەی ئەسوان. پێش نیشتنەوە، محمد ڕەزا دووبارە ڕۆیشتەوە بۆ سەر کورسی لای فڕۆکەوانەکە و خۆی فڕۆکەوانیەکەی دەکرد.

دوانیوەڕۆیەکی گەرم بوو. سەرۆك کۆمار سادات و هاوسەرەکەی هاتن بۆ پێشوازیمان.

هەموو ڕێوڕەسمێکی مەراسیمێکی ڕەسمی ڕەچاو کرابوو، تەنانەت ٢١ تۆپیش وەکو نیشانەی ڕێز تەقێنران.

دەستەی مۆزیك سرودی شاهنشاهی (سرودی نەتەوەیی ئێرانیان) ژەنی و محمد ڕەزا و کچەکەم فەرشی سوریان بۆ ڕاخرا.

محمد ڕەزا بە ئاشکرا ماندوو و بێتاقەت بوو. سادات هاتە پێشەوە و محمد ڕەزا و کچەکەمی ماچ کرد و وتی: (جەنابی حەزرەت دڵنیابە لەناو وڵاتی خۆت و نەتەوەی خۆتدایت!)

بە بیستنی ئەم قسانە محمد ڕەزا چاوی پڕ بوو لە فرمێسک. موبارەك جێگری سەرۆك کۆماریش یەکێکبوو لەو کەسانەی کە هاتبوو بۆ پێشوازی. سادات و هاوسەرەکەی لە ساڵی ١٩٧٦ بە سەفەرێکی ڕەسمی هاتن بۆ ئێران. محمد ڕەزا لەو سەفەرەدا قەرزێکی بەخشندانەی یەك ملیارد دۆلاری پێشکەش کرد.

جیهان سادات (هاوسەری سادات) یەکێك بوو لە هاوڕێ شەخسیەکانی کچەکەم. تاوەکو پێش شۆڕش هەفتەی چەندجارێك لەگەڵ یەکتریدا بە تەلەفۆنی قسەیان دەکرد.

شوێنی مانەوەی ئێمە لە ئەسوان لە هۆتێل ئوبروی لە دورگەیەکی دروستکراو بوو لە ناوەڕاستی ڕووباری نیل کە لەسەر ئەو ڕوبارە سەدێك دروستکرابوو و لەسەر سەدەکەش ڕووبارێکی دەستکرد دروستکرابوو. ئەو شوێنە میوانخانەیەکی تایبەت بوو کە دەوڵەتی میسر بەتایبەتی دروستی کردبوو بۆ میوانە تایبەتە پلە بەرزەکان.

سادات فەرمانیدا بوو بەدرێژایی ڕێگەی فڕۆکەخانەی ئەسوان تاوەکو شوێنی مانەوەی محمد ڕەزا، وێنەی شا لە هەموو شوێنێك هەڵواسن و لافیتەی پێشوازیشیان بە زمانی فارسی و عەرەبی هەڵواسیبوو.

لەسەر مێزی نان خواردنی ئێوارە قسەی زۆر لەنێوان سادات و محمد ڕەزادا کرا.

سادات شای توشی سەرسوڕمان کرد کاتێك پێی وت بۆ یەکەمینجار محمد ڕەزای لە کاتی خوازبێنی مەلەکە فەوزیەدا بینیوە!

سادات وتی بە محمد ڕەزا کاتێك لە ساڵی ١٩٣٩ کاتێك محمد ڕەزا هاتبوو بۆ بینینی فەوزیە بۆ میسر ئەو ئەفسەرێکی گەنج بوو لە سوپای مەلیك فاروق، لە مەراسیمی پێشێوازی سەربازی لە بەردەم وەلیعەهدی گەنجی ئێران (محمد ڕەزا) ئامادەبوو!

پاش خواردنی نانی ئێوارە ڕۆیشتین بۆ تەلاری دانیشتن و بەدەم خواردنەوەی چای و قاوە درێژەماندا بە قسە و باسەکانمان.

هەرچەندە پزیشکەکان بەهەمووشێوەیەك مەشروبات و خواردنەوەیان قەدەغە کردبوو لە محمد ڕەزا، بەڵام لیوانێك گیلاسی کنیاکی خواردەوە و دواتر چەند جارێك لیوانەکەیان بۆ پڕ کردەوە و ئەویش خاڵی دەکرد (محمد ڕەزا بەدرێژای تەمەنی زۆر حەزی لە کنیاك خواردنەوە دەکرد لەگەڵ کوری و ئیزەر) محمد ڕەزا کە بەتەواوی مەستبووبوو لە ناکاو دەستیکرد بە گریان. هەر وەکو منداڵی ساوا هەنسکی دەدا و زوو زوو دەگریا.

هەموو بێدەنگبووبووین.

ئەمیر ئەصلان ئەفشار هەندێك شانی محمد ڕەزای شێلا و توانی ئارامی بکاتەوە.

کاتێك هەندێك هاتەوە سەرخۆی ڕووی کردە سادات و وتی: (وەکو فەرماندەیەکم کە سەربازەکانی خۆی لە مەیدانی جەنگدا بە تەنها هێشتبێتەوە و خۆشی هەڵهاتبێت!)

(جیهان سادات) پرسی: (ئێستا بە باوەڕی جەنابت چی هاتووە بەسەر ئەواندا؟)

محمد ڕەزا وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوە.

(سادات) بۆ ئەوەی شا لەناو ئەو خەم و بێتاقەتیەدا دەربێنێت وتی: ((میسر ئامادەیە ئەفسەرانی پلە بەرزی سوپا بگرێتە خۆی و ئیقامەی سیاسیان بداتێ. یان بەلایەنی کەمەوە دەتوانن بۆ ماوەیەك لەمیسر بمێننەوە!)

محمد ڕەزا سەرێکی جوڵاند و لەژێر لێویەوە قسەیەکی وت بەکارتەر و وتی: (نەخێر. ئەمریکیەکان ڕێگە بەم کارە نادەن. کاتێك کە ئەوان منیان لە وڵاتەکەم کردە دەرەوە چۆن ئامادە دەبن ئیقامە بدەن بە ئەفسەرەکانم. ئەوان پێشتر پیاوەکانی خۆیان لە وڵات هێنایە دەرەوە. ئەوانەی کە ماون چارەنوسیان نادیارە!)

دواتر محمد ڕەزا ئەوەی ئاشکرا کرد کە سەفیری ئەمریکا و ئەمیر رۆبێرت هایزر داوایان لێ کردوە ڕێگە بدات بە هەندێك لە ئەفەسەرکانی وەکو ژەنراڵ تۆفانیان، ژەنراڵ ئەزهاری، ژەنراڵ ئویسی، ژەنراڵ جەم، ژەنراڵ مین باشیان و کۆمەڵێکی تاوەکو لە ئێران بڕۆنە دەرەوە.

شا وایدەزانی هەندێك لە ئەفەسەرکانی وەکو ژەنراڵ حسین فردوست پێش ئەو لە ئێران هەڵهاتوون. بەڵام دواتر کاتێك کە هەواڵی خیانەتی فردوستیان پێدا وەکو

کەسێك کە توشی لێدانێکی قورس بووبێت زوو زوو لە ژوورەکەی خۆی دەهات و دەڕۆیشت و بە بەرخۆیەوە دەیوت: (فردوست، فردوست!..نەخێر، نەخێر... باوەڕ ناکەم... بەهیچ شێوەیەك باوەڕناکەم!)

ئێمە پێنج ڕۆژ لە ئەسوان بووین، ئەمیر ئەصلان ئەفشار و بەڕێز محمد جعفر بهبهانیان کە لە سویسراوە هاتبوون بۆ میسر هاتن بۆلامان. فشار و زۆریان کرد لە شا بۆ ئەوەی میسر بەجێبهێڵێت.

ئەمیر ئەصلان ئەفشار و بهبهانیان باوەڕیان وابوو ئەمە پلانی ئەمریکایە بۆ ئەوەی شا لە ئەسوان و دوور لە هۆکارەکانی پەیوەندی گشتی و چاپەمەنیەکان بمێنێتەوە.

بهبهانیان باوەڕی وابوو ئەمریکا حەز ناکات ڕێگە بدات بە محمد ڕەزا بچێت بۆ ئەمریکا و حەز دەکات هەر لە میسر بمێنێتەوە و تاوەکو لێرە بەرە بەرە بۆخۆی بمرێت.

محمد ڕەزا بەهۆی تەشەنە سەندنی خێرای شێرەپەنجەکەیەوە پێویستی بە نەشتەرگەری بەپەلە هەبوو و باشترین چارەسەریش بۆ نەخۆشیەکەی ئەمریکا بوو.

دواتر ئێمە بیستمان ئەو ڕاوێژکارانەی ئەمریکا کە لە دەوڵەتی کاتی ئێراندا ئەندام بوون و کەسانی وەکو صادق قطب زادە کە خاوەنی جنسیەی ئەمریکی بوون هۆشداری توندیان دابوو بە ئەمریکا کە بە هیچ شێوەیەك ڕێگە نەدات بە شا بچێتە ناو ئەمریکاوە بۆ ئەوەی لە پەیوەندی نێوان ئەمریکا و ئێراندا هیچ کێشەیەك دروست نەبێت.

لە ڕۆژانی کەوتنی سەڵتەنەت و هاتنە سەر حوکمی حکومەتی شۆڕشگێڕی بیرۆکەی بوونی پەیوەندی نێوان ئەمریکا و هەندێك لە ئەندامە گرنگەکانی دەوڵەتی کاتی ئێران بە خەم و پەشێوێکی منداڵانە بەرچاو دەکەوت. بەڵام دواتر کاتێك کە هەندێك لە بەرپرسەکانی ئێران بە تاوانی سیخوڕی بۆ ئەمریکا دەستگیرکران و لەسێدارە دران دەرکەوت ئەمریکیەکان لەگەڵ گروپە دژەکانی ئێران هەر لە ساڵانی دەیەکانی ١٩٦١ وە پەیوەندی هەبووە و لە کاتی ئەنجامدانی کۆبوونەوە بەناوبانگەکەی گوادلوپ لە (فەرەنسا) کە لەو دانیشتنەدا وڵاتە گەورەکانی جیهان ئامادەبوون و باسیان لە دوورخستنەوەی شا دەکرد و دەگەیشتنە ڕێکەوتنێك،

هەندێك لەو پیاوانە مەبەست لە پیاوانی شۆڕش لەپشت دەرگای كۆبوونەوەكەوە ئامادەبوون و چاوەڕوانی دەرئەنجامی ڕێكەوتنەكەیان دەكرد بە ڕێبەرایەتی زلهێزە گەورەكانی جیهان!

كاتێك سەفارەتی ئەمریكا لە تاران لەلایەن كۆمەڵێك گەنجی توندڕەوەوە دەستی بەسەردا گیرا ئەو كەسانە خوازیاری ئەوەبوون بارمتەكانی سەفارەت بگۆڕنەوە لەگەڵ محمد ڕەزادا، شا سوێندی خوارد ئەمەش پلانی خودی ئەمریكایە و لەپشت پەردەی ئەم ڕووداوەوە دەبێت شتێكی دیكە لە ئارادا بێت!

پاشان ڕووداوێكی دیكە ڕوویدا گومانەكەی محمد ڕەزای سەلماند و بووە ڕاستی.

بەلایەنی كەمەوە قەناعەتمان كرد بەوەی كە بەرەیەك هەیە لە ئەمریكا خوازیاری ئەوەیە لەگەڵ حكومەتی تازەی شۆڕشگێڕیدا لە ئێران سازش بكات و بەرامبەر بەو سازشەش محمد ڕەزا تەسلیمی دادگای شۆڕشی ئیسلامی بكات.

لە پەنەما ئەوەندەی نەمابوو فڕۆكەكەمان بوەستێنن و محمد ڕەزا دەستگیر بكەن و ڕەوانەی ئێرانی بكەنەوە. من دواتر لەم بارەیەوە قسەتان بۆ دەكەم.

بەگشتی ئێمە پێنج ڕۆژ لە ئەسوان بووین لەم ماوەیەدا كەسانی زۆر نەدەهاتن بۆ سەردانمان. تەنانەت پەیوەندێكی زۆری تەلەفۆنیشمان نەبوو. لە ئێران بەهۆی ئەوەی كە كارمەندانی بەشی گەیاندن مانگرتنیان ڕاگەیاندبوو ئەگەری تەلەفۆن كردن نەبوو لەگەڵماندا. یەكێك لەو كەسانەی كە زۆر تەلەفۆنی دەكرد مەلیك حسینی پاشای ئەردەن بوو.

كنسانتین پاشای پێشوی یۆنان كە یەكێك بوو لە هاوڕێ نزیكەكانی كچەكەم زۆر تەلەفۆنی دەكرد و زۆر بێتاقەت و نیگەران بوو لەو بارودۆخەی كە ڕوویدابوو.

كنسانتین پاشای پێشوی یۆنان بارودۆخی ئێمەی باشتر لە خەڵك دەزانی چونكە ئەویش وەكو محمد ڕەزا لە پاشایەتی دوورخرابوویەوە.

كاتێك گەیشتینە ئەسوان فەرەح تەلەفۆنی كرد بۆ پاریس و بەخێرای دكتۆر (ژۆرژ فلاندن) هات بۆ میسر.

ئەم دكتۆرە فەرەنسییە پێنج ساڵ پێشتر چارەسەری شێرپەنجەی محمد ڕەزای كردبوو.

کنسانتین پاشای پێشوی یۆنانیش خۆی گەیاندە ئەسوان.

کچەکەم (فەرەح) تەفەلۆنی کرد بۆ بازل (سویسرا) کە پایتەختی بانکی ئەو وڵاتە بوو، ڕاوێژکارە داراییەکەی محمد ڕەزاشی بانگ کرد.

بهبهانیان کە زیاتر لە حەفتا ساڵ تەمەنی بوو، دەموچاوێکی خڕ و سمێڵێکی خۆڵەمێشی هەبوو، پێش ئەوەی لە ڕاوێژکاری سەرەکی کاروباری دارای شا و سەرپەرشتی سامانی خێزانی پەهلەوی لە دەرەوەی وڵات بچێت، لە باوکە گەورەی ئیفلام کارتۆنەکان دەچوو.

محمد ڕەزا وتی بە جعفر بهبهانیان لەوە بەدوا خۆم کاروباری داراییەکان لەدەست دەگرم، ئیدی پێویست بە تۆ ناکات کاروبارەکانی دارایی و ماڵی پەیوەست بە حسابە بانکیەکان بەڕێوەبەریت.

محمد ڕەزا فەرمانیدا بە بهبهانیان نامە بنوسێت بۆ هەموو بانکەکانی دەرەوە بۆ ئەوانەی کە حسابی هەبوو بۆ ئەوەی لەو مەسەلەیە ئاگاداریان بکاتەوە.

لەو چەند ڕۆژەی بهبهانیان لە ئەسوان بوو گریمانەیەکی دیکە لە بارەی هۆکاری کەوتنی سەڵتەنەتی پەهلەوی خرایەڕوو و بۆچوونێکی تازەش هاتە سەر بۆچوونەکانی پێشوو.

بهبهانیان لە بەردەم محمد ڕەزا چەندجارێك ئەوەی خستەڕوو کە باوەڕی وایە ئەمریکا لە کەوتنی شادا هیچ ڕۆڵی نەبووە و ئەمە پلانێکی بەریتانیەکان بووە و بەریتانیەکان لەڕاستیدا ئەمریکاشیان هەڵخەڵەتاند!

بهبهانیان وتی دکتۆر محمد مصدق توانی نەوتی ئێران لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیەکاندا دەربهێنێت و بیداتە دەست ئەمریکیەکان. دواتریش ئەمریکیەکان مصەدقیان لابرد و بە گەڕانەوەی شا بۆ دەسەڵات، ئێرانیان خستە ژێر چاودێری خۆیانەوە و پێیان خستە سەر بەرژەوەندیە چارەنوسسازەکانی بەریتانیا. لەو کاتەوە بەریتانیەکانیش بەشوێن گەڕانەوەی ئابڕو و کەرامەتی خۆیانەوە بوون و لە ساڵی ١٩٥٣ بە دواوە بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ دەستیان کرد بە پەروەردەکردنی پیاوەکانی خۆیان، تاوەکو لە کاتێکی گونجاودا بیانگەڕێنەوە بۆ ئێران و بیانکەنە جێگرەوەی حکومەتی سەڵتەنەتی!

کـچەکەم فـەرەح زۆر بەتونـدی دژی ئـەم بۆچـوونە بـوو و بـە بـیٚ نـاوەرۆك و بـە گاڵتەجاڕی ناوی برد و وتـی: (ئەمریکا و بەریتانیا وەکو رۆحێکن لە دوو جەستەدا. بەریتانیـەکان نـزیکترین هاوپـەیمانی ئەمریکیـەکانن و ئـەم گریمانەیـە وانیـە کـە تـۆ دەیڵێیت!)

بهبهانیان زۆر بێتاقەت بوو لەم بۆچوونەی فەرەح و بۆ چەند خولەکێك بێدەنگ بوو. پاشـان ڕووی کـردە محمـد ڕەزا و وتـی: (لـە ئێرانـدا بانگەشـەی زۆر کـرا تـاوەکو ئـەوە نیـشانی خـەڵك بـدرێت جـەنابی حـەزرەت هـیچ پەیوەسـت نیـە بـە مەسـەلەی ئـاین و مەزهەبەوە و باوەڕیشی بە ئیسلام نیە. پێت چۆنە هەمووومان بڕۆین بۆ مەکەی پیرۆز و لەویٚ عەمرەیەك بکەین.

بەڕێز ئەمیر ئەصلان کە بێدەنگ دانیشتبوو خۆشحاڵ بوو بەم پێشنیارە، لەکاتێکدا زۆر بەکەیف دەردەکەوت وتی: (ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی دنیا جەنابی حـەزرەت لـە کـاتی زیارەتکردنـدا ببیـنن و پلانـی ئاخوندەکانیش بـۆ بـیٚ دیـن نیـشاندانی جـەنابی حـەزرەت ببێتـە جوتـی نـاو نـاو. هەروەها دەتـوانین داوا بکـەین لـە شـا خالیـد (پاشـای سعودیە) بکەوێتە نێوان جەنابی حەزرەت و بەریتانیا و ئەمریکاوە!)

تانە و تەشـەری بۆچوونی چەند خولـەکێکی پێشتری کچەکەم (فـەرەح) بـۆ وەڵامـی بانگەشـەکەی بهبهانیـان لـەبارەی ئـەوەی کـە گوایـە بەریتانیـەکان دەسـتی هـەبووە لـە کـەوتنی شـادا لـەبیر کـرا و دووبـارە گفتوگـۆ لـەبارەی هۆکـاری گـۆڕانی ڕژێمـەوە دەستپێکرد.

بهبهانیان وتی بەریتانیەکان لە ئێرانی هاوچەرخدا سیٚ جار حکومەتیان گۆڕیوە. جارێکیان محمد علی شایان هێنایە خوارەوە، ،جارێکیشیان ئەحمـەد شـا و ئێـستاش جەنابی حەزرەت!

ئامـاژەی بهبهانیـان بـۆ کـەوتنی ئەحمـەد شـا لەلایـەن بەریتانیەکانـەوە بـووە هـۆی تورەبوونی محمد ڕەزا و وتـی بـە بهبهانیـان: (پیـاوی بچوکی نەزان بەسـە درێـژەی پـیٚ مەدە!)

بهبهانیان زۆر بێتاقەت و نیگەران بوو کاتێك کە محمد ڕەزا لەبەرچاوی ئامادەبوان ئەو قسەیەی پێ وت و بەیانی زوو هەموومانی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ سویسرا بۆ بازل.

بهبهانیان پێش ئەوەی ئەسوان بەجێبهێڵێت بە ئەمیر ئەصلان ئەفشار و سەرهەنگ جهانبینی و سەرهەنگ نویسی وتبوو: (زۆر بەداخم کە تەمەنێکی دووروودرێژ خزمەتی کەسێکی لەم شێوەیەم کردوە!)

لەبارەی جعفەر بهبهانیان دەبێت ئەوە بڵێم بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ کاروبارە داراییەکانی پاشای بەڕێوە دەبرد و کەسێکی زۆر تەندروست و ڕاستگۆ بوو. زۆرێك لە حسابە بانکیەکانی شا لە دەرەوەی وڵات بەناوی بهبهانیانەوە بوو، ئەگەر بیویستایە دەیتوانی ئەم پارانە نەنێرێت بۆ شا. بەڵام تەنانەت یەك دیناریشی لەم موڵکو ماڵە نەخوارد. سەرەڕای ئەوەی محمد ڕەزا لە ڕۆژەکانی کۆتای تەمەنی لە بەردەم ژمارەیەك خەڵکی زۆر بە نەزان ناوی برد، بەڵام بهبهانیان چی کرد و چۆن وەڵامی محمد ڕەزای دایەوە؟

ئەمەش یەکێکە لە بابەتە سەیرەکانی مێژوو.

بهبهانیان پاش ئەوەی ئەسوانی بەجێهێشت و ڕۆیشتەوە بۆ سویسرا بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە ئەو شەوە ئاگاداری ئەو ڕووبەڕووبوونەوەی محمد ڕەزا بوون لەگەڵیدا نامەیەکی نوسی و لە نامەکەدا داوای کردبوو لە هەموو ئەو ئامادەبوانەی کە لەوێدا بوون خۆیان دادوەری بکەن بزانن شا نەزان و ئەحمەقە یان ئەو!

بهبهانیان لەم نامەیەك بۆ نمونە نوسیبووی: (ئەسداللە علم سەرۆك وەزیرانی وڵات لە ساڵی ١٩٦٣ دەیویست ئایت اللە خومینی لەسێدارە بدات، بەڵام محمد ڕەزا تەسلیمی فشارەکانی ئاخوندەکان بوو و ڕەزامەندی پیشاندا بە دوورخستنەوەی.

ئەسداللە علم وتی بە شا من سەرۆك وەزیر و بەرپرسی پاراستنی ئاسایشی ئەم وڵاتەم، ئەگەر ئەم پیاوە (ئایت اللە خومینی) بە زیندووی بمێنێتەوە درەنگ یان زوو دووبارە بەشێوێکی دیکە دەنێتەوە، بەڵام شا لەبری ئەوەی کە ڕووبەڕووی ئایت اللە خومینی بێتەوە کەچی ئەسداللە علمی لەکارەکەی دوورخستەوە!)

بهبهانیان لەم نامەیەدا هەوڵیدا بوو بە بەڵگە و دەلیلی قەناعەتپێکراو بیسەلمێنێت کە محمد ڕەزا بێ عەقڵ و نەزانە نەك ئەو!

هەروەها لە نامەکەدا بابەتێکی دیکەی لەبارەی هەویداوە باس کردبوو کە ئێمە لە نزیکترین کەسانی محد ڕەزا و دەوڵەتەکەی بووین تاوەکو ئەو کاتە هیچشتێکمان لەبارەی ئەو بابەتەوە نەدەزانی.

ئەم نامەیە بهبهانیان بۆ محمد ڕەزا نوسیبووی و نوسخەیەکیشی ناردبوو بۆ ئێمە.

هەمووومان بە هاوئاهەنگی هەوڵماندا ئەو نامەیە نەهێڵین بگاتە دەست محمد ڕەزا و لێی بشارینەوە. و هیچکەسیش نەڵێت بە شا کە بهبهانیان نامەی ناردوە.

چونکە ناوەرۆکی نامەکە پڕبوو لە سوکایەتی و خستنەڕووی نەزانی و عەیب و عارەکانی محمد ڕەزا. لەبەر ئەوەیە دەڵێم هەموو ئەو کەسانەی کە لە دەورووبەری ئێمە بوون کەسانێکی ڕیاکار و دووڕوو درۆزن و بچوك بوون. کاتێك تێگەیشتن ئیدی شا ناگەڕێتەوە بۆ تاران و دەسەڵاتی جارانی نابێت، هەموویان ڕووی ڕاستەقینەی خۆیان نیشانداین.

سەرهەنگ جیهانبینی و سەرهەنگ نویسی لە بەردەم محمد ڕەزا پێکەوە گاڵتە و قسەی سوکیان بەیەك دەوت و گاڵتە و سوکایەتیان دەکرد!

ماچکردنی دەستی جەنابی حەزرەت وەلانرا و لەگەڵ ئەوەی کە هێشتا چەند ڕۆژێك تێنەپەڕی بوو لە دەرچوونی شا لە ئێران ئیدی ڕەعیەتەکانی پێشوو ئامادە نەبوون دەستی زاوای خوالێخۆشبووم ماچ بکەن!

محمد ڕەزا دڵنیابوو ئیدی هیچ ڕێگەیە نیە بۆ گەڕانەوەی و تاوەکو کۆتایی تەمەنیشی ناتوانێت ئێران ببینێتەوە. تەنانەت هەندێکجار ئێمە بۆ دڵدانەوەی و بەرزکردنەوەی ورەی دەمانوت ئەگەرێکی زۆری هەیە سوپا هەستێت و بارودۆخەکە هەڵبگەڕێتەوە، بەڵام محمد ڕەزا سەرێکی بەرز دەکردەوە بە ئاماژەی نەخێر و دەیوت: (ژەنراڵ هایزەر) سوپاکەی هەڵوەشاندەوە.

پاش دەرچوونمان لە ئێران ژەنراڵ عباس قرەباغی بەیاننامەی بێلایەنی سوپای دەرکرد و سوپای لە سەرجادەکان گەڕاندەوە بۆ ناو بنکەکانیان.

کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە محمد ڕەزا بە توڕەییەوە تفی کردە سەر زەوی و وتی: (ئەم پیاوە بچوکە کەرە من لە گوندەکانی ئەردەبیلەوە هێنام و گەیاندمە پلەی ژەنراڵی، سەیرکەن بزانن چۆن وڵاتی هەرەسپێهێنا!)

ماوەیەك دواتر کە لە مەراکیش بووین کمال الدین حبیب ئیلاهی، فەرماندەی هێزی دەریایی شاهنشاهی کە توانیبووی بە هاوکاری قاچاخچیەکان لە ڕێگەی شاخەکانی سنوری ئێران و تورکیا هەڵبێت و خۆی بگەیەنێتە ئێمە، ئەوەی باس کرد بۆمان کە ژەنراڵ قەرە باغی لەبری ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ یاخیەکان و شۆڕشگێڕەکان سوپاکەی گەڕاندەوە بۆ بنکەکانی و لە بەرامبەر ناڕەزایەتی ئەفسەرە پلە بەرزەکانی وەکو فەرماندە نشاط کە پێی باش بوو بە توندوتیژی خۆپیشاندانەکە دابمرکێنرێتەوە دەیوت: (ئەمریکا و ژەنراڵ هایزەر داوایان لێ کردوە سوپا بێ لایەن بکات و بیگەڕێنێتەوە بۆ بنکەکانی!)

ئیلاهی دەیوت ژەنراڵ حسین فردوست ڕیشی خۆی درێژ کرد و خۆی لە شێوەی ئیسلامیەکان لێ کرد و دەستیکرد بە هاوکاری کردنیان!

ئیلاهی دەیوت ناصر مقدم سەرۆکی ساواکیش لە شۆڕشگێڕەکانەوە بەڵێننامەی پاراستنی وەرگرتبوو[1]!

حبیب ئیلاهی کە لە دانیشتنی فەرماندە باڵاکانی سوپادا بەشداریێکی چالاکی هەبوو، پێرستێکی درێژی لە ئەفسەرە خائینەکان پێشکەش بە شا کرد، کە

---

[1] – ناصر مقدم (سەرۆکی ئیدارەی دووەمی بنکەی سوپا) و دواهەمین سەرۆکی ساواك چەند مانگێك پاش سەرکەوتنی شۆڕش لەکاتێکدا کە لە دەورووبەری سەدی کەرەج خەریکی دروستکردنی ڤێلا بوودەستگیرکرا و تەسلیمی دادگای ئیسلامی کرا.

لە دادگای ئیسلامی بانگەشەی ئەوەی کرد کە لەلایەن دەوڵەتی کاتیەوە نامەی پاراستنی وەرگرتوە، بەڵام بڕیاری شەرعی (ئایت الله خلخالی) بەسەردا سەپێنراو و بەهۆی ئەو تاوانە زۆرانەی کە کردبوونی بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ درا.

کەسانی وەکو ناصر مقدم و ژەنراڵ حسین فردوست ئەگەریش ڕیشیان هێشتبێتەوە بۆ ئەوە بوو کە دەموچاریان بگۆڕن.

بەدەرچوونی شا لە ولاَت سەد و هەشتاد پلە هەڵگەڕابوونەوە و ڕوویانکردە شۆڕشگێڕەکان!

ئەمیر ئەصلان ئەفشار کە شایەتی ئەم بۆچوونەی بوو بێ ئیرادە و بەدەنگی بەرز وتی: (ئەم خائینانە لەوە بەدوا چۆن دەتوانن سەیری جەنابی حەزرەت بکەن؟)

محمد ڕەزا بە بیستنی قسەی (ئەمیر ئەصلان) زەردەخەنەیەکی تاڵی کرد.

ئێمە تێگەیشتین لە مانای ئەم زەردەخەنە. محمد ڕەزا دەیزانی کە ئیدی بەهیچ شێوەیەك گەڕانەوەی نیە و جارێکی دیکە ئەم فەرماندانە چاویان بە محمد ڕەزا ناکەوێتەوە!

باسی ئەوەم کرد ئێمە بەگشتی بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ لە ئەسوانماینەوە. سادات هەوڵیدەدا ئەو ماوەیە کاتەکانی خۆی لەگەڵ شا بەسەر بەرێت تاوەکو لەو بێتاقەتی و خەمۆکیە دەریبهێنێت یان بەلایەنی کەمەوە عادەت بکات بەو بارودۆخەی کە بەسەریدا هاتبوو.

محمد ڕەزا و سادات ڕۆژانە بە بەلەم لەسەر ڕووباری نیل دەگەڕان یتم دەڕۆیشتن بۆ سەردانی پەرستگەی وێرانی فیلا لە کەناری نیل.

هەمووشتێك بۆ ئێمە تەواوبووبوو و چاوەڕوانی هەواڵ بووین لە ئەمریکا تاوەکو بە فڕۆکەیەکی تایبەتی بەرەو ئەمریکا بڕۆین. لە ڕۆژی پێنجەم کە هەموومان خۆمان ئامادە کردبوو بۆ سەفرکردن بۆ ئەمریکا، ئەردەشیر زاهدی لە واشنتۆنەوە تەلەفۆنی کرد و هەندێك لەگەڵ محمد ڕەزا قسەی کرد. پاشان کەسێك کە کارمەندی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بوو تەلەفۆنەکەی لە دەستی زاهدی وەرگرت و دەستیکرد بە گفتوگۆ کردن لەگەڵ محمد ڕەزا.

پاش ئەم قسەکردنەبوو، ئیدی تێگەیشتین مسیری ئێمە گۆڕاوە و لەبری ڕۆیشتن بۆ واشنتۆن دەبێت بۆ مەراکیش بڕۆین.

کاتژمێرێك دواتر سەفیری مەراکیش لە قاهرە خۆی بە پەلە گەیاندە ئەسوان تاوەکو بانگهێشتنامەی ڕەسمی سوڵتان حسن بدات بە محمد ڕەزا.

سوڵتان حسن (شای مەراکیش) وەکو سادات لە سەردەمی دەسەلاَتی محمد ڕەزادا، قەرزی زۆر بەخشندانەی بێ بەرامبەری لە ئێران وەرگرتبوو.

هەرچەندە سوڵتان حسن هەوڵیدا نیشانی بدات کە بانگهێشتەکەی محمد ڕەزا و هاوڕێکانی لایەنێکی شەخسی هەیە و نیشانە و پەیوەندی و گرنگیدانیەتی بە شای ئێران، بەڵام ئێمە دەمانزانی سادات دەترسا لەوەی ڕادیکاڵە ئیسلامیەکانی میسر و ئیخوان مسلمین لەدژی شای ئێران لە میسر دەستبکەن بە خۆپیشاندان و ئاژاوە بنێنەوە. هەر لەبەر ئەوە داوای کردبوو لە سوڵتان حسن تاوەکو چەند ڕۆژێک میوانداری شای ئێران بکات!

ئەمریکیەکان نەیاندەویست محمد ڕەزا قبوڵ بکەن فشاریشیان هێنابوو بۆ سادات تاوەکو لە میسر گلی بداتەوە. بەڵام سادات وتبووی بوونی شا لە میسر ئەگەری ئەوەی هەیە مەترسی بۆ دروستبکات. هەڵبژاردنی مەراکیش وەکو شوێنی مانەوەی تازە بۆ محمد ڕەزا بە ڕەزامەندی ئەمریکا و میسر بوو و سوڵتان حسنیش زیاتر لەژێر فشاری ئەمریکیەکان و میسریەکاندا محمد ڕەزای قبوڵ کرد.

٢٣ یان ٢٢ جنێوەری ١٩٧٨ بوو بەرەو مەراکیش چووین.

مەلیک حسنی دووەم بۆ پێشوازی لە محمد ڕەزا و کچەکەم هاتبوو بۆ فڕۆکەخانە و لەوێش مەراسیمێکی ڕەسمی سازکرا بەشێوەیەک کە لە شەئن و شەوکەتی سەرۆکی وڵاتێکدا بێت.

پاش کۆتای هاتنی مەراسیمی پێشوازیەکە، محمد ڕەزا و ئێمە کە میوانی شا حسنی دووەم بووین ڕۆیشتین بۆ کۆشکی (بەهەشتی گەورە) کە شوێنی تایبەتی میوانە پلە بەرزەکان بوو.

ئەم کۆشکە زۆر شکۆمەند و بەرز بوو لەسەر شاخەکانی ئەتەڵەس بوو دیمەنی زۆر دڵڕفێن لەدەوروبەریدا بوو. مەراکیش یەکێکە لەو وڵاتە هەژارە عەرەبیانەی ئەفریقا کە لە سەردەمی سەڵتەنەتی محمد ڕەزا یارمەتی زۆری دارای و قەرزی بێ سودی پێ درابوو. بۆیە بانگهێشتی سوڵتان حسن جۆرێک بوو لەو پێزانین و قەدرزانیەی کە پێشتر لەبارەیەوە کرابوو.

لەم ناوچەیەدا کانێکی ئاوی گەرمی کانزای هەبوو کە زۆر جێگەی ڕەزامەندی محمد ڕەزا و کچەکەم بوو. منیش کە ماوەیەکی زۆر بوو توشی ئازاری ئێسقانەکان ببووبووم بە زووی خۆم گەیاندە ئەو ئاوە گەرمە گۆگردیە.

ئاوەکە لە نزیک هۆتێلی مەئمونیەوە بوو باخێکی سەوز و دەریاچەیەکی جوانی سروشتیشی لێ بوو. محمد ڕەزا دەیوت سوڵتان حسن ئەم هۆتێلەی لەسەر شێوەی هۆتێلی جوانی رامسەر دروستکردوە. ئەم هۆتێلە بەردەوام شوێنی دەوڵەمەند و دیبلۆماتە بەناوبانگەکانی جیهان بوو.

ئەو کەسانەی لەو هۆتێلەدا مابوونەوە وەکو وینستۆن چرچیل، پل گیتی، گلبنگیان، ئوناسیس و باربارا و...بوون

بەڕێوەبەری هۆتیلەکە وێنەی ژمارەیەکی زۆر لەو بەرپرس و دیبلۆماتکار و سیاسیانەی کە پێشتر سەردانی هۆتیلەکەیان کردبوو بە دار و دیواری هۆتیلەکەدا هەڵواسیبوو.

زانیم دوای ڕۆیشتنی ئێمەش وێنەی جەنابی حەزرەتیش لەتەنیشت وێنەکەی وینستۆن چرچێلەوە هەڵدەواسرێت!

ڕۆژنامەنوسێکی زۆری ئەمریکی و بەریتانیش هاتبوون بۆ هۆتێلەکە تاوەکو بتوانن چاویان بە محمد ڕەزا بکەوێت و چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ساز بکەن. لەناو ئەم کەسانەدا چەند کەسێك هەبوون دواتر کتێبیان لەبارەی ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٧٨ی ئێرانەوە نوسی وەکو: ریچارد کاپوشینسکی، ویلیام شوکراس، کریستین ئوکرینت، ڤالتەر پیکپوس، دان مۆرگان، پەپیر سالنجەر و هتد...

هەروەها کۆمەڵێك لە دیبلۆماتکارەکانی پێشوو، سەفیرە کۆنەکانی ئەمریکا و ئەوروپا، شەریکە بازرگانەکانی محمد ڕەزا و کەسانی ناسراوی وەکو: (ژەنراڵ ڤرنون ڤالتەر) کە یەکێك بوو لە پیاوە دیارەکانی پەنتاگۆن و بە حکومەتی سێبەر دەناسرا لە ئەمریکا و لە سەرەتای خزمەتی خۆی لە پەنتاگۆن لەگەڵ محمد ڕەزادا پەیوەندی دۆستانەی هەبوو، (لۆرد چالفۆنت) کە پێشتر وەزیری حکومەتی کرێکارانی بەریتانیا بوو و هەروەها هەریەکە بە هۆکارێك (و زۆرتر بە هۆکری چاوپێکەوتن لەگەڵ محمد ڕەزا) هاتبوون بۆمەراکیش. هاوکات بە بوونی محمد ڕەزا لە کۆشکی بەهەشتی گەورە، کۆمەڵێکی دیکە لە ناودارەکانی جیهان لە نزیکی ئەو واتە لە (هۆتیل مأمونیە) نیشتەجێبووبوون.

کەسانی وەکو: (کۆنت دوپاری (بانگەشەکاری تاج و تەختی فەرەنسا) کە خەریکی نوسینی کتێبی بیرەوەریەکانی بوو، لۆرد (ندا بانینگی سیتوله) ئەندامی دەوڵەتی هاوپەیمانی رودزیا. سیمئۆن (پاشای پێشوی بولغاریا) کە هاوڕێی نزیکی محمد ڕەزا و شا حسن (پاشای مەراکیش) بوو.

ئێمە لە مەراکیش سەرلێشواوانە مابووینەوە. هێشتا بەڕاستی پێمان نەوترابوو کە هۆکاری دواکەوتنی قبوڵمان لە ئەمریکا بۆچی دەگەڕێتەوە؟

محمد ڕەزا لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و لەناو حزبی کۆماریخوازەکانیشدا هاوڕێی هەبوو.

لە واشنتۆن زانیاری دژ و پێچەوانە دەگەیشت. ژمارەیەك لە دۆستەکانی دڵنیاییان دەکردەوە کە سەرئەنجام ئەمریکا قبوڵی دەکات و کۆمەڵێك زانیاریشی پێ دەگەیشت کە ئەمریکا هەرگیز ئامادە نیە قبوڵی بکات و لە ناو خاکەکەیدا بمێنێتەوە و تەنانەت ئەگەر ئەمریکا قبوڵیشی بێت محمد ڕەزا بچێت بۆ ئەمریکا دەبێت خۆی نەڕوات چونکە لەوانەیە ببێتە هۆی تێکچوونی پەیوەندی نێوان ئەمریکا و دەوڵەتی شۆڕشگێڕی ئێران و لەم ڕێگەیەوە زیان بکەوێت لە بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا!

محمد ڕەزا بەئاشکرا بەهۆی ئەم هەواڵە دژ و ناکۆکانەوە بە تەواوی ڕۆحیەتی خۆی لەدەستدابوو بۆیە پەیوەندی کرد بە سەفیری ئەمریکا لە ڕیباط.

(ریچارد پارکەر) بەڵێنی پێدا کە ئەمریکا قبوڵی بکات.

یەکێك لەو کەسانەی کە شای هاندەدا بۆ ئەوەی لە مراکیش یان لە میسر یان لە ئەردەن بمێنێتەوە نەڕوات بۆ ئەمریکا (ئەردەشیر زاهدی) بوو.

ئەردەشیر زاهدی چەندین ساڵ سەفیری ئێران بوو لە ئەمریکا، بەهۆی پەیوەندی زۆر نزیکی لەگەڵ زۆربەی بەرپرسە دەوڵەتیەکانی هەردوو حزبی ئەمریکا، دڵنیابوو کە ئەمریکا بۆ ڕزگاربوونی گیانی دەستبەسەرکراوەکانی (دیبلۆماتکارەکانی سەفارەتی ئەمریکا لە تاران) شا تەسلیمی تاران دەکات!

من لە هەندێك لە کتێبە مێژووییەکان کە پاش کەوتنی شا لە ئێران و یان لە دەرەوەی ئێران بڵاکرابوونەوە بینیم ئەم ئامۆژگاری و ئاگادارکردنەوەیەی ئەردەشیر زاهدی بە هەڵە لێکدراوەتەوە. لەم کتێبانەدا نوسرابوو ئەردەشیر زاهری پێداگیری

دەکرد کە محمد ڕەزا لە ناوچەیەکی نزیك لە ئێران بمێنێتەوە تاوەکو بتوانێت لەژێر چاودێری پارێزگاری سی ئای ئەی و پەینتاگۆندا بێت و هەرکاتێك هەلێکی گونجاو هەڵکەوت بیگەڕێننەوە بۆ ئێران.

تەنانەت نوسەرێکی بەناوبانگی وەکو (ویلیام شوکرس)یش لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی ئەو ئەگەرەی خستبوویەڕوو و نوسیبووی بڕیاری زاهدی لەسەر ئەوە بوو کە لەگەڵ فەرماندەی دەریایی کمال الدین حبیب ئیلاهی بۆ ڕوویەڕووبوونەوەی حکومەتی تازەکار شتێك بکەن.

ئەم قسانە سەرلەبەری هەموو درۆ و هەڵبەستراون!

چونکە باوکی ئەردەشیر زاهدی لە کودەتای ١٩٥٣ ڕۆڵێکی سەرەکی هەبوو، ژمارەیەك لە نوسەرەکان ویستیان ئەردەشیر لەگەڵ باوکی ژەنراڵ فزل الله زاهدی بەراورد بکەن!

ژمارەیەکیش کە لایەنگری محمد ڕەزا بوون لە ڕاستیدا ئارەزوی دڵی خۆیان دەخستەڕوو.

کۆمەڵێك لەم نوسەرانەش لە خودی زاهدی پارە و خاویار و قاڵیان وەکو بەرتیل وەرگرتبوو، بۆ ئەوەی لە کتێبەکانی خۆیاندا بە پیاوێکی بەهێز بیخەنەڕوو کە دەتوانێت پێ بخاتە جێگە پێی باوکی خەریکی کودەتایەکە بە شێوەی کودەتای ١٩٥٣ بۆ ئەوەی محمد ڕەزا بگەڕێنێتەوە بۆ سەر تەختی دەسەڵات!

هەموو ئەم قسانە بە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا درۆ و هەڵبەسترون.

ئەردەشیر زاهدی پیاوێکی خۆشگوزەران بوو، بێ شەرمتر بیڵێم، ئەهلی ڕابواردن بوو!

هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی تێکچون لە ئێران زیانیاریمان هەبوو ئەوەی دەخستەڕوو ئەردەشیر زاهدی پارەکانی سەفارەتی ئێران لە واشنتۆن بە سودی شەخسی خۆی هەڵدەگرێت و زۆرێك لە موڵکو بیناکانی پەیوەست بە دەوڵەتی ئێران لە ئەمریکا بە سودی خۆی دەفرۆشێت!

ئەردەشیر بەهۆی ئیقامە و مانەوەی لە ئەمریکا و ناسراوی لەگەڵ کەسانی بەهێزی خاوەن دەسەڵات لەو وڵاتە، تەنانەت باشتر لە محمد ڕەزا دەیزانی کە ئیدی ئەو دەسەڵاتە بەرەو کۆتایی دەڕوات.

ئەردەشیر زاهدی هەموو تەمەنی لەژێر سێبەری ناوبانگی باوکیدا بردە سەر.

پێیان دەوت مهندس ئەردەشر زاهدی لەکاتێکدا بەشی کشتوکاڵی زانکۆی یۆتای بە نیوەچڵی بەجێهێشت هەرگیز نەیتوانی زانکۆش تەواو بکات.

ئێمە دەمانزانی ئەردەشیر زاهدی بەکرێگیراوی (سی ئای ئەی)ە. دانانیشی بۆ سەفیری ئێران لە ئەمریکا لەسەر داخوازی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بوو و ئەردەشیر زاهدیش لە سەردەمی مانەوەی لە ئەمریکا لە دۆستان و نزیکەکانی ویلیام راجەرز، ریچارد نیکسۆن، هێنری کیسنجەر و جۆرالد فۆرد بوو.

کاتێك جیمی کارتەر هەڵبژێردرا بۆ سەرۆکایەتی ئەمریکا، زاهدی لەبری ئەوەی بە ئاگاداری حکومەتی ئێران بڕوا بۆلای بەرپرسانی ئەمریکا کەچی بەردەوام بە تەلەگراف پەیامی دەنارد بۆ تاران و بۆچوونی بەرپرسە ئەمریکیەکانی دەدا بە وەزارەتی دەرەوە.

ئەم گۆڕانکاریەی زاهدی کە تاوەکو پێشتر لایەنگری ئەوە بوو بەشێوەیەکی توند بەرامبەر خۆپیشاندەران بینەوە نیشانیدەدا کە لە واشنتۆندا کۆمەڵێك باس و خواست هەیە!

لە کۆتایی ئەو ڕۆژانەی کە لە مەراکیش بووین ئەردەشیر لە پڕێکدا لە ئەمریکاوە هات بۆ مەراکیش و گفتوگۆیەکی لەگەڵ فەرەح و شا و منردا ئەنجامدا باسی ئەوەی کرد کە هەرگیز نابێت محمد ڕەزا پێ بخاتە ناو ئەمریکاوە!

ئەردەشر زاهدی کە خۆی بە دڵسۆزی شا نیشان دەدا بەهەرشێوەیەك بوو قەناعەتی کرد بە محمد ڕەزا کە هەرچی کردوە نەیێت بۆ ئەمریکا!

زاهدی وتی بە محمد ڕەزا دیموکراتەکان هەر لە سەردەمی جۆن ئێف کەنەدیەوە لەگەڵ ئەودا دوژمن بوون و ئەو ئەگەرە بوونی هەیە کە بۆ ڕزگاربوونی بارمتەکان تۆ تەسلیم بە ئێران بکەن!

دوای ڕۆیشتنی زاهدی محمد ڕەزا وتی بە من: (فەرمانکراوە بەم پیاوە بچوکە تاوەکو هەرچی کردوە ڕێگری لە ئێمە بکات سەفەر نەکەین بۆ ئەمریکا!)

محمد ڕەزا بۆ چارەسەر پێویستی بە سەفەرکردن بوو بۆ ئەمریکا. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئاگاداری ئەوەش بیت کە ژیانی دووەمی هەموومان لە ئەمریکادا بوو.

ئەوە خۆشەویستەکانم (ڕەزا، علی ڕەزا، فرحناز و لەیلا) لە ئەمریکا بوون.

موڵکە شەخسیەکانمان لە ئەمریکا بوون. داراییەکانمان لە ئەمریکا بوو. دۆستەکان و ئەندامەکانمان هەموو لە ئەمریکا بوون. ئێستا ئەمریکا داوای لێ دەکردین بڕۆین بۆ ئەردەن یان لە میسر و مەراکیشی هەژار بمێنینەوە!

محمد ڕەزا باوەڕی وابوو کە ئەمریکیەکان ناچارن ئەو قبوڵ بکەن چونکە ئەگەر ئەوە نەکەن ڕێبەرانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ڕێبەرانی وڵاتانی هاوپەیمانی ئەمریکا ئیدی دەکەونە گومانەوە لەبەرامبەر ئەو وەفادارییەی کە ئەمریکیەکان هەیانە بەرامبەریان!

محمد ڕەزا ناوی مەلیك خالید و سوڵتان حسن و پاشای ئەردەن (مەلیك حسین)ی بردو و وتی پێش هەمووکەس ئەمانە لە ئەمریکا دڵسارد دەبنەوە. هەموو بیر لەوە دەکەنەوە کە ئەگەر ڕووداوێکی هاوشێوەی ئێران ڕوویدا ئیدی ئەمریکا ئەوان قبوڵ ناکات.

ئێمە گوێمان لە قسەکانی محمد ڕەزا دەگرت و بێدەنگ دادەنیشتین بەبێ دەربڕینی هیچ بۆچوونێك سەیرمان دەکرد!

محمد ڕەزا ڕۆژ بەڕۆژ هێزی مێشك و جەستەی خۆی لەدەست دەدا.

لە ژوورەکانی هەریەکەماندا ڕادیۆیەکی بەهێز لەسەر شەپۆلەکانی ئێران داگیرسا بوو.

کاتێك کە یەکەمین هەواڵی پەیوەست بە لەسێدارەدانەکانی شۆڕش گەیشتە مەراکیش شا بەتەواوی توشی شۆك بوو. کچەکەشم توشی بێتاقەتی و نیگەرانی بووبوو.

ڕادیۆ بەردەوام هەواڵیدەدا کە فلانە بنکە خۆی تەسلیم کرد، فلانە هێز دەستی بەسەردا گیرا، فلانە ئەفسەر کوژرا و لەم جۆرە هەواڵانە.

لەم کاتەدا (ڕۆژی ١٤ فێبریوەری ١٩٧٩) هەواڵ گەیشت کە سەفارەتی ئەمریکا هێرشی کراوەتە سەر و ولییام سولیوان سەفیری ئەمریکا و کارمەندەکانی بە بارمتە گیراون.

هێرش بۆ سەفارەت لە ڕۆژی (سنت ڤالنتین) ئەنجامدرا کە یەکێك بوو لە جەژنە مەزهەبییەکانی ئەمریکا.

ڕادیۆی تاران بەردەوام ئەوەی دەخستەڕوو کە: (ئەمە دەنگی شۆڕشی ئێرانە!) هەواڵی دژ و ناکۆکی دەدا.

سەرچاوەی زانیارەکانی ئێمەش بەردەوام هەواڵی دژ و پێچەوانەیان دەدا.

لەسەر بنەمای هەندێك لە هەواڵەکان ئەوانەی کە هێرشیان کردبوویە سەر سەفارەت سەر بە چەپگەراکان بوون. کۆمەڵێکیش هەواڵیان دەدا کە شاهپور بەختیاریش لەگەڵ سالیوان دەستگیر کراوە و گوازراوەتەوە بۆ قوتابخانەیەك لە مەیدانی ژالە (کە ناوەندی کاتی ڕێبەرانی شۆڕش بوو)!

لەسەر بنەمای هەواڵێکی دیکە، سالیوان لە کاتی هێرشدا لە سەفارەت نەبووە و بۆ ئازادی دیبلۆماتەکان ڕۆیشتوە بۆلای مهندس مهدی بازرگان بۆ ئەوەی بارمتەکراوەکان ئازاد بکەن!

هەموو ڕۆژێك ئێمە ئەم جۆرە هەواڵە ناخۆشانەمان پێ دەگەیشت.

سەرەڕای هەموو ئەم هەواڵە ناخۆشانە ئەمریکیەکانیش باسی ئەوەیان دەکرد کە پەیوەندی سیاسی خۆمان لەگەڵ دەوڵەتی تازەی ئێراندا دەپارێزین!

هێرشکردنە سەر سەفارەتێك لە عورفی سیاسیدا چ مانایەکی هەیە؟

هەندێکجار تەنها لەبەر ئەنجامدانی خۆپیشاندانێك لەبەرامبەر سەفارەتێك پەیوەندی نێوان دوو وڵات دەپچڕێت!

سایروس ڤینس خۆی ئەوەی خستەڕوو کە داگیرکردنی سەفارەتی ئەمریکا نابێتە هۆی پچڕاندنی پەیوەندی یان دروستبوونی قەیرانێك لە نێوان ئەمریکا و ئێران!

ئەم شێوازی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەمریکیانە لەگەڵ داگیرکردنی سەفارەتەکەیاندا محمد ڕەزای توشی شۆك کردبوو. ئیدی دڵنیا بوو ئەمریکیەکان ڕژێمەکەیان کۆتایی پێهێناوە!

هەندێك لە ئێرانیەکان کە لەگەڵ ئێمەدا هاتبوون بۆ میسر و مەراکیش، بۆ خێزان و خانەوادەکانیان ئارامیان لێ بڕابوو و ئاگاداری چارەنوسی خێزانەکانیان نەبوون.

ڕۆژێکیان سەرهەنگ معزی (فڕۆکەوانی فڕۆکەکەی شا) هات بۆلای محمد ڕەزا و داوای کرد بگەڕێتەوە بۆ ئێران.

کارمەندەکانی فڕۆکەکەش وتیان بێتاقەتین لە بێ هەواڵی خێزانەکانمان.

محمد ڕەزا فەرمانیدا پارەی تەواویان پێ بدرێت بۆ ئەوەی بە ئاسودەی لەسەر خواستی خۆیان بگەڕێنەوە بۆ ئێران.

فڕۆکەوان معزی و سێ کەس لە هاوکارەکانی هەموو پێکەوە پەنجا هەزار دۆلاریان وەرگرت و گەڕانەوە بۆ ئێران.

(سەرهەنگ معزی دواتر چووە ناو گروپی شۆڕشگێڕی مجاهیدینی خەلق و لە هەنگاوێکی لەناکاوانەدا مەسعود ڕەجەوی و ئەبوالحسن بنی صدری لە تارانەوە بەرەو پاریس برد!)

کاتێك معزی و خزمەتکارەکان فڕۆکەیان دەویست بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە هەندێك لە کەسانی دەوروبەری محمد ڕەزا وتیان ئەو فڕۆکە تایبەتە مەگەڕێنەرەوە بۆ ئێران چونکە نرخی فڕۆکەکە بەلایەنی کەمەوە نزیکەی ٢٥ ملیۆن دۆلارە. محمد ڕەزا وتی: (من چەتە نیم فڕۆکەی هێزی ئاسمانی ئێران برفێنم. من بە سەدان ملیۆن دۆلار شتی بەنرخی شەخسیم لە کۆشکەکاندا بەجێهێشتوە و لەگەڵ خۆمدا نەمهێناوە. ئێستا ڕاست نیە ئەم فڕۆکەیە نەگەڕێنمەوە و بیانوێك بدەم بەدەستەوە بۆ دوژمنەکانم کە من بە دز و ڕێگر لەقەڵەم بدەن و لەلایەکی دیکەشەوە دەوڵەتی تازەی ئێران دەتوانێت شکات بکات و دەست بگرن بەسەر فڕۆکەکەدا.)

محمد ڕەزا دەوروبەرەکەی هاندەدا بەجێیبهێڵن و بڕۆن بەشوێن ژیانی خۆیاندا. بەم شێوەیە لەماوەی چەند ڕۆژێکدا ژمارەی کەسانی دەوروبەری محمد ڕەزا بەتەواوی کەمی کرد.

ئەوەی محمد ڕەزای نیگەران و بێتاقەت دەکرد دەستبلاوی و ڕابواردنەکانی ئەوکەسانە بوو کە لەگەڵیدا بوون.

ئەوان هەرچێکیان بویستایە دەیانکرد و پارەکەیان لەسەر حسابی محمد ڕەزا دەدا.

وەسڵی حسابی میوانیەکەی کۆشکە ڕازاوەکەی مأمونیە بۆ مەسرەفی دەوروبەرەکەی شا لەماوەی ئەو چەند ڕۆژە کەمەی کە لەوێ بووین ژمارەیەکی خەیاڵی بوو کە خەرجیەکەی بای ٢٠٠ هەزار دۆلار بوو!

فرۆکەوان معزی و کامبیز ئاتابی، کوڕی ئەبو الفتح ئاتابی (میرشکار شا)، ڕۆژی سێ جار ئەو ژنانەیان بانگهێشت دەکرد بۆ ژوورەکانیان کە ماساجیان دەکرد، پارەی ماساجەکەشیان دەبوو محمد ڕەزا بیدات!

هەندێك لە هاوڕێکان بە ڕادەیەك بێ مانابوون، تەنانەت ئەو پارە زۆرەی کە لە قومارخانەکەی مأمونیە دۆڕاندیان خستیانە سەر حسابەکەی محمد ڕەزا!

سەرەڕای ئەوەش، هەموو ڕۆژێك ژمارەی سواڵکەرەکانی بەر دەرگای شا زۆرتر دەبوون! یەکێك بۆ چارەسەری کوڕەکەی کە لەئەمریکا مابوویەوە داوای ٥٠ هەزار دۆلاری دەکرد. یەکێك بۆ ناردنی پارە بۆ ئێران پارەی پێویستبوو پێداگیری لەسەر ئەوە دەکرد کە خێزانەکەی هیچ پارە و خەرجی نیە. ئەوەش دیار بوو کە هەموویان دەیانەوێت محمد ڕەزا بدۆشن.

شا ئاوێکی پاکی کرد بەدەست هەموویاندا و وتی: (ئێمە ئێستا دوورخراوینەتەوە هیچ پارەیەکم نیە پێتان بدەم. ئەگەر هەرکەس دەتوانێت خەرجی خۆی دەربێنێت دەتوانێت لەگەڵماندا بمێنێتەوە. ئیدی باشترە بگەڕێنەوە بۆ ئێران!)

پاش ئەوەی کە ئیدی محمد ڕەزا بە ڕاشکاوانە هەموویانی جواب کرد بە خێرای دەوروبەرمان چۆڵ بوو!

دەرکەوت کە تاوەکو ئێستا پەیوەندی ئەو خەڵکە لەگەڵ خێزانی پەهلەوی لەبەر چی بووە!

تەنانەت کامبیز ئاتابای کە خزمی محمد ڕەزا بوو ئەوی بەجێهێشت و ڕۆیشت بۆ ئەمریکا. محمد ڕەزا لە ڕۆژی ٢٢ فێبریوەری خۆی تەلەفۆنی کرد بۆ پارکەر سەفیری گەورەی ئەمریکا لە مەراکیش و وتی: (حەزدەکەم هەرچی زووترە بڕۆم بۆ ئەمریکا!)

سەفیر وتی هێشتا هەفتەیەك بەسەر هێرشی شۆڕشگێڕەکان بۆ سەر سەفارەتی ئەمریکا لە تاران تێ نەپەڕیوە بۆیە لەم کاتەدا ڕۆیشتنی شا بۆ ئەمریکا لەبەرژەوەندی ئەمریکادا نیە.

محمد ڕەزا بە تووڕەی تەلەفۆنەکەی داخستەوە و ئەم جارە تەلەفۆنی کرد بۆ کەسێك لە واشنتۆن دی-سی بەڵام هەرگیز ناوەکەی پێ نەوتین. ئێمە دەمانزانی کە یەکێك لەو شەخسانە دیڤید راکفلەری سەرمایەداری گەورەی ئەمریکایە.

(برژینسکی)یش یەکێکی دیکە بوو لەو کەسانەی کە بەردەوام لەو ماوەیەدا بە تەلەفۆنی لەگەڵ محمد ڕەزادا قسە و باسی هەبوو. زبیگنیو برژینسکی لەچاو بەرپرسەکانی دیکەی ئەمریکا کەسێکی ڕاشکاوانەتر و بێ پەردەتر بوو. وەکو خۆمان دەڵێین ئەهلی پێچ و پەنا و مەسەلە شاردنەوە نەبوو.

وتی بە محمد ڕەزا: (سەرۆك کارتەر حەز ناکات بێیت بۆ ئەمریکا!)

برژینسکی و راکفلەر فشاریان دروستکرد بۆ سەرۆك تاوەکو لە ئەمریکا قبوڵی بکات سەرۆکیش وتبووی: (خۆ شا نایێت بۆ ئەمریکا بۆ یاری تێنس، ئەمریکیەکانی ئێران لەسەر ئەو دەکوژرێن و بەبارمەتە دەگیرێن!)

دەبێت ئەوە بڵێم کە پەیوەندی شا لەگەڵ جیمی کارتەر هەمیشە خراپ و تێکچووبوو.

محمد ڕەزا لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی کۆماری ئەمریکا پشتیوانی منافەسەکەی جیمی کارتەری دەکرد واتە (جراڵد فۆرد).

محمد ڕەزا هەمیشە کۆماریخوازەکانی بەلاوە پەسەند بوو تاوەکو دیموکراتخوازەکان. پاش هەڵبژاردنی جیمی کارتەر بۆ سەرۆکایەتی ئەمریکا، شا و کچەکەم (فەرەح) بە سەردانێکی ڕەسمی (لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٧٧) بانگهێشت کران بۆ واشنتۆن.

جیمی کارتەر لەم سەفەرەدا وتبووی بە محمد ڕەزا و کچەکەم: (سەردەمی پشتیوانی بێ چەندوچۆنی ئەمریکا لە سەڵتەنەتی ئێران تەواوبووە و ئەگەر شا دەیەوێت بەردەوام جێگەی پشتیوانی ئەمریکا بێت دەبێت چاوبخشێنێتەوە بە سیاسەتە سەرکوتکارەکانی خۆی و چالاکیەکانی ساواك سنووردار بکات!)

لەم سەفەرەدا، خەڵکێکی زۆر بەرامبەر کۆشکی سپی خۆپیشاندانیان لە دژی شا و فەرەح کرد و تەماتە و پەتاتەبارانیشیان کردن. پۆلیسەکان بۆ بڵاوەپێکردنی خۆپیشاندەرەکان گازی فرمێسك ڕێژیان بەکارهێنا و ئەو گازە بووە هۆی سوتانەوەی

چاوی شا کە هەمووکەس ئەو ڕۆژە وێنەی محمد ڕەزایان بە چاوی فرمێسکاویەوە بینی!

من دووجار فرمێسکی محمد ڕەزام بینیوە. جارێکیان لەو مەراسیمی پێشوازیەی کارتەردا لە محمد ڕەزا لەبەردەم کۆشکی سپی و جارێکیش لەکاتی چوونە دەرەوەی شا لە ئێران!

محمد ڕەزا دەیوت ئەم خۆپیشاندانە خودی دەوڵەتی ئەمریکا ڕێکیخستوە تاوەکو بیخاتە ژێر فشارەوە.

پاش گەڕانەوەی ئەم سەفەرە، محمد ڕەزا فەرمانیدا کۆمەڵێك لە سیاسیەکان ئازاد بکرێن و هەر وەش بووە هۆی ئەوەی خەڵکی ئەوەندەی دیکە سوربوون لەسەر ئازادی زیاتر و داوای زیاتریان دەکرد!

ساڵی ١٩٧٩ بوو مەلیك حسنی دووەم بێ پەردە پێی وتن دەبێت هەرچی زووتر بیر لە شوێنێکی تازە بکەنەوە چونکە لە تاران خۆپیشاندان لەدژم ئەنجامدراوە و خەڵکی ئێران من نەك بە میوانداریك بەڵکو بە خیانەتکارێك دەزانن لەبەرامبەر ئەوەی کە میوانداریم کردوە!

کچەکەم (فەرەح) پێشنیاری کرد بۆ محمد ڕەزا بۆ ئەوەی بڕۆین بۆ ئەردەن چونکە مەلیك حسین دۆستێکی دێرین بوو و لەگەڵ ئەوەدا حکومەتێکی بەهێزیشی هەبوو!

شا وتی: (سودی ئەم کارە چیە! مەلیك حسینیش دوای چەند ڕۆژێك داوای لێبوردمان لێ دەکات!)

شا تەلەفۆنێکی کرد بۆ ئەردەشیر زاهدی و داوای لێ کرد شوێنێکی ئارامی بۆ بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی ژیانی تێدا بەسەر بەرێت. ئەردەشیر زاهدی وەڵامی دایەوە کە خۆی لەگەڵ (دیڤید ئارۆن) ئەندامی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا قسەی کردوە و (ئارۆن) پێی وتوە لەکاتی هاتنی شا بۆ ئەمریکا لەوانەیە ئەمریکیەکانی نیشتەجێی ئێران بە بارمتە بگیرێن یان بکوژرێن!

ئێمە ڤێلایەکی ڕازاوەمان لە سورتا ( لە سین مۆریتسی–سویسرا) هەبوو، فەرەح پێشنیاری کرد بڕۆین بۆ سویسرا.

شا ئەم پێشنیارەی قبوڵ کرد، چونکە لە سویسرا داراییەکی زۆرمان هەبوو و بەرپرسانی سویسراش پێشینەیەکی دۆستایەتی زۆر کۆنیان لەگەڵ شادا هەبوو.

هیچکەس وایبیری نەدەکردەوە کە سویسرەکان خواستەکەی شا ڕەفز بکەنەوە.

ڕاگەیەنرا بوو بە ئەردەشیر زاهدی بەبێ دواکەوتن هەموو کەلوپەلی سەفەرەکەمان بۆ سویسرا بۆ فەراهەم بکات. بەڵام بۆ بەیانیەکەی تەلەفۆنێکی کرد و وتی بەرپرسانی سویسرا بەڕێزانە داواکاریەکەیان ڕەفزکردینەوە و وتویانە لە ئێراندا بەرژەوەندی زۆریان هەیە و ئامادەنین ئەم بەرژەوەندیانەیان لەبەرخاتری سەفەرێکی شا بۆ سویسرا بخەنە مەترسیەوە!

سویسرای بازرگان نەیدەویست بەرژەوەندی نەوتی وڵاتەکەی بخاتە مەترسیەوە لەبەر خاتری پاشایەکی لابراو.

کاتێک هەموومان لە سویسرا نائومێد بووین، کەوتینە بیری بەریتانیا.

بەریتانیەکان هەر لە کۆنەوە و لەسەردەمە جۆراوجۆرەکانەوە لەگەڵ ئێراندا پەیوەندێکی نزیکیان هەبووە.

بەریتانیا لە ماوەی حکومەتەکەی محمد ڕەزادا بەهۆی بازرگانیە نەوتیەکان و چەک و تەقەمەنیەکانیەوە قازانجێکی زۆریان دەستکەوتبوو و ئێستاش محمد ڕەزا چاوەڕوانی ئەوە بوو بەریتانیا هاوپەیمانێک و هاوڕێکی کۆنی خۆیان قبوڵ بکەن و جێگەی بکەنەوە.

محمد ڕەزا لە باشوری بەریتانیا خاوەنی موڵکێکی گەورە بوو کە چەند ساڵێک پێشتر کریبووی، ئەو موڵکانە دەگەڕانەوە بۆ سەدەمی ڤیکتۆریا[1].

محمد ڕەزا، بەهۆی پێداگیری هەموومانەوە بۆ ئەوەی داوا بکات لە بەریتانیا ڕێگەمان بکەنەوە، وتی ئەم ناپیاوانە بوون، بوونە هۆکاری کەوتنی ئێمە ئێستا چۆن بتوانم دووبارە پەنایان بۆ بەرمەوە؟ هەر ئەمانەش بوون باوکمیان لە وڵات دەربەدەر کرد!

---

[1] – ئەم موڵکە ناوی (ئستیل مانس) بوو لە ویلایەتی (ساری) لە باشوری لەندن و یەکێکبوو لە کێڵگە گەورەکانی پەروەردەکردنی ئەسپ لە بەریتانیا و زۆر بەنرخ بوو. لەناو ئەو کێڵگەیەشدا کۆشکێکی ڕازاوە و گەورەی سەردەمی شاژنە ڤیکتۆریا هەبوو.

فەرەح کە گەنجی و هەرزەکانی خۆی لە فەرەنسا بەسەر بردبوو. (ئێستاش هەر لە فەرەنسا دەژی) پێشنیاری کرد بڕۆین بۆ فەرەنسا.

بەڵام شا وتی لە دانیشتنی گوادلوپ (ژیسکاردستن) یەکەمین ڕێبەری ڕۆژئاوا بوو کە خیانەتنی لیٚ کردم و پێشنیاری ئەوەی کرد کە دەبێت ڕۆژئاوا پشت لە دەوڵەتی شا بکات!

(دواتر جیمی کارتەر لە کتێبی یادەوەریەکانی نوسی لە گوادلوپ من لەناو ڕێبەرەکانی جیهانی ڕۆژئاوا پشتیوانێکی کەمی شاهنشای ئێرانم کرد. پێش هەمووکەس ژیسکاردستن بوو کە باوەڕێکی تەواوی بەوە هەبوو کە دەبێت شا بڕوات!)

دواتر ڕووداوێك ڕوویدا کە بۆچوونەکەی محمد ڕەزای سەلماند. فەرەنسیەکان نەك هەر ئامادەنەبوون ئێمە قبوڵ بکەن بەڵکو داواشیان لیٚ کردین هەرچی زووە خاکی مەراکیشیش بەجێبهێڵین تاوەکو پێگەی سوڵتان حسن (هاوپەیمانی ئەوان)یش نەکەوێتە مەترسیەوە!

(کینت دومارانش) سەرۆکی (سدس) (دەزگای نهێنی فەرەنسا) هات بۆ مەراکیش.

سەرەتا سەردانێکی سوڵتان حسنی دووەمی (پاشای مەراکیشی) کرد کە ئێمە نەمانزانی ناوەڕۆکی گفتوگۆکەیان چی بوو، بەڵام گومانمان دەبرد لەبارەی مانەوەی شا و ڕووداوەکانی ئێرانەوە بووبێت.

پاشان هات بۆلای محمد ڕەزا و بە دەربڕینێکی توند و ناشیرینانە وتی بە محمد ڕەزا: (حکومەتی ئێران تیرۆرستی بۆ دزینی خێزانی شا ناردوە بۆ مەراکیش تاوەکو لەگەڵ شادا بیگۆڕنەوە؟)

محمد ڕەزا وەڵامی دومارانشی نەدایەوە بەڵام ڕووی کردە یەکێك لە ئەندامەکانی وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا، کە لەگەڵ دومارانشدا هاتبوو وتی: (لەماوەی دوو تا سیٚ هەفتەی ئایندە مەراکیش بەجێدەهێڵم. پاشان بەبیٚ خواحافیزی ژوورەکەی دومارانشی بەجێهێشت.)

مانگی ئەپریل بوو سایروس ڤینس بە تەواوی جوابی کردین و وتی: (لە بەرژەوەندی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا نیە بێن بۆ ئەو وڵاتە!)

واباس دەکرا هیچ ولاتێك ئامادە نەبوو ئێمە قبولْ بکات. جیهان بەو گەورەییە شوێنێك نەبوو ئێمە بەو بچوکییە جێگە بکاتەوە. لەهەمووشی گالْتەجاڕیتر ئەوە بوو کە لە زۆربەی ناوچەکانی جیهاندا موڵکو مالْی شەخسیمان هەبوو و لەڕوانگەی یاسای نێودەولْەتیشەوە دەمانتوانی بڕۆین بۆ ئەو ولاتانەی کە موڵك و مالْی خۆمان هەبوو!

لەبارەی (کنت دومارانش) دەبێت ئەوە بلێم کە ئەو لە هاوڕێی کۆنەکانی محمد ڕەزا بوو. (کنت دومارانش) بەو شێوەیەی کە محد ڕەزا دەیوت، پێشتر یەکێك بوو لە ڕاوێژکارە پلە بەرزەکانی ساواکی ئێران و موچەیەکی زۆریشی لە ساواك وەردەگرت. کنت دۆمارانش یەکەمین کەس بوو پاش هاتنە سەر حوکمی جیمی کارتەر لە ئەمریکا وتبووی بە محمد ڕەزا: (ئەم پیاوە بچوکە زۆر مصیبەتە!)

ئێمە داوتر زۆر درەنگ تێگەیشتین لە گۆڕانی ژیسکاردستن و کنت دۆمارانش و پشت بەردانی فەرەنسا لە محمد ڕەزا.

چونکە هەندێك لە سەرانی شۆڕشی ئێران لەگەلْ فەرەنسیەکاندا پەیوەندێکی زۆر کۆن و دێرینیان هەبوو.

کەسانی وەکو (ئەبوالحسن بنی صدر) و صادق قطب زادە لەکاتی کۆنفراسی گوادلوپ لە سالْی ١٩٧٨ لە پشت ژوری کۆنفراسەکەوە چاوەڕێ بوون تاوەکو ژیسکاردستن بێتە دەرەوە و دەرئەنجامی دانیشتنەکەیان پێ بلێت!

دواتر (ئەبوالحسن بنی صدر)، پاش هەلْهاتنی بۆ پاریس لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەلْ کچەکەم، ئەوەی خستەڕوو کە فەرەنسیەکانیش دەستیان هەبوو لە کەوتنی شا دا.

دەبێت ئەوە بلێم ڕۆژگار یاری سەیری هەیە. ئێستا، یەکەمین سەرۆك کۆماری ئێران، ئەبو الحسن صدر، یەکێکە لە هاوڕێ نزیکەکانی کچەکەم (فەرەح) و مالەکانیان کە لەلایەن پۆلیس و بەرپرسانی ئاسایشیەوە، بەتوندی چاودێری دەکرێن لە نزیك مالْی یەکترەوەیە.

ڕۆژێکیان هەوالْیان پێدابن کە بەڕێز پارکەر، سەفیری ئەمریکا، لە ربباط دەیەوێت بێت بۆ دیداری شا.

محمد ڕەزا، لە کتێبخانەی کۆشکەکەدا پێشوازی لە پارکەر کرد.

کچەکەشم فەرەح لەم دیدارەدا لەگەڵیاندا بوو. وەکو فەرەح دەیگەڕاندەوە پاش گەیشتنی پارکەر بۆلای شا بەبێ پێشەکی ڕۆیشتوەتە سەر ئەسڵی بابەت و پێی وتوە: (جەنابی شا دەبێت واز لەو بیرکردنەوە بهێنێت کە بڕۆیت بۆ ئەمریکا، بۆیە دەبێت بڕۆیت بۆ یەکێك لە وڵاتانی ئەمریکای باشور یان ئەفریقا!)

محمد ڕەزا بەڕاستی زۆر خراپ تێکشکابوو، زۆر بێتاقەتانە داوای کرد لە سەفیر پارکەر بەلایەنی کەمەوە ئیشێك بکات کە لەگەڵ خێزانەکەی بڕۆن بۆ مەکسیك!

محمد ڕەزا وتی لە ئەفریقا یادەوەری تاڵی هەیە، چونکە باوکی (ڕەزاشا) سەردەمی دوورکەوتنەوەی خۆی لە ئەفریقادا گوزەراند و لە ئەفریقای باشوریش کۆچی دوایی کرد.

محمد ڕەزا وتی لەبەر ئەوە مەکسیك هەڵدەبژێرێت چونکە نزیکە لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاوە و دەتوانێت لەوێوە پەیوەندی هەبێت لەگەڵ خزمەکانیدا.

( لەم کاتەدا شاژنی دایك (تاج الملوك) زۆر نەخۆش بوو لە پورلی هیلز لە کۆشکەکەی ئەشرەف دەژیا.)

سەفیر پارکەر کە بە ئاشکرا کەوتە ژێر کاریگەری ڕۆحیەتی شکاو و جەستەی لاوازی محمد ڕەزاوە بە داخ و پەراژەوە وتی: (هەوڵدەدەم ئەم خواستەت بگەیەنمە بەرپرسەکانی واشنتۆن و قەناعەتیان پێ بکەم!)

دواتر، پارکەر لە یاداشتەکانیدا نوسی: (کاتێك محمد ڕەزام بەجێهێشت بەڕاستی هەستم بەشەرم دەکرد کە ئەمریکا بەو شێوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوپەیمانێکی خۆیدا دەکات. ئەم پیاوە ئەو شایە بوو کە بە شێوەیەکی ڕاستگۆیانە زیاتر لە سێ دەیە خزمەتی بە بەرژەوەندی دایکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کرد!)

(ئەبو الحسن بنی صدر)، یەکەمین سەرۆك کۆماری ئێران، پاش کەوتنی دەسەڵاتی شا و حکومەتی سەڵتەنەتی کە ئێستا لە پاریس دراوسێی کچەکەم فەرەحە و شانازی بە هاوڕێیەتی فەرەحی کچمەوە دەکات لەیەکێك لە دیدارەکانی لەگەڵ کچەکەمدا وتبووی: (کاتێك کە شا لە میسر و مەراکیش بوو ئێمە پێشنیارمان کرد بۆ ئەمریکا کە شا قبوڵ بکات. سەفیر سولیوان (سەفیری ئەمریکا لە تاران) چەندجارێك ئەو پرسە

مرۆۋ دۆستانەی خستەڕوو و وتی: (شا بۆ نەشتەرگەرێکی پزیشکی پێویستی بە سەفەرکردنە بۆ ئەمریکا).

ئێمە کە نەماندەویست لە پەیوەندی ئێران و ئەمریکادا هیچ قەیرانێك ڕووبدات و ڕووداوی چاوەڕوان نەکراو لە وڵاتدا دروست بێت، وتمان بە سولیوان تاوەکو ئەوکاتەی کە دەکرێت و پێویستە سەفەرەکەی محمد ڕەزا بۆ ئەمریکا دوا بخەن و لەبەرامبەریشدا ژمارەی ئەمریکیەکانی نیشتەجێی ئێران کەم بکەنەوە.

ئێمە زانیاری ئەوەمان هەبوو توندڕەوە ئیسلامیەکان ئەو مەبەستەیان هەبوو لەکاتی سەفەری شا بۆ ئەمریکا ژمارەیەك لە ئەمریکیەکان بە بارمتە بگرن و دواتر ئەم بارتمانە بگۆڕنەوە بە شا.

ئێمە لە سەفارەتی ئەمریکا گروپێکی چەکدارمان جێگیر کرد سەرۆکایەتیەکەی سپێردرابوو بە کەسێك بە ناوی (ماشاالله قصاب) و جێگرەکەشی کەسێك بوو بەناوی (بشارتی).

ماشاالله قصاب و بشارتی وگروپە چەکدارەکەی بەرپرسی پاراستنی سەفارەتی ئەمریکا و دیبلۆماتەکانی بوون. شوێنی جێگیربوونی ئەم چەکدارانەش لە ناو سەفارەتی ئەمریکا بوو.

ئێمە پێشبینی ئەوەمان دەکرد ئەگەر شا بڕوات بۆ ئەمریکا گروپە چەپڕەوەکان لەم هەلە سود وەردەگرن و بەدەستبردن بۆ کرداری دژە ئەمریکی، ئێران و ئەمریکا ڕووبەڕووی یەکتر دەکەنەوە. بەڵام هەرگیز باوەڕمان نەدەکرد کە بەرەیەك لە خودی حکومەت بۆ خستنی دەوڵەتی بازرگان کردارێکی لەم شێوەیە ئەنجام بدات.

سەفیر سولیوان سوپاسی ئەو پێشبینیەی کرد بۆ ئەو دەوڵەتە شۆڕشگێڕیە و بەڵێنیدا تاوەکو ئەو شوێنەی کە دەتوانێت هەوڵبدات سەفەری شا بۆ ئەمریکا دوابخات و بۆ ئەنجامدانی ئەو سەفەرە کێشە و بیانو دروست بکات.

لەم کاتەشدا دەوڵەتی کاتی (مهندس مهدی بازرگان) بە هەوڵدانێکی زۆر توانی هەزاران ڕاوێژکاری سەربازی ئەمریکی و ئەمریکیەکانی نیشتەجێی ئێران و خێزانەکانیان لە وڵات ببەنە دەرەوە.

زۆرێك لەم ئەمریكیانە تەنانەت فریای ئەوە نەكەوتن كەلوپەلی ماڵەكانیشیان ببەن لەگەڵ خۆیاندا. بۆیە پێویستیەكانی ژیان و تەنانەت سەیارەكانیشیان لە ئێراندا بەجێهێشت و هەڵهاتن.

تەنانەت سەفیر سولیوان داوای لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكا كرد بۆ ئەوەی دیبلۆماتە ئەمریكیەكان بۆ ماوەیەكی كورتیش بێت لە ئێران بچنە دەرەوە. بەڵام وەزارەت تەنها ڕەزامەندی بۆ دەرچوونی سەفیری گەورە و ژمارەیەك لە ئەندامەكان دەركرد و ئاستی پەیوەندیەكەی بۆ ئاستێكی زۆر نزم كردەوە.

دەبێت ئەوە بڵێم محمد ڕەزا زۆر گرنگی بەم مەسەلەیە نەدەدا و نەیدەویست بیر لە پرسی پەیوەست بە ئاسایشی گیانی هاوڵاتیانی ئەمریكای نیشتەجێی ئێران بكاتەوە.

محمد ڕەزا دەیوت: (تەنانەت ئەگەر بۆچوونی ئەمریكیەكانیش لەم بارەیەوە ڕاست بێت، نابێت ئەمریكا ئێمە بۆ ئەوەی گیانی چەند ئەمریكیەك لە مەترسیدایە قبوڵ نەكات!

من لە جەنگی (ظفار) بە مەبەستی پاراستنی ئاسایشی دەمی كەنداوی عەرەب و تێپەڕینی نەوت بەرەو ئەمریكا گیانی ئێرانیەكانم خستە مەترسیەوە و سەربازە ئێرانیەكانم نارد بۆ شەڕی شۆڕگێڕەكانی ظفار تاوەكو بەرژەوەندی ئەمریكا و جیهانی ڕۆژئاوا بپارێزن. ئێستا ئەمریكیەكان ئەو حەقەیان نیە كە گرنگی بدەن بە من لەبەرامبەر پاراستنی گیانی چەند ئەمریكێكی بێ نرخدا و بۆ ئەو مەبەستە دەیانەوێت ڕێگە لە من بگرن!)

ئەو كەسانەی بە تەلەفۆن لە مەراكیش ڕۆژانە لەگەڵ شادا قسەیان دەكرد (صدام حسین) سەرۆك كۆماری عێراق، مەلیك حسین پاشای ئەردەن، سادات سەرۆك كۆماری میسر، دیڤید راكفلەر، نیلسۆن راكفلەر (جێگیری سەرۆك كۆماری ئەمریكا و سەرمایەداری بەناوبانگ)، فرانك سیناترا (هونەرمەندی بەناوبانگی جاز)، هێنری كیسنجەر (وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمریكا)، مارگرێت تاچەر (كاندیدی حزبی پارێگاری بەریتانیا بۆ سەرۆك وەزیران) محمد زاهر شا (پاشای لابراوی ئەفغانستان) مەلیك خالید (پاشای ئەو كاتەی عەربستان) و ژمارەیەكی دیكە كە هەموو ئەوانە

پشتیوانی خۆیان بۆ دەردەبڕی و هەوڵیاندەدا دڵنەوای شا بدەنەوە بەوەی کە پشتیوانی دەکەن.

(فرانك سیناترا) لە یەکێك لە پەیوەندیە تەلەفۆنەکانی خۆی لەگەڵ شا وتی ڤێلا شەخسیەکەی خۆم ئامادەکردوە بۆ میوانداری کردنت.

هەرچی زۆرتر لە دەرەوەی وڵات دەمایەنەوە، ماوە و نێوانی محمد ڕەزا و تاج و تەختەکەی زۆرتر دەبوو، ئەمەش شتێك نەبوو کە مەلیك حسنی دووەم نەتوانێت پێشبینی بکات.

بەهەرحاڵ، میوانداری کۆتایی هات و مەلیك حسن ڕۆژێکیان زۆر بەڕێزانە شای لە وڵات کردە دەرەوە!

بۆچی بەڕێزانە؟ عەرزت بکەم.

ڕۆژێکیان بەیانی هێشتا نانی بەیانیمان تەواو نەکردبوو کە سەرۆکی تەشریفاتی کۆشکی سەڵتەنەتی مەراکیش لە پڕێکدا و بەبێ زانیاری پێشوو هات بۆ دیداری شا و هەر لەسەر ئەو مێزەی کە نانمان دەخوارد دانیشت و وتی بە محمد ڕەزا: (جەنابی مەلیك حسنی دووەم ئاگاداری ئەوەن کە جەنابتان حەز دەکەن ئەم وڵاتە بەجێبهێڵن! بۆ ئەم مەبەستە جەنابیان فڕۆکە تایبەتەکەی خۆی ئامادە کردوە بۆ ئەوەی جەنابتان بەیانی ئەم وڵاتە بەجێبهێڵن!)

پاشان بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی شا بێت نیوە چەمانەوەیەك چەمیەوە و لە تەلارەکە چووە دەرەوە!

محمد ڕەزا، پاروکە لە قوڕگیدا وەستا. بە تووڕەییەوە چەقۆ و چنگاڵەکەی بە توندی کێشا بە قاپەکەی بەردەمیدا و وتی: (ئەم پیاوە بچوکە تاوەکو دوێنێ بوو دەیوت: جەنابی حەزرەتی شا! و ئەمڕۆ دەڵێت: (جەناب عالی!) دەبێت بەیانی بڕۆین ئەگەرنا کەس نازانێت چیمان بەسەر دێت!)

پێویستە ئەوە ڕوون بکەمەوە کە دەربڕینی وشەی (پیاوی بچوك!) بەبێ ئیرادە لە زمانی شا دەهاتە دەرەوە و ئەم وشەیەی بە مەبەستی سوك کردن یان تۆمەت نەدەوت. بەڵکو جۆرێك بوو لە کاردانەوەی دەروونی کە لەکاتی تووڕەبوونیدا دەهات بەدەمیدا!

پاشان کچەکەم وتی دەی باشە لێرەش دەرکراین بەڵام دەتوانین بۆ کوێ بڕۆین؟

ئینجا کچەکەم لە سەر مێزی نانخواردنەکە هەستا و بە بێزاری و بێتاقەتی دەستیکرد بە پیاسەکردن لە تەلارەکەدا.

محمد ڕەزا ڕۆیشت بۆلای تەلەفۆنەکە و پەیوەندی کرد لەگەڵ سەفیر پارکەر.

خۆشبەختانە ئەمجارە سەفیری ئەمریکا هەواڵێکی خۆشی پێدا. پارکەر وتی ڕاکفلەر سەرکەوتووبووە بەهۆی پێدانی بەرتیلێکی زۆر بە بەرپرسەکانی دەوڵەتی باهاما کە محمد ڕەزا قبولْ بکەن.

ڕێك لەبیرم نیە کە چەندی مانگی ئەپریل بوو ڕۆیشتین بۆ فڕۆکەخانەی ریباط.

لە فڕۆکەخانە فڕۆکە بوئینگە ۷٤۷ کەی سوڵتانی مەراکیش بە داگیرساوی چاوەڕێی دەکردین. سەرهەنگ جیهانبینی وتی بە لوسی پیرنیا: (باش بوو خۆمان هاتین ئەگەرنا کەمێك درەنگ بهاتینایە کۆتان دەکردینەوە و دەتانهێنایین بۆ فڕۆکەخانە!)

باهاما، وڵاتێکی دوورگەییە پێکهاتووە لە حەوت سەد دورگەی بچوك، زۆربەی دوورگەکانی خەڵکیا تێدا نیە و لەکاتی بەرزبوونەوەی ئاودا زۆربەیان ئاو دایاندەپۆشێت!

شوێنی محمد ڕەزا لەم دوورگەیەدا لەناو ڤێلایەکی ڕازاوەی (جیز کراسبی) بوو. محمد ڕەزا، فەرەح، من و سەرهەنگ جیهانبینی لەگەڵ لوسی پیرنیا، سەرهەنگ نویسی و چەند کەسێکی دیکە لە خزمەتکارەکان و سەگەکەی شا بە فڕۆکەی سەڵتەنەتی پاشای مەراکیش چووینە ناو (ناسو) ناوەندی دوورگەکانی باهاما.

لە فڕۆکەخانەی (ناسو) گەنجێکی جوان و زۆر بەڕێز بەناوی (ڕۆبێرت ئارمائۆ) هات بۆ پێشوازیمان.

ئەم گەنجە لە کارمەندانی نوسینگەی ڕاکفلەر و تایبەت بوو بە پەیوەندیە گشتیەکانەوە. بەڵام محمد ڕەزا باوەڕی وابوو ئەم کەسە یەکێکە لە کارمەندانی سی ئای ئەی! و ڕێکخراوی نهێنی ئەمریکا بۆ کۆنترۆڵی شای ئێران دایناوە!

ئەمریکیەکان دوورگەکانی (باهاما)یان ناونابوو دوورگەکانی بەهەشت! ناوەندی خۆشگوزەرانی جیهان بوون.

لێرەدا قومارخانە و نادیە شەوانەکان تاوەکو بەیانی کراوە بوون. مشتەریەکانیان بەزۆری شێخە دەوڵەمەندەکانی کەنداوی عەرەب و گەورە سەرمایەدارەکانی ئەمریکا و ئەورووپا بوون.

خودی (جیمز کراسی) کە ڤێلاکەی بۆ مانەوەی شا و هاوکارەکانی دانابوو، خاوەنی گەورەترین و ڕازاوەترین دە لە بینا و قومارخانەکانی باهاما بوو.

راکفلەرەکان (دیڤید ویلْسۆن)یش لە باهاما سەرمایەگوزاری زۆریان کردبوو.

کنسانتین، پاشای پێشووی یۆنان چەند هەفتەیەك بوو ئێمەی بەجێهێشتبوو و ڕۆیشتبوو بۆ ئەنجامدانی کارە بازرگانیەکانی لە ئەمریکا، کاتێك بیستبووی شا ڕۆیشتوە بۆ باهاما هات بۆ (ناسو) بۆلای ئێمە. دەبێت ئەوە بڵێم کە وەفاداری کنسانتین و سۆز و مهرەبانیەکەی بێ وێنە بوو.

کنسانتین، کە خۆی لەئەنجامی کودەتایەکی ئەفسەرەکانیەوە لە سەڵتەنەت دوورخرابوویەوە و چارەنوسی هاوشێوەی محمد ڕەزای هەبوو، زۆر دڵی بۆ ئێمە دەسوتا و شەوانە تاوەکو کاتێکی درەنگ لە کەنار دەریا لەگەڵ کچەکەم خەریکی گەڕان بوون و دڵی دەدایەوە.

کنسانتین مرۆڤێکی حەق ناس بوو. محمد ڕەزا پاش کودەتای یۆنان و لەناوچوونی ڕژێمی پاشایەتی یۆنان، ئیدارەی هەندێك لە سەرمایە ئەورووپیەکانی خۆی سپاردبوو بە کنستانتین و ئەویش کۆمەڵێك لە پێویستیەکانی سوپای ئێرانی ئەنجام دەدا و بەمەش دەیتوانی لەشوێنی کارەکەیدا بۆ خۆی بژی!

محمد ڕەزا هەمیشە دەیوت لە دنیادا هاوڕێی خۆشەویست و ڕاستەقینەی نیە.

دەیوت: (ئەو کەسانەی لە دەووروبەرم کۆبوونەتەوە بۆ پارە و دەسەلآت کۆبوونەتەوە، بەلآم کسانتین کەسێکی زۆر جیاوازە!)

دورگەی باهاما، لە نزیك ویلایەتی فلۆریدای ئەمریکا بوو و ئەم نزیکیەش بە ڕادەیەك بوو ئێمە هەستمان دەکرد لە ئەمریکاین.

هەستی نزیکبوون لەگەڵ ئەمریکا متمانەیەکی زیاتری بەخشی بە ئێمە.

لە میسر و مەراکیش هەستمان دەکرد لە ولآتانی سەدەکانی ناوەڕاستین. لە کاتی نوێژی نیوەڕۆ و عصر کاتێك بانگی (الله اکبر) لە مکابەرەی مزگەوتەکانەوە بەرز

دەبوویـــەوە. محمـــد ڕەزا و هـــەموومان توشـــی تـــۆقین دەبـــووین چـــونکە لـــە تـــاران شۆڕشگێڕەکان چەندین مانگ هاواری (الله اکبر)یان دەکرد، بۆیە هەر بەیستنی ئەو دەنگە توشی لەرزین و تۆقین بووبووین.

محمـــد ڕەزا لـــەباهاما هـــاوڕێی زۆری هـــەبوو. شـــازادە مۆنـــاکۆ لێـــرە چـــەند قومارخانەیـەکی هـەبوو. کۆمـەڵێك لـە نادیـەکانیش مـوڵکی فرانـك سـیناترا و جـری لوئیس بوون.

سوهارتو (سەرۆك کۆماری ئەندەنوزیا)ش لە باهاما چەند قومارخانە و هۆتێلێکی گەورەی هەبوو. کۆمەڵێك لە قومارخانەکانیش موڵکی شێخەکانی کەنداوی عەرەب بوون.

بـەو شـێوەیەی کـە محمـد ڕەزا باسـی دەکـرد، تـاوەکو پـێش شۆڕشـی کوبـا، ئەمریکیەکان بۆ عیش و نۆش دەڕۆیشتن بۆ کوبا بەڵام پاش ئەوەی کە ڤیدل کاسترۆ حکومەتی کوبای لەناوبرد، سەرمایەدارەکانی ئەمریکا سەرمایەکانی خۆیان لە باهاما خستەگەڕ و باهاما ڕەونەقێکی ئابوری گەورەی بەخۆیەوە بینی.

گازینۆدارەکانی ئەمریکا کە لە کوبا دەرکرابوون هاتبوون بۆ باهاما و لەوێ نادی ڕازاوە و گازینۆی گەورەیان دروستکردبوو.

ڕاستە بە ڕواڵەت باهاما وڵاتێکی سەربەخۆی بوو و لە ساڵی ١٩٧٣ سەربەخۆیی خۆی بەدەستهێناوە، بەڵام زۆربەی ناوچە گرنگەکانی ئەم وڵاتە موڵکی ئەمریکا بوون.

هەر یەکەم شەو کە ڕۆیشتین بۆ باهاما جێمز کراسبی هات بۆ لامان. کراسبی وتی لێرە ٤٠ کۆمپانیا و ١٧ هۆتیل و ٦ گازینۆم هەیە. هەروەها وتی بەتەنها خاوەنی زیاتر لە ٤٠٠ هیکیتار زەوی گرنگی دورگەی باهامام!

واتە نزیکەی یەك لەسەر چواری هەموو باهاما موڵکی بەڕێز کراسبی بوو!

کراسـبی هەوڵیـدا، محمـد ڕەزا ناچـار بکـات تـاوەکو بڕێـك لـە پارەکـانی لـە کۆمپانیاکانی کراسبی سەرمایەگوزاری پێ بکات.

لـە شـەوی دووەمـی مانـەوەمان بـەڕێز (پینـدلینگ) سـەرۆك وەزیرانـی باهامـا، هـات بۆلامان.

سێر لیندن پیندلینگ دەیویست دڵنیامان بکاتەوە کە زۆر بەخۆشی بۆ شا و هاوڕێکانی دەگوزەرێت.

خاڵێك کە جێگەی سەرنج بوو بۆ ئێمە ئەوە بوو کە شۆفێری سەیارەکەی پیندلینیگ کچێکی زۆر جوانی ئەمریکی بوو!

دوو کچی جوانیشی لەگەڵدا بوو، کچەکان بەشێوەیەك هەڵسوکەوتیان دەکرد وەکو بڵێی پارێزەری تایبەتی سەرۆکن!

پیندلینگ کە هەستی بە سەرسوڕمانی ئێمە کردبوو وتی: (حەز دەکەم تاوەکو ئەو شوێنەی بۆم دەکرێت بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارە شەخسیەکانم سود لە خاتونەکان وەرگرم!)

پاش ڕۆیشتنی پیندلینگ محمد ڕەزا وەکو بڵێی گاڵتە دەکات ڕووی کردە ئێمە و وتی: (ئێمەش لە ئێران ئەو هەموو ساڵانە کەسانێکی وەکو پورشجاع و ئەبو الفتحمان لە دەوری خۆمان کۆکردبوویەوە!)

ئامـاژەی شـا بـە پـور شـجاع خزمـەتکارە تایبەتەکـەی و ئـەبوالفتح ئاتـابی سەرپەرشتیاری ڕاوکردنە تایبەتیەکانی بوو!

رۆبیرت ئارمائو بۆ ئەوەی فەرەح لەناو ئەو خەم و خەفەتە دەربهێنێت پێشنیاری بۆ کرد پێکەوە بڕۆن بۆ شار و سەیری چەند نمایشێکی شەوانە بکەن!

محمد ڕەزا ئەم پێشنیارەی قبوڵ کرد و فەرەحی هاندا بۆ ئەوەی بڕوات. منیش لەسەر داواکاری فەرەح لەگەڵیاندا ڕۆیشتم.

دواتر تێگەیشتم کە محمد ڕەزاش لەگەڵ پارێزەرە باهاماییەکانی خۆی ڕۆیشتوە بۆ شوێنێکی دیکە و تاوەکو بەیانی خەریکی ڕابواردنی خۆی بووە.

خۆشحاڵبووین بەم هەواڵە.

ئەگـەر محمـد ڕەزا گەڕابێتـەوە بـۆ ڕابـواردنی شـەوانەی خـۆی کەواتـە بەڕاسـتی ڕۆحیەتی هاتوەتەوە سەرخۆی.

بۆ بەیانیەکەی ئەشرەف تەلەفۆنی کرد و هەموومان لە بێتاقەتی و نیگەرانی هاتینە دەرەوە.

ئەشرەف وتی: (راکفلەر لەسەر داخوازی ئەو ئامادە بووە تاوەکو ئارمائۆ بخاتە خزمەت شاوە.)

ئارمائۆ تەنها ٢٨ ساڵ تەمەنی بوو و بەڕەگەزیش خەڵکی پورتوگال بوو (لە باوك و دایکێکی پورتوگالی لە ئەمریکا لەدایکبووبوو)

ئارمائو زۆر شۆخ و شەنگ بوو، کەسێکی وەرزشکار بوو.

ئەو دەمەی راکفلەر پارێزگاری نیۆیۆرك بوو ئارمائۆی ناسیبووی و لەلای ئەو خزمەتی دەکرد.

ئەشرەف وتی: (ئەو کاتەی چاوم بە راکفلەر کەوت داوام لێ کرد بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش و کارەکانی شا کەسێکی بەتوانا و شارەزای بۆ دابنێت.)

راکفلەریش ئەم پێشنیارەی قبوڵ کرد و وتی (بۆ ئەنجامدانی هەموو کاروبارەکانی پەیوەست بە شا، ئارمائۆ باشترین کەسە!)

پاش ئەشرەف، ڕاستەوخۆ ئەردەشیری زاهدی تەلەفۆنی کرد و وتی ئایا ئارمائۆ توانیویەتی ئێوە ڕازی بکات؟

ئەردەشیر باسێکی ڕابردووی ئارمائۆی کرد و وتی ئارمائۆ لە هاوڕێ شەخسیەکانی منە و کەسێکی متمانە پێکراوە.

ئێمە هەموومان وامان دەزانی، محمد ڕەزا ئیدی کەسێکی بی ٘ متمانەیە، بەڵام محمد ڕەزا کە زۆر بەتوندی گومانی هەبوو لە ئارمائۆ ژمارەیەکی لە واشنتۆن دی-سی وەرگرت و لەگەڵ ئەو کەسەی کە لەپشتی تەلەفۆنەکە بوو، داوای لێ کرد تاوەکو لێکۆڵینەوەکی لەبارەی ڕۆبێرت ئارمائۆوە بۆ بکات.

ئارمائۆ پاش مردنی محمد ڕەزاش بۆ ماوەی دوو ساڵی تەواو لەگەڵماندا بوو. زۆر ڕێزی لە شا دەگرت و بە جدی و لێهاتووییێکی تەواوە کاری بۆ شا دەکرد. شا وتی: واز بێنن با ئەم کابرایە بەکرێگیراوی سی ئای ئەی بێت. ئامانجی سی ئای ئەی ئەوەیە کە ئاگادار بێت لە پەیوەندی من لەگەڵ ناوخۆی ئێراندا. زۆر باشە من تەنانەت تەلەفۆنەکانی خۆم دەدەم بە ئارمائۆ بیانگرێت تاوەکو ئەمریکیەکان ئاگاداری بچوکترین شتیشم بن. ئەوەی کە گرنگە بەلای منەوە ڕێکخستن و گرنگیدانە بە ژیانی

ماڵ و منداڵەکانم لە ئەمریکا کە ئارمائۆ ئەوە بە وردی و ڕاستگۆی ئەنجام دەدات. ئەمەش بۆ من بەسە!)

شا داوای لە ئارمائۆ دەکرد تاوەکو منداڵەکانی ڕابهێنێت لەسەر ڕۆیشتنیان بۆ قوتابخانە و بارودۆخی ئاسایشیان بپارێزێت.

دەبێت ئەوە بڵێم بەبێ بوونی ئارمائۆ سەلامەتی هەموومان لەبەردەم مەترسیێکی زۆر گەورەدا بوو.

دادگای شۆڕشی ئێران بۆ سەری شا و شاژنەکەی خەلاتێکی گەورەی دیاری کردبوو. ئێمە لە باهاما و لە پاناماو لە سەرزەمینێك دەژیان کە مافیاکان دەسەلاتێکی گەورەیان هەبوو و ئابوری ئەو ئەو ولاتانەش بەڕاستی ئابوری مافیاکان بوو.

پاراستنی گیانی ئێمە لەم دوو ولاتە کە دزە گەورەکان بۆ دۆلارێك یەکتریان دەکوشت زۆر جێگەی پێزانین و ڕێزە.

ئارمائۆ، پیاوێکی گەورەی لێهاتوو و ڕاهێنراوی تایبەتی لە دەوری محمد ڕەزادا دانا کە تاوەکو ئەو ئەو کاتەی محمد ڕەزا کۆچی دوایی کرد وەکو دوانەیەکی چەسپاو و وەکو سێبەرێکی هەمیشەیی لەگەڵیدا بوو. ئەم پیاوە ئەمریکیە ناوی (مارك میرس) بوو دواتر بیستمان لە ڕابردوودا یەکێك بووە لە کارمەندە دیارەکانی ئیف بی ئای و ماوەیەکیش پارێزەری سەرۆك کۆمار نیکسۆن و ئەرستۆ ئۆناسیس بووە.

(مارك موریس) جەبەخانەیەکی تەواوبوو. ئارمائۆ دەیوت: (ئەم پیاوە بەتەنها خۆی دەتوانێت ڕووبەڕووی سوپایەك ببێتەوە)

کاتێك مارك مورس لەگەڵ شادا دەڕۆیشت، شا کە بەهۆی نەخۆشیەکەیەوە زۆر لاواز و هەژار بووبوو هەر وەکو منداڵێکی ساوابوو لەبەردەم زەبەلاحێکی ئەفسانەییدا.

مارك مورس بەهۆی ئەو هەیکەلە زل و عەزەلاتە گەورانەی کە هەیبوو لەکاتی ڕووداني هەر مەترسیێکدا بە ئاسانی دەیتوانی باوەش بکات بە محمد ڕەزادا!

مارك مورس زۆر بە جدی ئەرکەکەی ئەنجام دەد و تەنانەت شەوانەش لە پشت دەرگاکەی محمد ڕەزاوە دەخەوت.

من تاوەکو ئێستا لە تەمەندا هیچکەسم وەکو ئەم پیاوە نەبینیوە کە خۆی بکات بە قوربانی و بە جدی ئیشەکانی بکات.

مارك مورس بە ڕادەیەك پەیوەندی لەگەڵ خێزانەکەماندا پەیدا کردبوو کە پاش ڕۆیشتنی ئێمە بۆ پەنەما کاتێك کە سەربازێکی پەنەمای داوای لە فەرحناز کردبوو کە کارێکی نابەجێی لەگەڵدا بکات زۆر بەتوندی دابووی لە سەربازە پەنەمایەکە و بریندار ی کردبوو!

هەڵبەتە موچەی ئەم پاسەوانە زۆر گران بوو!

محمد ڕەزا و فەرەح لەگەڵ نەوە خۆشەویستەکانم لە ڤێلای ڕازاوەی بەڕێز جیمز کراسبی دەژیان و من و هاوڕێکانی دیکەش لە کەناری زەریا کۆمەڵە ڤێلایەکی جوانمان گرتبوو کە بۆ هەرشەوێك مانەوە لەو ڤێلایانەدا ٣٠٠ دۆلار بوو.

هەمووومان بیست کەس بووین و شەوی ٦ هەزار دۆلار تێچوونی مانەوە و خۆراك و خەرجیەکانی دیکەمان بوو.

پاسەوانەکانمان سەرەتا چەند کەسێکی ئەمریکی بوون. بەلام دوای ئەوەی کە یاسر عەرەفات، ڕێبەری فەلەستینیەکان، کە لە ڕوودا و ئاژاوەکەی تاراندا ڕۆڵێکی گرنگی بینی بوو، بۆ پیرۆزبای شۆڕشی ئێران ڕۆیشت بۆ خزمەتکردنی زیاتری هاوڕێکانی لەو سەردانەیدا ئەوەی خستبوویەڕوو کە کۆمەڵێك لە پارتیزانە فەلەستینیەکان دەنێرێت بۆ لەسێدارەدانی شا و خێزانەکەی لە باهاما، محمد ڕەزاش پاش بیستنی ئەم هەواڵە داوای لە سەرۆك وەزیرانی باهاما کرد یارمەتی بدات.

سەرۆك وەزیرانی باهاماش نزیکەی ٣٠ پاسەوانی لێهاتووی کردە بەرپرسی پاراستنی شا و ئێمە. بەلام وتی بە محمد ڕەزا ناتوانێت بە خوانێکی بەلاشی ئێوارە ئەمانە ڕازی بکات بۆیە دەبێت موچەیەکی باشیان پێ بدەیت بۆ ئەو چاودێریەی کە دەیکەن!

دیار بوو بەرپرسەکانی باهاما مەبەستیان هەڵتەکاندنی گیرفانی شا بوو.

محمد ڕەزا ڕۆژێکیان حسابی کرد وتی تێچوونی هەموو ڕۆژێکمان لێر نزیکەی ٤٠ هەزار دۆلارە! و ئەمانە خەریکە ڕووتمان دەکەنەوە!

محمد ڕەزا زۆر بێتاقەتی ئەو هەموو فشارانە بوو ڕووی کردە سەرهەنگ جهانبینی و وتی: (وەکو بڵێی تۆ بەرپرسی گیانی من و سەرۆکی پاسەوانەکانی منی. لەکاتێکدا دەبێت بۆ پاراستنی گیانی تۆش پارە بدەم!)

ڕۆژی دواتر محمد ڕەزا داوای کرد لە ئارمائۆ کە ژمارەی هاوڕێکانی کەم بکاتەوە و تەنها ئەو کەسانە بهێڵێتەوە کە خۆیان دەتوانن تێچوونی خۆیان بدەن!

ئارمائۆ بەو شێوەیەی کە عادەتی ئەمریکیەکانە و شەرمیش ناکەن لە باوك و دایکی خۆیان داوای لێبوردنی لە هەموویان کرد جگە لە ئێمە (خزمەکانی محمد ڕەزا).

بە گەیشتنی ئێمە بۆ باهاما نەوە خۆشەویستەکانم هاتن بۆ (ناسو) بۆ لای باوك و دایکیان. بە هاتنی منداڵەکان بۆ باهاما سەرۆك وەزیر (پیندلینگ) زانیاریدا کە دەبێت پاسەوانی ئاسایشی زیاد بکات. ئەم قسە بەو مانایە بوو کە دەبێت پارەی زیاتر بدەیت.

کەم کەم خەریکبوو وەسڵی حسابەکەمان لە ملیۆنێك دۆلار تێدەپەڕی!

ئێمە لە میسر و مەراکیش میوان بووین و تەنانەت لەکاتی دەرچوونمان لەو وڵاتانە خەڵاتی زۆر گرانبەهایان پێشکەش کردین ئێستا لە بارودۆخێکدابووین کە تەنانەت بۆ سەلام و عەلەیکێکیش داوای پارەمان لێ دەکەن!

پیندلینگ ساختەچێکی تەواوبوو. لەکاتێکدا کە هەموو پارەکان دەچووە گیرفانی ئەوەوە سەرەڕای ئەوەش ڕۆژێکیان هات بۆ لای پاشا و وتی توشی کێشەیەکی شەخسی بووم و پێویستم بە دوو سەد هەزار دۆلارە بە قەرز!

محمد ڕەزا پێی وت هەڵسوکەوتت لە پیاوێکی جێنتلمان ناچێت!

(پیندلینگ)یش بە ناشیرنێکەوە وەڵامی دایەوە: (تۆش جێنتلمان نیت! کەسێکی هاوڵاتیەکانت لە وڵاتەکەتدا دەریان کردویت.)

لەم قسە و باسانە کچەکەم لەهەموو کەس زیاتر بێتاقەت بوو. من و خاتو ئەشەرف و کچەکەم فەرەح لە تاران بڕیاری لەسێدارەدانمان بۆ دەرچووبوو و دادگای شۆڕش فەرمانی کوشتنمانی دەرکردبوو و داوای لە هەموو شۆڕشگێڕەکانی جیهانیش کردبوو لە هەرکوێیەکدا ئێمەیان بینی بمانکوژن و لەبەرامبەریشدا خەڵاتێکی باش وەردەگرن!

ئەم هەواڵە، بەتەواوی فەرەحی توشی شکست کردبوو. تەنانەت لە سێبەری خۆیشی دەترسا. ڕۆژێکیان وتی بە محمد ڕەزا: (هەریەکە لەو کەسانەی کە پارێزگاری

لە ئێمە دەکەن لەهەمانکاتیشدا بە مەترسیێکی جدی دادەنرێن. چونکە لەوانەیە بۆ بەدەستهێنانی ئەو پارەیە کە دانراوە بۆمان بمانکوژن!)

کچەکەم کێشەی دیکەشی هەبوو. محمد ڕەزا زۆر بەتوندی نەخۆش و ڕەنجاو بووبوو و لەگەڵ ئەوەدا توشی بەدگومانیش بووبوو. ئەگەر کچەکەم بۆ چەند خولەکێك لێی دووربکەوتایەتەوە دەبوو کاتژمێرێك بۆی ڕوون بکردایەتەوە کە لەکوێ بووە و لەگەڵ کێدا پەیوەندی گرتووە.

دادگای شۆڕشی تاران وتبووی ئەگەر کچەکەم (فەرەح) بتوانێت شا بکوژێت ئەوا دەیبەخشن!

ئەم بابەت بووبوویە هۆی ئەوەی شا تەنانەت لە ژنەکەشی دەترسا و توشی ترس و تۆقینی کردبوو. دەبێت ئەوە بڵێم چەند مانگێك پێش مردنی محمد ڕەزا، بووبوویە کێشەیەکی زۆر گەورەی ڕۆحی بۆ کچەکەم.

هەر هەواڵێك لە تاران یان لە پایتەختێکی دیکەی جیهانەوە دەگەیشت ئازارگەیەنەر بوو. سەرۆك کۆمارەکان و پاشاکانی دیکەی جیهان، ئەو دۆستانەی کە چەندین ساڵ لەگەڵ محمد ڕەزا و فەرەح ماچ ماچێنیان دەکرد، ئێستا لە بۆچوونەکانی خۆیاندا بەتوندی ڕەخنەیان لە شا و کارەکانی دەگرت!

بەڵی! حەقیقەتەکە ئەوەبوو کە ئەوان نەیاندەویست ئێران برەنجێنن. ئێران هەمیشە ئێران بوو. لەکاتێکدا کە شا دواهەمین ڕۆژەکانی خۆی دەگوزەراند.

جیهان بەشێوەیەك هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردین کە گوایا تاوانبارترین کەسی ئەم جیهانەین. کاتێك فشارەکان زۆر بوون. محمد ڕەزا هەوڵیدا دواهەمین تیری خۆی لە کەوانەکەدا بوەشێنێت.

محمد ڕەزا تەلەفۆنی کرد بۆ (هێنری کیسنجەر). هینری کیسنجەر لە ئەندامی پایەبەرزەکانی حزبی کۆماریخوازەکان و وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمریکا و هاوڕێکی نزیکی شا و کەسانی دەسەڵاتداری ئەمریکا بوو.

شا لەبەردەم من و فەرەحدا تەلەفۆنی کرد بۆ کیسنجەر و بە دەنگێکی نەرمەوە پێی وت: (ئەم چ وڵاتێکی ئازادە ئێوە هەتانە؟

ئەمە چ وڵاتێکە کە شوێنێکتان نیە بۆ هاوڕێیەکی خۆتان؟

من (شا) هیوادارم جارێکی دیکه سەرکەوتنی خۆم بەدەستبهێنمەوە تاوەکو قەرەبووی ئەو ساڵانەتان بۆ بکەمەوە کە هاورێیەتیم کردوون و دەست بکەم بە دوژمنایەتیتان!)

محمد رەزا کە بەتەواوی ناڕازی بوو لە بێ وەفای ئەمریکیەکان و بەچەشنێك لەگەڵ ئەو هاورێییەدا قسەی دەکرد وتی بە کیسنجەر: (چارەنوسی من بێ گومان وانەیەکی پەندئامێز دەبێت بۆ رێبەرانی دیکەی رۆژهەڵاتی ناوەراست و وڵاتانی جیهانی سێیەم تاوەکو ئیدی پشت بە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا نەبەستن)

پاشان وتی: (ئێوە دەبێت لە سۆڤیەتەکانەوە فێر بن. ئێوە دەبێت لە رووسەکانەوە فێربن. ئەوان ئەوەندە لەگەڵ هاورێکانی خۆیان بە وەفان کە بۆ پاراستنی دۆستەکانیان ئامادەن لەشکرکێشی بکەن!)

محمد رەزا نزیکەی نیو کاتژمێر لەگەڵ کیسنجەر قسەی کرد و توانی قەناعەتی پێ بکات کە رۆڵێکی زیاتر ببینێت بۆ ئەوەی هاوکاری بکات تاوەکو بڕوات بۆ ئەمریکا.

رێژەیەکی زۆر لە سەرمایە و ژیانمان لە ئەمریکا بوو. پێش کەوتنی رژێمی محمد رەزا، هۆشەنگ ئەنصاری ناردبوو بۆ ئەمریکا تاوەکو سەرپەرشتی ئەم سەرمایانە بکات. ئێستا پێویستی دەکرد خۆمان برۆین بۆ ئەمریکا و لەوێ ژیانمان بگۆرین.

محمد رەزا کە زۆر ترسی لە چارەنوس و ئایندەی خۆی هەبوو هەوڵیدەدا بە گەیاندنی خۆی بۆ ئەمریکا ژیانی منداڵەکانی رێکبخات و چاکیان بکات.

هەرچەندە دواتر شا توانی سامانەکانی خۆی، ئەو سامانانەی کە بەهۆی ئەرکەکانی باوکیەوە بەدەستی هێنا بوو کۆیان بکاتەوە، بەڵام دەبێت ئەوە بڵێم هەندێك کەس وەکو بهبهانیان کە موڵکوماڵەکانی شا کە تاوەکو پێش کەوتنی حکومەت سەرپەرشتی دەکرد رێژەیەکی زۆری بەتاڵان برد و خستیە سەر حسابەکانی خۆی!

من نامەوێت ئەرك و ماندوبوونەکانی بەرێز کیسنجەر بۆ سەفرەکەی شا بۆ ئەمریکا بەکەم سەیر بکەم، بەڵام هەر ئەم کیسنجەرەش پشکێکی لە سامانی محمد رەزا و لە راستیدا لە سامانکەی ئێمە (خێزانی شا) بە تاڵان برد.

محمد ڕەزا لەبەر ئەوەی کە باری کەوتبوو و ڕێگەیان نەدەدا بەخۆی لە ئەمریکا بمێنێتـــەوە، لـــە دەستپێـــشخەرێکی بەپەلـــەدا، سەرپەرشـــتی و کۆکردنـــەوەی موڵکوماڵەکەی سپارد بە گروپێکی ئەمریکی کە لە بانکێکی موڵکی راکفلرەکان (چیس منهتن بانك) کاریان دەکرد.

ئەم کەسانە بریتی بوون لە: (مەك لوی)، (هێنری کیسنجەر)، جۆزیف رید) و ئەو (ڕۆبێرت ئارمائۆ)یەی کە باسم کرد!

دەبێت ئەوەش باس بکەم کە بەڕێز هۆشەنگ ئەنصاریش کە لەلایەن محمد ڕەزاوە دەستنیشانکرا بوو بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەم بانکەدا کار بکات لەماوەیەکی زۆر کورتدا بوو بە یەکێك لە گەورەترین دەوڵەمەنـدەکانی ئـەمریکا و ئێستاش لـە ڕیـزی راکفلەرەکاندایە و بەڕێز هینری کیسنجەریش کارمەندی هۆشەنگ ئەنصارییە.

من لە ڕاستی کرداری بەڕێز ئەنصاری هیچ گومانم نیە، هەرچەندە کەسێکی زۆر سالم و باش و وەفادار و هەمیشە هاوکاری کردووین و یەکێکبوو لە هاوڕێ زۆر نزیکەکانمان لە ئەمریکا، بەڵام ئەویش تاوەکو توانی شای هەڵخەڵەتاند.

ئەوەشم بینی یاداشتەکانیدا کە بە بۆنەی ساڵیادی کەوتنی حکومەتی شا لە گۆڤاری ئێرانیەکانی دانیشتوی لۆس ئەنجلس بڵاوی کردبوویەوە سەرەڕای ئەو ڕێزداریەی کە دەریبڕی بوو بۆ محمد ڕەزا نوسیبووی: (من کرێکارێکی سادەی ڕستن و چنینی فەخری ئێران بووم بەهۆی شۆڕشی سپی شا و خەڵکەوە گەیشتمە وەزارەت!)

(کیسنجەر) پاش گفتوگۆ تەلەفۆنیەکەی لەگەڵ محمد ڕەزا ڕۆیشتبوو بۆلای کارتەر، ئەویش پێی وتبوو: ( تاوەکو کاتێك کە لە جیهاندا شوێنێکی دیکە هەیە بۆ شا نابێت بێت بۆ ئەمریکا، چونکە هاتنی بۆ ئەمریکا دەبێتە هۆی ئەوەی پەیوەندیەکانمان لەگەڵ ئێرانی ئیسلامیدا لەناوبچێت، ئەمە قسەی کۆتایی منە!)

(سایروس ڤینس) وەزیری دەرەوەش کە لەم گفتوگۆیەدا ئامادە دەبێت درێژە دەدات بە قسەکەی کارتەر و دەڵێت: (هاوڕێکانمان لە دەوڵەتی شۆڕشی ئێران زانیاریان پێداوین کە ئەگەر شا بێت بۆ ئەمریکا ئەوان ناتوانن ڕێگە لەو توندڕەوانە بگرن کە خوازیاری ئەوەن پەیوەندیەکانیان بپچڕێنن لەگەڵ ئەمریکادا!)

جارێکی دیکەش هەوڵدانەکان توشی شکست بوون.

کیسنجەر تەلەفۆنێکی کرد بۆ محمد ڕەزا و وتی: (کاردانەوەی کارتەر زۆر سەخت و ڕەسمی بوو! بەلاّم ئێمە (کیسنجەر و راکفلەر) بەردەوام هەوڵی خۆمان دەدەین بۆ ئەوەی ڕێگەیەکت بۆ بدۆزینەوە بۆ ئەوەی بێت بۆ ئەمریکا!)

محمد ڕەزا دەیوت: (من ڕێك بووم بە کەسێکی سەرگەرەدان کە بۆ شوێنێك دەگەڕێت لەناویدا بژی!)

محمد ڕەزا دەیوت من لە ساڵی ١٩٤٠ بە دواوە هاوپەیمانی ئەسڵی ئەمریکا بووم لە ناوچەکەدا. ئێستا سەیر بکەن بزانن ئەم ئەمریکیانە چەندە بێ شەرم و چەتاوەڕوون!

فشارە دەروونیکان و نەخۆشیەکانی محمد ڕەزا ئەوەندەی دیکە زۆربوون. فەرەح ناچاربوو دووبارە پرۆفیسۆر (ژۆرژ فلاندرین) لە پاریس بانگ بکاتەوە.

دکتۆری شارەزای فەرەنسی بەبێ دواکەوتن هات بۆ باهاما و هەوڵیدا لەگەڵ گروپەکەی خۆی چارەسەرێکی بکات. بەلاّم هەوڵدانەکانی پرۆفیسۆری فەرەنسی زۆر سودی نەبوو.

پرۆفیسۆر فلاندرین پاش چەند چارەسەرێکی سادە و پێدانی دەرمان ئەوەی خستەڕوو کە دەبێت شا بۆ چارەسەرکردنی یەکجاری لە نەخۆشخانەیەکی زۆر پێشکەوتووی تایبەتی شێرەپەنجەدا بخەوێنرێت!

بارودۆخی تەندروستی سەلامەتی شا ڕۆژ بە ڕۆژ ترسناکتر دەبوو و ئەمەش بەردەوامی مانەوەی لە (باهاما) نەگونجاوتر و قورستر دەکرد.

لەلایەکی دیکەشەوە، ئێمە وەکو ئەستێرە گەورەکانی یاری سرك بوبووینە جێگەی سەرنجی گەشتیارەکان.

باهاما سەرزەمینی گەشتیاری و توریستی بوو. جۆری گەشتیارەکانی باهاما جیاوازن لەگەشتیارەکانی هەموو جیهان. ئەو خەڵکانە بۆ سەردانی شوێنەوارێکی مێژوویی یان فەرهەنگی نایێن بۆ باهاما. بەڵکو ئەو گەشتیارانە دێن بۆ باهاما کە دەیانەوێت لە هەر جوڵە و کردارێکی خۆیان چێژ وەرگرن.

ڕۆژێکیان، گرووپێك لە ژنانی ئەمریکی کە بەتەواوی ڕووت و قووت بوون هاتن بۆ بەردەم ڤێلاکەی محمد ڕەزا و وتیان دەیانەوێت بەم کردارەیان شای دوور خراوە لە بێزاری و دڵشکاوی دەربێنن!

ڕۆژێکیان هاوسەری پێشوی کیان کای چیك (سەرۆك کۆماری تایوان) هات بۆ لای محمد ڕەزا و وتی لەبەر ئەوەی کە جنسیەی ئەمریکم هەیە دەمەوێت لەگەڵ شادا هاوسەرگیری بکەم تاوەکو لەو ڕێگەیەوە شا بتوانێت بێت بۆ ئەمریکا!

هەموو ڕۆژێك ڕووبەڕووی شتێکی تازە دەبووینەوە. بۆ نمونە کۆمەڵە گەشتیارێك دەهاتن و حەزیان دەکرد لەگەڵ شادا وێنەی یادگاری بگرن!

شوێنی مانەوەی محمد ڕەزا و کچەکەم بەخێرایی بوو بە گرنگترین و سەرنجڕاکێشترین شوێنی گەشتیارەکانی باهاما! بەرپرسەکانی باهاما کە بەڵێنیاندا بوو لەبەرامبەر وەرگرتنی پارەیەکی زۆر شوێنی مانەوەی شا بپارێزن. کارمەندی دەوڵەتیشی لە سەر ڕێگەی چوونە ناوچەی ڤێلاکەی شاوە جێگیر کردبوو و هەر گەشتیارێك بیویستایە بچێت بۆ ئەوەی شا ببینێت دەبوو پێشەکی پانزە دۆلار بدات ئێنجا ڕێگەی پێ دەدرا بڕوات بۆ ئەو شوێنە و لەو ناوچەیەدا لەگەڵ شا یان لەگەڵ ڤێلاکەیدا وێنەیەك بگرێت!

زۆربەی گەشتیارەکانیش پێیان باش بوو لەکەناری بەرامبەر ڤێلاکەی شا دا مەلە بکەن.

لێرەشدا دەبێت باسی ئەو ڕۆژنامەنوسە هەواڵدزانەش بکەم کە خواخوای بچوکترین هەواڵیان بوو لەسەرتاسەری جیهانەوە ڕژابوونە ناو باهاماوە.

کۆی ئەم هەلومەرجانە، ژیانی بۆ هەموومان تاڵ کردبوو. بەتایبەتی ئەو کاتەی کە هەواڵ گەیشت کە کارلۆسی تیرۆریستی جیهانی تیمێکی تایبەتیی ناردوە بۆ ئەوەی شا و هاوڕێکانی لەسێدارە بدات.

وابزانم لە شەش یان حەوتی ئەپریلی ١٩٧٩ بوو لە ڕادیۆیەکدا کە لە مەراکیش هێنابوومان لەگەڵ خۆماندا هەواڵی لە سێدارەدانی ئەمیر عباس هەویدامان لە تاران بەرگوێ کەوت. هەموومان بە ئاشکرا خۆشحاڵ بووین بە لە سێدارەدانی هەویدا. تەنانەت محمد ڕەزاش خۆشحاڵ بوو.

ئەم پیاوە بە نەزانی کارەکانی خۆی سیانزە ساڵی سەرۆك وەزیرانی خۆی بە بێ شەرمی و بێ ئابڕووی لەخۆی داماڵی و هەمووی خستنە گەردنی شا و وتی: (سیستەمی شاهنشاهی کەمتەرخەم بووە نەك ئەو!)

هەویدا و خێزانەکەی لە بەهاییە دەمارگیرەکانی ئێران بوون. هەر لەبەر ئەوە بوو بەهاییەکان و ئیسرائیلیش کە پشتیوانی لە بەهاییەکان دەکات لەگەڵ کۆمەڵەی بەهاییەکانی ئەمریکا گردبوونەوەیەکیان بەهۆی لەسێدارەدانی هەویدا ئەنجامدا، بەڵام ئەم هەراوهوریایە هەر زوو لەبیر کرا.

محمد ڕەزا لەبەرامبەر لەسێدارەدانی کۆمەڵێکیان زۆر بێتاقەت دەبوو و بەڵام لەبەرامبەر کۆمەڵێکی دیکەیان دەیوت باش بوو حەقی خۆیان بوو!

لەبارەی هەویداوە وتی: ((زۆر باش بوو، مافی خۆی بوو! بەڵام لەبارەی خوالێخۆش بوو خلعتبری (وەزیری دەرەوە) وتی: (بەداخەوە، پیاوێکی زۆر باش و سەر ڕاست بوو!)

چەند ڕۆژێك دواتر، گۆڤاری فەرەنسی (پاری ماچ) گەیشتە دەستمان کە وێنەی تەرمەکەی هەویدا لەسەر بەرگی گۆڤارەکە بڵاو کرابوویەوە لەگەڵ سێ چەکدار کە لەسەرسەری بوون.

لەم گۆڤارەدا، چاوپێکەوتنێکی ئاخوندێك بڵاوکرابوویەوە کە بە خلخاڵی بەناوبانگە، خلخاڵی لەم چاوپێکەوتنەدا باسی ئەوەی کردبوو کە چۆن تاوەکو ئێستا سەرەڕای هەویدا چوار سەد کەسی دیکەی سەر بە حکومەتی شایان لەسێدارە داوە.

محمد ڕەزا بە خوێندنەوەی چاوپێکەوتنەکە و بە بینینی وێنەکە دڵنیابوو کە بۆچوونەکانی خلخاڵی لەبارەی کوشتنی ئەو و خێزانەکەیەوە زۆر جدی و ترسناکە. دەوڵەتی باهاما هەموو ڕۆژێك بەشێوەیەك لە شێوەکان خەرجی شای گرانتر دەکرد بۆیە بەگشتی مانەوە لە باهاما بەهەموو شێوەیەك نەگونجاوبوو.

بۆیە شا بڕیاریدا لە باهاما بڕوات، بەڵام بۆ کوێ؟

شوێنێکی پێشبینی کراو بۆ کاتی ناچاری هەبوو. ئەنوەر سادات سەرۆك کۆماری میسر کە لەسەردەمی شادا پارەی زۆر بەخشندانەی وەرگرتبوو.

تەلەفۆنی کرد بۆ باهاما و پاش بیستنی ئەوەی کە بێ ئومێد بووە لە بەدەستهێنانی شوێنێکی دیکە، پێی وت دەرگاکانی ولاتەکەی هەمیشە بەرەو ڕووی شا کراوەیە!

محمد ڕەزا نەیدەویست جارێکی دیکە بگەڕێتەوە بۆ میسر. ئەو پێی خۆش بوو بڕوات بۆ مەکسیك. شا لەگەڵ (خوزە لوپز پورتی یو) سەرۆك کۆماری ئەو کاتەی مەکسیك دۆستایەتی و ناسراوی هەبوو.

بۆیە خۆی تەلەفۆنی کرد بۆ (لوپز) و لەکاتێکدا زۆر ئومێدی بەوە نەبوو کە داواکاریەکەی قبوڵ بکات، لوپز لە هەنگاوێکی باوەڕپێنەکراودا ئامادەی خۆی پیشاندا بۆ پێشوازیکردنی شا!

بۆیە دووبارە جارێکی دیکە سواری فڕۆکەیەکی (چارتری) کرێ بووین و بەرەو چوارەمین شوێنی مانەوەی پاش دەرچوونمان لە ئێران، ڕۆیشتین.

شوێنی تازەی مانەوەمان لە مەکسیك لەناو ڤیلای بەناوبانگی (گوڵی سور) بوو لە مەکسیکۆسیتی. لە مەکسیك بوو هەستمان کرد ملی شا غودەیەکی دەرەقی دروستکردوە.

فشاری ڕۆحی زۆر، شای توشی نەخۆشیێکی دیکەی تازە کردبوو. دەرکەوتنی ئەم غودەیە لە ملیدا ئەوەی نیشان دەدا کە نەخۆشیەکەی زۆر بەخێرای لە حاڵەتی تەشەنەکردندایە.

بە خێرای پرۆفیسۆر (فلاندرن)مان لە پاریس بانگ کرد. ئەویش لەگەڵ گروپەکەی خۆی هات بۆ مەکزیکۆسیتی و نمونەیەکی لە غودەیەکی وەرگرت. فلاندرن وتی: (ئێستا نیشەکە گەیشتوەتە ئاستێك ئیدی بە ڕاستی دەبێت سپڵی دەربهێنرێت!)

مانەوەی لە مەکسیك بۆ محمد ڕەزا دەردەسەری و ئێش بوو، چونکە دەبوو هەموو هەفتەیەك چارەسەری کیمیایی بۆ بکرێت. بەڵام ئێمە لە ڤێلای گوڵی سور (کوئر ناواکا) ڕۆژانی خۆشمان هەبوو.

لە (کوئر ناواکا) چەند کەسێك لە هاوڕێیانی ئەمریکی شا هاتن بۆ دیداری: وەکو (هینری کیسنجەر)، (جرالدفۆرد)، (ریچارد نیکسۆن)، (فرانك سیناترا)، (دیڤید راکفلەر)، (ئەلیزابێت تایلۆر) و هتد..

دیداری ئەم کەسانە لەگەڵ شا، هیچ کاریگەرێکی نەبوو لەسەر بەرزبوونەوەی ورە و ڕۆحیەتی چونکە زۆر نەخۆش بوو.

محمد ڕەزا هەموو ڕۆژێك زیاتر لاواز و بێ تواناتر دەبوو. تەنانەت ئێسقانەکانی دەمووچاوی لەژێر پێستیەوە دەرکەوتبوون.

لە هەمووی خراپتر هەندێك لەو هاوڕێیانەی کە دەهاتن بۆلای بەبێ ئاگاداری ڕۆحیەتی شا کۆمەڵێك قسەیان دەکرد کە ئەوەندەی دیکە دەبوونە هۆکاری ڕووخانی ڕۆحیەتی شا. بۆ نمونە (هێنری کیسنجەر) پێی وتبوو: (ئەگەر جەنابی حەزرەت دە ساڵ پێشتر لە دەسەلات لابچوایە ناوت دەچووە ناو گەورەترین ڕێبەرەکانی پاش جەنگی جیهانی دووەم و مێژوو بۆ هەمیشەیی باسی دەکردی!)

جراڵد فۆرد سەرۆك کۆماری پێشووی ئەمریکاش سەرەڕای زەمکردنی ئەخلاقی بەریتانیەکان وتبووی بە شا: (بەریتانیەکان بە فەراهەمهێنانی زەمینەی کەوتنی شا ویستیان لێدانێك بدەن لە ئەمریکا و ئەمریکیەکانیش بچوك بکەنەوە!)

بارودۆخی مەزاجی شا ئێمەی ناچار کرد بیر لە ئەنجامدانی نەشتەرگەرێك بکەینەوە. پرۆفیسۆر فلاندرن پێشنیاری نەخۆشخانەیەکی کرد لە ئەمریکا.

کیسنجەر کە هاتبوو بۆ مەکسیکۆسیتی داوای کرد لە شا بۆ بەدەستهێنانی ڕێگەیەك بۆ هاتنە ناو ئەمریکاوە پارە خەرج بکات. کیسنجەر بە ئاشکرا وتی سەرۆك کۆماری ئەمریکا کارتەر حەز ناکات ڕێگەی پێ بدات بێتە ناو ئەمریکاوە، بەلام (ماندیل) جێگری سەرۆك کۆمار دەکرێت بە پارە بیکڕیت و قەناعەتی پێ بکەیت!

چوار هەفتە لە مانەوەمان لە مەکسیکۆسیتی تێ پەڕیبوو. بارودۆخی شا گەیشتە ئەو پەڕی ترسناکی خۆی و لەهەمووشی خراپتر توشی نەخۆشی مەلاریاش بووبوو!

(کوئر ناواکا) پڕ بوو لە مێشولەی مەلاریا.

ئەمجارە لەسەر پێشنیاری (ڕۆبێرت ئارمائۆ) لە ئەمریکا دکتۆرێکمان دامەزراند کە دکتۆری خێزانی راکفلەرەکان بوو.

دکتۆر (بنجامین کین) مامۆستای زانکۆی کۆرنیل بوو لە نیۆیۆرك، یەکێك بوو لە ناسراوترین پزیشکەکانی جیهان و پزیشکی کەسایەتیە بەناوبانگەکانی جیهان بوو، هات بۆ مەکسیکۆسیتی بۆ چارەسەرکردنی شا.

(کین) سەرەڕای شێرەپەنجە زۆر و مەلاریاکەی، توانی نەخۆشی زەردیشی لێ بەدی بکات! دکتۆر کین وتی: (ئەم زەردۆییە بووەتە هۆی ئەوەی کە شێرەپەنجەکەی بەخێرای زیاد بکات و توشی غودەی ملیش ببێت!)

(دکتۆر بنجامین کین) پاش ئەوەی کە فایلی دۆسیەی چارەسەریەکەی شای پشکنی بە ئاشکرا دکتۆر (ژۆرژ فلاندرن)ی فەرەنسی بە بەرپرس زانی لە پێشکەوتنی شێرەپەنجەکەی جەستەی شا و وتی: (پزیشکە فەرەنسیەکان کۆمەڵە چارەسەرێکیان پێداوە کە بۆ سەلامەتی شا زۆر ترسناك بوون و بوونەتە هۆی پەرەسەندنی شێرەپەنجەکەی! لەم کاتەشدا دەموچاوی شا ڕەش بووبوو و بە دەست ئازاری سکیشیەوە دەینالاند.

دکتۆر کین لە کاتێکدا کە زۆر بەتوندی ڕەخنەی لە پزیشکە ئەوروپیەکان دەگرت وتی: (دەبوایە شا ماوەیەکی زۆر لە مەوپێش نەشتەرگەری بۆ ئەنجامبدرایە ئەوان دەرمانی کورتیزیونیان بۆ دیاری کردوە کە بە ڕاستی زیانی هەیە!)

وتی دەبێت بەپەلە شا نەشتەرگەری بۆ بکرێت و باشترین نەخۆشخانەش لە جیهاندا لە ئەمریکایە.

لەسەر پێشنیاری دکتۆر کین پسپۆڕێکی شێرەپەنجە لە نەخۆشخانەی مموریال هات بۆ مەکسیکۆسیتی و دەستیکرد بە چارەسەرکردنی.

ئیدی مانەوە لە مەکسیکۆ چارە نەبوو. کیسنجەر و راکفلەر و والتەرماندیل هەموویان کارتەریان خستە ژێر فشارەوە تاوەکو لەبەر مەسەلەی ئینسانی، شا قبوڵ بکات. کارتەر کە لەژێر فشارێکی زۆردا بوو، تەنانەت لەلایەن جێگرەکەی خۆشیەوە تەکلیفی لێ دەکرا، بڕیاریدا شا قبوڵ بکات و بڕوات بۆ نیویۆرك و لە نەخۆشخانەی مموریال بخەوێنرێت.

کارتەر داوای لە وەزارەتی دەرەوە کرد، پێشتر بەرپرسانی دەوڵەتی ئێران لەم ڕووداوە ئاگادار بکەنەوە تاوەکو دڵنیا بن کە شا تەنها بۆ چارەسەری نەخۆشی دەچێت بۆ ئەمریکا و لەگەڵ کۆتایی هاتنی نەشتەرگەریەکەشیدا لە ئەمریکا دەردەکرێت.

پـێش ڕۆیـشتنمان بـۆ نیۆیـۆرك لـوز پـورتی یـو (سـەرۆك كۆمـاری مەكـسیك) هـات بۆلامان و دڵنیای كردینەوە كە شا دەتوانێت دوای چارەسەر لە ئەمریكا بگەڕێتەوە بۆ مەكسیك. لەسـەرەتای مـانگی مـەی بـوو بـە فڕۆكەیـەكی كرێـی سـەر بـە كۆمپانیـای (گۆلف ئستریم) ڕۆیشتین بۆ نیۆیـۆرك. ئەم كۆمپانیایە موڵكی ئێرانێكی ملیۆنێر بوو بەناوی نمازی (كەخەڵكی شیراز) بوو.

لە ئەمریكا زۆربەی كۆمپانیاكانی فڕۆكەوانی و كۆمپانیاكانی كەشتیوانی و كارگە گەورەكان و تەنانەت پالاوگەكان و چاڵە نەوتەكانیش موڵكی ئێرانیەكان بوون كە ئێمە پێشتر هەرگیز ناوی ئەوانەمان نەبیستبوو.

كاتێك شـا بیـستی بـەڕێز نمـازی (كـە ئێرانێكـی نیـشتەجێی ئەمریكایـە) خـاوەنی چەندین كۆمپانیای فڕۆكەوانی و كەشتیوانی و چەندین كۆمپانیـای نـەوت و پالاوگـەی نەوت و كارگەیە بە داخ و پەژارەوە وتی: (من ئەگەر لە ساڵی ١٩٥٣ نەگەڕایەمەوە بۆ ئێران و لە ئەمریكا بومایە ئێستا سەرمایەدارێكی گەورەی ئەمریكا بووم و دوور بووم لە هەموو ئەم نەگبەتیانە!)

كاتێك لـە فڕۆكەخانەیـەكی نەناسـراو لـە (فـۆرت لادردیـل) نیـشتینەوە هـچكەس چاوەڕوانمان نەبوو!

لە فڕۆكەخانەكە، تەنها ڕاوێژكارێكی ئەمریكی كە لە بەڕێوەبەرایەتی لێكۆڵینـەوەی كەرەسە كشتوكاڵیەكانی ئەمریكا كاری دەكرد چاوەڕوانمان بوو، پاش ئەوەی هـەموو كەلوپەلـەكانی پـشكنی بـۆ ئـەوەی دڵنیـا بێـت لـە مەكـسیك گـوڵ و گیـا و یـان تـۆوی سەوزەوات و میوەمان لەگەڵ خۆماندا نەهێناوە!

محمـد ڕەزا لـەو حاڵـە بێتاقـەت و بێـزارە كـە ڕەنگـی زەرد و لاواز هەڵگـەڕا بـوو وتـی: (سەیركەن بزانن توشی چ ڕۆژگارێك بووم؟ هـەر لـەم خاكـەی ئـەمریكادا ترۆمـان، جۆن ئێف كەنەدی و كارتەر دەهاتن بۆ پێشوازیم و فەرشی سوریان بۆ ڕادەخستم!)

هەمووومان بێتاقەت و بێزاربووین لەم پشتگوێخستن و گوێنەدانەی ئـەمریكا، بـەلام دەمانتوانی چی بكەین. ئێمە نەڕۆیشتین بۆ نەخۆشخانەی ممۆریال. بەڵكو چووین بۆ نەخۆشخانەی نیۆیۆرك كە سەر بە ناوەندی پزیشكی كۆرنێل و بەوە بەناوبانگ بوو كە سەر بە (زانكۆی كۆرنێل)ە.

ژووری شا له قاتی حەوتەم بوو. ژوورێکیش له تەنیشت ئەودا بۆ فەرەح گیرا بوو و دەرگایەکیشی لەسەر بوو کە دەچووە ناو ژوورەکەی شا.

شا بەناوی خوازیاری (دیڤید نیوسام) له نەخۆشخانە خەوێنرا. له هەموو دۆسیە و فایلەکانی پزیشکیەکەیدا به (دیڤید نیو سام) ناو دەبرا. سەیر لەوەدایە (دیڤید نیوسام) لەو کاتەدا ناوی حەقیقی جێگری وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بوو!

سەرەڕای ئەوەش هەوڵدرابوو زۆر بەشێوەیەکی نهێنی ئەم نەشتەرگەریە ئەنجام بدرێت بۆ شا و کەس ئاگاداری هاتنی شا نەبێت، بەڵام هەر لە یەکەم ڕۆژی هاتنمانەوە بۆ نەخۆشخانەکە پێمانزانرا و چاپەمەنیەکان و وێزگە ڕادیۆییەکان و تەلەفزیۆنەکان بابەتەکەیان ئاشکرا کرد بۆ خەڵکی.

من ئێستا ناوی هەموو ئەو پزیشك و تیمەم له بیر نیە كە محمد ڕەزایان چارەسەر دەکرد. بەڵام دەبێت ئەوە بڵێم لە ئەمریکا هەمووشتێك لەسەر بنەمای پارەیە. شا نەخۆشێکی پارەدار بوو و نەخۆشخانەی کۆرنیل و پزیشکەکانی هەوڵیاندەدا لەم پاروە کە بە چنگاڵەکەوە بووە بەتەواوی سود وەرگرن.

فەرەح کە بیست و چوار کاتژمێر لەسەر سەری پیاوەکەی بوو، وتی پێم هەر لەیەکەم ساتی هاتنەژوورەوەی شا و خەواندنی سەرۆکی نەخۆشخانەکە هات بۆلامان و داوای لە شا کرد بە مەبەستی هاوکاری کردن بۆ کڕینی کەرەسەی بەشی شێرەپەنجەناسی نەخۆشخانەکە وەکو بەشداربوویەك له کارێکی خێرخوازیدا ئەگەر دەتوانی بڕی ملیۆنێك دۆلار ببەخشێت بە نەخۆشخانەکە!

ئەمە باج و خەراج وەرگرتنێکی ئاشکرا بوو لە کەسێك کە لەسەرە مەرگدا بوو!

محمد ڕەزا کە خەریکبوو دەستوپەنجەی لەگەڵ مەرگدا نەرم دەکرد هیچ چارەیەکی نەبوو جگە لەوەی کە دەبوو ئەم پارەیە بدات!

ژمارەیەکی دیکەی پزیشکەکان وەکو پزیشك کۆلمن (پسپۆڕی چارەسەری کیمیایی) ئەویش هاتە ناو گروپی پزیشکانی چارەسەرەوە.

هەر چەند خولەکێك یەکجار پزیشکێکی تازە بە فایلێکەوە خۆی دەکرد بە ژوورەکەی شادا و هەواڵی دەپرسی و پاش چەند پرسیارێکی دوبارە بوو لە ژوورەکە دەچووە دەرەوە.

ئێمه دواتر هۆکاری سەردانی ئەم هەموو پزیشکانەمان زانی کە هەریەکە لەوانە بۆ چەندین جار چارەسەری شا (و لە ڕاستیدا چەند پرسیارێك لە شا) بە دەیان هەزار دۆلاریان وەرگرتبوو!

پزیشکەکان پاش چەندین کۆبوونەوە و ڕاوێژ کە زۆر درێژەی کێشا بڕیاریاندا بیبەن بۆ ژووری نەشتەرگەری، لەکاتێکدا کە هەموو فەحس و سۆنەر و وێنەکان ئەوەیان نیشان دەدا سپڵی بووە بە سێ ئەوەندەی سپڵی ئاسای خۆی و دەبوو زراویشی دەربهێنن!

بۆ بەیانی ڕۆژی دوای نەشتەرگەریەکە بینیمان ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکارانی ئێرانی نیشتەجێ ئەمریکا هاتوون بۆ بەردەم نەخۆشخانەکە و هۆتافی مەرگ بۆ شا دەدەن!

کچەکەم بە زەردەخەنەیەکی تاڵ وتی: (ئەمانە نازانن ئیدی پێویست بەوە ناکات بڵێن مەرگ بۆ شا چونکە شا خۆی خەریکە دەڕوات!)

لێرەدا بۆ ئەوەی بەتنها نەبین فەریدون جوادیش هات بۆلامان.

نازانم پێشتر بۆم باسکردن یان نا؟(فریدون جوادی) یەکێك بوو لە کۆنترین هاوڕێکانی سەردەمی زانکۆی فەرەح لە پاریس و لە ڕاستیدا یەکەمین هاوڕێیشی بوو لە فەرەنسا. فریدون جوادی بەدرێژای ژیانی خۆی لەگەڵ ڕەزاگیانی (قطبی) برازام و مامۆستا هۆشەنگ نهاوەندی سێگۆشەیەکی خۆشەویستانە و پاکیان لە دەوروبەری فەرەحی خۆشەویستم دروستکردبوو.

فریدون جوادی هاوڕێیەکی دڵسۆز و خۆشەویستبوو بۆ کچەکەم و فەرەحیش ئەوی وەکو برایەك خۆش دەویست[1]

---

[1] – بۆ زانیاری لەبارەی پەیوەندی برادەرانەی فەرەح و فەریدون جەوادی سەیری کتێبی (پاش کەوتن)ی (ئەحمەد علی ئەنصاری) (کوڕی پورێی فەرەح) بکە لاپەرە ٧٦.

ئەحمەد علی ئەنصاری دەنوسێت: (بەهۆی هاتوچۆ بەردەوامەکانی ئەم فەریدونە بۆ کۆشك پەیم بە پەیوەندێکی ناناسای نێوان فەرەح و فەریدون بردبوو و چەندینجاریش لە ڕێگەی هۆکاری جیاواز و بە ئاماژە و نیشانە فەریدونم تێگەیاندبوو کە ئەم پەیوەندیە بەم شێوەیە بە شاراوەیی نامێنێتەوە...)

ئەحمەد علی ئەنصاری (کوڕی پوری فەرەح) لە بەشێکی دیکەی یاداشتەکانیدا دەنوسێت:

فەریدون وەکو خزمەتکارێك لە نەخۆشخانە لە دەوروبەری شا و فەرەح دەسوڕایەوە و بە قسە نەرم و ئارامکەرەوەکانی کچەکەمی لە نارەحەتی و بێزاری دەردەهێنا. ئێستاش فریدون لە پاریس لە نزیك کەچەکەم دەژی و هاوڕێی و برایەکی دڵسۆزە بۆ فەرەح

کچەکەم فەرەح کە مانەوەی بۆی زیانی هەبوو بۆ حاڵەتی دەروونی پاش ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکە داوای کرد لە ئەشرەف بۆ ماوەیەکی کورت ڕێگەی بکاتەوە لە ماڵەکەی. بەڵام ئەشرەف کە کچەکەم (فەرەح) و دەوروبەری فەرەحی بە بەرپرسی کەوتنی شا دەزانی بە توڕەییەوە ئەم داواکاریەی ڕەفز کردەوە و پێی وت (باشترە بڕۆیت بۆ دۆزەخ!)

من بینیومە لە چەند کتێبێکی مێژووییدا کە نوسەرە بیانی و ئێرانیەکان نوسیویانە، وتراوە فەرەح لەماوەی ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکەی شا لە نیۆیۆرك ڕۆیشتوە بۆ ماڵی ئەشرەف و لەلای ئەو ماوەتەوە.

ئەم بابەتە هیچ ڕاست نیە و من و فەرەح و فریدون جوادی لە نەخۆشخانە دەماینەوە.

فەرەح هەمیشە ڕقی لە نەخۆشخانەبوو و لە نەخۆشخانەش دەترسا. بەڵام ناچاربوو بۆ وەفاداری هاوسەرەکەی لە نەخۆشخانەی نیۆیۆرك بمێنێتەوە.

هێشتا چەند ڕۆژێك لە نەشتەرگەریەکەی شا تێ نەپەڕیبوو وێنەکان ئەوەیان نیشاندا پزیشکەکان لەکاتی ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکەدا بەردی زراوەکەیان بەجێهێشتوە! هەروەها دەمی زراوەکەش هێشتا بەستراوە.

پرۆفیسۆر کۆلمن لە بری ئەوەی نارەحەت بێت بەم مەسەلەیە بە پێکەنینەوە وتی: (ها، ها! بەڕاستی جێگەی گاڵتە و پێکەنینە پزیشکەکان زیخەکانیان بەجێهێشتوە!)

فەرەح بەبێ دواکەوتن تەلەفۆنی کرد بۆ پاریس و لەگەڵ پرۆفیسۆر (فلاندرن) قسەی کرد. (ژۆرژ فلاندرن) کە سەرەڕای ئەوەی کە ماوەیەکی دووروودرێژ بەرپرسی

---

(مەسەلەیەکی دیکەی گرنگ کە لەکاتی مانەوەی شا لە مەکسیك دروستبوو، و ئەوەش بووە هۆی ئەوەندەی دیکە بێتاقەتی و خەمۆکی شا، باسی ئەو پەیوەندیەی نێوان فەرەح و فەریدون بوو کە ئاشکرا بوو و باسەکەش گەیشتبوویەوە گوێی شا.

پاراستنی سەلامەتی شا بوو هاوڕێی دێرینی فەرەحیش بوو وتی: (لە ئەنجامدانی نەشتەرگەی زراودا ڕەوشێکی زۆر لێهاتوانە هەیە کە پزیشکەکە دەبێت لەکاتی نەشتەرگەریەکەدا فشار بخاتە سەر جگەری نەخۆشەکە بۆ ئەوەی بزانێت هەموو زیخ و بەردەکان لە زراوکەدا هاتونەتە دەرەوە یان نا؟ بۆچی ئەم کارەیان نەکردوە؟ بۆچی؟)

پاشان پێشنیاری کرد بۆ فەرەح بۆ پاراستنی گیانی شا بەخێرای لە ئەمریکا بیکاتە دەرەوە! ئێمە کەوتبووینە ناو بارودۆخێکی سەیرەوە.

لەلایەکەوە پزیشکە ئەمریکیەکان پزیشکە فەرەنسی و ئەوروپیەکانیان تۆمەتبار دەکرد بەوەی کە بەهۆی بەکارهێنانی دەرمانی بێ کەڵکەوە بوونەتە هۆی پەرەسەندنی شێرەپەنجەکەی و لەلایەکی دیکەشەوە پزیشکە ئەوروپیەکان هاوکارە ئەمریکیەکانیان تۆمەتبار دەکرد بەوەی کە دەیانەوێت شا بکوژن!

پاش ڕاوێژێکی زۆر، پزیشکەکان وتیان بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری دووەمی شا لە ئێستادا ناکرێت چونکە بینینی زۆر لاواز بووە، دەبێت سود لە ڕەوشێکی دیکە وەربگیرێت کە ئەویش پزیشکێکی تایبەتی کەنەدیە کە بۆ لەناوبردنی بەردی زراو بەکاری دەهێنێت بۆیە دەبێت ئەو پزیشکە بانگ بکرێت!

هەروەها پزیشکەکان بڕیاریاندا غودە دەرەقیەکەشی لیزەری لێ بدەن! باشترین ناوەندی ئەو کارەش نەخۆشخانەی (کترنیگ-ئیستون) بوو. دایکی شا چەند ساڵێك پێشتر لەو نەخۆشخانەیە نەشتەرگەری بۆ کرابوو و شا وەکو سوپاسگوزاری ملیۆنێك دۆلاری پێ بەخشیبوو!

لە ڕۆژی ٤ نۆڤەمبەری ١٩٧٩ لە تارانەوە هەواڵ گەیشت کە گروپێك لە خوێندکارانی تاران بە ڕێبەرایەتی چەند کەسێك لە ئاخوندەکان چوونەتە ناو سەفارەتی ئەمریکاوە و بە هێزی چەك ٦٦ کەس لە دیبلۆماتە ئەمریکیەکانیان بە بارمتە گرتوە و داوای ئەوەیان کردوە کە دەبێت لەگەڵ شادا ئاڵوگۆڕیان پێ بکرێت.

ڕۆژنامە و ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکانی جیهان پڕبوون لە هەواڵی ئەم بارمتانە.

باسی ئەوە دەکرا کە ڕێبەری ئەم خوێندکارانە مەلایەکە لە زانکۆی مۆسکۆ خوێندویەتی!

ئێمە زۆر توشی ترس و نیگەرانی بووین لەم داواکاری خوێندکارانە. ناوەندی لێزەری نەخۆشخانەی (کترینگ ئیستون) ئیدی ئامادە نەبوو شا قبوڵ بکات و چارەسەری بکات و دەیوت لەوانەیە تیرۆرستەکان هێرش بکەنە سەر نەخۆشخانەکە.

پاپای گەورە داوای میانجیگیری کرد بەلأم ڕێبەرانی ئێران ئامادە نەبوون گوێ بۆ خواستەکەی پاپا بگرن.

وڵاتێکی جیهانی سێیەم کە تاوەکو ماوەیەك پێش ئێستا هاوپەیمانی یەکەمی ئەمریکا بوو، ئێستا خەریکە لەگەڵ ئەمریکا ڕووبەڕوو دەبێتەوە و خەریکە لەگەڵیدا دەکەوێتە ململانێی توندەوە.

فەرەح هیوادار بوو ئەمریکا هێرش بکاتە سەر ئێران.

هەموو هاوڕێکانمان تەلەفۆنیان دەکرد و هیواداربوون ئەمریکا دەستێك بوەشێنێت لە ئێران.

تەنانەت شاهپور بەختیار لە پەناگەکەی پەیوەندی کرد و وتی: (هیوا بۆ گەڕانەوەی شا زیاترە لە تەسلیمکردنەوەی بە دەوڵەتی ئێران بێتاقەت مەبەن!)

بەلأم محمد ڕەزا لە کاتی بیستنی ئەم هەواڵە توشی جۆرێك لە نەخۆشی تازە بوو و بەردەوام عارەقی دەکرد. ئەم قسانەی قبوڵ نەبوو و بەتایبەتی داوای لە کیسنجەر و راکفلەر کردبوو کە ئاگاداری بن و نەهێڵن ئەمریکا تەسلیمی بکاتەوە!

بە بارمتەگرتنی ٦٦ دیبلۆماتی ئەمریکی لە تاران، پێش ئەوەی ئەمریکیەکان ڕقیان لەو دەسەلأتە تازەیەی ئێران بکەوێت ئەوەندەی دیکە ڕقیان لە شا کەوت.

ئەمریکیەکان بە ئاشکرا خوازیاری دەرکردنی شا بوون. ڕۆژنامەکان بە ئاشکرا هێرشی توندیان دەکردە سەر کیسنجەر، راکفلەر، ئارمائۆ، دکتۆر کین و پزیشکەکان و هەموویان بە خیانەتکار و دژە بەرژەوەندی ئەمریکا تاوانباریان دەکردن!

حکومەتی ئەمریکا بە فەرمانی سەرۆك کارتەر هەموو داراییەکانی ئێرانی بلۆك کرد و کۆمەڵێك ڕێوشوێنی توندی گرتەبەر بۆ ئەوەی بارمتەکان ئازاد بکات. (ریچارد هیلمز) سەفیری پێشوی ئەمریکا لە تاران (سەرۆکی پێشووی سی ئای ئەی) کە هاوڕێی نزیکی محمد ڕەزاش بوو بەردەوام دەهات بۆ بینینی محمد ڕەزا و زانیاری پلە

یەکی و نهێنیانەی دەدا بە محمد ڕەزا لەکاتێکدا لە نەخۆشخانە کەوتبوو و چاوەڕوانی چارەنوسی خۆی بوو.

قەیرانی سەفارەت بووە هۆی ئەوەی ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی جیهان کە تاوەکو ئەو کاتە زۆر گرنگیان بە بارودۆخی ئێران نەدەدا دەستبکەن بە باسی حکومەتی شا. ئەوان بە زیادەڕەوی و گەورەکردن (شا)یان تاوانبار کرد بەوەی کە دەستی هەبووە لە کوشتنی خەڵکی ئێراندا و بەهۆی ساواکەوە خەڵکیان زۆر بێ بەزەییانە سەرکوت کردوە. لەماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا شەقامی ئەمریکا بەتەواوی بوو بە دوژمنمان. ئەمە گەیشتە ئاستێك کچەکەم ترسی ئەوەشی هەبوو بەلآیێك بێت بەسەر منداڵەکانیشیدا کە خەریکی خوێندن بوون لە ئەمریکا.

کاری چارەسەرەکە تاوەکو ڕادەیەك وەستابوو. شا زۆربەی کاتەکانی خۆی لە نەخۆشخانەدا بە سەیرکردنی تەلەفزیۆنەوە دەبردە سەر و هەواڵەکانیش بەردەوام پڕ بوون لەهەواڵی خۆپیشاندان لە بەرامبەر سەفارەتی ئەمریکا لە تاران و داوایان دەکرد شا تەسلیم بکرێتەوە!

ئەم ڕووداوانە محمد ڕەزایان زۆر بەتوندی ترساند بوو، شا دڵنیابوو پلانێکی ڕۆژئاوایی لە ئارادایە کە دەیەوێت شا تەسلیمی ئێران بکاتەوە.

محمد ڕەزا دەیوت دەستبەسەراگرتنی سەفارەت، کاری خودی کارتەر و هاوڕێکانیەتی و دەیانەوێت بە بزواندنی بیری گشتی ئەمریکا و بە بیانوی ڕزگاربوونی گیانی ٦٦ بارمتەی ئەمریکی شا تەسلیمی دادگای شۆڕشی ئێران بکەنەوە!

شا وتی بە (ریچارد هیلمز) و هاوسەرەکەی (سنتیا) کە بۆ دیداری هاتبوون بۆ نەخۆشخانە: (ئەگەر ئەمریکا نیەتێکی باشی هەیە پێویستە ئایت الله خومینی و توندڕەوەکان لەسەر کار لابەرێت).

هەروەها شا پرسی لە هیلمز (کە سەرۆکی پێشوی دەزگای ڕەش بوو): (بۆچی ڕۆژئاوا منی لەناوبرد؟)

(هیلمز) لەبری وەڵامی ئەم پرسیارە پێشنیاری کرد بۆ شا کە هەرچی خێراترە بگەڕێتەوە بۆ مەکسیك.

ئەم ڕستەیەی (هیلمز) ئەوەندەی دیکە شای توشی تۆقین کرد! ئیدی شا دڵنیابوو لەوانەیە ئەمریکیەکان لەگەڵ ئەو بزوتنەوە شۆڕشگێڕەی ئێران معامەلە بکەن و شا تەسلیمی ئێران بکەنەوە.

ئەوەی کە ئەوەندەی دیکە شای توشی نیگەرانی و تۆقین کرد بۆچوونەکەی دکتۆر (کۆلمن) بوو.

(کۆلمن) کاتێك پاش چەند ڕۆژێکی دیکە هاتەوە بۆ بینینی شا و سەیری شێوەی چارەسەرەکانی چەند ڕۆژی پێشووتری کرد بە توڕەییەوە فایلەکەی کوتا بە زەویدا و وتی: (مەگەر نەم وت دەبێت ئەو حبانەی پێ نەدرێت چ کەسێك ئەم حبانەی داوە بە شا؟)

کۆلمن وتی: (چاودێری شا ناکرێت و من دڵنیام لێرە کەسانێك هەیە نایانەوێت شا چارەسەر بکرێت!)

لە کۆتایی مانگی نۆڤەمبەر بوو لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کەسێك هات بۆ نەخۆشخانە و پێیڕاگەیاندین دەبێت بەبێ دواکەوتن ئەمریکا بەجێبهێڵن!

شا وتی بە ئارمائۆ پەیوەندی بکە بە سەرۆك کۆمار (لوپز پۆرتی یو)وە.

ئارمائۆ ڕۆیشت و چەند کاتژمێر دواتر هاتەوە و ئەوەندەی دیکە بارەکەی قورس کردین و وتی: (مەکسیك ئامادە نیە دووبارە وەرمانبگرێتەوە و سەرۆك کۆمار لوپز سەرەڕای ئەو بەڵێنەی کە دابوی وتی ناتوانم شا قبوڵ بکەم!)

ئێمە نەماندەزانی دەبێت چی بکەین!

ئارمائۆ وتی: (دەوڵەتی ئەمریکا خۆی پەناگایەکی تازەی لەبەرچاو گرتوە و لەوانەیە خۆی ئێمە بنێرێت بۆ وڵاتێك لە دەریای کارئیبی یان ئەمریکای ناوەند).

فەرەح داوای لێ کردم لە ئەمریکا لەلای منداڵەکان بمێنمەوە و لەوان جیاببمەوە. مانەوەی من لە ئەمریکا هیچ ڕێگرێکی یاسای نەبوو. هەرچەندە دوورکەوتنەوە لە کچەکەم زۆر قورس بوو، بەڵام بۆ ئەوەی لەلای نەوە خۆشەویستەکانم بم ئەم پێشنیارەم قبوڵ کرد. بەتایبەتی کاتێك کە لەیلا تەنها نۆ ساڵ تەمەنی بوو و منیش بەڕاستی دەمتوانی ڕۆڵی دایکی ببینم و شوێنی خاڵی فەرەح پڕ بکەمەوە.

محمد ڕەزایان لەسەر کورسیە تایەدارەکەی سواری ئۆتۆمبێل کرد و لەگەڵ هاوڕێکانی ڕۆیشتن بۆ فڕۆکەخانەی (لاگاردیا).

دوابەدوای ئەم ڕۆیشتنە ئیدی باسی دەربەدەری کچەکەم لە زمانی خۆیەوە بیستو. ئەوانیان لە نەخۆشخانەوە برد بۆ فڕۆکەخانەی لاگاردیا و لەوێشەوە بۆ بنکەی (لیک لەند) لە تەکساس.

شا لە بنکەی (لیک لەند) لە نەخۆشخانەیەکی تایبەتی نەخۆشیە دەروونیەکانی ئەفسەرەکان خەوێنرا! ژوورێکیشیاندا بە کچەکەم و هاوڕێکانی کە چەند پەردەیەکی کۆن و چەند قەنەفەیەکی کۆنی تێدا بوو.

فەرماندەی ئەم بنکەیە بەرپرسێکی تووڕە بوو لە سەردەمی جەنگی ڤێتنامدا فەرماندەی یەکێك لە هێزەکان بووە ناوی (ئاکەر) بوو، بەردەوام داوای لە فەرەح دەکرد بۆ ئەوەی یاری تێنسی لەگەڵدا بکات.

وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، ڕێگەیدابوو بە بنکەی (لیك لەند) تاوەکو پەنایەك بدۆزنەوە بۆ شا و هاوڕێکانی.

ئارمائۆ زانیاری دەدا کە هەوڵ و پەیوەندیکردنی زۆر لە ئارادایە تاوەکو یەکێك لە ولاّتەکانی پارگوای، گواتمالا، تونگا، ئایسلەند یان پەنەما شا قبوڵ بکەن، بەلاّم تاوەکو ئێستا ئەم هەوڵدانانە بێ دەرئەنجام بوون.

سەرئەنجام (عمر تورخوس) حاکمی سەربازی پەنەما (سەرۆکی پاسەوانی نەتەوەیی) ملی بۆ فشارەکانی ئەمریکادا و ئامادە بوو شا قبوڵ بکات.

دەیان هەزار سەربازی ئەمریکا لە پەنەما بوون. ئەمریکا چەند بنکەیەکی سەربازی گەورەی لە پەنەما و لە دەوروبەری کەناڵی پەنەما هەبوو. شا و هاوڕێکانی بە فڕۆکەیەکی بچوکی هێزی ئاسمانی ئەمریکا لە تەکساسەوە بەرەو پەنەما ڕۆیشتن و لە فڕۆکەخانەی (هاوارد) کە فڕۆکەخانەیەکی بنکەی ئەمریکیەکان بوو نیشتەوە.

شوێنی مانەوەی شا لە دوورگەی (کونتادورا) بوو کە ژەنراڵ (عمر توریخوس)یش لەو شوێنەدا چەند ڤێلایەکی ڕازاوەی هەبوو.

هەر لەوێ دەرکەوت کە بۆچی توریخوس شای قبوڵ کردوە. ئەویش چاوی لە پارەکانی شا بوو.

کچەکەم (فەرەح) باسی دەکرد دەیوت شا لەو ماوەیەدا بەچەشنێك لاوازبووبوو نەیدەتوانی خۆی بگرێت و هیچ جل و بەرگێک بە جەستەیەوە نەدەوەستا!

هەر بۆیە عمر تورخوس کاتێك شای بینیبوو بەبێ ئەدەبی وتبووی: (شا، شا، کە باسی دەکەن ئەمەیە؟)

عمر توریخوس یەکێکبوو لە پاڵەوانەکانی بۆکسێنی پێشووی جیهان و جەستەیەکی گەورەی هەبوو.

خاڵێکی زۆر گرنگ کە پێویستە لێرەدا ئاماژەی بۆ بکەم، بێ خۆشەویستی و بێ وەفایی برا و خوشکەکانی محمد ڕەزا بوو.

هەڵبەتە تاج الملوك (شاژنی دایك) عوزری هەبوو. ئەو پیرەژنێکی نەخۆش و لەکارکەوتووبوو سەرەڕای نەخۆشی شێرەپەنجە توشی نەخۆشی لەبیرچوونەوە و لەرزینش هاتبوو.

(تاج الملوك) هیچ کەسی لەبیر نەمابوو و هیچیشی نەدەزانی.

محمد ڕەزا لەبەر ئەوەی کە پەیوەندێکی زۆری بە دایکیەوە هەبوو و خۆشحاڵ بوو بەوەی کە ئێستا هیچشتێکی لەبیر نەماوە و ناتوانێت لە دەورووبەرەکەی تێ بگات و کەس بناسێتەوە دەیوت: (بۆ ئەم کارە سوپاسی خوداوەند دەکەم. بەهیچ شێوەیەك حەزم نەدەکرد دایکم ئاگاداری ئەم کەوتنە و لەناوچوونی ئێمە بێت بۆ ئەوەی خەفەتمان بۆ نەخوات!)

(ئەشرەف)یش پەیوەندێکی زۆری لەگەڵ براکەی هەبوو، بەلایەنی کەمەوە ڕۆژانە دوو یان سێ جار تەلەفۆنی بۆ دەکرد، بەڵام ئامادە نەبوو لەگەڵ فەرەحدا قسە بکات و کچەکەمی بە بەپرسی نەگبەتیەکانی شا دەزانی. دەیوت فەرەح بەدفڕ بوو، پاش هاوسەرگیری لەگەڵ محمد ڕەزا یەکەمین ڕووداوی تیرۆری شا ڕوویدا و سەرئەنجامیش حکومەتی پەهلەوی کەوت!

جگە لە ئەشرەف ئیدی هیچکەس پەیوەندی نەکرد بە شاوە. نە شاهپور غلامرەزا، نە عبدالرەزا، نە برا و خوشکەکانی دیکەی... هیچکەس.

غلامرەزا کە کەسێکی زۆر پارە پەرست بوو ئامادە نەبوو تەنانەت سەنتێکیش سەرف بکات بۆ تەلەفۆن بۆ ئەوەی هەواڵی برا تاجدارەکەی بپرسێت.

کاتێک تاج الملوك (شاژنی دایک) کۆچی دوایی کرد ئەم برا و خوشکانەی شا، ئامادە نەبوون تێچوونی کفن و دفنی دایکیشیان بدەن و شاژنی دایک بە پارەی بەخشینەکانی کچەکەم دفن کرا!

حەمید ڕەزاش لەگەڵ منداڵەکانی لە ئێران مابوویەوە و زوو زوو لەگەڵ ڕۆژنامەکانی ئینقلابی ئێران چاوپێکەوتنی دەکرد و قسەی بە شا دەوت!

حەمید ڕەزا ناوی خۆی گۆڕی بوو بە حەمید ئیسلامی و ڕیشیشی هێشتبوویەوە!

محمد ڕەزا زۆر بێتاقەت بوو لەم هەموو بێ سۆزیە و بەردەوام تفی لە خێزانەکەیان دەکرد.

شەوانە کە تەنها دەماینەوە دەیوت: (ئەمانە چەندین ساڵ وڵاتیان حەپەلوش کرد و بار و بنەی خۆیان بەست و بەدناوی و پیاوخراپیەکەیان بۆ من بەجێهێشت! ئێستاش تەنانەت ئامادە نین تەلەفۆنێکیشم بۆ بکەن و هەواڵم بپرسن!

شوێنی مانەوەی ئێمە لە پەنەما دورگەی (کونتادورا) بوو.

پاش دابەزینمان لە فرۆکە سواری هەلیکوپەتەرێك بوون و ڕۆیشتین بۆ کونتادورا.

دورگەی کونتادورا موڵکی کەسێك بوو بەناوی گابریل لوئیس کە لە ساڵی ١٩٦٠ ئەو دوورگەیەی کڕیبوو و کردبووی بە دورگەیەکی گەشتیاری و کات بەسەر بردن.

ڤێلای شوێنی مانەوەی شا ڤێلایەکی ڕازاوەی سور و سپی زۆر جوان بوو.

بەردەم ڤێلاکە بە نزمایییەکی ئارام بەرەو کەناری دەریاکە درێژ دەبوویەوە و لەبەردەمیشیدا لمی نەرمی کەناری دەریایی هەبوو. لەم ڤێلایەدا سێ ژووری جیاواز هەبوون کە تایبەت بوون بە پاسەوانە پەنەماییەکان و (شا)وە.

بەجێگیربوونمان لە ڤێلاکە و خواردنی نانی نیوەڕۆ، سەفیری ئەمریکا لە پەنەما بەناوی (ئامبلەر ماس) لەگەڵ (گابریل لوئیس) خاوەنی دوورگەکە هاتن بۆ بینینی شا و پێشوازیان لێ کردین.

بۆ بەیانیش (عمر توریخوس) هات بۆ بینینی شا. عمر توریخوس پیاوێکی زۆر بێ ئەدەب بوو و بەهیچ شێوەیەك ڕەچاوی ئادابی گفتوگۆی سیاسی نەدەکرد.

دیدارەکەی لەگەڵ شادا زۆر چاوپێکەوتنێکی دڵسارکەرەوانە بوو.

تورخوس هەر بەبینینی شا وتی: (چۆن تۆ لە تەختی سەڵتەنەتەوە بەرەو دورگەی کونتادوراس هاتی؟)

عمر تورخوس بەحسابی خۆی دەیویست لەگەڵ شادا گاڵتە بکات! بەڵام محمد ڕەزا هیچ حەزی لەم گاڵتەکردنانە نەبوو و بەڵکو زیاتر بێتاقەت دەبوو.

دواتر توریخوس وەکو بڵێی بۆ ئازاردانی شا هاتووە درێژەی پێدا و وتی: (من ئەگەر لەبری تۆ بومایە لە وڵاتەکەم دەمامەوە و لەگەڵ فەرماندە سەربازیە بەوەفاکانم دەکوژرام!)

تورخوس بەم قسانەی ویستی ئەوە بگەیەنێت بە محمد ڕەزا کە ئەو ئیشێکی خراپی کردوە لەو بارودۆخەدا، هێزەکانی خۆی بەجێهێشتوە و بەوشێوەیە هەڵهاتووە!

تورخوس شای بەو پەڕی بێ ئەدەبی بە (چوپن) ناو برد!

چوپن لەلای خەڵکی پەنەما بە واتای تڵف دێت! (پرتەقاڵێك کە ئاوەکەی تاوەکو دوا دڵۆپ دەگیرێت وخۆی دەمێنێتەوە پێی دەوترێت تڵف یان تڵفی چای!)

توریخوس بێ منەتانە لەگەڵ شا قسەی دەکرد پێی وت: (تۆ ڕێك وەکو تڵفی، دەسەڵاتە گەورەکان ئاوەکەی تۆیان گرت و پاش ئەوەی کە باش چڵپاندیان فڕێیاندای!)

کچەکەم باسی دەکرد ئەم پیاوە بچوکە نیوە دڕندەیە (عمر توریخوس) تەنانەت بە چاوێکی خراپیشەوە سەیری منی دەکرد و بەردەوام بەبیانوی بینینی شا دەهات بۆ کونتادورا و ئیزعاجی دەکردم!

فەرەح دەیوت: (پێی دەوتم هەرچیت بوێت بۆت دابین دەکەم! باشە بۆ ئەم پیاوە نەخۆشە بەجێناهێڵێت!)

جێگری تورخوس پیاوێکی تاوانبار بوو ناوی مانۆئیل ئانتۆنیو نوریەگا بوو کە دەمووچاوێکی زۆر گەورە و سەیری هەبوو.

وا بڵاوبوو کە ئەم نوریەگایە لەگەڵ مافیاکانی مادە بێهۆشکەرەکاندا پەیوەندی هەیە و هاوکاری مافیاکان دەکات بۆ پەڕینەوەی مادەی بێهۆشکەر بۆ ئەمریکای ناوەند.

پەنەما وەکو وڵاتێکی گەشتیاری سەرچاوەی خراپە و بەرەڵایی بوو. لەم وڵاتەدا بچوکترین شت کە ناوی ئەخلاق بێت نەبوو.

سەرهەنگ نوریەگا بە فەرمانی سەرۆك بووبوو بە بەرپرسی پاراستنی شا. لەهەمانکاتیشدا فەرماندەی چەکدارەکانی گاردی میلی پانەماش بوو، نوریەگا نزیکەی ۲۵۰ چەکداری لە دەوروبەری ڤێلاکەی شا و لەسەرتاسەری کەناری کنتادورا جێگیر کردبوو و خۆیشی سەپەرشتی ئەو کارەی دەکرد!

محمد ڕەزا زۆر پێی سەیر بوو لەو هەموو پاسەوانە، بەڵام نوریەگا دەیوت: (زانیاری لەبەردەستدایە کە ئەوە نیشان دەدەن کە تیرۆرستەکان لەسەرتاسەری جیهانەوە هاتوون بۆ کوشتنی شا بۆ پەنەما!)

ئێمە باوەڕمان کرد بەم قسانە چونکە ڕاوێژکاری متمانەپێکراوی شا واتە بەڕێز ئارمائۆ وتبووی بە شا کە نوریەگا لەگەڵ سی ئای ئەی پەیوەندێکی زۆر نزیکی هەیە!

شا وابیری دەکردەوە نوریەگا لەوانەیە لە هاوڕێکانی خۆی لە ڕێکخراوی زانیاری ناوەندی ئەمریکا سی ئای ئەی هەواڵی پێ بگات، بۆیە کاتێك وتی تیرۆرستەکان بۆ کوشتنی شا و هاوسەرەکەی هاتوون بۆ پەنەما باوەڕی کردبوو!

دواتر دەرکەوت ئەم بابەتە جۆرێك بوو لە هەڵخەڵەتاندن و پارە ڕاکێشانە لە شا!

نوریەگا خەڵکی بێ ئیشی گاردی میلی هێنا بوو بۆ ئەو شوێنە و داوای کردبوو لە شا موچەیان پێ بدات و مەسروفیان بکێشێت! بۆ هەر پاسەوانێکیش مانگانە ۳ هەزار دۆلار دەدرا!

لەکاتێکدا ئەم پاسەوانانە بەشێوەیەکی ئاسای مانگانە ۱۰۰ دۆلاریشیان وەرنە دەگرت وەکو موچە!

دیار بوو نوریەگا لەم هەڵخەڵەتاندن و قۆڵبڕینە بە تەنها نەبوو و لەگەڵ عمرتورخوس هاوبەش بوو.

شا لەلای ئارمائۆ نارەزایەتی دەربڕی. ئارمائۆ بە توڕەی وتی بە نوریەگا باشترە واز لە شا بهێنێت. بەڵام نوریەگا بەبێ بەزەی وتی هیچ ڕێگەیەکی دیکەی نیە جگە لە پێدانی ئەم پارەیە!

ئەو پارەیەی کە نوریەگا دەیویست نزیکەی یەك ملیۆن دۆلار بوو بۆ هەر مانگێك!

نوریەگا بۆ شیرین کردنی کارەکەی ژمارەیەك تۆپ و دۆشکەشی دامەزراندبوو لە دەوروبەری ڤێلاکەی شا و ڕۆژانەش چەندین بەلەمی سەربازی بە سەربازی تەیارەوە لەبەردەم کەناری دەریاکەدا دەهاتن و دەچوون!

ڕۆژانەش کاتێك فەرەحی کچم خەریکی ئیسکی سەر دەریا بوو نوریەگاش لەناو بەلەمێکی خێرادا دادەنیشت و پاسەوانی دەکرد!

لە جەژنی سەری ساڵ ئەوە خۆشەویستەکانم لە ئەمریکاوە هاتن بۆ کونتادورا بۆلای باوك و دایکیان.

ئیسرائیل لە پەنەما دەسەلاتێکی باشیان هەبوو چونکە باڵوێزخانە و بنکەیەکی سەربازیشیان هەبوو.

سەفیری ئیسرائیل بەردەوام دەهات بۆ دیداری کچەکەم و محمد ڕەزا. شا داوای کرد لە سەفیری ئیسرائیل تاوەکو هاوکارێکی شەخسی بکات و داوا لە موساد بکات کە پاسەوانێکی شەخسی بۆ دابنێت.

نزیکەی ١٢ مانگ ژەنراڵێکی ئیسرائیلی بەناوی (مایك هراری) کە بەڕەگەز بەریتانی بوو، بەردەوام لەگەڵ شادا بوو تاوەکو ئەو ڕۆژەی محمد ڕەزا کۆچی دوایی کرد یەك سات بەجێینەهێشت.

ڕۆژێکیان سەرهەنگ نوریەگا بە زۆر دەیویست کچەکەم ببات بۆ شوێنێکی دوورتر لە ڤێلاکەی بەبیانوی گەڕان و سەردان.

فەرەح ئەم خواستەی بە شێوەیەکی بەڕێزانە ڕەفز کردەوە و وتی: (هەرکاتێك پیاوکەم باش بوو لەگەڵ ئەودا دەچم بۆ سەردانی ئەو شوێنانە!)

بەلام نوریەگا دەڵێت: (پیاوەکەت وەکو خواردنێکی لێ هاتووە کە مابێتەوە. ئەو تاوانبارە و لە وڵاتەکەی خۆی دەرکراوە و ئێستا خەریکە لەدەروونی خۆیدا هەست بە ئازار دەکات. باشتر ئەوەیە لەبیری خۆتدا بیت.)

ژەنراڵە ئیسرائیلیەکەش (مایك هراری) کە لە دوورەوە ئاگاداری ئەو کێشمەکێشەی فەرەح و نوریەگا دەبێت دێتە پێشەوە و داوا لە نوریەگا دەکات واز لە فەرەح بهێنێت. تەنانەت لەسەر ئەو مەسەلەیە قسەوباسێکی کەمێك توند دەکەوێتە نێوانیان.

هەرچەندە نوریەگا ڕۆیشت و ئیدی دەردەسەری بۆ فەرەح دروست نەکرد، بەڵام هەواڵی ئەم باسە گەیشتە گوێی محمد ڕەزا و محمد ڕەزای زیاتر لە هەموو کاتێك توشی ئازار و بێتاقەتی کرد.

شا چاوڕێی ئەوە بوو توریخوس جێگرەکەی ناچار بکات داوای لێ بوردن بکات.

بەڵام توریخوس وتی: (من ناتوانم نوریەگا ناچار بکەم، چونکە داواکارێکی بەڕێزانەی لە ژنەکەی تۆ کردوە!)

نوریەگا لەگەڵ ڕۆژنامەکانی پەنەما و بڵاوکراوە جیهانیەکاندا چاوپێکەوتنی دەکرد و بۆچوونەکانی خۆی لەبارەی شاوە بە ڕاشکاوانە دەخستەڕوو!

نوریەگا لە چاوپێکەوتنێکدا وتبووی: ((شا خەمبار و بێتاقەتە! حاڵەتێکی خەیاڵپلاوی هەیە، ئێمە دەزانین ئەو پیاوکوژ بووە بەڵام نەخۆشیەکەی بەجۆرێکە مرۆڤ بەزەیی پێدا دێتەوە. شا ئێستا واهەست دەکات بونەوەرێکی جیهانی دیکەیە و وەکو منداڵی خۆر یان وەکو خودایەکی بت پەرستەکانە، نەك مرۆڤێکی ئاسای!))

محمد ڕەزا ئەم ڕۆژنامانەی دەخوێندەوە کە نوریەگا لێدوانی بۆ دەدان، زۆر خراپ تورە دەبوو، بەڵام نەیدەتوانی هیچشتێك بکات چونکە پاراستنی ژیانی محمد ڕەزا لەدەستی نوریەگا بوو!

ژەنراڵی ئیسرائیلی (مایك هراری)، ئەو زانیاریەی ڕاگەیاند بە (شا) کە بەتەواوی لەژێر چنگی دەزگای (ڕەش)دایە. هەروەها وتی عمر تورخوس و مانوی نوریەگاش هەردووکیان پیاوی (سی ئای ئەی)ین. ئینجا وتی ئەو دوو کارمەندە ئەمریکیەش واتە (ئارمائۆ) و هاوکارەکەی (ماس) کارمەندی (سی، ئای، ئەی)ین.

(ئامبلرە ماس) سەفیری ئەمریکا بوو لە پەنەما، ئەو ماوەیەی کە محمد ڕەزا لە پەنەمابوو زۆربەی کاتەکانی خۆی لەگەڵ ئارمائۆدا دەگوزەراند.

بۆیە پەنەما زیندانی سی ئای ئەی و محمد ڕەزا و کچەکەشم زیندانی ئەمریکا بوون.

ئەو زیندانیانەی کە ناچاربوون تێچوونێکی قورس بدەن بۆ مانەوەیان لەو زیندانەدا.

نوریەگا لە وەسڵی حسابەکاندا، سەرەڕای ئەوەی کە داوای موچەیەکی مانگانەی ۷٥۰ هەزار دۆلاری دەکرد بۆ سەربازەکانی چاودێری داوای سەد هەزار دۆلاریشی بۆ خواردن و خواردنەوە دەکرد.

هەرکاتێك رۆبێرت ئارمائۆ و هاوکارەکەی لە پێدانی پارەکەدا دەستیان قورس بگرتایە بە خێرای فرۆکەیەکی بچوك لەسەر ئاسمانی ڤێلای شا دە سوڕایەوە و دۆشکەکەشی دەستی دەکرد بە تەقەکردن. دواتر نوریەگا دەیوت بە شا ئەم فرۆکەیە فرۆکەی تیرۆرستەکان بوو و لە کۆستەریکاوە بۆ کوشتنی تۆ هاتبوون!

بەم شێوەیە هیچ ڕێگەیەك نەبوو بۆ هەڵهاتن لە پێدانی باج و خەراج بە نوریەگا.

من سەری ساڵ لەگەڵ ئەوە خۆشەویستەکانم ڕۆیشتم بۆ پەنەما و کونتدورا بۆ ئەوەی چاوم بکەوێت بە کچەکەم و زاوا خۆشەویستەکەم و دیدارەکەم تازە بکەمەوە.



امیر عباس هەویدا و جەعفەر شەریف ئیمامی      محمد ڕەزا و ئەشرەف

لەیەکێك لەسەردانەکانیدا بۆ دامەزراوەی ئەشرەف



محمد ڕەزا و فەرەح پەهلەوی و بەشێك لە ئەندامانی

حکومەتەکەی لەسەردانیان بۆ مەرقەدی ئیمام رەزا لە مەشهەد



عبدالله ڕیازی و ژەنراڵ قەرەباغی



دکتۆر مەنوچر ئیقبال



عباسعلی خلعتبری



سەرلشکر حسن پاکروان لە دادگای
شۆڕش بڕیاری لە سێدارەدانی درا



بەشێك لە بەرپرسە بالاكانی سەردەمی شا بەپێی بڕیاری دادگای شۆڕش لەسێدارەدران



غلامڕەزا نیك بی سەرۆكی شارەوانی تاران لە دادگا

# گێڕانەوەی شا بۆ ئێران

پەندێکی پێشینانی پەنەمای هەیە دەڵێت: (ئەو پیاوەی بۆ ئاڵتون ئیش دەکات متمانەی نیە!)

(عمر توریخوس) و (نوریە گا) تەنها بۆ پارە ئیشیان دەکرد. ئەم جۆرە مرۆڤانە بەرامبەر هەر کەسێك کە پارەی زۆرتری بدایە ڕاستەوخۆ تەسلیم دەبوون و ئیش و کاری خۆیان دەگۆڕی!

بارمتەگیراوەکانی سەفارەتی ئەمریکا لە تاران، دەستمایەیەکی باش بوون بۆ ئێران بۆ ئەوەی معامەلەیان پێوە بکات لەگەڵ ئەمریکادا.

صادقی قوطب زادە، وەزیری دەرەوەی دەوڵەتی کاتی ئیسلامی، کە ساڵانەی گەنجی خۆی لە ئەمریکا گوزەراندبوو و شارەزای ڕۆحیەتی ئەمریکیەکان بوو، ڕووبەڕوو لە تەلەفزیۆنە جیهانیەکانەوە دەردەکەوت و لە چاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ ڕۆژنامەنوسەکاندا بانگەشەی سەیر و سەمەرەی لەبارەی تاوانەکانی شاوە دەخستەڕوو و خوازیاری گێڕانەوەی محمد ڕەزا و دادگاییکردنی بوو لە دادگای شۆڕشی ئێران.

بۆچی ناوی ئەم کابرایەم لەبیرە؟ ئێستا باسی دەکەم.

پاش ئەوەی ئەم کابرایە بوو بە وەزیری دەرەوەی ئێران سەرچاوەکانی زانیاری شا لە تاران تەلەفۆنیان کرد و زانیاری سەیریان لەبارەی ئەم کابرایەوە خستەڕوو.

ئێمە، ئەو دەم چ لەگەڵ ئەورووپا و چ لەگەڵ ئەمریکا و چ لەگەڵ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ڕۆژانە پەیوەندیمان هەبوو.

باوەڕ بکەن لێرە چەند کارمەندێك لە پشت تەلەفۆنەکانەوە دادەنیشتن و لەگەڵ پایتەختەکانی جیهان بەردەوام زانیاریان وەردەگرت. خودی کچەکەم (فەرەح) زۆرترین پەیوندی تەلەفۆنی وەردەگرت!

فەرەح کە زۆر لاواز و بێ هێز بووبوو زۆربەی کاتەکانی لەپاڵ ڕادیۆ و سەتەلایەتێکی تایبەتیدا دەگوزەراند، سەتەلایتەکە ئارمائۆ لە واشنتۆنەوە هێنابووی.

کچەکەم ڕۆژانە خەریکی تەلەفۆنکردن بوو بۆ ئەمریکا. نزیکەی کاتژمێر ١٠ی شەو تەلەفۆنی دەکرد بۆ ولاتانی ڕۆژهەلات چونکە لەوێ تازە ڕۆژ دەبوویەوە، لە ئێوارانیشدا تەلەفۆنی دەکرد بۆ ئەوروپا. لە مەلیك حسین پاشا، جیهان سادات هاوسەری سەرۆك کۆماری میسر، مەلیك حسن پاشای مەراکیش، مەلیك خالید پاشای عەربستانەوە بیگرە تاوەکو دەگاتە سەرۆك وەزیرانی تورکیا و ئیسرائیل.

لە ڕۆژنامەنوسان و نوسەرەکانی نیشتەجێی تارانەوە بیگرە تاوەکو دەگاتە کارمەندی وەزارەتەکانی دەرەوە و ساواکی هەڵوەشاوە.

هەرچەندە حکومەتی سەڵتەنەتی هەڵوەشابوویەوە، بەلاّم هێشتا کەسانێك هەبوون لە ناوەوە و دەرەوەی ولاّت سەبارەت بەو ڕژێمە وەفادار بوون.

کچەکەم لەو پەیوەندیە تەلەفۆنیانەدا زانیاری زۆر گرنگی دەست دەکەوت.

بۆ نمونە زانیمان صادق قطب زادە کوڕی دارفرۆشێکی تاران بووە و لە ئەمریکا تەنها توانیویەتی دوو کۆرس بخوێنێت و لەگەڵ ئەوەی کە بە ناوی (دکتۆر!) قطب زادە ناودەبرا بەلاّم هەرگیز تەنانەت زانکۆشی تەواو نەکردبوو.

هەروەها زانیاری تەواو هەبوو کە قطب زادە نەك شۆڕشگێڕ، بەڵکو فێڵبازێکە لە ئەمریکا و فەرەنسا خۆی لە ئەنجومەن و فدراسیۆنە خوێندکاریە ئیسلامیەکان نزیك کردوەتەوە و لەهەمانکاتیشدا پەیوەندی لەگەڵ سی ئای ئەی و ساواك و ڕێکخراوی فەلەستینی الفتح و معمرالقزافی هەبووە و لەهەموو ئەم سەچاوانەش پارەی وەرگرتوە!

ئارمائۆش ئەم زانیاریانەی پشت ڕاست کردەوە و ئێمە زانیمان دەوڵەتی کاتی کە ڕاستەوخۆ پاش کەوتنی محمد ڕەزا، حکومەتی گرتە دەست چەندین ئێرانی کە

ڕەگەزنامەی ئەمریکیان هەیە لەناو ئەو دەسەلاتەدا بوونیان هەیە و چەندین سالیش لەگەلّ ئەمریکیەکاندا ئیشیان کردوە!

هەر ئەم حالەتە گوماناویانە بوو کە نەخۆشیە گوماناویەکەی شای زۆر کردبوو، شا دەیوت سەیرکەن بزانن ئەمریکا چۆن بە بەکارهێنانی بەکرێگیراوە ڕەسمیەکانی خۆی لە ئێراندا هەژموونی پەیدا کردوە و ئیستعمارێکی تازەی سەپاندوە بەسەر ولاتەکەماندا!

باسی ئەوە دەکرا کۆمەلێك لەو کەسانە بەخێرای لە پۆستەکانیان دوورخرانەوە، چونکە ئەو خوێندکارانەی کە هێرشیان کردە سەر سەفارەتی ئەمریکا کۆمەلێك بەلگەیان دەستکەوت کە ئەوەی نیشان دەدا کەسانێك لە دەولەتی تازەی ئێراندا ئەندامی سی ئای ئەی و دەزگاکانی دیکەی ئەمریکان.

صادق قطب زادەش، دواتر بە تۆمەتی کودەتا لەدژی حکومەتی ئیسلامی لەسێدارە درا.

کۆمەلێك لە ڕۆژنامەنوسەکانی نیشتەجێی ئێرانیش زانیاری زۆر بەنرخیان گەیاندە کچەکەم.

نوری زادە، یەکێك بوو لەو ڕۆژنامەنوسانەی کە ئێستا لە لەندەن دەژی و سەرکەوتنی گرنگی لەم بوارەدا بەدەستهێناوە پێشنیاری کرد بۆ کچەکەم هەولبدات تێچوونی دامەزراندنی چەند ڕۆژنامە و گۆڤارێك لە ئێراندا بگرێتە ئەستۆ، چونکو زۆرێك لە ڕۆژنامەنوسەکانی گروپی رستاخیز و ڕۆژنامەی ئیتلاعات و کیهان پاکسازی کراون و ئێستا بێ ئیشن.

ئەم کەسانە پەیوەندیان بە محمد ڕەزاشا و دەسەلاتی پەهلەویەوە هەیە بەلام پارەیان نیە بۆ ئەوەی ڕۆژنامە و گۆڤار دەربکەن.

کچەکەم ئەم پێشنیارەی قبولّ کرد. ئێمە لە ئێراندا هێشتا هاوڕێیانی دەسەلاتدار و دەولەمەندمان هەبوو. فەرەح، نوری زادەی بە ناونیشانێك لە تاران نارد بۆ شوێنێك و زووبەزووی بینیمان کۆمەلێك ڕۆژنامە و گۆڤار بلاوبوونەوە کە بە ئاشکرا دژی کۆماری ئیسلامی و حکومەتی ڕۆحانی کاریان دەکرد و پشتیوانی بەختیاریان دەکرد کە لە سەفارەتی فەرەنسا لە تاران خۆی حەشار دابوو.

بەداخـەوە دواتـر هـەواڵمان پێگەیـشت کـە یـەکێك لـەو ڕۆژنامەنوسـانە بـە تـاوانی بەشداری کردن لە دژایەتیکردنی حکومەتی جمهوری ئیسلامی لە سێدارە دراوە!

نـوری زادەش پـاش ئـەوەی کـە تاوانبـار کـرا بـە بڵاوکردنـەوەی فکـری ئایـت الله شریعتمداری لە تاران هەڵهات و ڕۆیشت بۆ لەندن.

هەڵبەت ئێمـە دواتـر لـە دەرکردنـی ڕۆژنامـەی کـەیهان لە لەنـدن سـەرمایەگوزاریمان کـرد و زۆرێـك لـە بڵاوکراوەکـانی دەرەوە لـە سـەرەتاوە بـە هاوکـاری کـچەکەم و خـاتو ئەشرەف بەڕێوە دەبران.

ئێـستاش پـاش ئـەوەی کـە بیـست سـاڵ تێدەپـەڕێت بەسـەر کـەوتنی حکومـەتی سـەڵتەنەتیدا هەنـدێك لـەو ڕۆژنامەنوسـانە کـە لـە ئێرانـدان توانیویانـە کـاری خۆیـان بپارێزن و کاتێك دێـن بـۆ دەرەوەی وڵات وەکـو وەفادارێـك دێـن بـۆ دیـداری کـچەکەم و دەستی ماچ دەکەن.

ئێستا کە لە یادەوەریەکانی ڕابردووم ناوی ئایت الله سید کازم شریعیتمداریم برد دەمـەوێت یارمـەتیم بـدەن بـەوەی کـە ئاماژە بکـەم بـەوەی کـە ئـەم پیـاوە ڕۆحـانێکی ڕۆشـنبیری دژی ئایـت الله خـومینی و تونـدڕەوە مەزهەبییـەکان بـوو. ئـەو حزبێکـی گـەورەی لـە تـەبرێز دامەزرانـد و ئامانجیـشی ئـەوەبوو کـە پـاش کـەوتنی تـەبرێز حکومـەتێك لـەناو دڵـی جمهـوری ئیـسلامیدا دروسـتبکات و لـەوێوە دەسـتبکات بـە دژایەتیێکی تەواوی ئایت لله خومینی و هەرەس بە دەسەڵاتەکەی بهێنێت.

دەوروبەرەکەی شریعتمداری و ڕاوێژکارە نزیکەکەی واتە کوڕە گەورەکەی مهندس شریعتمداری بەڵێنی پێدابن کە پاش سەرکەوتن، حکومـەتی سـەڵتەنەتی بگەڕێننـەوە بۆ وڵات و پشتیوانی پاشایەتی ڕەزا گیان بکەن.

ئەم نوری زادەیەش کە پەیوەنـدی بـە فەرەحـەوە هـەبوو و یارمـەتی دارایـی بـۆ حـزب وەردەگـرت پـشتیوانی ئـەوەی دەکـرد کـە ئـەو حزبـە تازەیـە خوازیـاری گەڕانـەوەی سـەڵتەنەتە. بەداخـەوە ئەنـدامان و لایـەنگرانی ئـەم حزبـە زۆر بـە توندوتیـژی سەرکوتکران و دووبارە ڕەنجمانم بەبا چوو.

عەرزم کردن لەبەر ئەوە ناوی صادق قطب زادە لە یادەوەریمدا ماوە چونکە ئارمانۆ ئەوەی پشتڕاست کردەوە کە وەزیـری دەرەوەی ئێـران لەگەڵ ئـەمریکادا پەیوەنـدێکی

دێـرین و دۆسـتانەی هەیـە. ئێمـە تێگەیـشتین لـەم ئاماژەیـەی ئارمـائۆ کـە قطـب زادە بەکرێگیراوی (سی، ئای، ئەی)یە.

لەوانەیە وابزانیت لەم بابەتە خۆشحاڵ بووین. نەخێر! چونکە محمد ڕەزا وتی هیچ دوور نیە ئەمریکیەکان بۆ پشتیوانی بەکرێگیراوەکەی خۆیان من تەسلیم بە ئێران نەکەن!

پێدانی هەموو ئەو تێچوون و خەرجیە قورسە لە پەنەما لەڕێگەی ڕۆبێرت ئارمائۆ و هاوکارەکەی ئەمبلێر ماس (سەفیری ئەمریکا لە پەنەما) و مارک میرس بوو.

پەنەماییەکان هەموو ڕۆژێك زیاتر لە ڕۆژی پێشووتر بۆ شا و خێزانەکەی وەسڵیان دروست دەکرد و حسابیان زۆر دەکرد لەسەرمان.

ئەوان هەروەکو مانگایەکی شیردەر سەیری محمد ڕەزایان دەکرد کە دەبێت هەموو ڕۆژێك زیاتر بیدۆشن.

ڕۆژێکیان لەسەر پێدانی پارەی وەسڵەکان لەنێوان ئارمائۆ، ماس و میرس لەلایەك و مانۆئیل نوریەگا لەلایەکی دیکە کێشە دروستبوو و نوریەگا هەرسێکیانی دەستبەسەر کرد!

بەڵام پاش چەند خولەکێك  کە توڕەبوونەکەی نەما سەفیری ئەمریکای ئازاد کرد و دوو نەفەرەکەی دیکەشی هێشتەوە!

کاتێـك محمـد ڕەزا ئاگـاداری ئـەم مەسـەلەیە بـوو بـە بێتاقەتیـەوە وتـی: (کاتێـك کـە ئەمانـە سـەفیری ئـەمریکا و هاوڵاتیـانی ئـەمریکا دەستبەسـەر دەکـەن دەبێـت حـسابی ئێمە چۆن بێت!)

نوریەگا هەرکاتێك بهاتایە بۆ بینینی فەرەح یان شا بەخراپە باسی ئارمائۆی دەکرد و دەیـوت: (ئـەم کـوڕە منداڵـە و مـاس سـەفیری ئـەمریکا دزن و پارەکـانی بـەڕێز شـا دەدزن!)

هەڵبەتە تاوەکو ڕادەیەك قسەکانی ڕاست بوو. بەڵام خودی خۆی دەیان ئەوەنـدەی ئارمائۆ و ماس دزی دەکرد.

بارمتـەکان، هێـشتا لـە سـەفارەتی ئـەمریکا لـە تـاران دەستبەسـەر بـوون و جـەنگی دەسەڵات لە ئێرانـدا بووبووبیـە هـۆی دەستلەکارکێشانەوەی دەوڵـەتی کـاتی. کەسـانی

وەکو ئەبوالحسن بنی صدر، صادیق قطب زادە و فەرماندەی دەریایی بەڕێز مەدەنی خۆیان کاندید کردبوو بۆ سەرۆك کۆماری و هەریەکەیان هەوڵیان دەدا سەرکەوتنی خۆیان لە هەڵبژاردنەکاندا بەدەستبهێنن.

ئەمانە هەرسێکیان لایەنگری ڕۆژئاوا بوون. ئێمەش بەردەوام چاودێری هەواڵی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری ئێرانمان دەکرد. فەرماندەی دەریایی ئەحمەد مەدنی لە ئەفسەرانی هێزی دەریایی بوو و محمد ڕەزا دەیناسی.

محمد ڕەزا ئێمەی دڵنیا کردەوە کە ئەگەر فەرماندەی دەریایی مەدەنی بگاتە سەرۆکایەتی ئەوا هەموو ئامادەکارێك دەکات بۆ ئەوەی دەسەڵاتی سەڵتەنەتی بگەڕێتەوە.

لەبارەی ئەبوالحسن صدریش زانیارەکانی ئارمائۆ ئەوەیان دەخستەڕوو کەسێکە سەر بە دەزگاکانی بەریتانیا و فەرەنسایە و پەیوەندێکی زۆر باشی لەگەڵ ئەوروپییەکاندا هەیە.

بەڵام صادق قطب زادە بە بەکرێگیراوێکی ئەمریکی دادەنرا.

ئەگەر صادق قطب زادە لە پۆستی وەزیری دەرەوەدا بیتوانایە شای بگەڕاندایەتەوە بۆ ئێران و دادگایی بکردایە ئەوا دەیتوانی بۆ هەڵبژاردنەکە پێگەیەکی بەهێز بۆ خۆی دروستبکات و خەڵکیش لەخۆشیدا دەنگیان بۆ دەدا.

بۆیە قطب زادە دەستیکرد بە ڕێکەوتنی نهێنی لەلایەکەوە لەگەڵ ئەمریکا و لەلایەکی دیکەوە لەگەڵ توریخوس و نوریەگا کە ئامانجیشی گەڕانەوەی شا بوو بۆ ئێران.

بەو شێوەیەی کە ئێمە ئاگاداربووین، ئەمریکا بەرامبەر بە ڕەزامەندیان بۆ ئەم خواستە داوایان کردبوو لە قطب زادە کە پاش ئەنجامدانی ئەم کارە هەوڵبدات ئەمریکا نەهێنێتە ناو ئەم کارەوە و وایپیشانی بدات کە ئەمە معامەلەیەکی نێوان پەنەما و ئێران بووە و ئەمریکا دژی ئەم کارە بووە!

بەم شێوەیەش هەم بارمتەکراوەکان ئازاد دەبن و هەمیش ئەو ئاژاوە کۆتایی دێت و هەمیش ئەمریکا تاوانبار ناکرێت بەوەی کە شا تەسلیم بە ئێران ناکاتەوە و تاوانبارێکی گلداوەتەوە.

قطب زاده بەڵێنی پێدانی پارەیەکی زۆر خەیاڵی دا بە تورخوس و نوریە گا. پەنەما بەهەشتی معامەلەی مادەی سڕکەر بوو لە کیشوەری ئەمریکا و توریخوس و نوریەگا کەسانێك بوون لەو ترانزێتی مەوادی مخەدەر و معامەلەیەی کە لە پەنەما ئەنجام دەدرا، پارەیەکی زۆریان وەردەگرت. کاری ئاڵوگۆری مادەی بێ هۆشکەر و چەك بۆ پارتیزان و گروپە دژە نیکاراگواییەکانیش لەلایەن ئەم کەسانەوە لە پەنەما ئەنجام دەدرا. (هەڵبەتە بە زانیاری سی ئای ئەی و دەوڵەتی ئەمریکا). بۆیە ئەم تاوانبارانە کاتێك ڕووبەڕووی پێشنیارێکی لەو شێوەیە بوونەوە بێ گومان یەك سات بیری لێ ناکەنەوە.

هەڵبەتە هاوڕێ و دۆستەکەی محمد ڕەزا واتە راکفلەریش کەسێکی بچوك و بێ دەسەلأت نەبوو. خاوەنی ئیمپراتۆریەتێکی گەورەی دارایی بوو، زۆر بە زووی ئاگاداری ئەم پلانە بوو و شای ئاگاداری ئەم مەسەلەیە کردەوە کە لە سەروبەندی ڕووداندا بوو. عارەق لەسەر و چاوی محمد ڕەزا دەتکا.

ئێران لە پەنەما سەفارەتی نەبوو، بۆیە صادق قطب زادە، دوو هاوڕێی کۆنی خۆی بە جامتای پڕ لە پارەوە نارد بۆ پەنەما سیتی. ئەم کەسانە بریتی بوون لە: (کریستیان بورگە) و (هیکتۆر ڤیلالۆن).

(کرستیان بورگە) کە وەکیلێکی چەپگەرای فەرەنسی و (هیکتۆر ڤیلالۆن) ئەرژەنتینێکی سەرسەخت بوو لە سەردەمی ئاوارەییان لە فەرەنسا لەگەڵ (صادق قطب زادە) ناسراویان پەیدا کردبوو و هەرسێکیان ماوەیەك لە ئوردوگاکانی الفتح لە لوبنان و سوریا و لیبیا ژیانیان بەسەر بردبوو.

ئەم دوو کەسە لە ڕۆژی سەری ساڵ لە پەنەماسینی لەگەڵ (عمر توریخوس)، (مانوئیل نوریەگا) و (مارسل سالامین) دیداریان کرد. دانیشتنەکە چوار کاتژمێر درێژەی کێشا و سەرئەنجام ڕەزامەندیان پیشاندا بەوەی کە شا تەسلیمی ئێران بکەنەوە.

ئەوان (رویو) سەرۆك کۆماری پەنەماشیان ئاگادار کردەوە لەم مەسەلەیە.

بەم شێوەیە بەرپرسە باڵاکانی پەنەما پارەیەکی زۆریان دەست دەکەوت و لەدیدی جیهانیشەوە هیچ کێشەیەکیان نەبوو، چونکە بانگەشەیەکی زۆر لە دژی شا دەستپێکردبوو و هیچکەس ئامادە نەبوو پشتوانی لە محمد ڕەزا بکات.

قطب زادە هۆشداری دابوویە پەنەما کە ئەگەر ئەم پێشنیارە قبوڵ نەکەن ئەوا ئاسایشی هەزاران کەشتی کە لە ئاوە جیهانیەکاندا ئاڵای پەنەماییان لەسەرە دەکەونە مەترسیەوە!

لەکاتێکیشدا کە هەموویان محمد ڕەزایان بە نەزان و تڵف سەیر دەکرد. محمد ڕەزاش بۆ خۆی زیرەك بوو و لەو بێنە و بەرەیەدا لەگەڵ پەنەمادا سەرکەوتوبوو کە پیاوێکی بەناوبانگی پەنەمای کە ئاگاداری هەموو ئەو مەسەلەیە بوو لەلای خۆی دابمەزرێنێت.

ئەم کابرایە ناوی (خوزە دوخسوس) بوو کە پارێزەری عمر توریخوس بوو کە هەمووکەس بە (چوچو) بانگیان دەکرد.

(چوچو) شەو و ڕۆژ لەگەڵ توریخوس ژیانی بەسەر دەبرد و هەربۆیە ئاگاداری هەموو مەسەلەکان بوو.

(چوچو) هەموو ڕێکەوتنەکەی مو بە مو دەگەڕاندەوە بۆ محمد ڕەزا. ئەم هەواڵانە لەگەڵ ئەو زانیاریانەی کە راکفلەر دابووی وەکو یەك بوون و مەسەلەکە هیچ جێگەی گومان و دوو دڵی نەبوو کە پلانێك هەیە بۆ ئەوەی محمد ڕەزا و کچەکەم تەسلیمی ئێران بکەنەوە بۆ دادگایی کردن و لەو ڕێگەیەشەوە هۆکارەکانی ئازادکردنی ٦٦ بارمتەکراوە ئەمریکیەکە فەراهەم بکەن.

ڕێکەوتنەکە لەسەر ئەوە بوو کە ئێران لەپەنەما داوای تەسلیمکردنەوەی شا دەکات و پەنەماش لەبەرامبەردا داوا دەکات تاوەکو بارمتەکراوەکان ئازاد بکات.

هەرچەندە پارە لە بڕیارەکانی تورخوس و نوریە گا ڕۆڵێکی سەرەکی هەبوو، بەڵام ئەوان هیواداریش بوون لەم هەلە ئاڵتونیە سودێکی سیاسی باشیشیان دەستکەوێت. چونکە سەرۆك کارتەر کێبەرکێکەرێکی جدی هەبوو لە هەڵبژاردنەکەدا بۆ سەرۆکایەتی ئەویش (ڕۆناڵد ریگن) بوو.

لەکاتێکدا کە سەرۆك کۆمار جیمی کارتەر لە تەسلیمکردنەوەی کەناڵی پەنەما بۆ ئەم وڵاتە پشتیوانی دەکرد و رۆناڵد ریگن لە بانگەشەی هەڵبژاردنەکەی خۆیدا سەرۆك کۆماری (عمر تورخوس)ی بە (شەقاوە و بەرەڵا) و (دیکتاتۆر) دەزانی و دەربڕینی سەخیفی بۆ بەکاردەهێنا. تورخوس دەیزانی ئەگەر بارمتەکراوەکان ئازاد نەکرێن ئەوا کارتەر لە هەڵبژاردندا دەرناچێت و ئەمەش بە واتای ئەوەیە کە دەبێت عمر توریخوس بڕوات!

لەم کاتەشدا نوێنەری تایبەتی کورت والدهایم (سەرۆکی نەتەوە یەکگرتوەکان) بۆ رێکەوتن و میانجیگیری ئازادی بارمتەکراوەکان لە ئێران بوو. پاش ئەوەی کە ئەم رێکەوتنە هیچ دەرئەنجامێکی نەبوو هات بۆ پەنەما بۆ ئەوەی شا تەسلیم بکاتەوە بەرامبەر بە ئازادی بارمتەکراوە ئەمریکیەکان.

دەوڵەتی پەنەما دوو نوێنەری بە نهێنی نارد بۆ تاران تاوەکو لەبارەی شێوەی تەسلیمکردنەوەی شا لەگەڵ ئێراندا رێك بکەون. ئەم دوو کەسە واتە (مارسل سالامین) و (رومولو ئسکوبار) لە تاران لەگەڵ صادق قطب زادە رێکەوتنێکیان ئەنجامدا و باسیان لە رێوشوێنی تەسلیمکردنەوە و گەڕانەوەی شا کرد بۆ ئێران.

چوچو ئێمەی ئاگادار کردەوە لەو مەسەلەیە. محمد ڕەزاش بە تەلەفۆن لەگەڵ راکفلەر قسەی کرد و نیگەرانی خۆی پیشاندا لەبارەی ئەو پلانەوە کە لە ئارادایە بۆ گەڕانەوەی شا بۆ ئێران.

راکفلەر وتی: (ئەو و کیسنجەر و رۆناڵد ریگن بە هەموو هێزێکیانەوە لەبەرامبەر ئەم پلانە دەوەستن و نابێت تۆش نیگەران بێت.)

دیموکراتەکان خوازیاری ئەنجامدانی معامەلەی نێوان پەنەما و ئێران بوون، چونکە ئازادکردنی بارمتەکراوەکان لەوانەیە ببوایە هۆی ئەوەی کە کارتەر لە هەڵبژاردنەکاندا سەرکەوێت. بەڵام لەلایەکی دیکەوە کۆماریخوازەکانیش خوازیاری ئەوەی بوون کە ئەم بارودۆخە بەو شێوەیە بمێنێتەوە تاوەکو کۆتای هەڵبژاردنەکە، چونکە مانەوەی بارمتەکراوەکان دەبووە هۆی ئەوەی کە لایەنگرانی رۆناڵد ریگن، زۆر بێت.

ئەم کێشمەکێشەی نێوان هەر دوو بەرەی کۆترەکان و بازەکان لە ئەمریکا لەوانەبوو ببوایە هۆی ڕزگاربوونی محمد ڕەزا.

ئەم هەواڵ و زانیاریە بێتاقەتیکەرانە بوونە هۆی ئەوەی دووبارە بارودۆخی ڕۆحی و مەزاجی شا تێکبچێتەوە و دووبارە تەندروستی شا بکەوێتەوە مەترسی.

(هامیلتۆن جۆردن) سەرۆکی کارمەندەکانی کۆشکی سپی و ئەندامی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەی ئەمریکا، کە لە ڕێگەی سەرچاوەی سی ئای ئەیەوە ئاگاداری هەموو پرسەکانی پەیوەست بە شا بوو بوو، بەبێ ئەوەی کە ببێتە جێگەی سەرنج ڕێگەی گرت لەو کەسانەی کە لە تاران گەڕانەوە و لێی پرسین ئایا ڕێگەیەك هەیە بۆ ئازادی بارمتەکراوەکان؟

(مارسل سالامین) بە لێبڕاوی وتی: (بەڵێ تەنها تەسلیمکردنەوەی شا!)

چوچو کە ئاگاداری هەموو وردەکاریەکان بوو وتی بە شا کە ئیدی مانەوەی لە پەنەمادا باش نیە و دەبێت پێش ئەوەی دەستبەسەر بکرێت لە پەنەما هەڵبێت!

بەڵام بۆ کوێ؟

فەرەح بەبێ دواکەوتن پەیوەندی کرد بە جیهان سادات و هەموو ئەو پلانەی بۆ جیهان ساداتی هاوسەری ئەنوەر سادات ڕوون کردەوە.

چەند خولەکێك دواتر خودی سادات تەلەفۆنی کرد و داوای کرد کە لەگەڵ شادا گفتوگۆ بکات. وتی بە محمد ڕەزا فڕۆکە تایبەتیەکەی خۆی بەبێ دواکەوتن دەنێرێت بۆ شا بۆ پەنەماسیتی بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ میسر.

پیاوەکانی نوریەگا هەرچی قسە و باسی تەلەفۆنی محمد ڕەزا و فەرەح هەیە هەموویان تۆمارکردبوو و ئاگاداری عمر توریخوسیان کردبوویەوە کە شا دەیەوێت لە پەنەما هەڵبێت.

لەم کاتەشدا لە تاران هەواڵ گەیشت کە وەزیری دەرەوەی ئێران (صادق قطب زادە) زانیاریێکی بڵاوکردوەتەوە لەبارەی ئەوەی کە شا لە پەنەماوە دەگەڕێنرێتەوە بۆ ئێران.

پێش ئەوەی کە فڕۆکەکەی سادات لە میسرەوە بگاتە پەنەماسیتی ئێمە هەموو کەلوپەلەکانی خۆمان کۆکردەوە و بڕیارماندا بە فڕۆکەیەك بڕۆین بۆ فڕۆکەخانەی پەنەما سیتی.

لەم کاتەدا پیاوەکانی نوریەگا هاتن و پێیان ڕاگەیاندین کە بە فەرمانی سەرهەنگ نوریە گا دەبێت شا ئەمشەو لە پەنەما سیتی بمێنێتەوە و بەیانی ئەم وڵاتە بەجێبهێڵێت!

ئارمائۆ بە بیستنی ئەم هەواڵە دڵنیابوو کە تەسلیمکردنەوەی شا بۆ ئێران بەتەواوی ئامادەکراوە. بۆیە بەخێرای پەیوەندی کرد بە راکفلەرەوە و وتی ئەگەر کارێك نەکەیت شا تەسلیم دەکرێت.

لەم کاتەشدا ڕەزاگیان و ئەوە خۆشەویستەکانم خاکی پەنەمایان بەجێهێشت و گەڕانەوە بۆ نیویۆرك.

پاش گەڕانەوەی منداڵەکان من هەندێك ئارام بوومەوە.

لەم کاتەدا خودی نوریەگا هات و پرسیاری ئەوەی لێ کرد کە بۆچی بەو خێراییە دەیەوێت پەنەما بەجێبهێڵێت.

محمد ڕەزا وتی پێویستیم بەوە هەیە لە نەخۆشخانە بمخەوێنن و چارەسەری پزیشکیم بۆ بکرێت.

نوریەگا وتی لە پەنەما نەخۆشخانەی ئەمریکی گورگاس هەیە کە شا دەتوانێت لەو نەخۆشخانەیە چارەسەر بکرێت.

ئەم نەخۆشخانەیە بەناوی دکتۆرێکی ئەمریکی (ویلیام گورگاس) ناونرابوو و لە ناوچەیەکی بەرزی پەنەماسیتی بوو بەناوی ئانکۆن هیل.

شا وتی: (پێم خۆشە پەنەما بەجێبهێڵم.)

نوریەگا بە تووڕەییەوە وتی بۆ بەجێهێشتنی پەنەما پێویستی بە ئەنجامدانی تەشریفات هەیە.

محمد ڕەزا لە ماوەی چەند هەفتەیەکی پێشوتریش توشی هەناسە توندی بووبوو و لەکاتێکدا کە دەنگی سنگی قرخە قرخی دەکرد بە نوریەگای وت ڕێکخستنی هەموو تەشریفاتەکە پەیوەندی بە ئارمائۆوە هەیە.

مەبەستی محمد ڕەزا ئەوە بوو کە ئەگەر نوریەگا باجی دەوێت باشترە بڕوات بۆ لای ئارمائۆ و واز لەو بهێنێت.

لەم کاتەدا کەسێك بەناوی (کارلۆس گارسیا) کە دەوترا پزیشکی گشتی و دکتۆری تایبەتی عمر توریخوسە هاتە ژوورەوە و خوازیاری ئەوە بوو کە چارەسەری محمد ڕەزا بکات.

دکتۆر پاش سەیرکردنێکی کورت وتی سەفەرکردن بۆ بەڕێز شا لەم کاتەدا ترسناکە و دەبێت بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە نەخۆشخانە بخەوێنرێت.

بەڵام شا ئەمەی قبوڵ نەکرد.

گاریا کاتێك زانی شا ڕازی نابێت و ئینکاری دەکات پێداگیری لەسەر ئەوە کردەوە تاوەکو دەرزێکی بۆ بکات، دەرزێکی هێنابوو لەگەڵ خۆیدا.

لێرەدا ئارمائۆ و ماس گەیشتنە فریای شا و بە توڕەییەوە داوایان کرد لە دکتۆر گارسیا تاوەکو شوێنەکە بەجێبهێڵێت.

دواتر زانیمان کە گارسیا ویستویەتی ئیشەکەی شا تەواو بکات و ویستویەتی بە دەرزی بیکوژێت.

پەنەماییەکان کە بەڵێنیاندا بوو شا تەسلیمی ئێران بکەنەوە، کاتێك زانیان شا خەریکە هەڵبێت لە پەنەما و بەشێك لە دەسەڵاتدارانی ئەمریکاش پشتیوانی شا دەکەن بەوەی کە بەهیچ شێوەیەك نابێت تەسلیم بکرێت، هەوڵیاندا جەنازەکەی تەسلیم بکەنەوە.

هەموومان چاوەڕوانی فڕۆکەکەی سادات و سەفەرکردن بوین بۆ میسر، لەوکاتەدا بارودۆخی شا بەتەواوی تێکچوو و شا توشی تەنگەنەفەسی بوو و کەوتە سەر زەوی.

بۆیە بەپەلە شا گەیەنرایە نەخۆشخانە و خەوێنرا. ئارمائۆ پەیوەندی کرد بە راکفلەر و بەخێرای دکتۆر دوبیکی نەشتەرگەری بەناوبانگی ئەمریکی و گروپێك لە پزیشکەکان هاتن بۆ پەنەما.

شا پێویستی بە نەشتەرگەی هەبوو بەڵام دکتۆر دوبیکی و دکتۆر کین باوەڕیان وابوو لە پەنەما چاودێری پێویست و گرنگ نیە بۆ شا و دڵنیا بوون لەوەی کە پەنەماییەکان هاوکاریان ناکەن و لەوانەیە شا توشی بەرکەوتنێکی خراپ ببێت.

بۆیە ئەمە وای کرد کە دەرچوونی شا لە پەنەما بۆ دوو هەفتە دوا بکەوێت و پزیشکە ئەمریکیەکان کۆمەڵێك چاودێریان ئەنجامدا تاوەکو بتوانن شا وا لێ بکەن تەحەمولی ئەو سەفەرە بکات کە لە پەنەماوە دەڕوات بۆ میسر.

بارودۆخی جەستەیی و شێوە و ڕوخساری شا بەجۆرێك تێکچووبوو کە بۆ هەمووکەس ڕوون بوو کە شا تاوەکو کۆتایی مانگ نامێنێت.

دواتر ئارمائۆ باسی دەکرد بۆمان کە کارتەر خۆشحاڵ بووە بەوەی کە بارودۆخی جەستەی شا تێکچووە و هیوادار بووە شا بە نەخۆشی سروشتی خۆی بمرێت و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئێران وازبهێنێت لەوەی کە بارمتەکان بگۆڕێتەوە بە شا و لە ئەنجامیشدا ٦٦ بارمتەگیراوکە ئازاد دەکرێن.

پەنەماییەکانیش کاتێك شایان بەو حاڵەتە بینی هەوڵیاندا هەتاوەکو پێیان دەکرێت هەرچی پارە لەدەستی شادا هایە و هێناویەتی لەگەڵ خۆیدا لێی بسێنن. پەنەماییەکان پاش خەواندنی زۆریان هێنا بۆ شا تاوەکو ملیۆنێك دۆلار ببەخشێت بۆ چاکردنی بارودۆخی تەندروستی و دامەزراندنی ناوەندێکی پزیشکی لە پەنەما!

محمد ڕەزاش ڕەزامەندی لەسەر دوو سەد هەزار دۆلار دەربڕی.

لەماوەی ئەو دوو هەفتەیەی کە محمد ڕەزا لە نەخۆشخانە خەوێنرا بوو سێ سەد هەزار دۆلاری دیکە خرایە سەر حسابە پزیشکیەکانی و لەکاتێکدا کە هەموو نەخۆشخانەکە بە هەمووشتێکیەوە بای ئەو نرخە نەبوو!

نورەیەگاش سەدان سەرباز و بەرپرسی ئاسایشی نەتەوەی هێنابوویە بەردەم نەخۆشخانەکە و جێگیری کردبوون و دوای خەرج و تێچوونی ئەوانەشی لە شا دەکرد!

بوونی شا لە پەنەما بۆ ئەوانە هەلێکی ئاڵتونین بوو. ئەوان شایان دەدۆشی. لەو ئێرانیانەشی کە شەیدای ئەوە بوون شا بگەڕێننەوە پارەیان وەردەگرت، پارشیان بە ئەمریکیەکان دەکرد و بەکورتی هیچ هەلێکیان لەدەست نەدەدا.

دەبوو شا هەرچی زووتر نەشتەرگەری بۆ بکرایە، بەڵام لە پەنەما تەنانەت دەزگای پێویستیش بۆ جیاکردنەوەی شیکاری خوێنیش نەبوو.

پزیشکە ئەمریکیەکان حەزیان دەکرد ببەنەوە بۆ ئەمریکا چونکە نەخۆشخانەکانیان بۆ نەخۆشیەکانی شا ئامادە و تەیار بوون. بەڵام کارتەر بەهیچ شێوەیەك ڕێگەی بە کارێکی لەم شێوەیە نەدەدا و دەیوت بە جەهەنم شا دەمرێت هیچ بەلامەوە گرنگ نیە ئەوەی کە بۆ من گرنگە گیانی بارمتەکراوەکانە و ئەم بۆچوونەش بە ئاشکرا لە ڕاگەیاندنەکاندا بلاْودەبوویەوە. سادات لەگەڵ ئەوەی کە بەڵێنیدا بوو فڕۆکەتایبەتیەکەی خۆی بنێرێت، کەچی ئەو کارەی نەکرد.

ئێمەش ناچاربووین فڕۆکەیەکی سەر بە کۆمپانیای ئۆرگرین بە کرێ بگرین.

پاش سێ مانگ مانەوە لە پەنەما کە زیاتر لە ٥ ملیۆن دۆلار تێچوونی شا بوو سواری فڕۆکەیەکی ئۆرگرین بووین کە فڕۆکەیەکی باری بوو بە قورسی جێگەی بیست کەس لە هاوڕێکان بوویەوە، شا تایەکی زۆر توندی هەبوو و سەرەڕای ئەوەی کە چەند بەتانێکیان پێوە پێچابوو بەلاْم هەر دەلەرزی.

فڕۆکەکە لە ڕێگەدا بۆ وەرگرتنی سوتەمەنی لە دورگەی (ئازور) کە دورگەیەکی موڵکی پورتوگالیەکان بوو نیشتەوە.

هۆکاری ئەم وەستانە ناچاریەش ئەوەبوو کە تاران ئاگاداری ئەوەبووبوو کە شا بەرەو میسر کەوتوەتە ڕێ و سەرچاوە ئەمریکیەکانیش هەواڵیاندا بوو لە تاران خۆپیشاندان و جوڵەی گوماناوی لەدژی میسر و ئەمریکا دەستیپێکردوە و لەوانەیە بۆ بارمتەگیراوەکان ڕووداوی پێشبینی نەکراو دروست ببێت.

فڕۆکەکە بۆ ماوەی ٢ کاتژمێر لە فڕۆکەخانە مایەوە تاوەکو زانیاریەکان (سی ئای ئەی) هەڵیانبسەنگێنێت و شیکاریان بکات.

ئارمائۆ لە ناو فڕۆکەکەدا لەگەڵ هامیلتۆن جۆردن پەیوندی کرد و جۆردن پێی وت: (لەوانەیە ناچار بکرێن نەڕۆن بۆ میسر!)

لەم کاتەدا سەرۆك کارتەر پەیوەندی کرد بە ئەنوەر ساداتەوە و ڕێکەوتنێکی لەگەڵدا بەست. کارتەر دەیویست دڵنیا بێت کە بە ڕۆیشتنی شا بۆ جاری دووەم بۆ میسر توندڕەوە ئیسلامیەکان و گروپەکانی وەکو ئیخوان المسلمین ئاسایشی ناوخۆی میسر ناشێوێنن و توشی قەیرانی ناکەن؟

ئەم بابەتە دواتر خوالێخۆش بوو سادات بۆی باسکردین. سادات وتی: (من وتم بە کارتەر پێویست ناکات تۆ لە بیری ئاسایشی میسردا بیت باشترە بیر لە بارمتەکراوکانی خۆت بکەیتەوە!)

لە فڕۆکەخانەی قاهرە سەرۆك کۆمار ئەنوەر سادات و هاوسەرەکەی جهان سادات هاتن بۆ پێشوازیمان. سادات بە بینینی محمد ڕەزا بە ئاشکرا توشی شۆك بوو. شای لە باوەش گرت و ماچی کرد و وتی: (سوپاسی خودا دەکەم کە زیندووی!)

زاوا خۆشەویستەکەم بە ڕادەیەك لاوازبووبوو کە جلەکانی نەدەوەستان.

چەند ڕۆژ دواتر، خاتو سادات کە نەیدەتوانی خەم و خەفەتی خۆی بەرامبەر ئێمە بشارێتەوە پێی وتین: (من توشی سەرسوڕمان بووم لە بێ سۆزی ئەمریکیەکان. سەیرکەن بزانن چۆن هەڵسوکەوتیان کردوە لەگەڵ هاوپەیمانە ئەسڵیەکەیاندا؟)

سادات ئێمەی لە (کۆشکی قبە) دانا و بەم کارەی ویستی ئەوە نیشان بدات کە ئەو لە هاوڕێیەتیدا لە پێشەوەیە و تەنها شای ئەو کاتە نەویستوە کە شا بووە، بەڵکو ئێستاش دەیەوێت لەکاتێکدا کە تاج و تەختەکەشی لەدەستداوە و هاوڕێیەتیەکەی هەروەکو جاران بەردەوامە!

سادات بەم کارەی ئەوە نیشانی شا و کچەکەم فەرەح دا کە سادات لە نەخۆشخانە ژووری بۆ نەگرتوە، بەڵکو لە کۆشکی بەناوبانگی قبە کە تایبەتە بە شوێنی میوانە پایە بەرزەکانی دەرەوە شوێنی مانەوەی بەخشیوە بە فەرەح و شا.

هەڵبەتە هەلومەرجی جەستەیی محمد ڕەزا بەجۆرێك نەبوو کە بتوانێت لە کۆشکدا بمێنێتەوە. پاش دوو کاتژمێر پشوو لە کۆشکی (قبە) محمد ڕەزا لەسەر خواستی خۆی برا بۆ نەخۆشخانەی (معادی) لە قاهرە و بەخێرای خەوێنرا.

لێرەدا دەستی کچەکەم زیاتر کراوە بوو. فەرەح بەبێ دواکەوتن تەلەفۆنی کرد بۆ پاریس و پزیشکەکانی شا هاتن بۆ قاهرە. لە ئەمریکاش پرۆفیسۆری ناسراوی نەشتەرگەری، ئەو کەسەی کە یەکەمین کرداری دانانی دڵی لە ئەمریکا ئەنجامدا، واتە دکتۆر دیباکی هات بۆ قاهرە.

بۆ ئەوەی پزیشکە میسریەکان بچوک نەبنەوە و گوایا متمانەیان پێ ناکرێت، دوو دکتۆری بەناوبانگی میسریش کە پزیشکی تایبەتی سەرۆك کۆماری میسر بوون پەیوەست بوون بە گروپی پزیشکەکانەوە.

پزیشك (کین) دەزگای شیکاری خوێن (جیاکردنەوەی خڕۆکەکانی) لەگەڵ خۆیدا لە ئەمریکاوە هێنا بوو.

لێرەدا دەرکەوت کە خڕۆکەکانی خوێنی شا بەتەواوی توشی مەترسی جدی بوون.

نەشتەرگەریەکەی لە ڕۆژی ۳۱ مارچ ئەنجامدرا و نزیکەی دوو کاتژمێر درێژەی کێشا.

ئەو دەزگایەی کە پزیشکە ئەمریکیەکان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان بۆ میسر لەکاتی کرداری کارەکەیدا توشی کێشەی هونەری بوو.

من، فەرەح، خاتو ئەشرەف، فاتمە پەهلەوی، سەرهەنگ جیهانبینی و ئەردەشیر زاهدی (کە لە ئەمریکا هاتبوون) لە ژوورێکی دیکە و لە ڕێگەی تەلەفزیۆنەوە سەیری نەشتەرگەریەکەی شامان دەکرد.

پاش دەرهێنانی سپڵی شا دکتۆر دوبیکی وتی: (سپڵی) ئەوەندەی تۆپێکی یاریکردنی لێ هاتووە! بیست ئەوەندەی حاڵەتی سروشتی لێ هاتبوو و پەنکریاسیشی بەخۆیەوە توشی کێشە کردبوو!)

گەورەبونی پەنکریاسەکەش بووبوویە هۆی ئەوەی کە دروستبوونی ئەنزیمەکان توشی مەترسی و لەناوچوونی پێکهاتەکانی دەوروبەری ببێت.

یەکێك لە پزیشکە میسریەکان کە لە ژووری نەشتەرگەریەکەدا بوو وەکو نارەزایەتێك لەدژی پزیشك دوبیکی و دکتۆر کین لە ژووری نەشتەرگەریەکە هاتە دەرەوە و وتی ئەوانە دەیانەوێت هەر بە ئەنقەست شا بکوژن!

دکتۆر (زەکریا الباز) وتی: (من وتم بە دکتۆر دوبیکی و دکتۆر کین دەبێت پاش نەشتەرگەریەکە سۆندە لەناو سکی شادا دابنرێت تاوەکو لە ڕێگەی ئەو سۆندەیەوە ڕێگە لە دروستبوونی دومەڵ و پیسی ناو سکی شا بگرێت. بەڵام دکتۆر دوبیکی کە پزیشکێکی ناسراوی جیهانیە وتی: (پێزبست بەم کارە ناکات!)

هەر خوێندکارێکی پزیشکیش دەزانێت کە ئەم کارە پێویستە. من پێم سەیرە دکتۆر دوبیکی و دکتۆر کین ئەمەیان ڕەفز کردەوە!)

فەرەح کاتێك دکتۆر دوبیکی لە ژووری نەشتەرگەریەکەدا هاتە دەرەوە بەرە لای ڕای کرد و وەکو ناڕەزایەتییێك ئەو بابەتەی کە دکتۆر زەکریا الباز وتبووی لەگەڵ دکتۆر دوبیکی باسی کرد.

دکتۆر دوبیکی وتی: (جگەری شا سپی و خاڵدار بووە. ئەمەش واتە هێرشی شێرەپەنجەکە تاوەکو ڕادەی مەرگ نزیك بووەتەوە!)

دکتۆر دوبیکی وتی پێمان کە لە دەورووی فەرەح کۆبووبووینەوە: (شا زۆر نامێنێت، و دانانی سۆندەش بە مانای ئازاری زیاترە )

دکتۆر کینیش هات بۆلای دوبیکی و وتی: (بهێڵن شا بە ئارامی بمرێت. جگەری پڕە لە وەرەمی سەرەتانی و من بەدرێژای ژیانی پزیشکیم شتی لەم شێوەیەم نەبینیوە!)

دە ڕۆژ پاش کرداری نەشتەرگەریەکە، بارودۆخی شا بەرەو خراپ بوون ڕۆیشت. ڕێگە گرتنی دوبیکی و کین لە دانانی سۆندە بۆ دەرچوونی پیسی بووە هۆی ئەوەی کە سکی توشی گەنین بێت. پزیشکەکان بەخێرای دەستبەکار بوون و بە کونکردنی شوێنی ئاوسانەکە ڕێژەیەك لە پیسی کۆکراوە (دوور بێت لە حازری) لە سکی شاوە هاتە دەرەوە.

پزیشکە میسریەکان کە لە ژووری نەشتەرگەریەکەدا بوون سوێندیان دەخوارد کە پزیشکە ئەمریکیەکان بەئاشکرا ئەم کارەیان کرد بۆ ئەوەی زووتر شا بمرێت!

پزیشکە میسریەکان وتیان هیچ گومانی تێدانیە کە شا دەمرێت، بەڵام ئەگەر چارەسەری دروستی بۆ بکرایە ئەوا شا بەلایەنی کەمەوە بۆ شەش مانگی دیکە دەما.

(ئەشرەف) کە زۆر بەتوندی کەوتبویە ژێر کاریگەری سوێندی پزیشکە میسریەکانەوە و باوەڕی پێ کردبوون پسپۆڕێکی پزیشکی شێرەپەنجەی لە ئەمریکا بانگ کرد.

پزیشك (مۆرتۆن کۆلمن) پزیشکی شێرەپەنجەی بەناوبانگی ئەمریکی لەسەر خواستی ئەشرەف کەمتر لە ٢٤ کاتژمێر خۆی گەیاندە قاهرە و هاتە سەر شا.

پزیشك (مۆرتـۆن كـۆلمن) كاتێك هاتـه نـاو نەخۆشخانەی معادی و (شـا)ی بـەو تـا بەرزەوە بینی كە دەسوتا و لە تاو ئازاری سكی هاواری دەكرد.

(مۆرتـۆن كـۆلمن) سەرسـوڕمانی خـۆی پیـشاندا كـە چـۆن دكتـۆر دوبیكـی پـاش نەشتەرگەریەكە سۆندەی پیسی بۆ دانەناوە بۆ ئەوەی جەرەعەت و چڵكەكەی لە سكی بچێتە دەرەوە و بە تەلەفۆن پەیوندی كرد بە دوبیكی لە ئەمریكا.

(كۆلمن) پێی نەوتین كە دوبیكی چی پێ وتوە، بەڵام بۆ بەیانی داوای لە ئەشرەف كرد بۆ ئەوەی دەستحەقەكەی بداتێ!

وتی بە ئەشرەف: (ئیشی جەنابی شا تـەواو بووە. تەنانـەت ناتوانیـت ڕەگەكانیشی بدۆزیتەوە بۆ ئەوەی دەرزی پێویستی بۆ بكات، بەداخەوە!)

كـچەكەم كـە بـاوەڕی نـەدەكرد پیـاوە تاجدارەكـەی لـە حاڵـەتی خواحافیزیدایـە دواهەمین هەوڵی خۆیدا. فەرەح كە هـاوڕێی نزیكی هـەبوو لـە فەرەنسا پەیوەنـدی كـرد بەچەند كەسایەتێكی فەرەنسیەوە كە پێم خۆش نیە ناویـان بهێنم و فەرەنـسیەكانیش بەخێرای پزیـشكێكی بەناوبانگی گرانبـەهایان بـەناوی پرۆفیـسۆر (پیرلوئی فـانی یـن) نارد بۆ قاهرە. ئەمە دووەمین گرووپی پزیشكی و نەشتەرگەری بوو كـە لەسـەر محمـد ڕەزا ئەنجامدرا.

دكتـۆر (فـانی یـن) بـە گەیشتنی بۆ قاهرە سكی شـای هڵدڕی و نزیكـەی ٢ لـیتر لـە جەرەعەت و پیسی لـێ دەرهێنا و بـەو پـەڕی سەرسامیەوە وتـی نەشـتەرگەری پێشوو (دكتۆر دوبیكی ئەمریكی)، ڕێژەیەكی زۆر لە جگەر و پەنكریاسی سـەرەتانی لـە سـكیدا بەجێهێشتوە و ئەمەش ناكرێت هەڵە بێت!)

دكتۆر (فانی ین)ی فەرەنسی هەموومانی لە ژوورێك لە نەخۆشخانەكە كـۆ كـردەوە و پاش پیشاندانی ئـەو پیسی و جەراعـەت و زیادانـەی كـە لـە سـكی شـادا دەریهێنـابوو وتی ئەگـەر سۆیندەیان لـە سـكی شـادا دابنایـە ئەمـە ڕووی نـەدەدا. ئـەوان ویـستویانە مردنی شا پێش بخەن!

دكتۆر پاش ئەوەی كە پاشماوەكەی ناو سكی پیشانی ئێمەدا وتی من نازانم بۆچی دكتۆر دوبیكی ئەم كارە تاوانبارانەی ئەنجامداوە؟

دکتۆر (ڤانی ین) هەواڵێکی شۆکهێنەری دیکەی پێداین. وتی: (لەکاتی ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکەدا زیان گەیشتوە بە پەنکریاسی. من نازانم ئەم کارە بە ئەنقسەت کراوە یان لەکاتی ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکەدا دەرزی نەشتەرگەریەکەی بەرکەوتوە، بەهەرشێوەیەك بووە شوێنی برینەکەی ئینتیهابێکی ترسناکی کردوە!)

لە ١٩ جولای شا ئیدی کەم کەم بەرەو بێهۆشی دەچوو.

هەر ساتێك بێ هۆشیەکەی زیاتر دەبوو... و پرسیم لە پزیشکەکانی سەر شا ئایا هیچ هیوایەك هەیە؟

ئەوانیش وتیان: (نەخێر، بێهۆش بوونی بەمانای ئەوەیە کە ئیدی لە تەواوبووندایە!)

لەوانەیە هێشتا تەریق دەبوونەوە ئەگەر وشەی (مەرگیان) بەکار بهێنایە. بەڵام ئێمە هەموومان دەمانزانی کە کۆتایی شا نزیك بووەتەوە.

محمد ڕەزا کاتژمێر ٩ بەیانی ٢٧ جێنیوەری ١٩٨٠ کۆچی دوایی کرد. کاتێك کە شا مرد من، فەرحنازی ١٧ ساڵە، ئەردەشیری زاهدی، مارك میرس، کچەکەم فەرەح، ئەشرەف و ئەمیر پور شجاع لەسەر سەری بووین.

ڕۆژێکی هاوینی زۆر گەرم بوو. هەواڵی مردنی شا بوو بە سەردێڕی هەواڵەکانی جیهان. بە پێچەوانەی ئەوەی کە ئەمریکیەکان بیریان لێ دەکردەوە، مردنی شا نەبووە هۆی ئازادبوونی بارمتەکراوەکان و دیبلۆماتکارەکانی ئەمریکا بەڵکو هەر لە دیلیدا مانەوە.

سادات هاوڕێیەتی و برادەرایەتی خۆی لەبەرامبەر محمد ڕەزادا زۆر بەڕێزانە ئەنجادا و ڕێوڕەسمێکی شکۆمەندانەی بۆ ئەنجامدا.

جەنازەکەی شا، لە تابوتێکدا کە لەسەر تۆپێك دانرابوو و بە ئەسپ ڕاکێشرا و لە نەخۆشخانەوە تاوەکو مزگەوتی الرفاعی کە نزیکەی ٥ کیلۆمەتر بوو بە ڕێوڕەسمێکی شکۆمەندانە برا.

تابوتەکە بە ئاڵای ئێران داپۆشرابوو و نیشانەکانی شا لەسەر تابوتەکە دانرابوو.

نوێنەری دەوڵەتەکانی ئەمریکا، بەریتانیا، فەرەنسا و ئەڵمانیا لە پشت جەنازەکەوە بوون. ریچارد نیکسۆن، هێنری کیسنجەر، ئەنوەر سادات، کنسانتین پاشای پێشوی یۆنان و سەفیری ئیسرائیل و مەراکیشیش ئامادە بوون.

پاش مردنی محمد ڕەزا و ئەنجامدانی تەشریفاتەکانی پەیوەست بە خاکسپاردنەکەی، ئێمە نزیکەی ساڵێك لە کۆشکی قبە لە قاهرە ماینەوە و لە میوانداریە شکۆمەندانەکەی سەرۆك کۆمار سادات سودمەندبووین. کچەکەم (فەرەح) لەگەڵ علیڕەزا، فرحناز و لەیلا لە ساڵی ١٩٨١ ڕۆیشتن بۆ ئەمریکا.

فەرەح پاش ئەوەی کە دەستیکرد بە ڕێکخستنی ژیانی منداڵەکان و هەندێك ئیش وکارەکان و خوێندن و قوتابخانە و کاروبارەکانی منداڵەکانی ڕێکخست خۆی گەڕایەوە بۆ پاریس کە شارێك بوو هەمیشە خۆشیدەویست. کچەکەم کاتەکانی خۆی بەدرێژای ساڵ لەنێوان شاری کانکتی کیتی (ئەمریکا) و پاریسی (فەرەنسا) دابەش کردبوو.

ڕەزاگیانیش پاش مردنی باوکی کە بۆ ماوەی دوو ساڵ لە مەراکیش مایەوە، بۆ هەمیشەیی ڕۆیشت بۆ ئەمریکا.

ئەشرەفیش لە بینای بەرزی (ئیمپایراستیت) لە نیۆیۆرك کە گرانترین و گەورەترین بینای جیهان بوو لە قاتی سەدمیندا دەژیا.

ئەشرەف لەگەڵ ئەمیر هۆشەنگ ئەنصاری لە (کۆمپانیای گەشتیاری ئیستراحەتگای خۆر) بوو بە شەریك کە لە کۆمەڵە دورگەی ڤێرجینیا بوو و خاوەنی چەندین هۆتێلی شکۆمەند بوو.

ئەشرەف سامانەکەی خۆی لە کاری گەشتیاری، کۆمپانیای فڕۆکەوانی و هێڵی کەشتیوانی خستەگەڕ و بە زووی بووە بە یەکێك لە ملیۆنێرەکانی ئەمریکا.

ئەشرەف کە لەڕووی مادییەوە زۆر گەورە بوو سەنتەرێکی توێژینەوەی ئێرانناسی لە نیۆیۆرك دامەزراند کە ئامانجی زیندوڕاگرتنی فەرهەنگ و مێژووی ئێرانی خۆشەویست بوو!

کچەکەشم کاروباری داراییەکانی لەگەڵ راکفلەر ڕێکخست و لە چەند پشك و بانکێکی جیهانیدا سەرمایەگوزاری گەورەی کرد.

ڕەزا گیانیش لە کۆمپانیا نەوتی و پالاَوگەکانی ئەمریکادا سەرمایەگوزاری کرد.

پاش مردنی شا، ئێمە توشی کێشەی زۆر بووین. زۆرێک لەو کەسانەی کە کاروباری داراییەکانی شایان لە دەرەوەی ولاَت بەڕێوە دەبرد، ڕێژەیەکی زۆر موڵکومالّی محمد ڕەزایان بەتالاَن برد و هەڵهاتن. ئێمەش هیچ بەڵگەیەکمان نەبوو بۆ ئەوەی لەدژی ئەو کەسانە داوا تۆمار بکەین.

ئێستاش پاش بیست ساڵ کاتێکی زۆر تەرخان دەکەین تاوەکو هەندێک لە داراییەکانی خۆمان لە بانکەکانی سویسرا و لیختین ئەشتین کۆبکەینەوە و وەریان بگرینەوە.

کۆمەڵێک لە کەسانی نزیک لە محمد ڕەزا و تەنانەت کەسانی خێزانەکەشی خیانەتیان لێ کردین. لە سالاَنی سەرەتای دەرچونمان لە ئێران کچەکەم (فەرەح) بەهۆی سادەی و پاکی ویژدانیەوە(!) یارمەتی هەرکەسێکی دەدا کە داوای هاوکاری بکردایە.

کەسانی زۆر لە دیبلۆماتکار و ئەفسەر و پیاوانی کۆمەلاَیەتی و فەرهەنگی و ڕۆژنامەنوس لە ئێرانەوە دەهاتن بەناوی دژایەتی حکومەتی ئێرانەوە داوای پارە و یارمەتیان دەکرد لە فەرەح.

کۆمەڵێک لەو کەسانە ڕاستگۆ بوون بەهۆی وەرگرتنی پارە لە کچەکەم دەستیانکرد بە دامەزراندنی ڕادیۆ یان بلاَوکردنەوە ڕۆژنامە و گۆڤاری وەرزی لە دەرەوەی ولاَت و دەستیانکرد بە دژایەتی کردن و بانگەشە دژای ئێران.

ئەوانە سەرەڕای ئەوەی کە دژی حکومەتی کاریا دەکرد داوای گەڕانەوەی ڕژێمی پاشایەتیشیان دەکرد بۆ ئێران و ناوی محمد ڕەزا و سەڵتەنەتی پەهلەویان بە زیندویەتی ڕادەگرت.

کۆمەڵێک لە ساختەچیش هەبوون پاش وەرگرتنی پارەیەکی باش سەرەڕای ئەو بەڵێن و پرۆژەیەی کە پێشکەشیان کردبوو پارەکانیان خوارد و بەهیچ شێوەیەک تخونی ئەو کارە نەکەوتن کە بانگەشەیان بۆ کرد.

هەندێک لەو کەسانە بۆ هەڵخەڵەتاندنی کچەکەم (فەرەح) و ڕەزاگیان! درۆی زۆرسەیر و سەمەرەیان دەکرد!

بۆ نمونە ژەنراڵ بەهرام ئاریانا دەیوت پەنجا هەزار کەسی شەڕکەری لێهاتووی لە سنوری ئێران و تورکیا ڕێکخستوە و ئێستا بۆ کڕینی چەکی سەربازی پارەی پێویستە! بۆیە لەڕێگەی ئەم کارەیەوە چەندین ملیۆن دۆلاری خوارد!

من هەر ئەوکاتە وتم بە کچەکەم کە کۆ کردنەوەی پەنجا هەزار شەڕکەر لە سنوری ئێران و تورکیا شتێك نیە کە بتوانرێت بشاردرێتەوە. ئەگەر شتێکی لەو شێوەیە بوایە ئەوا ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکانی جیهان باسیان دەکرد. یان بەلایەنی کەمەوە ئێران ناڕەزایەتی پیشان ئەدا لەبەرامبەر تورکیا. بەلام کچەکەم لەبەر ئەوەی دەیویست بە بەهەرشێوەیەك بووە تۆڵەی خۆی بسێنێتەوە بەهۆی ئەو ناڕەحەتی و ئاوارەی و دەربەدەریەی کە توشی بووبوو، ئامادەبوو باوەڕ بکات بەو بانگەشەیە و دەیوت: (ئەم پیاوە چەندین ساڵ سەرۆکی بنکەی هێزی شا بووە و لەوانەیە بەم تەمەنەوە درۆ نەکات!)

دواتر تێگەیشتین کە هەموو پارەکانی بە قومار لە گازینۆ پڕ لە زرق و برقەکانی لەندەن (لەوشوێنەی کە دەژیا) لەگەڵ خۆشەویستە گەنجەکەیدا سەرف کردوە!)

شاهپور بەختیاریش بۆ خەبات دژی ئێران تاوەکو توانی پارەی ڕاکێشا. ژەنراڵ دکتۆر ئەحمەد مەدەنیش کە پاش شۆڕشی ئیسلامی بووبوویە فەرماندەی هێزە دەریاییەکانی حکومەتی تازەی ئێران دەستی بۆ کچەکەم درێژ کرد و تاوەکو ئەوەی کە پێی کرا بە بەڵێنی پوچ و بێ بنەما بۆ دژایەتیکردنی حکومەتی ئێران و خستنی دەوڵەتی شۆڕشی پارەی لە کچەکەم ڕاکێشا.

مەدەنی کە هەڵهاتبوو بۆ تورکیا لەوێوە بە شاراوەی هات بۆ پاریس و چاوی کەوت بە کچەکەم و بە هەموو قەناعەتێکەوە بەڵێنیدا بە کچەکەم کە لەماوەی سێ مانگدا حکومەت هەرەس پێ دەهێنێت!

هەرکەسێك دەهات بۆلامان بە وەرگرتنی بڕێکی زۆر پارە کۆمەڵێك بەڵێنی دەدا و پاش وەرگرتنی پارەکە دەڕۆشت و ئیدی نەدەگەڕایەوە.

کەم کەم تێگەیشتین کە ئامانجی ئەم کەسانە زیاتر تالان کردن و پارە ڕاکێشانە لە ئێمە. هەر بۆیە لەم ڕووەوە کچەکەم فەرەح یارمەتیەکانی پچڕاند و ئێستا تەنها هاوکاری چاپەمەنیەکان و ڕادیۆ و تەلەفزیۆنە ئێرانیەکان دەکات یان هاوکاری ئەو

بیانیانە دەکات کە لەدژی ئێران ئیش دەکەن و لە بەرژەوەندی فەرەح و ڕەزا و سەڵتەنەتی پەهلەوی کار دەکەن، ئەوانیش پاش بڵاوکردنەوەی بەرنامەکە یان چاپکردنی بابەتەکە دەبێت پارەکە وەرگرن.

کاری دەستبڕینی کچەکەم و ڕەزاگیان تەنها کاری چەند ڕۆژنامەنوسێکی ئاوارە یان سیاسەتمەدار و کەسانی سەربازی نەبوو، تەنانەت غلامڕەزا پەهلەویش کە خاوەنی داراییەکی زۆر گەورەیە گرانترینماڵی لە لەندەن و بورلی هیلز هەبوو ماوەیەك بووبوویە موی لوتی کچەکەم و بەهەر شێوەیەك کە دەیتوانی پارەی لە کچەکەم ڕادەکێشا!

پاش دەرچونی لە ئێران، غلامڕەزا ماوەیەك لە لەندن نیشتەجێبوو، ئێستا لە (بورلی هیلز)ە کە ناوچەیەکی زۆر گران و شوێنی نەجیبزادەکانی لۆس ئەنجلسە، لەوێ ڤێلایەکی شکۆمەندی هەیە. بەڵام بەو شێوەیەی کە بووەتە عادەتی ڕۆژانەی (بەتایبەتی خەرجی گرانی تریاك کێشانی بیست و چوار کاتژمێری!) خۆی هەڵدەواسێت بەم و بەو و هیچ ئابڕوویەکی نیە و گوێی لێنیە کە ئابڕوی خێزانی پەهلەوی بۆ سێ وەچەیان بەرێت بۆ ئەوەی شتێکی دەستکەوێت.

لەناو هەموو ئەوانەدا فاتمە پەهلەوی ژنێکی زۆر شەریف بوو. ئەو ڕۆیشت و بەهیچ شێوەیەك سەیری دواوەی نەکرد و سەرەئێشەی بۆ هیچکەس دروست نەکرد.

فاتمە تاوەکو کۆتایی تەمەنی نیشتەجێی فەرەنسا بوو. (هەڵبەتە لە ڕۆژانی کۆتایی تەمەنی لە لەندەن ژیانی بەسەر دەبرد بۆ کاری نەشتەرگەریەکانی و هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد.)

فاتمە لەگەڵ دوو کوڕەکەی لە پاریس دەژیا. ئەویش خۆی سامانێکی زۆری گواستبوویەوە بۆ دەرەوەی وڵات، و بەوشێوەیەش کەبیستم، دەڵێن نزیکەی حەوت سەد یان هەشت سەد ملیۆن پوندی بەریتانی لە داراییەکانی پیاوەکەی محمد خاتمیەوە بۆ بەجێمابوو.

لەبەر ئەوەی (ژەنراڵ محمد خاتمی) ساڵی ١٩٥٣ ڕۆڵی هەبوو لە ڕزگارکردنی محمد ڕەزا بۆ دەرەوەی وڵات، شا وەکو پێزانینێك، خۆی بە قەرزای دەزانی، بۆیە دەستی کراوە بوو بۆ هەر معامەلەیەك کە دەیکرد بۆ کڕینی کەرەسە و پێویستیە جەنگیە ئاسمانیەکانی شاهنشاهی و لەم معامەلانەدا بەوشێوەیەی کە عادەتی بازاڕە

ڕێژەیەکی زۆر پارەی لەلایەن ئەو کۆمپانیا و کارگە چەك سازانەوە وەردەگرت کە معامەلەی لەلا دەکردن و دەرئەنجامیش ئەم پارانەی لە بانکە جیهانیەکاندا دادەنا.

محمد ڕەزاش دەیزانی دەرئەنجام ئەم پارانە دەچنە گیرفانی خوشك و خوشکەزاکانیەوە بەلاّم زۆر کاردانەوەی نەبوو و بەکورتی بارودۆخی فاتمە لە هەردوولاوە باش بوو!

فاتمە بەهیچ شێوەیەك نزیکی خوشك و براکەی نەدەکەوت، چونکە دەترسا کەسانی وەکو غلامرەزا چاوی تەماع بکەنە سامانەکەی و داوای پارەی لێ بکەن.

شەمسە و پیاوەکەشی! چوون بۆ ئەمریکای ناوەند. شەمسە لەسەردەمی دەسەلاّتی محمد ڕەزادا دوورگەیەکی لە دەوروبەری ترینیداد و توباگو کڕی بوو، دوورگەکە فڕۆکەخانەیەك و چەند بینایەکیشی تێدابوو. واتە ولاّتێکی بۆخۆی هەبوو دووری ئەو دورگەیە لەگەڵ خاکی ئەسڵی ئەمریکا کەمتر لە کاتژمێرێك بوو.

شەمسە کە پێش (مهرداد پهلبد) شوی بە پیاوێکی ئەمریکی کردبوو ڕەگەزنامەی ئەمریکی هەبوو و بەهاولاّتی ئەمریکی دادەنرا. شەمسە هەر لە کۆنەوە خاوەنی دارایی و سەرمایەی زۆر بوو لە ئەمریکا و لەگەڵ سەرمایەدارە گەورەکان هاوبەشی هەبوو. بارودۆخی شەمسە تەنانەت لە بارودۆخی کچەکەم و ڕەزگیان زۆرباشتر بوو.

شەمسە ژنێکی زۆر بێ سۆز بوو. تەنانەت ئامادە نەبوو لە ڕێوڕەسمی ناشتنی براکەی لە میسر ئامادەبێت و بەگشتی هەموو پەیوەندێکی خۆی لەگەڵ بنەماڵەی پەهلەویدا پچڕاندبوو.

محمود ڕەزا پەهلەوی برایەکی دیکەی شاش لە کالیفۆرنیا بوو کە کەسێکی موعتادی تریاك بوو. محممود ڕەزا پشکدارێکی چالاك بوو لە معامەلەکاندا و سامانێکی زۆر گەورەی پێکەوەنا بوو، بەلاّم یەك دینار هاوکاری ئێرانیە ئاوارە و بێ کەسەکانی نەدەکرد.

بەلاّم هیچ ئاگاداری عبدالرەزا نەبووم کە برایەکی دیکەی محمد ڕەزا بوو. هەندێك دەڵێن ناو و ناونیشانی خۆی گۆڕیوە و لە ئەرژەنتین کێڵگەیەکی گەورەی کڕیوە و بۆخۆی دەژی. هەندێکی دیکە دەڵێن لەگەڵ هژبر یزدانی لە کۆستەریکا بینراوە. هەندێکی دیکە دەڵێن لە ئاوارەییدا و بە تەنهای بەبێ ناونیشان مردوە.

بەبۆچونی من لەهەمووی ڕاستر بۆچوونی فریدون جوادی بوو.

فەریدون کە ئێستا چا و چرای ماڵی من و کچەکەم فەرەحە، زانیارێکی زۆری هەبوو لەبارەی پەیوەندی شاراوەی عبدالرەزا لەگەڵ دەزگا سیخوڕیەکان لە ماوەی سەڵتەنەتی محمد ڕەزا و زانیاری بە بەڵگەی لابوو و دەڵێن عبدالرەزا سیخوڕێکی لێهاتووی وەکو جیمز بۆند بووە، و خیانەتی لە براکانی کردوە. پاش شۆڕش، دەزگایەکی سیخوڕی ناونیشانێکی تازەی بۆ دروستکردوە و ناونیشانی ون کردوە.

ئێستا لەبەر ئەوەی کە ناوی عبدالرەزام برد دەبێت ئەو حەقەی پێ بدەم کە عبدالرەزا ڕۆشنبیری خێزانی پەهلەوی بوو، هەرچەندە عەبدالرەزا پەیوەندی هەبوو لەگەڵ محمد ڕەزادا، بەڵام عبدالرەزا بەهیچ شێوەیەك شای قبوڵ نەبوو و (شا)ش زۆر گومانی لە عبدالرەزا بوو.

خوشکی گەورەی خێزانی پەهلەوی واتە خاتو هاودەم السلطنە کە بارودۆخێکی زۆر باشی نەبوو لە ئەوروپا لە هەژاریدا مرد و بە یارمەتی دارایی کچەکەم (فەرەح) دەژیا.

شاژنی دایك (تاج الملوك)یش کە توشی شێرەپەنجە بووبوو لە نیویۆرك مرد و هیچ یەکێك لەو خوشك و برایانەی ئامادە نەبوون جەنازە نەگبەتەکەشی بەرز بکەنەوە! دەرئەنجام کچەکەم هەرچەندە هیچ دڵی بە تاج الملوك خۆش نەبوو ١٢ هەزار دۆلاری نارد بۆ غلامرەزا پەهلەوی بۆ ئەوەی بیداتە خەرجی کفن و دفنەکەی. دواتر بیستمان کە غلامرەزا ١٢ هەزار دۆلارەکەشی بردوە و دوتر سەردانی شارەوانی نیویۆرکی کردوە و لەوێ ناوی تاج الملوکی لە پێرستی هەژارەکاندا نوسیوە و بە سودوەرگرتن لە یاسای شارەوانی مەیتەکەی دایکی بەبێ ئەنجامدانی هیچ تەشریفاتێك لە گۆڕێکی بەکۆمەڵدا ناشتوە!

ئەشرەفیش تاوەکو ئێستا بەو پیریە هێشتا چالاکە و بارودۆخێکی باشی هەیە. سەرەڕای ئەوەی کە کچەکەمی بە هۆکاری کەوتنی شا دەزانی و لە هەرشوێنێك کە دادەنیشێت بە خراپە باسی فەرەح دەکات بەڵام هەر جێگەی ڕێزی ئێمەیە، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە هەمیشە یەك سات ناوەستێك لە خەرجکردنی پارە و سەرمایەکەی بۆ دژایەتیکردنی دەسەڵاتی ئێران و پەیوەندێکی زۆر باشیشی هەیە

لەگەڵ دەسەڵاتدارەکانی ئەمریکا و کەسانی دیبلۆمات و پیاوە بەهێزەکان و هەمیشە خەریکی جوڵاندنیانە دژی حکومەتی ئێران.

ئەشرەف دەوڵەمەندترین کەسی خێزانی پەهلەوی و لە سەرمایەدارە گەورەکانی جیهانە، هەرچەندە ئەشرەف لە نیویۆرك دەژی، بەڵام لەهەمانکاتیشدا لە پاریس، ڕۆما، مۆنتکارۆ و چەند ناوچەیەکی جوانی دنیادا شوێنی زۆر ڕازاوە و گرنگی هەیە.

کوڕەکەی شەهرام لەبواری سامان و داراییەوە ئەویش کەمتر نیە لە دایکی.

ئازادە شەفیق (کچی ئەشرەف)یش لەگەڵ دایك و باوکی دەژی. ئازادە دەڵاڵی شتی کۆن و شەهرامیش دەڵاڵی خشڵ و زێڕە.

کاتێك تاج الملوك لە نەخۆشخانەی نیویۆرك خەوێنرابوو لەسەر خشڵ و زیوەکانی شەڕ لەنێوان شەمسە و ئەشرەف لەلایەك و غلامرەزا لەلایەکی دیکەوە دروستبوو و دواتر دەرکەوت شەمسە بە بڕی ١٥ ملۆن دۆلار خشڵ و زیوی شاژنی دایکی ڕفاندوە.

ئەشرەفیش لەم نێوەندەدا پشینیاری ڕێگە چارەیەکی کرد و بڕیاردرا خشڵ و زێڕەکان بکەن بە ناوی شەهرامە تاوەکو بتوانن بیانفرۆشن و پارەکەی لەنێوان منداڵەکانی شاژنی دایك دابەش بکەن.

ئەمانە کەسانێك بوون هەرچەندە  بڕی ١٥ ملیۆن دۆلار خشڵی زێڕ و زیوی شاژنی دایکیان لوشدا، بەڵام ئامادە نەبوون جەنازەکەی لەسەر زەوی هەڵگرن و بینێژن و دەرئەنجام شارەوانی نیویۆرك لە گۆڕێکی بەکۆمەڵ لە شوێنێکی نەناسراو لەگەڵ بێکەس و هەژارەکاندا ناشتی.

بەڵام لەبارەی ئەحمەد ڕەزا بڵێم. ئەحمەد ڕەزا پەهلەوی لەناو براکانی شادا تەنها کەسێك بوو کە بارودۆخی دارایی باش نەبوو و بە یارمەتی مانگانە و پارەی گیرفانی کچەکەم دەژیا. ئەحمەد ڕەزا مانگانە دوو هەزار دۆلاری لە فەرەح وەردەگرت و ئەمساڵ کچەکەم پارەکەی بۆ زۆر کرد بۆ سێ هەزار دۆلار.

حەمید ڕەزاش کە لە ئێران مابوویەوە هەر لەو وڵاتە کۆچی دوایی کرد.

ئەمەش لەبارەی بارودۆخی خێزانی پەهلەوی لە دەرەوە و لە ئاوارەیی. بەڵام ڕێگەم پێ بدەن کەمێك لەبارەی هاوڕێ و یارانی پێشوو کە ئێستا لە ئەمریکا و لە ئەورووپان و هەندێکجار بۆ داواکردنی پارە و بڕینی گیرفانامان دەردەکەون قسە بکەم.

ئەردەشیر زاهدی: (ئاشەکەی هەمووشتێك دەهاڕێت!)

پێش هەمووشتێك گەورەترین دەلاڵی سەیارە گرانبەهاکانی جیهانە و لە هەراجیەکاندا ئامادە دەبێت و سەیارە دەگمەن و تایبەتەکان دەکڕێت و دەفرۆشێت.
چەندین سەیارەی لیمۆزینی بێنز و رولزرویسی گولە نەبڕی محمد ڕەزا کە لە ناو مۆڵەکان و شوێنی مانەوەکانی شا لە سویسرا و ولاّتانی دیکەی ئەوروپا و ئەمریکا بوو فرۆشتنی و دیناریك لەو پارانەی نەدایەوە بە ئێمە و لەبەرامبەر ناڕەزایەتیەکانی کچەکەشم ئەوەی خستەڕوو کە حەوت سەد هەزار دۆلاری لەلای محمد ڕەزا بووە!

ئەردەشیر هەچی هەبوو لەسایەی سەری محمد ڕەزاوە بوو و ئێستاش بە چەتاوەڕووییەوە دەیووت پارەم لەلای محمد ڕەزایە و باشتریشە لەخۆی بپرسن!

مۆڵکێکی زۆر بەنرخی هەبوو لەوانەیە گرانترین ڤێلای هەموو سویسرا بووبێت، باوکی پاش کودەتای ساڵی ۱۹۵۳ کڕیبووی.

فزل الله زاهدی لەم ڤێلایەدا کۆچی دوایی کرد.

ئەردەشیر خان پیاوێکی زیرەکە و پەیوەندێکی زۆری لەگەڵ زۆربەی دیبلۆماتەکان و کەسە ناسراوەکانی ئەمریکا و دەسەلاّتدار و تەنانەت هونەرمەند و ڕۆژنامەنوسەکانیش هەیە.

هۆکاری ئەم پەیوەندیەش دیارە. کاتێك سەفیری ئێران بوو لە ئەمریکا تاوەکو توانی بە گیرفانی سەفارەتی ئێران و لەسەر گیرفانی محمد ڕەزا خاویار و پستە و قاڵی و فەرشی بۆ پیاوانی کۆمەلاّیەتی و سیاسی ئەمریکا کڕی. (وەکو دەڵێن لەسەر گیرفانی خەلیفە بەخشی!)

سەرەڕای ئەو هەموو چاکەیەی محمد ڕەزا کردی بەرامبەر بە ئەردەشیر خان و ئەو هەموو خزمەتەی کە کچەکەم فەرەح و تەواوی ئەندامانی خێزانی پەهلەوی کە گرنگێکی تایبەتیان دەدا بەم پیاوە بچوکە چەتاوە ڕووە کەچی لەلای دادگای فیدراڵی ئەمریکا شکاتی کردبوو و داوای سامانێکی زۆری کردبوو بەتایبەتی ئەوەی کە لەلای خاتو گەوهەر مهناز (کچی ئەردەشیر و خاتو شاناز) بوو.

چەندین ساڵە کچەکەم و ڕەزاگیان لەم دادگاوە دەبات بۆ ئەو دادگا. لەکاتێکدا محمد ڕەزا پێش مردنی لە وەسیەتەکەیدا ١٥٪ سامانەکەی بەخشی بە کچەکەی شاناز و سەرەڕای ئەوەش ٨٪ بەخشی بە نەوەکەی مهناز.

محمد ڕەزا بێ ڕادە شانازی خۆشدەویست. شاناز منداڵی یەکەمی محمد ڕەزا و کچی فەوزیە بوو. هەروەها نەوە تاقانەکەی مهناز زاهدی زیاتر لە گیانی خۆشدەویست.

شاناز ژنێکی زۆر نەجیبزادە و بە شەخسیەت و ئیماندار بوو! و ئەو لەسەر پێشنیاری باوکی لەگەڵ ئەردەشیر زاهدی هاوسەرگیری کرد کاتێك کە بینی پیاوەکەی ئەردەشیر بێ ڕادە بێ بەندو بارە و بێ ئەخلاقە وازی لە ئەردەشیر هێنا و تەلاقی لێ وەرگرت.

شاناز پاش ئەردەشیر ئیدی شوی نەکردەوە و ڕووی کردە شیعر و عیرفان و تەصەوف.

کچەکەشی مهناز چەند ساڵێك پێشتر لەگەڵ ئەمریکێکی مسوڵمان هاوسەرگیری کرد و دوو کوڕ و کچێکی لەو ئەمریکیە هەیە.

شاناز هەرگیز خۆی تێکەڵی دنیای سیاسەت نەدەکرد و ژیانێکی ئارام و دوور لە دەنگە دەنگی لە شارێکی دووری باکوری ڕۆژئاوای ئەمریکا هەبوو.

وەسیەتنامەکەی محمد ڕەزا لەلای وەکیلێکی بەناوبانگی فەرەنسی بوو کە چەندین ساڵ پێشتر وەکیلی خێزانی پەهلەوی بوو.

لەسەر بنەمای ئەم وەسیەتنامەیە کچەکەم فەرەح ١٥٪، ڕەزاگیان ٢٠٪، علیڕەزا ٢٠٪، فەرحناز ١٤٪، لەیلا ١٤٪، شاناز ١٥٪ و مهناز (نەوەی محمد ڕەزا) ٢٪ لە هەموو دارایی و موڵکە گوازەرەوە و نەگوازەرەوەکانی شایان بە میرات دەبرد.

ئەردەشیریش وەکیلێکی مل ئەستوری گرت بەناوی (ویلیام راجرز) ئەم کابرایە پێشتر وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بوو.

ئەردەشیر پارەیەکی زۆری بەم وەکیلەدا و ئێمەی لەم دادگاوە دەبرد بۆ ئەو دادگا تاوەکو بتوانێت پشکێکی زیاتر بۆ کچەکەی مهناز وەربگرێت، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

کچەکەم لە پاریس و لە کانکتی کیت نوسینگەیەکی تایبەتی دروستکردوە و کاری نوسینگەکە زیاتر هاوشێوەی نوسینگە تایبەتەکەی سەردەمی دەسەڵاتیەتی لە کۆشکدا. بەرپرسی ئەم نوسینگەیەش لەدەستی فەریدون گیان (جوادی) یە.

لەبارەی فەریدون لەبیرم چوو بیڵێم. لەکاتی شۆڕشدا لە ئێران گیری خواردبوو و نەیتوانی بوو لە ئێران هەڵبێت. کچەکەم ئەو ئەرکەی سپارد بە حسین ئەمیر صادقی (کوڕی شۆفێری تایبەتی شا) کە لە لەندن بوو بەهەر شێوەیەك بووە ڕێگەیەك بۆ دەربازبوونی فەریدون جوادی فەراهەم بکات. حسین نزیکەی ٤ ملیۆن دۆلار پارەی وەرگرت و کۆمەڵێك قاچاخچی گرنگی گرت و توانی لەڕێگەی سنوری کوردستانەوە بەرەو تورکیا و لەوێشەوە بەرەو ئەوروپا بیهێنن.

خۆشبەختانە کچە خۆشەویستەکەم هەرگیز چاوی لە سامانی محمد ڕەزا نەبوو. سامان و داراییەکانی کچەکەم ئەگەر لە محمد ڕەزا زۆرتر نەبووبێت کەمتریش نەبوو و سەرەڕای ئەو ١٥٪یەی کە شا پێی بەخشی بوو خۆی موڵك وماڵی شەخسی هەبوو. هەر لە ڕێگەی ئەم سامانەوە بوو هاوکاری زۆرێك لە ئاوارە ئێرانیەکان و وێزگەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی دەکرد و ڕۆژنامەکانی دادەمەزراند.

هۆشەنگ نهاوەندیش لە پاریسە، بەڵام ئێمە هیچ پەیوەندێکمان لەگەڵیدا نیە. بەداخەوە هۆشەنگ توشی بێ ئەخلاقی بوو و ڕۆژنامەکانی فەرەنسا وێنەی هۆشەنگیان بە جلوبەرگی ژنانە و ئارایشی ژنانەوە بڵاوکردبوویەوە و ونوسیبوویان وەزیری پێشوی دەوڵەتی شا لە ئاهەنگی هاوجنسبازەکاندا دەرکەوت.

برازا خۆشەویستەکەم کە لە گیانم خۆشەویسترە (ڕەزا قطبی) ئەویش سوپاس بۆ خوا سەرکەوتووە و یەکێکە لە سەرمایەدارە گەورەکانی ئەوروپا و خەریکی کاری بازرگانییە. ئەو کەسانەشی کە هەمیشە بەیەکەوین خاتو (مهناز ئەفخەمی)یە. خاتو ئەفخەمی لە ڕابردوودا یەکەمین سەرۆکی ڕێکخراوی ژنان بوو لە ئێراندا و ڕۆڵێکی گرنگی لە ئازادی ژنانی ئێران هەبوو. باشتر بڵێم یەکێك بوو لە ڕێبەرانی بزوتنەوەی مافی ژنان لە ئێراندا. مهناز وەکو قاڵی کرمانە و هیچ نەگۆڕاوە و ڕابردوو و کات هیچ کاریگەرێکی نەکردوەتە سەری. مهناز لێرەش لە ناو بزوتنەوەکانی ژناندا چالاکە و ناوی ژنانی ئێران بە زیندووی ڕادەگرێت. مهناز هەر لەو سەروبەندی ڕاکردندا

پیاوەکەی بەجێهێشت بۆ ئەوەی بتوانێت بە ئازادی چالاکی سیاسی بکات. مهناز باوەڕی وایە ژیانی خێزانی بۆ ژن ڕێگە نادات چالاکی سیاسی ئەنجام بدات.

(نصرت الله معینیان)یش بۆ کچەکەم (فەرەح) بەهەمان وەفاداری جارانی مایەوە و ئێستاش ڕێکخەری پەیوەندی گروپە سەڵتەنەتخوازەکانە لەگەڵ کچەکەمدا. لەڕاستیدا معینیانی ڕۆڵی ڕێکخەرێکی دارایی دەبینێت بۆ ئەو گروپانە. سەرەڕای ڕۆڵە سیاسیەکەی حسابدارێکی باوەڕپێکراویشە.

خۆشەویستێکی دیکە کە زۆر ئەرکی دەکێشا دکتۆر مەنوچهر گنجی، وەزیری پێشوی پەروەدەر و فێرکرن بوو کە هەر لە یەکەم ڕۆژی کەوتنی حکومەتی سەڵتەنەتی چالاکانە سەرگەرمی ڕێکخستنی کاری فەرهەنگی، سیاسی و بانگەشەی دژە دەسەلاتی شۆڕشی ئیسلامی بووە و لەم ڕێگەیەشدا لەگەڵ دامەزراوە بیانیەکان و سەرچاوە ئەمریکیەکان و ئەوروپیەکان و کەسانی دەسەلاتدار پەیوەندی هەبووە و بۆ ڕادیۆ فارسی زمانەکان و ڕۆژنامەکان بوجەی دابین دەکرد.

بەڕێز گەنجی، نزیکەی ٥ بۆ ٨ ملیۆن دۆلاری لە کچەکەم (فەرەح) و ئەوەندی ئەم پارەیەشی لە ڕەزاگیان و خاتو ئەشرەف وەرگرت، بەلام دواتر ئیدی پارەی نەویست و خۆی دەستیکرد بە دابینکردنی بوجە بۆ سەڵتەنەتخوازەکان!

ئەمیرخان طاهری، سەرنوسەری ڕۆژنامەی کەیهان لە سەردەمی سەڵتەنەتی محمد ڕەزا، کە پەیوەندێکی زۆری لەگەڵ بنەماڵەی سەڵتەنەتیدا هەیە ئێستاش بەردەوام ڕاوێژی فکریمان هەیە.

پڕۆژەی دامەزراندنی کیهانی لەندن ئەمیرخان بوو. پارەکەشی کچەکەم فەرەح دابینی دەکرد، بەلام مصباح زادە نەمەك نەشناس بوو و کاتێك کیهانی لەندن قازانجی دەستکەوت نەك هەر ئەو پارەیەی نەگەڕاندەوە کە پێشتر دابینکرابوو بەڵکو ئەمیر خانیشی تۆمەتبار کرد و لەوێ دەریکرد و هۆشەنگ وەزیری هێنا.

هەڵبەتە ئێستا زۆر پەیوەندی نیە لەنێوان کچەکەم و مصباح زادە، بەلام من کەسێکی سیاسی نیم و بەهۆی نزیکیم لەگەڵ مصباح زادە ناتوانم ڕابردووی لەبەرچاو نەگرم.

لەو سەرەتایەوە هەرکەس لە ئێراندا هەڵبهاتایە خۆی بێ پارە دەکرد و دەهات بەشوێن ئێمەدا تاوەکو ڕووتمان بکاتەوە. ئێمەش بە سادەیی باوەڕمان دەکرد و بە دڵسۆزییێکی فراوانەوە پارەمان پێ دەدا.

ئیشەکە گەیشتبوویە ڕادەیەك کە براکانی خسرەوانی (ژەنراڵ پەرویز خسرەوانی سەرۆکی بنکەی تاج، عتاالله خسرەوانی، وەزیری کار لەسەردەمی شا) کە خۆیان کەسانێکی سامانداریش بوون هاتن و داوای پارەیان کرد.

سەرەتا وتیان بەدەستی خاڵی لە ئێران هەڵهاتووین و پێویستمان بە ملیۆنێك دۆلارە! کاتێك کچەکەم وتی ناتوانم ئەوەندە پارەتان پێ بدەم وتیان باشە نیوەی ئەو پارەیەمان بەدەرێ. پاشان داواکاریەکەیان هاتەوە سەر سەد هەزار دۆلار و دواتر بە ٥ هەزار دۆلاریش ڕازی بوون و هەر یەکەیان ٥ هەزار دۆلاری وەرگرت و ڕۆیشتن!

پەروێز خسرەوانی ساڵانێکی دوورودرێژ کارێکی پڕ داهاتی هەبوو. ماوەیەکی زۆر فەرماندەی پۆلیسی گشتی وڵات و ڕۆژگارێکی زۆریش سەرۆکی سەنتەری تاج بوو. لە کاری دروستکردنی شوقە و زەویداریدا لێهاتوبوو و ژمارەیەکی زۆر بەنزینخانەشی هەبوو لە تاران.

کەسێکی لەم شێوەیە بە چ شێوەیەك پێویستی بە ٥ هەزار دۆلارە؟

ئەم کابرایە برایەکی دیکەی هەبوو کە فەرماندەی سەربازی بوو و ئێمە پاش دەرچوونمان لە ئێران ئەم برایەمان هەرگیز نەبینیەوە.

(شعبان جعفری)یش کە لە ئاهەنگ و مەراسیمە تایبەتیەکاندا وەرزشکارە کۆنەکانی ڕێکدەخست و لە بەردەم محمد ڕەزادا نمایشی سەرنجڕاکێشی پێشکەش دەکرد لە ترسی مەرگی حەتمی لە وڵات هەڵهات.

شعبان لە ڕووداوی کودەتای ساڵی ١٩٥٣ وەرزشکارە بەهێزەکانی چەکدار کرد و توانی لەگەڵ هێزە سەربازیەکاندا خۆپیشاندەران سەرکوت بکەن.

محمد ڕەزا ئەوی زۆر خۆشدەیست و زۆر یارمەتی دەدا. شعبان تەصوری دەکرد ڕەزاگیان و کچەکەشم دەبێت وەکو محمد ڕەزا هاوکاری بکەن و پارەی بێ حساب و کتابی پێ بدەن، هەر بۆ ئەم مەبەستە لە ڕێگەی منصور رفیع زادەوە هات بۆ بینینی کچەکەم و ڕەزاگیان، و داوای هاوکاری کرد. سەرئەنجام لەبەر ئەوەی کە مرۆڤێکی

شەقاوە و بێ سەروبەر بوو و نەك ئاگاداری سیاسەت و فەرهەنگ نەبوو، بەڵکو هیچ ئەدەبیشی نەبوو و وتی: (من شعبان تاجبەخشم، لەبەرئەوەی کە من لە کودەتای ١٩٥٣ ڕۆڵێکی سەرەکیم لە گەڕانەوەی تاج و تەختی محمد ڕەزادا هەبوو دەبێت ژیانم دابین بکەن!)

کچەکەم پێکەنی و وتی: (ئێستا نە تاج ماوە و نە تەخت!)

ڕەزاش لە درێژەی قسەکانی دایکیدا وتی: (تۆ لە ڕابردوودا موچەی خۆت بەشێوەیەکی زۆر باش وەرگرتوە. باشترە ئیدی جارێکی دیکە نەیێیت بۆ ئێرە)

شعبان کاتێك بینی تۆپی یەکەمی کاریگەری نەبوو و دەستیکرد بە ناڵە و گریان و باسی ئەوەی کرد کە لە ئێران هیچشتێکی لەگەڵ خۆی نهێناوە و لێرە دەستیکردوە بە دەستپانکردنەوە!

ڕەزاگیان وتی بە منصور ڕەفیع زادە پێنج هزار دۆلاری بدەرێ.

شعبان ماوەیەکی زۆر لە ئەڵمان بوو و لە ڕستۆرانێکدا کاری دەکرد. ئێستا لە کالیفۆرنیا لە کەبابخانەیەکی ئێرانیدا کار دەکات و بەوشێوەیەی کە بیستومە بووەتە وەستایەکی زۆر باشی کەباب.

منصور ڕەفیع زادەش یەکێك بوو لە خاوەن پلە بەرزەکانی ساواك، ساڵانێکی زۆریش لە دەرەوە خزمەتی کردین.

ڕەفیع زادە بە دڵ و بەگیان ڕەزای خۆشدەویست. ڕەفیع زادە پیاوێکی دەوڵەمەند بوو و ژیانێکی باشی لە ئەمریکا بۆ خۆی فەراهەم هێنا بوو. بەڵام بەداخەوە کوڕە گەورەکەی بەپێچەوانەی باوکی بۆ ئەوەی ببێتە خاونی پارەکانی باوکی، شەوێکیان سەری باوکی بڕی بوو!

ئەم کوڕەی ئێستا لە زیندانی ئیتالیایە و سزای لەسێدارەدانی بۆ دەرچووە و چەند ساڵێکە چاوەڕوانی سزاکەیەتی.

من ئەگەر بمەوێت ناوی هەموو کەس ببەم و باسی هەمو وکەس بکەم ناتوانم. چونکە یەکەم هەندێك لە یرەوەریەکانم بۆ ئەوە ناشێن کە باسیان بکەم، و دووەم بەهۆی پیری و نەخۆشیتەوە زۆر تاقەتم نەماوە و گرنگتر لەوانەش یادەوەریەکانم زۆر بێزار و بێتاقەتم دەکەن.

لێرەدا ڕێگەم بدەن چەند یادەوەیەکی خۆشتان بۆ باس بکەم کە لەسەروی هەموویانەوە ئاهەنگی ژنهێنانی ڕەزا گیان بوو.

لە ساڵی ١٩٨٥ ڕەزاگیان کچێکی ئێرانی ناسی کە خەڵکی زنجان بوو و تازە قوتابخانەی ناوەندی تەواو کردبوو.

ئەم کچە لەگەڵ خێزانە بەڕێزەکەی لە شاری سانفرانسیسکۆ دەژیا و هاوڕێی خوشکی ژنەکەی ئەحمەد ئویسی بوو.

ڕەزاگیان لە کاتی میوانێکدا لەگەڵ یاسمین ئیعتمادی ئەمینی ئاشنایەتی دروستکرد و لە بەهاری ساڵی دواتر هاوسەرگیری لەگەڵدا کرد.

گرێبەستەکەیان بە ئامادەبوونی بەڕێز مامۆستا عباس مهاجرانی ئەنجامدرا و بوك و زاواش بۆ گوزەراندنی مانگی هەنگوینیان ڕۆیشتن بۆ باشوری فەرەنسا بۆ ڤیلای کچەکەم.

لە مەراسیمی گواستنەوەکەدا هەموو کەسایەتیە سیاسی و سەربازیەکانی سەردەمی سەڵتەنتی محمد ڕەزا لە سەرتاسەری ئەورووپا و ئەمریکاوە هاتبوون و وادەردەکەوت کە جارێکی دیکە دەسەڵاتی محمد ڕەزا تازە بووەتەوە و لە سەردەمی سەڵتەنەت دەچوو. کۆمەڵێك میوانی بیانیشمان هەبوو کە دەتوانم ئامارە بە هەندێکیان بکەم وەکو کوڕی گەورەی مەلیك حسین پاشای ئەردەن (شای ئێستای ئەردەن) و کوڕی مەلیك حسن (پاشای مەراکیش).

هاوڕێی ئەمریکیشمان هەبوو وەکو کیسنجەر و راکفلەر و چەند کەسێکی دیکە.

ئەمە شەوێکی مێژوویی و سەرتاسەری خۆشی بوو پاش ٨ ساڵ لە ئاوارەی و خەم و خەفەت.

یەکێك لە خۆشبەختیەکانی ئێمە بوونی چینێکی زۆر باشی ئێرانیەکان بوو لە هونەرمەند و نوسەرەوە بیگرە تاوەکو دەگاتە سیاسەتمەدار و ئەفسەرە پلە بەرزەکانی سەردەمی سەڵتەنەت، ئێمە لەو ئاهەنگەدا جگە لە محمد ڕەزا لەناوماندا نەبوو هیچ کێشە و خەمێکی دیکەمان نەبوو و هیچ هەستمان بە غەریبی نەدەکرد.

تەلەفزیۆنەکان و ڕادیۆکان و ڕۆژنامە زمانەکان کەش و هەوایەکی ئێرانیان بۆ ساز کردبووین. گۆرانیبێژەکان گۆرانی شادی ئێرانیان دەخوێند و ژەنیارەکانیش هەر وەکو ڕابردوو باشترین ئاهەنگیان بۆ دەژنین.

تاوەکو پێش ئەوەی لە ئێران بچینە دەرەوە وابیرمان دەکردەوە ئێمە ژیانی شاهانەمان هەیە. بەڵام کاتێك ڕۆیشتین بۆ ئەمریکا و خاوەنی کارگەیەکی دروستکردنی ئۆتۆمبێلمان دەبینی کە بە تەنها خاوەنی پەنجا ملیارد دۆلارە، یان خێزانی راکفلەرەکان کە نزیکەی سەد ملیارد دۆلار سامانیان هەیە، و ئەم خاوەن سامانە گەورانەمان لەگەڵ دوو سێ ملیارد دۆلاری خێزانی پەهلەویمان بەراورد دەکرد، ئیدی تێگەیشتین کە چ کەسانێك بەڕاستی (شا)ی ڕاستەقینەن!

کۆمەڵە دەوڵەمەندێك لە ئەمریکا و ئەوروپا هەن کە داراییەکانیان دەیان ئەوەندەی داراییەکانی خێزانی پەهلەوی و تەنانەت خێزانی سەڵتەنەتی سعودیەشە.

ئەوانە خۆیان و نەوەکانی ئایندەشیان لە نعمەت و خۆشگوزەرانێکی باوەڕپێنەکراودان بەبێ ئەوەی نیگەرانی ئەوەش بن کە ئیمپراتۆریەتەکەیان دەڕووخێت و هەرەس دەهێنێت!

بە باوەڕی من هەموو خۆشبەختی ٣٧ ساڵەی سەڵتەنەتی محمد ڕەزا ئەوەندەی ئەو چەند ڕۆژەی مانەوەمان لە نەخۆشخانەی سەربازی بنکەی ئەمریکی (لیك لند) لە تەکساس بەهای نەبوو!

هەموو ئەو ناز و نیعمەتەی سەردەمی سەڵتەنەتی پەهلەوی بۆ خێزانەکەی ئێمە ئەوندەی ئەو ڕۆژە کورتانەی دەربەدەری لە پەنەما نرخی نەبوو، کە سەربازێکی بەکرێگیراوی وەکو (نوریە گا) تەماع بکاتە کچەکەم!

من تاوەکو ئێستاش تێنەگەیشتم بەڕاستی لە شۆڕشی ئێران چی ڕوویدا و چۆن بەو شێوەیە محمد ڕەزا لەو ترۆپکی گەورەیی و چێژ وەرگرتنە بەو خێراییە کەوت، تەنها ئەوە دەزانم کە ئەگەر جارێکی دیکە ژیانم بگەڕێتەوە بۆ دواوە ئامادەم کچەکەم بدەم بە کرێکارێك یان کارمەندێکی سادە بەڵام ناهێڵم ببێتە ژنی شا...



ئەردەشیر زاهدی



فزل الله زاهدی




محمد ڕەزا لە فڕۆکەخانە

بۆ دواهەمینجار ئێران بەجێدەهێڵێت



فەرەح دیبا



محمد ڕەزا و خێزانەکەی لە
سەردەمی نەخۆشیدا لە ئاوارەیی



محمد ڕەزا و فەرەح لە پەنەما



محمد ڕەزا لەسەردەمی نەخۆشیەکەی لە ئەمریکا



بنەماڵەی محمد ڕەزا و ئەنوەر سادات و خێزانەکەی لەسەر تابوتی محمد ڕەزا



صدام حسين و فەرەح پەهلەوی





**باوك و كوڕ (ڕەزا شا و محمد ڕەزا شا)**



فەرەح لەسەر گۆڕی محمد ڕەزاشای هاوسەری



**دایك و كچ**

**"فەریدەی دیبا" و" فەرەحی دیبا "**



فەرەح پەهلەوی شاژنی ئێران



فەرەح و لەیلای کچی



مندڵی فەرەح پەهلەوی لەگەڵ قوتبی خاڵۆزایدا



# شاهنشاه: فکر نمیکردم رسیدن به آزادی اینقدر گران تمام میشود

کیهان

جشنهای باشکوه ۲۸ امرداد در سراسر کشور

رستاخیز از حالت حزب انحصاری خارج شده

هیچ محصلی در دوره متوسطه مردود نمیشود

دانشجویان تظاهرکننده سفارت ایران را اشغال کردند

به تظاهرکنندگان دستورهای صریح مارکسیستی و کمونیستی میرسد

دستور شاهنشاه درباره جلوگیری از هرنوع توصیه از طرف وابستگان و نزدیکان نظام سلطنت

وقایع اخیر در نیت من بدادن آزادیها تغییری بوجود نیاورده است

کودتای نظامی در افغانستان



شابانو فەرەح پەهلەوی | پەند وەربگرین | فەرەح پەلەوی لە تاراوگە

# فەریدە دیبا

به باوەڕی من هەموو خۆشبەختی  ٣٧ساڵەی سەڵتەنەتی محمد ڕەزا ئەوەندەی ئەو چەند ڕۆژەی مانەوەمان لە نەخۆشخانەی سەربازی بنکەی ئەمریکی )لیک لند( لە تەکساس بەهای نەبوو!

هەموو ئەو ناز و نیعمەتەی سەردەمی سەڵتەنەتی پەهلەوی بۆ خێزانەکەی ئێمە ئەوندەی ئەو ڕۆژە کورتانەی دەربەدەری لە پەنەما نرخی نەبوو، کە سەربازێکی بەکرێگیراوی وەکو )نوریە گا( تەماع بکاتە کچەکەم!

من تاوەکو ئێستاش تێنەگەیشتم بەڕاستی لە شۆڕشی ئێران چی ڕوویدا و چۆن بەو شێوەیە محمد ڕەزا لەو ترۆپکی گەورەیی و چێژ وەرگرتنە بەو خێراییە کەوت، تەنها ئەوە دەزانم کە ئەگەر جارێکی دیکە ژیانم بگەڕێتەوە بۆ دواوە ئامادەم کچەکەم بدەم بە کرێکارێک یان کارمەندێکی سادە، بەڵام ناهێڵم ببێتە ژنی شا...



لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ( ٨٠٠٠ ) دینار